# پێشەکی

لەمێژوودا هزر، هەمیشە چەکی هەرە بەهێزبووە کە مرۆڤ لە ڕێگایەوە توانیویەتی لە ژیاندا تێبکۆشێ. هزر؛ لە ڕێگا سەخت و دژوارەکاندا ڕۆناکی و مەشخەڵی مرۆڤایەتی بووە، هەر بەمەشەوە سیستەمی خۆی دروست کردووە و ئاستی ژیانی پەرەپێداوە و گەیاندویەتیە لوتکەی پێشکەوتنی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی. لە هەموو قۆناخەکانی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی و گەلاندا، هزری ڕۆناك دەرکەوتوونەتەڕوو، کە بوونەتە زەمینەی ئاوابوونی شارستانیەت و مێژوو بۆ گەلان. لە هەر شارستانیەتێکدا بیرمەند و پەرتووك هەیە و لەنێو هەر گەلێکیشدا پەرتووك و ڕۆناکبیر هەیە.

گەلی کوردستان، کە لەمێژوودا رووبەڕووی گەلێك هێرشی تاڵانکەری و داگیرکەری بۆتەوە و بەدەستی هێزە سەردەست و داگیرکەرەکان زوڵمی هەرە دژواری لەبەرامبەردا پەیڕەو کراوە، بەجۆرێك کە لەسەدەی دواییدا ئەم گەلەیان مەحکومی سیاسەتی نکۆڵی و فڕکردن کرد. ئیدی هەر جۆرە زوڵم و ستەمێك لەسەری بەڕێوەبراوە کە لەمێژووی گەلاندا وێنەی کەم دەبینرێ، ئەمەش دەرکەوتنی سەرۆکایەتیەکی کردۆتە پێویستیەکی ژیانی. گەلی کورد کە بەبوێری و فیداکاری و تامەزرۆی بۆ ئازادی دەناسرێ، نە ببوو بەخاوەن سەرۆکایەتیەکی ئایدیۆلۆژی و سیاسی کە نوێنەرایەتی بەرژەوەندی و ئیرادەی ئەو بکات و، هەر بۆیە لە رووی هزری بەهەژاری ماوە، ئەمەش لە ڕێگەی گەیشتن بە ژیانێکی ئازاد و شەرەفمەندانە، ئێش و ئازاری زێدەتر دەکرد.

دەرکەوتنی سەرۆکی نەتەوەیی عەبدوڵڵا ئۆجەلان بۆ گەلەکەمان، ڕووداوێکی مێژووییە. سەرۆك عەبدوڵڵا ئۆجەلان بۆ گەلی کورد بووە بیرمەند و هاوکات ئەو کەسەی کە ئەمە جێبەجێدەکات، بەمجۆرەش توانی ڕەهەندی نوێ بۆ کێشەی کورد بهێنێتەدی و دووری بخاتەوە لە ڕەمەکیەت و بیکاتە کرداری بکەر، واتە کرداری جووڵانەوەی ئاپۆچی. لە هەموو رووییەکی سیاسی، ئایدیۆلۆژی، سەربازی، ستراتیژی و تاکتیکی سەرۆکایەتی کرد، بۆ ئەوەی جارێکی دیکە گەلەکەمان، دوای ساردبوون و لە جووڵەکەوتنی بۆماوەیەکی درێژ، بتوانێ دەرکەوتنێکی مێژوویی بکات، سەرلەنوێ سەرهەڵبدات و شۆڕشی ژیانەوە ئەنجام بدات.

تەواوی ئەمانەش بەرهەمی سەرۆك عەبدوڵڵا ئۆجەلانە، ئەوەی کە لەسەرەتاوە تاوەکو ئێستا سەرۆکایەتی بۆ جووڵانەوەکە کرد و لەپێناویشیدا تەواوی هزری خۆی پێشکەش کردووە،

کاری کرد و چالاکی بێ ڕاوەستانی درێژەپێدا بۆئەوەی ئەم جووڵانەوەیە هێز و توانا وەربگرێ و لە تەنگژە و هەڵوێستی دژوار ڕزگاری بکات و زیاتر بەهێزی بکات. سەرۆك بەخەباتی بەردەوام و بێوچانی خۆی کە ڕاوەستان و پشوودان ناناسێ و بە هزری خوڵقکاری تیژی خۆی هەمیشە لە پشت هەموو پێشکەوتن و سەرکەوتنێکدا بۆتە هێزێکی گەورەی ماددی و مەعنەوی، کە بەو هێز و تیۆریانەی خۆی و پراکتیکی خۆی بۆتە ڕێبازێکی تەواو و گشتگیر.

ئەم ڕێبازە لێکۆڵینەوەی خۆی لە هەڵسەنگاندنەکانی سەرۆك وەردەگرێ، ئەوانەی کە هەموو بوارەکان لەخۆوە دەگرێ و بەمجۆرە بنچینەیەك بۆ هەموو خەباتێك لە تێکۆشانی ڕزگاری ــ دیموکراسی لە ڕووی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، سەربازی، ئەخلاقی دادەنێ. ئەم هەڵسەنگاندنانە بە قووڵایی لێکۆڵینەوە لە هەموو ئەو کێشە ئاڵۆز و گرێکوێرانە دەکات کە لە پێش تێکۆشانی ڕزگاری دەردەکەوێت. تەواوی کون و قوژبنەکان دەپشکنێ بۆئەوەی هیچ لێڵییەکی تێدا نەهێڵێ و شێوازی چارەسەری بۆ ئەم کێشانە دادەنێ و هەروەها شێوازی هەرە باش بۆ خۆرزگاربوون نیشاندەدات. ئەم هەڵسەنگاندنانە پشت ئەستوورن بەبنەمایەکی تیۆری بەهێز و ڕاستینەیەك بۆخۆی بەبنەما دەگرێت، کە لەژێر ڕۆناکی ئەودا تێکۆشان دەستپێبکات. ئەمەیە گەوهەری ئەم هەڵسەنگاندنانەی کە لە دووتوێی ئەم پەرتووکەدا ئامادە و کۆکراوەتەوە کە سەرۆك عەبدوڵڵا ئۆج ئالان پێشکەشی کردوون.

ئەم هەڵبژاردنەش هەندێك ئاخافتن و هەڵسەنگاندنی سەرۆکن کە لە قۆناخ و بۆنەی جیاجیا پێشکەشی کردوون کە لە زمانی تورکیەوە بۆ زاراوەی سۆرانی وەرگێڕدراوە و لە ڕۆژنامەی "**وڵات**"دا بڵاوکراونەتەوە.

ئێمەش لێرەدا وەکو پەیوەست بوونێك بە بیرەوەری شەهیدان و بۆ خستنەڕووی ڕاستیەکانی شۆڕش و سەرۆکایەتی هاوچەرخی گەلی کوردستان، ئەم پەرتووکە دەخەینە بەردەستی خوێنەران و بەو هیوایەین کە توانیبێتمان خزمەتێکی بچووك بەشەهیدان و دۆزی ڕەوای گەلەکەمان بکەین و ئەم هەڵسەنگاندنانەش ببێتە ڕۆناك کەرەوەی ڕێگای گەیشتن بەچارەسەری دیموکراسییانەی کێشە ڕەواکەمان.

**یەکێتی ڕۆشنگەری دیموکراتی (YRD)**

# ناوەڕۆك

# هونەری سەرۆکایەتی

*راسپاردەکانی سەرۆکی گشتی PKK عەبدوڵا ئۆج ئالان سەبارەت بە سەرکەوتنەکانی ساڵی شازدەمینی PKK و ساڵرۆژی شەڕی گەریلا.*

ئەگەر ئاوڕێك لەمێژووی پارتیمان بدەینەوە دەبینین هەر تەنیا بەشێوەیەکی ژیانی پەرەگرتوو یان ئاسۆی هزری و ئارەزووی مرۆڤانە و پەیوەستبوون بەو مێژووەوە نییە، بەڵکو هەر کتومت وەك گۆڕانێکی ئازادی، بەڵام کاتێك تەماشای دوژمن دەکەین و هەڵی دەسەنگێنین بۆمان دەردەکەوێت کە سەرچاوەی هێزەکەی لە پشت بەستن لە گەلێکی دواکەوتوو هەتا دوایی کۆنەپەرستەوە دێت. ئەو گەلە بە یەکێك لە گەلە هەرە دواکەوتووەکانی جیهان دەناسرێ، کە تەواوی بەها مرۆڤایەتی و مێژوویەکانی ئازادی شایستەی مرۆڤی شێواندووە و کردوونی بە پاشکۆی بەرژەوەندییەکانی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بارودۆخە مێژوویەکان و رووداوە نوێیەکان هانی زۆر لە دۆست و لایەنگرەکانی داوە، کە بایەخ بە دۆزەکەمان بدەن و هەڵوێستی لێ وەرگرن. هەرچەندە تائێستا دەزگا نێودەوڵەتیەکان نەهاتوون بەپەرۆشەوە هەڵوێستی خۆیان دەرهەق بە کوردستان و بزاڤە رزگاریخوازەکەی نیشانبدەن دەربخەن و بە شێوەیەکی دروست هەڵیسەنگێنن، بەڵکو هەمیشە بەچاوێکی کۆنەپەرستانە سەیری گەلی کورد و دۆز و بزاڤەکانیان کردووە و مەسەلەی مافی ژیان و بوون و نەبوونی لەلای شتێکی قێزەوەنە. بەڵێ، هەر لە رۆژگاری کۆنەوە تا ئێستا گەلەکەمان بەشێوەیەکی خراپ بەکارهێنراوە، فەرمانی زۆردارانەی بەسەردا سەپێندراوە و ژیانی دوور لە هەموو رێباز و یاسایەك بە شێوەیەکی ئەوتۆ بەسەر بردووە، کە تەنانەت مافی مرۆڤایەتیشی لێ زەوت کراوە. بەڵام ئەمرۆ بەدەرکەوتن و پەرەسەندنی بزاڤی شۆڕشگێڕی بە سەرکردایەتی پێشەنگە شۆڕشگێڕەکەی، بارودۆخی گەلەکەمان بەپێچەوانەی ئەو رابردووە گۆڕاوە. ئەگەرچی دەبێ لەوەش بەئاگابین کە ئەم بزاڤە بەهۆی تایبەتمەندی شۆڕشەکەمان، هێشتا لەچاو

بزاڤـە شۆڕشـگێڕییە مێژووییەکانـدا تەسـکبینانە سـەیر دەکـرێ. چـونکە هێشـتا کـەس نەیتوانیوە پڕ بەپێستی خۆی هەڵیسەنگێنێ و تێی بگات. نەك هەر دۆست و دوژمنانمان، بـەڵکو تەنانـەت کادیرەکانیشمان دوورن لەگرتنەبـەری ڕێچکەی سیاسـی پارتەکـەمان و بەباشی نایناسن. ئەوەتا دەبینین لە دوو ڕێگاوە بۆی دەچن، هەندێکیان دەیانەوێ بەگیان و بەدڵ بێگـەنێ، ئـەوانی دیکـەش دەیانـەوێ شـۆڕش هەرلـە پەرداخـە ئاوێکـدا بخنکێـنن. ئەوەش گرفتێکە پێویستە بە ووردی لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ.

بزاڤەکەمان بەشێوەیەکی دروست پـەرەی بـە هونـەر داوە، کـە دەشـێ بڵێین بۆتـە زەمینـەك بـۆ زۆربـەی هەڵسـەنگاندنەکان. هـەر کەسـێك هـەوڵی داوە بـە گوێرەی خـۆی هەڵیسـەنگێنێ. گەیشـتنمان بـەم ئاسـتە لەسـەر بناخەیـەکی زانسـتی خـۆی لەخۆیـدا پەرەسـەندنی ئـیرادەی مرۆڤـی سـەرکەوتووە. بزاڤـی وورە و بـڕوا بـەخۆبوون لەناخـدا دەوروژێنێت و لەگەڵ زانستدا دەیانکاتە یەك و بە جددیەوە کار دەکات بـۆ هێنانەکایـەی مرۆڤی خاوەن سیمای تایبەت کە توانای بونیادنان و داهێنانی هەبێ.

ئـەوەی تائێسـتا بونیـادنراوە لەنـەبوون پەیـدا کـراوە، ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ خاسیەتی هونەری پارتەکەمان و بوونی توانای داهێنان تیایدا، واتا تایبەتمەنـدی PKK داهێنانە، هەر بۆیەش لەکاتی هەڵسەنگاندنی بزاڤەکەمان دەگەینە لێکدانەوەیەکی راسـت و دروست و بەباوەڕییەکی ئەوتۆ کە نزیکبوونەوە لـە پـارتی و پەیوەنـدی پێـوە کـردن و ناسـینی بەشـێوەیەکی لاسایی شـتێکی نەشیاوە. چـونکە ئێمـە نـاتوانین پارتەکـەمان بـە تێروانینێکی تەسك لە رووی مێـژوویی، کۆمەڵایـەتی، ئـابووری، رۆشـنبیری و رامیاریـەوە هەڵسەنگێنین. بەمجۆرە ناگەینە کرۆکی مەسەلەی ناسینی پارتەکـەمان، بـەڵکو پێویسـتە بچینە نێو ناخی لایەنە وورد و درشتەکانی، تاوەکو بەتەواوی لێـی تێبگـەین و خاسـیەتە تایبەتـەکانیمان بـۆ دەرکـەون. ئەگـەر سـەرنجێکی مێـژووی مرۆڤایـەتی و گەشەسـەندنی شارستانیەت و پێکهاتنی چینە فەرمانڕەواو کۆلۆنیالیستیەکان و سیاسەتی فاشـیزمانەیان بدەین، ئەو کاتە دەگەینە ئەو سـەرنجامەی کـە پێشـەنگی ئـەم سیاسـەتە کۆلۆنالیزمییـە، دەوڵەتی تورکیایە، کە لە پەیڕەوکردنی شەڕی تایبـەت و کوشـتن و تـالان و تێکشکاندنی گشـت شـیرازە مرۆڤایەتیـەکانی گـەلان، لـە سیاسـەتی دەرەوە و ناوەوەیـدا، ئـەم شـتە گەیشـتۆتە دوارادە. ئـەمرۆش ئـەم دەوڵەتـە تـەواوی هێـزی خـۆی بـەنیازی لـەنێوبردنی

بزاڤی رزگاریخوازی کوردستان خستۆته گەڕ. جا ئەگەر ئێمە شارەزای ئەم سیاسەتە کۆلۆنیایزمە ببین، ئەوا لەڕۆڵی مێژوویی ئەم شۆڕشەی کوردستان تێدەگەین کە هەروا بەرێکەوت سەریهەڵنداوە و دەرنەکەوتۆتە سەرشانۆی مێژوو.

هەر تەنیا بە بەراودکردنێکی مێژوویی ساکار بۆمان دەردەکەوێ کە لە رۆژگاری پێکهاتنی چینە دەسەڵاتدارەکانەوە تا ئێستا لێکچوونێکیان لە نێودا هەبووە، لەوەدا کە پشت بەستی هەموویان ئەو سیاسەتە کۆلۆنیالیزمە کۆنەپەرستیە یە کە دەیەوێ شیرازە مرۆڤایەتیەکان لەنێو بەرێ و لە بەردەم پەرەگرتنی بزاڤە شۆڕشگێڕەکانی گەلان بگرێ. هەروەها بۆمان دەردەکەوێ کە ئامانجی بزاڤە شۆڕشگێڕیەکانیش لەیەکتر دەچن، لەوەدا کە هەموویان مەبەستیان هێنانە کایەی دەسەڵاتی گەل و رزگارکردنی نیشتمان و نەهێشتنی ژێر دەستەیی کۆلۆنیستەکانە، بە پشت بەستن بە توندوتوێژی شۆڕشگێڕیی. هەر لەبەر ئەوەش پێویستە ئەمرۆ چاکتر لەڕاستی شەڕ تێبگەین. ئاشکراشە بزاڤی شۆڕشگێڕی هیوای ملیۆنەها کەسی ژێردەستەی لەخۆوە گرتووە و چاووگی ورە و بڕوایە.

بزاڤی رزگاریخوازی کوردستان بە پێشەنگایەتی PKK کە لەم رۆژگارەدا لەگەرمەی شەڕێکی شۆڕشگێڕانە و ژیانیدایە. لە رووی جۆری هێزەکەی و دژە هێزەکەی لە زۆرلایەنەوە لە بزاڤە شۆڕشگێڕیەکانی مێژوو دەچێ. لێرەشدا راستی شەڕ بەمشێوەیە دەردەکەوێت.

ئەگەر چاوێك بە شۆڕشی ئیسلامدا بگێرینەوە و شیبکەینەوە ئەوا دەبینین حەزرەتی محمد پشتی بە ئەوزاری پێغەمبەران بەستبوو، لە قورئانیشدا هەر وا هاتووە، ئەگەر لە بارودۆخی شۆڕشەکەش بکۆڵینەوە، دەبینین کە تیرە عەرەبەکان لەو رۆژگارەدا لەنێو خۆیاندا لەناکۆکی و ململانێدا بوون. شێوازی ژیانیان بریتی بوو لە کۆچبەری بەدەشتە بیابانییەکاندا، نەزان و دواکەوتوو و بەرچاوتەنگ بوون و دژی هەموو جۆرە پەرەگرتنێك دەوەستان و هەردەم لەگەڵ بازرگانە جوولەکەکاندا ناکۆك بوون. لەلایەکی تریشەوە هیوایەکیان بە ژیان هەبوو، جا ئەوەی حەزرەتی موحەمەد پێیهەڵسا، زیندوو کردنەوەی مرۆڤایەتی بوو. هەر بۆیەش ئەو ژیانە لەلایەن ئەوەوە روون دەکرایەوە و پەرەی پێ دەدرا، بۆ ئەو تیرە عەرەبانە وەك سەرابی تریفەی مانگ وابوو لە دەشتی بەرفراوانی بیاباندا. واتە حەزرەتی موحەمەد بۆ ئەوانە مانای ژیان بوو. لەو نیمچە

دورگەیەدا کە لە مێژووی کۆنییەوە پابەندی باری قورسی شیرازە کۆنەپەرستیەکان بوو و شوێنەواری سیاسەتی زۆر لەهۆزەکانی نەتەوەی جوولەکە و ئەو نەتەوانەی پێوە دیار بوو کە موسا نەفرەتی لێ کردبوون. بەڵێ حەزرەتی موحەممەد بەرەنگاری ئەو کەسانە دەبۆوە کە دەیانخواست مرۆڤایەتی نەهێڵن و لەسەر بناخەی کۆنەپەرستانە هەموو شتێك داروخێنن و تەگەرە بخاتە بەردەم پەرەگرتنی هیوای ئەو گەلە ستەمدیدانەی، کە لەژێر فشاری باری قورسی کۆیلایەتیدا دەیانناڵاند و چاویان بڕیبووە رزگاربوون.

راستیەکی مێژووییە کە دیاردەی نوێ شوێنی دیاردەی کۆنی بەسەرچوو دەگرێتەوە، جا ئەو سەردەمەی کۆیلایەتی هەزار ساڵی بەسەردا تێپەڕبوو و لە تێکشکاندنێکی درندانەی شیرازە مرۆڤایەتیەکان و رێگرتن لە پێشکەوتن بەولاوە شتێکی دیکەی لە هەگبەدا نەبوو. هەر دەبوایە شۆڕشێکی نوێخوازانە واقیعەکە بگۆڕێ. لەو قۆناخەدا شتێکی ئاسایی بوو لە منداڵدانی مێژوودا کەسایەتیەکی مەزنی وەك حەزرەتی موحەممەد لەدایك بێ، کە هیوای ملیۆنەها کەسی لەخۆوە گرتبوو. مادام بارودۆخەکە هێندە شیاو و پێگەیشتووبێ کە هەر بەتاقە تروسکێك دارستانێك گڕ بگرێ و موعجیزەیەك بێتە ئارا، ئەوا هەرچی لەمپەرێکی بێتە رێ رایدەماڵێ. ئەم راستیە حاشاهەڵنەگرەی مەزنێتی حەزرەتی موحەممەد وەك پێغەمبەرێك، بەردەوام بە درێژایی مێژوو خۆی لەوەدا دەسەلمێنێ کە ئەو کەسایەتیەی لە رۆژگارێکی پڕ لە ئاستەنگییدا ببێتە هێزی چارەسەر، ئەوا لە کاروانی مێژوودا نەمردەبێ و دوای هەزاران ساڵیش ناوی وون نابێ.

مەزنێتی شۆڕشی فەرەنساش هەر بەهەمان پێودانگ شیدەکرێتەوە. مۆنارشییەکان بەرجەستەی کۆیلایەتی هەزاران ساڵ و ئاستەنگ بوون لەبەردەم نوێکردنەوە، هەڵدەستان بە لە باربردنی تەواوی شیرازە و بەها مرۆڤایەتیەکان و دژە تەنی پەرەگرتن بوون لە جەستەی ئەوروپادا. ئەو مۆرناشیە دەرەبەگانەی وەك ماری ئەنتوانێت و شالوسی، مۆتەکەیان بوون. بۆیە نوێخوازانی شۆڕشگێڕان لەژێرەوە لە کەف و کوڵ و سەرەتایەکدا بوون لەپێناو پێویستی هاڕین و سەرنگوونکردنی مۆنارشییەکان. جا لێرەدا دەتوانین بڵێین ئیدی مێژوو رۆژمێری ماری پێچایەوە و کردیە بەردەبازی رێگای نوێنەرانی چینی بۆرژوا کە کەڵکیان لە بارودۆخەکە وەرگرت و دروشمی "ئازادی،

یەکسانی، برایەتی" یان هەڵگرت. هاوکات فەیلەسووفە فەرەنساییەکانیش چرای ڕۆشنکردنەوە بواری هزریان داگیرساند و سەرکردە سەربازیەکانی وەك ناپلیۆن دەستیان بە بەفتوحات کرد. لەلایەکەوە هەر سەربوو بەتەوری زەبەلاح دەیان پەڕاندن، لەلایەکی دیکەشەوە دروشم و بانگەوازی ئازادی بەوپەڕی بەختیاریەوە لەنێو سوورایی خوێندا دەدرەوشانەوە و گوڵی سەربەستی ئەو شۆڕشە تا ئەمڕۆکەش ڕۆڵی کاریگەری خۆی دەبینێ و، دەپشکوێ.

مەزنێتی شۆڕشی ئوکتۆبەر لە روسیاش کە ڕۆژگارێکی نوێی لەمێژووی مرۆڤایەتیدا هێنایە ئاراوە، هەر لەهەمان جۆگەلەوە سەرچاوەی هەڵگرتووە. بەڵێ، کەسایەتیەکی زۆر رادیکالی وەك (عەلی) لە شۆڕشی ئیسلامدا و (بابۆف) لە شۆڕشی فەرەنسادا و چەپڕەوی شۆڕشگێڕ و کۆمۆنیست، مێژوویان پڕ لەسەرەوەری کرد. ئەو کەسایەتیانەی ویستیان ئازادی و یەکسانی و دادپەروەری بۆ مرۆڤ شیاو و رەها بکەن، کە سەدانساڵ بوو زەوت کرابوون. ئەوان بۆ گێڕانی ڕۆڵی مێژوویی بەکاریگەر تێکۆشان، کەچی ڕۆژگاریان بۆ گەیشتنە ترۆپکی سەرکەوتن نالەبار و خۆشیان بۆ ئەو مەبەستە گونجاو نەبوون. گەلێکیان گیانی بەرەنگاریی و قارەمانێتییان نواند، بەڵام هەر لەریزی چینە ناوەندیەکاندا مانەوە و نەیانتوانی خۆیان لە خەسڵەتە کۆنەپارێزەکانی ئەو چینانە رزگار بکەن، بەڵکو لەنێوان هەڵپەی پێشکەوتن و بەند و داوی دواکەوتوورییدا ململانێیان بوو.

شۆڕشگێڕانی ئۆکتۆبەر ویستیان ئەم رەوشە لەمپەری چینە ناوەندییەکان ببڕێ و کەسایەتی رادیکالی ئەوتۆ لەنێو پارتی بەلشەفیکدا دەرکەون کە خولیای چینە ناوەندییەکانی پاکتاوکرد، بەوەش ڕۆڵێکی شۆڕشگێڕانەیان گێڕاو بەشێوەکی رادیکاڵیانە پەرەیان بەبوونی مرۆڤایەتیشدا. بۆ یەکەمجار لە مێژوودا رەنج سەردەکەوێ و چینی چەوساوەی ستەملێکراو دەسەڵات دەگرێتە دەست. بەڵێ ئەم شۆڕشە کاریگەری لەمێژوو کرد و تائێستاش بەردەوامە و ڕێگایەکی مرۆڤانەی راست و دروستی ئاشکرا کردووە. جا ئەگەر ئەمڕۆ ئەو کۆنەپەرستانەی دەرگایان لەبەردەم گشتی خاچ پەرستەکاندا والاکردووە، توانیبێتیان هەرەس بە بەرهەمی بونیادنراوی شۆڕشەکە بێنن، ئەمە مانای ئەوە نییە کە لەمێژوودا هیچ ڕۆڵێکی نەبینیوە، چونکە شۆڕشێك بوو راستی یەکسانی سەلماند و روخسارێکی گەشی بە ژیانی مرۆڤایەتی بەخشی و بە مۆرکی ئازادیی

خەملاندی. ئەمەش بناخەکەی چەسپیوە و هەرگیز لەق نابێ.

شۆڕشی کوردستانیش لەژێر سایەی سەرۆکایەتی PKKدا پەرەی سەندووە و کۆمەڵگاکەمان لەرپیشەوە دەگۆڕێ. ئەو شۆڕشەی حەز و هیوای ژێردەستانی لەخۆوە گرتووە و بزاڤەکەشی دەروون زاخا و دەدا و، بەئەزموون وەرگرتن لە شۆڕشە پێشینیەکانی مێژوو سەرلەنوێ وەرەی مرۆڤایەتی جۆش پێدەدات و پەرەی پێدەدات. واتە PKK خۆی لە خۆیدا بزاڤی گۆڕانێکی بنەڕەتی مێژووە.

هاوەڵانی حەزرەتی موحەممەدیش رادیکال بوون، لە رۆژگاری خۆیاندا بیروباوەڕ و سیاسەتێکی نوێیان داهێنا و کەوتنە رەخنە گرتن، لەکۆمەڵگای کۆن. لەسەرەتادا تێگەیشتن لەشۆڕشەکەیان ئاسان نەبوو، بەڵام کە تەقینەوە و بوونە هێزێکی کاریگەر لەسەر مێژووی مرۆڤایەتی و ژیاندنەوەی برِوا بەخۆ بوون، کڵپە سەندنی ئەو شۆڕشە بەچەشنی بورکانێك رووی زەمینی هەژاند. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تایبەتمەندێتی ناواخنەکەی و رشدی جۆش و خرۆش و خۆشەویستی رقی پیرۆز. وێڕای لایەنی سیاسی و سوپاییەکەی کە سەرگوزشتە و شەڕێکی مەزن بوو، کەچی لەئاکامدا گەیشتنە قۆناخی دامەزراندنی ئیمپریاتۆریەت.

ئەگەر لەشۆڕشی فەرەنسا وورد ببینەوە، ئەوا زۆر شتمان بۆ روون دەبێتەوە. دەرکەوتنی چینی بۆرژوازی بە ناکۆکیەکانیەوە، پەیدابوونی فەیلەسوف و زانایان و هیوای ئازادی و گرِوتنی و تینی تایبەت لەناو شۆڕشدا و باڵادەستی مۆنارشی و کەنیسە لە رژێمی کۆندا و، دەرکەوتنی ناپلیۆن وەك سەرکردەیەکی سەربازی بۆرژوای بەهێز و بڵاوبوونەوەی شۆڕش لە ئینگلتەرا و فەرەنسا و ئیسپانیا و کەنارەکانی سوریا و میسر و کەنارەکانی مۆسکۆ، شۆڕش توانی لەماوەی 15 ساڵدا بەمرِەنگە گەشە بکات. هۆی سەرەکی ئەم گەشەکردنەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هیوا و کین و تووڕەیی و وشیاریەی کە لەخۆوەی گرتبوو. هەروەها بۆ چۆنێتی شێوازی دەربازکردنی ژیانی کۆن بە بڕیار و پێداگرتن لەسەری.

لەم رووەوە شۆڕشی بەلشەفیك زیاتر سەرنجی مرۆڤ رادەکێشێت، سوپای بەلشەفیك لەسەر بنگەی گیروگرفتەکانی ژیان و رشدی و هیوا و ورە و یەکسانی ئاوابوو، کە لەدواییدا توانی هەموو ئاسیا و ئەوروپا و ئەفریقیا بهەژێنێ، بە دامەزراندنی

ئیمپراتۆرییەت و پەیوەندیە نوێیەکان توانیان کاریگەری لەسەر هەموو دنیا دروست بکەن.

دەتوانین زۆر نمونەی تری مێژوویی بەنیازی هاوشانی و بەراووردکردن لەگەڵ بزاڤی پارتەکەمان PKK بخەینە بەرچاو. ئەو بزاڤەی حەز و ئارەزووی ئازادیخوازانەی مەزنی لەخۆوە گرتووە و نوێکردنەوەی هۆشیاری و وورە و ئازادی و داخوازی مەزنی لەخۆیدا بەرجەستە کردووە و، بە گرتنەبەری جۆرەها شێوازی فێربوون و فێرکردن، دەمامکی لەڕووی ناکۆکیە هەنووکەییەکان هەڵماڵیوە و بە تین و گوڕەوە بەرەنگاری تەواوی ئەو نەخشە گڵاوانەی کۆنەپەرستان بۆتەوە کە لە جیهانی ئەمڕۆدا، بەنیازی چارە رەشکردنی گەلان، هەوڵی پراکتیزەکردنیان دەدرێت. زەمینەی سەقامگیری پارتەکەمان لەتوانای بەرچاویدایە بۆ پەرەپێدان، کە لەتوێی هیوا و توانای PKKوە دێت. تا ئێستا مێژوو بزاڤێکی بەمرنگە بەهێزی بەخۆیەوە نەبینیوە، کە پشت بە هێزی خۆیی ببەستێ. بەبێ هیچ یارمەتی و پشتگیریەکی دەرەکی و نێودەوڵەتی. لەمانەش گرنگتر ئەوەیە کە ئاسۆ و ئامانجی خۆی بۆ گەیشتن بە واتای راستەقینە دەستنیشان کردووە و، لەپێناویدا خەبات دەکات. ئەمەش باوەڕی دەدات بە مرۆڤ و وورەی بڵند دەکات. لێرەدا دوژمن هیچ گرنگ نییە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە تۆوی هیوا لە خوددا بچێنێ و لە هەموو گۆشەیەکی دنیادا بڵاوی بکاتەوە. ئەو کاتەش هیچ کەسێك ناتوانێت لەبەردەمیدا رابوەستێ و بەرەو شەڕی گەلەری هەنگاوی مەزن دەهاوێژێ. هەربۆیە دەتوانم بڵێم نزیکبوونەوەی راست لە PKK و تێگەیشتنی راستیەکانی، بە پێودانگی کلاسیکی و سادە ناسازێ، بەڵکو پێویستە پێودانگە مێژوویی، زانستی و ئایدیۆلۆژیەکان بۆ ئەو مەبەستە پەیڕەو بکرێ و هەرچی تایبەتە بە پارتەکەمان وەك موڵکی سەرتاپای مرۆڤایەتی سەیر بکرێت.

لەوەش ئاگادارین کە هێشتا کەسانێکی کەم هەن لەناو ئێمەدا لە دەرەوەی رێکخستندا دەژین و ژیانی خۆیان بەشێوەیەکی نافەرمی بەسەر دەبەن، لە بەرامبەر ئەمەش بەشی هەرە زۆری هەڤاڵانمان بە شۆڕشی رزگاریخوازی گەلەکەمان PKK وە گرێدراوە و گەشبینن، لەلایەکی دیکەوە بزاڤەکەمان لە پەرەگرتنێکی نەپساوەدایە لەدژی یاسا فەرمیەکانی دەوڵەتی تورکیا، کە بە زەبری هێز و خستنە گەڕی شێوازی دەمامکدراو بەسەر گەلەکەماندا سەپاندوویەتی. هەر لەم کاتانەشدا بەچاوی کەم بایەخ

سەیری توانای دەوڵەت ناکەین، ئێمە دژی سیستەمی دوژمنێك دەجەنگین، کە نوێنەری تەواوی ئیمپراتۆریەتە کۆنەکانی مێژووە؛ وەك ئیمپراتۆریەتی فەرەنسی، یۆنانی، رۆمانی، بێزەنتی، ساسانی و سەلجوقی و عوسمانی، ئەم دەوڵەتە نەگریسە هێزی خۆی لەو ئیمپراتۆریەتە کۆنانەوە هەڵێنجا و لە ژێر فەرمانڕەوایی مستەفا کەمال پاشادا دامەزرا. ئەگەر زیاتریش بەناخی رابردوودا رۆبچین، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ کە لەرۆژهەڵاتدا دەوڵەتی تورکیا نوێنەری پاشماوەی پاشایەتییە و بگرە میراتگری شوێنەواری ئەو کۆت و پێوەندە کۆلۆنیالیستانەیە کە هەزاران ساڵ پێش ئێستا لەلایەن پاشاکانی رۆژهەڵاتەوە بەسەر گەلانی ناوچەکەدا سەپێنرابوون، کە هەرە دواییەکەیان سوڵتان عەبدول حەمید بوو. بەڵام نابێ ئەو رووداوە سەرنج راکێشانەی سەردەمی دوایش لەیاد بکەین کە ئەوە ئاشکرادەکەن دەوڵەتی تورکیا کاریگەری شۆڕشی ئۆکتۆبەر و لێشاوە شۆڕشگێڕیەکی قۆستەوە و بە شێوەیەکی هەلپەرستانە بۆ مەرامی لەخشتەبردن بەکاری هێنا. ئەگەرچی بۆی نەلوا لە ژێر ئەو پەردەیەدا بەردەوام بێ، ئەوا لە ئاکامدا خیانەتی لەو شۆڕشە کرد و بە گۆڕانی بارودۆخ، بەژرەوەندیەکانی بە ئاقاری ئینگلیزەکاندا وەرچەرخاند.

ئەگەر ئێستاش لەم قۆناخەدا دەوڵەتی تورکیا بەووردی هەڵبسەنگێنین، ئەوا دەبینین نموونەی ناشیرینترین سیاسەتی کۆلۆنیالیە و تاوانبارترین شێوازی ستەم چەوساندنەوەی خستۆتە گەڕ. شتێکی شایستەشە بڵێین ئەوەی بەم ئاستەی گەیاندووە، کەڵك وەرگرتنە لە قۆستنەوەی ئەم کە قۆناخە بەشێوەیەکی هەلپەرستانە بۆ خزمەتی خۆی بە پشتیوانی هێزە ئیمپریالیستەکان بەکاریهێنا. ئەوەتا بەردەوام هەڵپەیەتی بۆ خۆگونجاندن و چوونە نێو ناتۆ (پەیمانی باکووری ئەتڵەنتی) و ئەنجومەنی ئەورووپی، تەنها بۆئەوەی پەرە بەخۆی بدات.

رژێمی تورکیا مێژووەکەی بە خوێن سوورە، پڕە لە چڵێسی و کۆنەپەرستی و پشت بەستەی پەرەپێدان و داهێنانی نوێی شەڕی تایبەتی و بە نیازی لاوازکردنی هێزی رزگاریخوازی گەلەکەمانە.

ئەگەر سەرنجی مێژووی پارتیمان بدەین؛ ئەوا دەبینین وێڕای ئەو هەموو سیاسەتی ستەم و چەوساندنەوەیەی داگیرکەران کە دەرهەق بە گەلەکەمان پەیڕەویان

کردووە، ئەم گەلە هەمیشە سەرچاوەی هێزی بنەڕەتیمان بووە و بە هەموو شێوەیەك پشتمان پێ بەستووە و، هیچ کاتێك بە بچووکمان دانەناوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە تروسکەی راستەقینەی هیوامان بووە و رۆژ لەدوای رۆژ ئەم هیوایەمانی گەشەدارتر کردووە و سەقامگیریان کردووە بۆ ئەوەی ببین بە خاوەن هێزێکی مەزن بۆ رووخاندنی دیواری زۆرداری و رامالینی ستەمکاران. نابێ لە یادیشمان بچێ کە گەلەکەمان بە پێچەوانەی گشت یاسایەکی فەرمی و شیرازەی مرۆڤایەتی، کۆیلەئاسا جلەوکێش کراوە و بواری پەرەگرتنی لەبەردەم داخراوە. هەربۆیە تا ئێستاکەش مێژوو مولکی ئەو چینە دەسەلاتدارانەبووە کە ویستویانە مرۆڤایەتی بەرەو قۆناخی ئاژەلێتی، واتە قۆناخی بێ یاسا و رێسا بگێڕنەوە. بەلام دەبێ لەو راستیەش تێبگەین کە ئیتر هێزە داگیرکەر و هەلپەرستەکان ناتوانن لەمەودوا کۆششی گەلانی ژێر دەستە پێشێل بکەن و راستیە مێژوویەکان بشێوێنن و حەشار بدەن. چونکە ئەمڕۆ پەردەی سەر ئەو روخسارە کۆلۆنیالیستیە هەلمالدراوە، کە بە درێژایی قۆناخەکانی رابردوو، بە دزینی کەلەپووری گەلان و لەباربردنی بەها مرۆڤایەتیەکان مێژوویەکی بێ ئابڕویان بۆ خۆیان تۆمار کردووە و خۆیان وەك پارێزەر و میراتگر ناساندووە. هەرچەندە شەڕە تایبەتیە نەخشە بۆکێشراوەکەیان بە هێزیش بێت، دیسان لە کۆتاییدا تەنیا هێزی رەنج و ئەو شەڕەی کە بەوشیاریی و بە قارەمانێتیەوە پیادە دەکرێت، سەر دەکەوێت. ئەم راستیەش سەلمێنراوە، چونکە بەدرێژایی مێژوو ئەو شەڕە سەربازی، سیاسی و کۆمەلاتییەی کە هێزی زۆرلێکراو و چەوساوە پیادەیان کردووە، بە بەردەوامی سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە. لەبەر ئەوە ئەگەر بە شێوەیەکی راست مێژوو هەلبسەنگێنین، ئەوا بە ئاشکرا بناخەی هێزە مێژووییەکەمانتان بۆ دەردەکەوێت؛ هەرچەندە ژمارەشمان کەم بێ، دوژمنەکانمان خاوەن پیلانێکی کۆنەپەرستی بەتواناش بن، دیسان هیچ کەسێك ناتوانێت لە بەرامبەر ئێمەدا رابوەستێت و تای تەرازووی سەرکەوتنەکانمان لاسەنگ بکات. چونکە پشت بەستەی ئێمە داهێنەری بەهێز و پڕ هیوای ئەو گەلە ستەمدیدەیەن، کە دوارۆژ رۆشن دەکاتەوە و کۆت و زنجیری داگیرکەران دەپچڕێنێ. PKK پشت بەم هێزە دلێرە دەبەستێت و هەر بەم هێزەش بەرەو لوتکەی سەرکەوتن هەنگاو دەهاوێژێ.

ئەمجارە لەسەر چۆنیەتی سەرکەوتن و بنەماکانی سەرکەوتن چین و چۆن دەتوانین پێیان بگەین رادەوەستین. دەبێ بنەماکانی سەرکەوتن لە رێگای شیکردنەوەی

بارودۆخی کوردستانەوە بناسین، چونکە لە واقیعێکی وا دواکەوتوودا کە گەل هەر ئەوەتا هەناسەی لەبەردا ماوە، لە هیوای ژیان بەولاوە هیچیتری بە دەستەوە نەماوە و، هەموو سیاسەتێکی فشار و ستەم و زۆری کە تەنانەت لەسەر ئاژەڵیش پەیڕەو ناکرێت لەسەر ئەو پەیڕەوی دەکەن. بۆ گۆڕینی ئەم واقیعە پێویستە بزاڤی شۆڕشگێڕی بە دروستی هەڵبسەنگێنین و تۆوی هیوا لەناخی مرۆڤدا بچێنین و، لەگەڵ ڕەنجی راستەقینەدا یەك بگرین. ئەگەر دەتانەوێ بژین پێویستە بزاڤی هیوا بتەقێننەوە و بیکەنە شەڕێکی شۆڕشگێڕی و بە شێوەیەکی راست تەماشای واقیع بکەن ئەمە راستیەکە پێویستە هەموو کەس بیزانێ، چونکە دوژمن توانیویەتی هەموو سامانی سەر زەوی و ژێر زەوی وڵاتەکەمان بە تاڵان ببات. هەڵبەتە بە سەپاندنی کۆت و پێوەندی کۆیلایەتی پڕوپووچ توانیویەتی خودی مرۆییانەی مرۆڤی کوردی  لەبوونی خۆی نامۆ بکات و بیخاتە ژێر کاریگەری رۆشنبیری بێگانەوە، بەڵام هیچ کاتێك ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە واز لەم گەلە دەهێنین، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو هێزە سەرەکیەی کە دەتوانێ ببێ بە بناخەی هەر بزاڤێکی شۆڕشگێڕی، ئەم گەلەیە. PKKش بزاڤێکە هێز و تواناکەی لەم واقیعەوە سەرچاوە دەگرێت.

چۆن دەتوانین سەرلەنوێ مرۆڤ بونیاد بنێینەوە؟ بەڵێ لێرەدا دەبێ بە راشکاوی دان بەوەدا بنێین کە گەلەکەمان تائێستا هەموو شێوازێکی دەرهەق بەکارهێنراوە و دوژمن بە داوێن پیسی رەفتاری لەگەڵدا کردووە و، هەموو بەها مرۆڤایەتیەکانی بە تالان بردووە و بە هەموو شێوازێکی خراپیان بەکار هێناوە. ئەمە راستیەکە دەبێ بزانین. بەڵام لەبەرامبەر ئەمەدا دەبێ ئەوەش بزانین کە ئێمە خاوەنی گەلێك کەسانی نەبەزین، پێویستە ئەوانە بکەینە چاووگی بڕوای شۆڕشگێڕانە و متمانەی دووبارە دامەزراندنەوەی کەسایەتی مرۆڤ لە کوردستاندا. ئەرکی هەموو شۆڕشگێڕێکیشە پەی بەو راستیە ببات. هەر تەنیا بە کەمێك وورە و باوەڕی دەتوانن تۆوی ژیانێکی نوێ بچێنن و دەروازەی پەرسەندنە مرۆییەکان واڵا بکەن. لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە ئایا چۆن دەتوانین سەرلەنوێ مرۆڤ بونیاد بنێینەوە؟ گەلێك لەسەر ئەم خاڵە راوەستاین و گەلێك جاریش هێناومانەتە سەر زمان و بەردەوامیش باسی دەکەین؛ لەناو ئەو بارودۆخ و جێگایەی کە تێیدا گەورە بووین دەیانگووت: کۆتاییان پێهاتووە و ناتوانن جارێکی دی

ببوژێنـەوە و بگەڕێنـەوە سـەر هۆشـی خۆیـان، بـەڵام ئێمـە بـەو پرسـیارە چـاوی خۆمـان کردەوە.

ئێمە کێین و نوێنەرایەتی کێ دەکەین؟ چۆن دەتوانین ببین بە مرۆڤ؟ کاتێك ئـەو شتانەمان دەردەبڕی، هەموو کەس گاڵتەی پێ دەکردین، تەنانەت نـزیکترین کەسـی ئێمـە پێمان پێدەکەنی. بەڵام ئێمە جەختمان لەسـەر هـەبوونی خۆمـان کـردەوە و بەمشـێوەیە چـوینە نـاو ژیانـەوە. لێـرەدا ئـەو پرسـیارە خـۆی قـوت دەکاتـەوە لەجێگایەکـدا ئەگـەر سووربوون، پێداگرتنی لەگەڵدا نەبێت، مرۆڤ چۆن دەتوانێـت خـۆی پێشـبخات؟ چـی روو دەدات ئەگەر یەکێ هەڵسێ و جەخت لەسەر ئەوە بکات کە پێویسـتە ببێـت بـە مـرۆڤ و هاوار بکات و بڵێت: ئایا من مرۆڤم، دەمەوێت ببم بە مرۆڤ؟ بەڵێ بـە هەنـدێ خۆزگـە و خەون و هیوا و ئاوات دەتوانێ ئەمـە لـە واقیعـدا بەرجەسـتە بکـات، نـەك هـەر ئەوەنـدە بەڵکو دەتوانێ زاڵیش بێت بەسەر ئەو کۆت و پێوەندانەی کە لە چوارچێوەی دامـەزراوی خێزاندا گیریان بەتاکە کەس خواردووە و پەلوپۆی ئازادی دەربڕین و بنیادنانیان ئیفلیج کـردووە. ئـەمڕۆ ئـەم شـتانە لـەناو PKK دا بوونەتـە راسـتیەك و، پێویسـتە ئـەو راسـتیانەش بـاش بـزانین کـە پێشـەنگی ئێمـە، لەسـۆنگەی ئـەو لـەخۆ پرسـینەوە و پێداگرتنەوە و، بە دووبارە هۆش بەبەر مێشکدا کردن پەرەی گرتووە.

لە مێژووی پـارتی و پەرەسـەندنی سـەرۆکایەتیماندا، وەڵامێکـی راسـت و گونجـاوی ئەم دامەزراوەمان " مؤسسە القیادە " داوەتەوە و، خۆمـان نەخسـتۆتە ریـزی دۆڕاوەکـان. هەر بۆیە لەناو خۆماندا کەسایەتی دۆڕاو پەسند ناکەین. سەرۆکایەتی نە لەدوور و نەلە نزیکـەوە پەیوەندیـەکی بـەو کەسـایەتیە دۆڕاو، خـۆفرۆش و ئـەو کەسـانەوە نییـە کـە لەبەرامبەر رژێم خۆیـان دۆڕانـدووە. لـەوەش زیـاتر بگـرە هـیچ پەیوەندیـەکی بەوانـەوە نییە کە لەناو گەلدا دیماگۆجن. بەڵکو سەرۆکایەتی پەیوەندیەکی پتەوی لەگەڵ خـەباتی ئایـدیۆلۆژی و مەعنـەویات و هیـوا و کـاری رێکخسـتن و بەرجەرسـتەکردنیان لـەناو ئـەو بزاڤـەدا کـە لـە کۆتاییـدا سـەرکەوتن بـەدی دێنێـت، هەیـە. ئەمـەش بـە پەرەسـەندنێکی هەمەلایەنە دادەنرێت. لێرەدا گرنگ ئەوەیە کە ئەگەر مرۆڤ بەسەر دەروونی خۆیدا زاڵ بێت و هەنگاو بهاوێژێت، ئـەوا دەتوانێـت سـەرکەوتن بەدەسـت بخـات. **ئـەو مرۆڤـەی کـە نەتوانێت لەناو شۆڕشدا سەرکەوتن بە دیبێنێت، ئەوا پێویستە بە پێودانگە سەرەکیەکان خـۆی هەڵسـەنگێنێت، ئـەو کاتـە دەزانێـت بۆچـی سـەرنەکەوتووە. هـۆی سـەرەکی**

**سەرنەکەوتنی ئەو کەسایەتیانەش لە زۆربەی کاتدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لەسەر ئەو دەرفەتە ماددی و مەعنەویانەی کە پارتی بۆ خزمەتی شۆڕش خستوویەتیە بەردەستیان دەژین. ئەمەش شتێکی هەڵەیە، چونکە ئەو دەرفەتانە موڵکی ئەو نین، بەڵکو موڵکی گەل و مێژوون کەسی مافی نییە کە بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاری بهێنێ و کەسیش ئەو مافەی نییە لەسەر ئەو ژیانەی کە پێشکەشی دەکرێ، دابنیشێ خۆی بە گەورە بزانێ. هەروەها کەس مافی نییە گەمە بەو شتانە بکات کە شۆڕش دەیخاتە بەردەستیان.**
ئەمجۆرە کەسایەتیانە، لەناو شۆڕشدا دز و راستڕەوون، یان لەناو رێکخستندا بە کورتبین و کەم توانا لەقەڵەم دەدرێن. لەکاتی تەنگانەدا دەبینین چۆن ئەوانە بە شێوەیەکی هەلپەرستانە دەچنەوە باوەشی رژێم و، لەوێدا هەندێك بەئاشکرا لەبەرگی فەرمیدا دەناسرێن و هەندێکی دیکەشیان دەبنە سیخوڕ و کرێگرتەی نهێنی. هەندێك کەسایەتی تر دێنە ناو ریزەکانمان کە تا دواڕادە بێ هیوا و بێ وورە ماون و هیچ بڕوایەکیان نەماوە و خاوەنی هیچ کینی پیرۆز و تووڕەیی و قسەیەك نیین تاوەکو بڵێن: ئەوە رێباز و ئیرادەی ئێمەیە بۆ رزگار کردن. ئەوانە کەسایەتی کۆیلەن و، بەو کەسایەتییەی خۆیان هەتا دوایی و بەتوندی  بەرژێمەوە گرێدراون، تایبەتمەندی کەسایەتی رژێمی داگیرکەر بۆ خۆیان دەکەنە ژیانێك و دەیانەوێت بەم شێوازە خراپە لەناو ئێمەدا بمێننەوە و بەدەوامی بەمانەوەی خۆیان بدەن. لەناو ئەمجۆرە کەسایەتییانەدا سەرکردە هەڵناکەوێ، چونکە ئەمانە گەمە دەکەن و دەبنە مەترسیەك لەسەر رێکخستن و ئاستەنگی لەبەردەم پێشکەوتنی بزاڤی رزگاریخوازیدا دەنێنەوە. ئەو دوو جۆرە کەسایەتییەی کە باسمان کرد بەزانایی بێت یان بە نەزانی دڵسۆز بن یاخود نیاز خراپ، زێدە گرنگ نییە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە ئەمانە ئەگەر بەمشێوەیە لەناو شۆڕشدا بەردەوام بن، ئەوا دەبنە هۆی دواکەوتن و زۆری و زەحمەتی بۆ شۆڕش. لەبەر ئەوە پێویستە لە دژی ئەم دووڕوانە کە لە فەرهەنگی سۆسیالیزمدا بە "هەلپەرست" ناسراون بجەنگین، چونکە چەندە بزاڤەکەمان لەو نموونانە پاك بکرێنەوە، ئەوەندەش هێزی پێشڕەوێتی پارتیمان پتە و دەبێ و بەرەو هێنانە دی ئامانجەکان هەنگاوی گەورە دەهاوێژێ. کەواتە ئەو شۆڕشەی کە لەبەرامبەر ئەمانە تەگبیری خۆی وەرنەگرتبێ، گەمژەیە.

لە شۆڕشەکانی جیهانیشدا گەلێك لەم پرسانە دەرکەوتن، بۆ نمونە لە شۆڕشی

ئیسلامدا کەسایەتی وەك "ئیمامی عەلی"، لە شۆڕشی فەرەنسیدا بزافی"بابۆف"و لەسەردەمی هاوچەرخیشدا بزافی"لینینیزم" تەگبیریان بەرامبەر ئەو دووڕوانەی کە ویستویانە خەنجەری ژەهراوی لە پشتی شۆڕش بدەن وەرگرتووە. ئێمەش لەسەر هەمان بنەما دەتوانین زیاتر پەرە بە سەرۆکایەتی بدەین.

پارتی کرێکارانی کوردستان PKK بە ئەزموون وەرگرتن لە گشت سەرۆکایەتیە مێژووییەکان و هەڵوێست وەرگرتن لەدژی ئەو کەسایەتیە لاوازانەی کە بە شێوەیەکی راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ هێز و ئاکاری خۆیان لە رژێمی دەسەڵاتدار وەردەگرن، پەرەی بە هونەری سەرۆکایەتی داوە. هەر ئەمەشە هۆی ئەو پەرەسەندنە بەرچاوەی بزافەکەمان. لێرەدا پرسیارێك خۆی زەق دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیە هونەری سەرۆکایەتی چییە و چۆن دەتوانرێت ئاوا بکرێت؟ لە وەڵامدا دەڵێین ئەگەر لەبەرامبەر هێرشی ئەو لایەنانەی کە باسمان کرد بە ووردی لە خۆت رابمێنی و بەباشی بەناخی کێشەکاندا شۆڕببیتەوە و لە دژی چەمك و بۆچوونە هەڵەکان بجەنگی و بەرەو رووی نزیکترین کەسی خۆت راوەستی، ئەوا دەتوانیت ببیت بە سەرکردەیەکی باش. ئەگەر شێوەی پرسەکە و شێوازی نزیکبوونەوە و مەوداکەی باش تێگەیشتی، ئەوا دەتوانیت هونەری سەرۆکایەتی پێش بخەیت. PKK بە گەورەترین بزاڤ دادەنرێت لەبابەتی هونەری سەرۆکایەتی و شێوە و شێواز و مەوداکانیدا. بەبێ دەرك کردن بەو راستیە، هیچ کەسێك ناتوانێت لە هونەری سەرۆکایەتیدا پێشکەوتن بەدی بهێنێت. باشە شێوازی PKK چۆنە؟ چۆن دەتوانی لەناو PKK دا پێشبکەوی؟ PKK بە هاوسەنگی لەگەڵ شێوە و ناوەرۆك، رق و کینی پیرۆز و تورەیی و هۆشیاری زانستی رەفتار دەکات و پێکەوەیان دەبەستێتەوە. هەر لەسەر ئەو بنەمایە PKK توانیویەتی وەك توانستی دەنکە گەنمە شامیەك، وزەیەکی گەورە پەیدا بکات و بۆ دەرەوەی ئاراستە بکات و، لە کاتی تەقاندنەوەشدا کاریگەریەکی گەورە بەسەر دەووروبەردا بەجێ بهێڵێت. هەروەها PKK بەدوای رێگاچارەی دروستی وەك، شێوە، شێواز، دابەش کردنی کار، پڕوپاگەندە و هاندان، رێکخستنی گەل، رێکخستنی بنگەی پارتی، تێپەڕاندنی سەرەتا و گەیشتن بە ژیانی گشتیدا، وێڵ بووە.

هەموو ئەمانە جێگای خۆیان لەناو PKKدا دەگرن و پەرەشیان پێدەدەین. بێگومان بزافێکی بەمرەنگە بەخێرایی سەرکەوتن بەدەست دەهێنێ. بەڵام دەبێ لەوەش

وریابین، که دوژمنان هەڵپە دەکەن و تەگەرە دەخەنە بەردەم پەرەسەندنەکان و کەڵك لەخاڵە لاوازەکان وەردەگرن. بۆ پووچەڵ کردنەوەی ئەمجۆرە خۆ مەڵاسدانەش، دەبێ ئاگای گورجوگۆڵی و تانوپۆی خەبات و خێرایی شێوەی گونجاوی هەڵبژاردن بین و بەشێوەیەکی باش هەڵیبسەنگێنین. بەمشێوەیەش دوژمن نەدەتوانێ زەمینەی بونیادنانمان لەق بکات.

ئەگەر بە راستی دەتەوێ پەرە بە هونەری سەرۆکایەتی بدەیت و شایانی ئەو بیت، ئەو کاتە پێویستە ئەم خێرایی و تان و پۆیە بگریت و بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە بەکاری بهێنیت. چونکە شۆڕشەکان زمانێکی تایبەتی خۆیان هەیە، ئەو زمانەی تۆ بە گوێرەی ئارەزووی خۆت کە هەر بە وشە ریزکردن هەڵدەبژێری، شایانی شۆڕش نییە، بەڵکو، هێزی بەرێوەبردن و رێکخستن هەموو شۆڕشەکان پەیوەستە بە زمانی شۆڕشەوە. ئەویش بریتییە لە شێوازی دروست و وتاربێژی. لە شۆڕشەکاندا گەلێك کەسایەتی مەزن و بەکاریگەر و بەتوانا لەم بوارەدا دەرکەوتن، تەنانەت سەرکردە سیاسی و سەربازیە بە هێز و بە تواناکانیش لەم رێگایەوە گەیشتوونەتە ئاراستەی خۆیان. بۆ نمونە؛ لە شۆڕشی بەلشەفیکدا "ترۆتسکی"و لە شۆڕشی کۆیلەداری "رۆما" دا "شیشار" بەهێزی وتاربێژی ناسران. لە یۆنانیشدا گەلێك وتاربێژی مەزن و بەتوانا دەرکەوتوون، تا گەیشتوونەتە رادەی دیماگۆجیەت. ئەوەش لەبەر ئەوەی کە لە وتارەکانیاندا رژێمیان بەبنچینە گرتووە. لە شۆڕشی ئیسلامیشدا قورئان بە وتارێکی مەزن دادەنرێت، کە بە زمانە پاراو و رەوانبێژیەکەی دەناسرێتەوە و، تا ئێستاش وتاربێژی قورئان بە بەهێزترین وتاربێژی دادەنرێت، کە ئاوازێکی مۆسیقای تێدایە و وەك شیعر دەخوێندرێتەوە. زمانە رۆمانسیەکەی شۆڕشی فەرەنسیەکانیش تا ئەمرۆش کاریگەریەکەی هەر بەردەوامە، بەڵام بەلشەفیەکان بە پروپاگەندە و هاندان بەناوەبانگ بوون و لەم رێگایەشەوە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. هەموو لایەنەکانی ئەم مەسەلەیە روون و ئاشکرایە، وەکو دەنکە تۆوێکە و لەپاشان گەورە دەبێت و دەبێتە هۆی دارشتنی زمانێکی دەوڵەمەند و گەورە. لەبەر ئەوە ئەو وتووێژە سەرنج رادەکێشێ و کاریگەر دەبێ و رۆڵێکی گەورەش لەپەرەسەندندا دەبینێ. هەروەها هەرچەندە ئەو دەنکە تۆوە لەجێگای خۆیدا بێ و راست بێ ئەوەندەش رۆڵی خۆی لە راستی زماندا دەبینێ و بەمشێوەیە دەبێتە بانگەوازی

ژیـان. بـەڵام پێویسـتە هەسـت بـەو خاڵـە گرنگـە بکـەین، کـە ئـەویش لاوازی لـە دەنکـە تۆوەکەدا لاوازی لە شۆڕشدا دروسـت دەکـات. لەبـەر ئـەوە پێویسـتە نـاوەڕۆکی ئـەم تـۆوە باش بناسرێت و بزانرێت راستگۆیە یان نا، پێویستە لەڕاستیەکەی بە گومان بین. ئەگەر شـێواز و وتاربێـژی لاواز بێـت، ئـەوا دەبێتـە هـۆی دۆڕان و بـەکرێگیراوی بـە شـێوەیەکی ناراستەوخۆ. چونکە پێشنەکەوتن و جێبەجێنەکردنی ئـەرکی رێکخسـتن و هەڵـە کـردن، لـە داهـاتوودا دەبێتـە هـۆی دۆڕان و سـەرنەکەوتن. ئەمـەش مانـای ئەوەیـە کـە پێویسـتە شێوە و شێواز و تان و پۆ لەهونەری سەرۆکایەتیدا ون نەکرێت، بـەڵکو پێویسـتە بکـرێن بە بەشێك لەژیان و دەست بەرداریان نەبین. لێـرەدا دەپرسـین ئایـا ئێمـە چـۆن هونـەری سـەرۆکایەتی پـەرە پێـدەدەین؟ شۆڕشـەکەمان کەسایەتی درۆزن و دەمامکـدراو لـەخۆوە ناگرێ و بەلاوەیان دەنێت. چـونکە شـۆڕش بزاڤێکـی گـەورەی خـاوێن کردنەوەیـە، وەکـو ئاوێنـە وایـە کـە رووە دەمامکـدراوەکان ئاشـکرا دەکـات. بـەڵێ سـەرۆکایەتی شۆڕشـگێڕی بەمشێوەیە پەری پێدراوە. داگیرکەرەکان سەرەڕای هەموو فڕوفێـڵ و تەڵەکەبازییـەکیان، دیسان ناتوانن لەبەرامبەر ئەو کەسایەتیەی کە پەیوەنـدی خـۆی لەگـەڵ درۆ و فرتوفێـڵ پچڕاندووە رابوەستن. لەوانەیە هەنـدێك کەسـایەتی کـەوتوو هـەبن، بـەڵام ئەمانـە لـەناو شۆڕشدا جێگایان نابێتەوە. بێ دەسەڵاتی، کەوتوویی و بێچارەیی کاری ئەو کۆیلانەیە کە لەبەرامبـەر رژێـم خۆیـان بەدەسـتەوە دەدەن. ئـەم تایبەتمەندیانـە تـەنیا بـە هەڵکـەوت دەرناکـەون. بـەڵێ ئەمـە کەسـایەتییەکی رووخـاوە و بـە بـەردەوامی سـکاڵا چـییە. ئـەو کەسایەتیەش کە بەکاری فروفێڵ و هەڵخەڵەتانـدن هەڵدەسـتێ، بـا بـاش بزانـێ کـە ئـەوە بەکرێگیراوی فەرمی رژێمە. ئەمانە پێـودانگی راسـت و دروسـتی سـەرۆکایەتیە. ئەوانـەی دەیانەوێت لەلایەنی سـەرۆکایەتیەوە پێشبکەون، پێویسـتە بـە گـوێرەی ئـەو پێودانگانـە خۆیان ئامادە بکەن، چونکە درۆ و فروفێڵ، بەگوێرەی رژێم ژیان بەسەر بردن، راوەستان لـە دژی ئـەو کەسـانەی کـە وشـیار و زانـان، ئـەو بـێ دەسـەڵاتیەی کـە لەکۆیلایەتیـەوە سەرچاوە دەگرێ، سکاڵاچێتی و بێچارەیی لەچارەسەرکردنی کێشەکاندا فرمێسك رشتن و خـاوەنی ئـەم تایبەتمەندیانـە نـاتوانن لـەناو شۆڕشـدا پـێش بکـەون و خۆیـان بگەیەننـە پەرەســەندنەکانی ســەرۆکایەتی، یــان نوێنــەراتی بکــەن. ئەگــەر زیــاتر لەســەر ئــەم تایبەتمەندێتیانــە رابوەســتین و بــەپێودانگی چــینایەتی شــیان بکەینــەوە و هــەڵیان بسـەنگێنین، دەگەیەنـە ئـەوە راسـتیەی کـە ئـەم تایبەتمەندیـە کەوتووانـە هـی چـینی

ناوەڕاستن. ئەوەندەی مێژووی مرۆڤایەتی کۆنە و پەیوەندیەکی قووڵی بەو دەوروبەرەوە هەیە کە هەڵساون بە لەناوبردن و تێکشکاندنی گەلانی دنیا و، ئەو کەسانەی کە بەدرێژایی مێژوو تێکدەشکێن زۆربەیان سەر بەم چینەن. چونکە ئەوان لەنێو پەرەگرتنی شۆڕشەکاندا خۆیان پەروەردە ناکەن و دەیانەوێ چەندان شێوە و روخسار بپۆشن، لەسەرەنجامیشدا لەوپەڕی بەرزاییەوە دەکەونە خوارەوە. کەواتە دەتوانین بڵێین هەمیشە تەگەرەکانی ڕێگای شۆڕش لە کەسایەتیەکانی چینی ناوەڕاستەوە سەرچاوە دەگرن. هەربۆیە بە مەترسیدارترین چین دەناسرێن. ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئەگەر چینی ناوەڕاست بە ژمارەیەکی کەمیش هەبن، دیسان ئاستەنگی لەبەردەم شۆڕشدا دەنێنەوە. ئەگەر ئەمانە پاکسازی و چارە نەکرێن، ئەوا لەوانەیە شۆڕش لەماوەیەکدا بەرەو راستڕەوی بڕوات و بکەوێتە خزمەتی رژێمەوە. چونکە هەندێك راستڕەو لەناو ئەم چینەدا هەن، کە بەشێکی ئەم چینە نکۆڵیکەرن و رۆڵێکی گەورە لە ونبوون و سەرنگونووندا دەبینن، هەروەها بەشێکی دیکەش هەن کە چەپڕەوی زێدەڕۆن، کە ناتوانین پشتگوێیان بخەین، نوێنەرانی ئەم چینە وەکو هەردوو رووی دراوێکن، لەلایەکیەوە دەچنەوە باوەشی رژێم، لەلاکەی دیکەوە خۆکوژی توندڕەون و لە جێگای بڵندەوە خۆیان فڕێدەدەنە خوارەوە.

پێویستە سەرۆکایەتی لەڕووی چینایەتیەوە خۆی شیبکاتەوە و بەباشی خۆی بپشکنێ، چونکە ئەگەر وریای راست و چەپ نەبێت، ئەوا ناتوانێت پەرە بسێنێت. زۆر لە شۆڕشە مێژووییەکان ئەگەرچی دەیان ساڵ تەمەنیشیان بووبێ، ئەوا دیسان بوونەتە قوربانی ئەم توێژە کۆمەڵایەتیە و، نەیانتوانیوە لەبەردەم هێرشەکانیدا خۆڕاگرن. کەواتە دەبێ سەرنجی ئەو شتانە بدەین کە توێژی ناوەڕاست لە ئەنجامی راستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆی سەپاندنی ئەو کەسایەتیانەدا کە دەبنە هۆی تێکدانی کارگێڕی و دامرکاندنەوەی ورە و بڕوا بەخۆبوون، یان رووکردنە خۆکوژی تێکیان دەشکێنێ. لەبەر ئەوە پێویستە سەرۆکایەتی شۆڕشگێڕ ڕێگا لەپێش ئەم جۆرە کەسایەتیانە بگرێ، چونکە سەرۆکایەتیەکی بەمجۆرە دەتوانێ پێشبکەوێ. ئەگەر ئاوڕێك لە مێژووی پارتیمان بدەینەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە ئێمەش لە زەبری ئەم توێژە زۆرمان بەرکەوتووە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەندە سەرکەوتنمان بەدەست هێنابێ، ئەوەندەش راستی هێزی

یاساکانی شۆڕشمان دیاریکردووە، کە چۆن بەزەیی بەکەسدا نایەتەوە. بەکورتی واتە: (رامانێنی ئەو کرێگرتە نهێنی و ئاشکرایانەی لە دنیادا ریسواکراون و هەڵکێشانی ریشەی خراپەکارییان و دژایەتیکردنی هەموو تایبەتمەندیەکانی توێژی ناوەڕاست، ئەرکێکی شۆڕشگێڕیە و لە کرۆکی ئەرکەکانی شۆڕشە، کە بە وشیاری و رێکخستن شەڕیان لەگەڵدا بکات. دەتوانین بڵێین کە بارودۆخی بابەتی و هیوا و ئاواتە شۆڕشگێڕیەکان و هەنگاونان لەسەر رێچکەی رێکخستنێکی پتەو و پێکەوە گرێدانی ویست و وشیاری بەیەکەوە، هاندەری پەرەگرتنی توانا خودیەکان و زەمینەی پێشکەوتنی سەرۆکایەتین).

واتە تەنیا بارودۆخە بابەتیەکان بەس نین، بەڵکو پێویستە لەگەڵ خودی شۆڕشدا تێکهەڵکێش بن، جا ئەوکات ئاستی رێکخستن و هۆشیاری و هێزی ویست دەردەکەون. وێڕای کۆسپە دەرەکی و ناوەکیەکان ئەو توانایەمان دەبێ کە پەرە بەسەرۆکایەتی بدەین، چونکە ئەوکات هەرکەس دەتوانێ وەکو دەروێش لەنێو بزاڤدا خۆی پاکژ بکاتەوە. مرۆڤێکی ئایینپەروەر لە رۆژێکدا چەند جار نوێژ دەکات، مرۆڤی سۆسیالیستیش ئەوەندە پێویستی بە پەروەردەی ئایدیۆلۆژی هەیە. بەجۆرێك دەبێ، هەمیشە لەنێو ناخی بیرکردنەوە و تێرامانــدا بێ، هەرکاتێکیش پێویست بوو دەبێ زریان ئاسا سەرهەڵبدات. سەرەتا دەبێ رۆژانە خۆی لەناخەوە پاك بکاتەوە و بیر و گیانی بەهێز بکات، تا دەبێتە پێکهاتەیەکی پۆڵایین. لێرەدا دەپرسین، پێویستیەکانی ئەو مەبەستە چین؟ لە وەڵامیشدا دەڵێین؛ **ئەو شتانەی کە بۆ پەرەپێدانی ئەم هونەرە پێویستن، جەختکردنە لەپێناو سەرخستنی کاروان و هێنانە دی داخوازیەکان و هەنگاونانە لەسەر ئەو بنەمایە.** واتە دەبێ بڵێی: *من رێگای خۆم هەڵبژاردووە و دوورم لەدنیای کەسانی بوودەڵە و دژی تاریکستانی کۆڵۆنیالیزم، وزەم خستۆتە گەڕ و ئازادانە بەرێوەم، چونکە من دەمەوێ ببمە مرۆڤ و کەسیش نییە بتوانێ لەم رێگایە دامبڕێ.* بەڵێ: ئەگەر تۆ پەیوەست بیت بە کار و شەڕ و ئایدیۆلۆژی، ئیتر لەهیچ شتێکت کەم نابێت و گەشە دەکەی، بەڵام ئەگەر دز و فێڵباز بی، ئەوا لەسەر توانستەکان چوارچمکی دادەنیشی و خەریکی خۆپاراستن دەبی، واتا وای لێدێ لە تێری و تەسەلیدا شوکرانە دەڵێی، ئەوکاتەش بۆت نالوێ بگەیتە سەر هێڵی سەرۆکایەتیەکی پتەو. بەشێوەیەکی گشتی ئەمە هەڵسەنگاندنی PKKیە بۆ پەرەگرتنی هونەری سەرۆکایەتی لەبار بەگوێرەی تایبەتمەندیە مێژووییەکان. لێرەدا بەپێویستی دەزانین کە هەڵسین بە ئەنجامدانی

هەڵسەنگاندنی وورد و درشتی مێژووی خۆمان و پەرەگرتنە ناوخۆییەکانمان. ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە، مادام رێبازی سۆسیالیزممان گرتبێتە بەر، ئەوا سەرۆکایەتیەکەمان سەرۆکایەتیەکی نەتەوەیی ـ سۆسیالیستی و دیموکراتیە.

لایەنە دیموکراتیەکەی بزاڤەکەمان، گەلەکەمان لە کارگێڕی تاریکی دوژمنان رزگار دەکات تاوەکو خۆی بتوانێت کاروباری هەڵسوڕێنێ. ئەمەش جێگرەوەی کارگێڕی دەوڵەتی تورکیایە. ئەو کارگێڕیەی مەبەستمانە واتە کارگێڕی خۆجێی، سەرەتا لەکوردستاندا دادەمەزرێ و فەرمانڕەوایش لەسەر ئەو بنەمایە پێشدەکەوێت، سۆسیالیزمیش بەپێی تەقەلا و وزەی پێشەنگی و زانستی هەڵدەسەنگێنرێ. ئەم هەلومەرجانەش، بێگومان لە PKKدا هەیە کە بزاڤێکی نەتەوەیی ــ دیموکراسی و پێشەنگی سۆسیالیزم و سەرکردەی بەرەیە. بزاڤی رزگاریخوازی نیشتمانی چەندان چین و سەرۆکایەتیەکانی ئەم چینانەی لەخۆوە گرتووە. لەبەرئەوەی پارتیمان پێشەنگایەتی سۆسیالیزدەکات، ئەوا دەزانێت چۆن خۆی لێیان نزیك بکاتەوە و بیانخاتە پاڵ شۆڕش. نابێ ئەوەشمان لەبیریمان بچێ کە PKK سەرۆکایەتی بەرەی دیموکراتی و بەرەی رزگاری نیشتمانی دەکات. لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین کە سەرۆکایەتیکردن بریتییە لە هونەری بزاڤی تاکتیکی. جا ئەگەر بڵێین تایبەتمەندیە گشتیەکانی سەرۆکایەتی ستراتیژی پێکدێنێت، ئەوا تاکتیك مانای هەنگاو هاوێشتنە بە بەهرەمەندی و بە لێزانیەوە و، زانینی ئەوەی کە چۆن ئەو کەسایەتیە بودەلانە پێشبخات کە کۆلۆنیالیستی داگیرکەر دەیەوێت بیانخاتە خزمەتی خۆیەوە. هەر بۆیە تەنیا بەناوبردنی سەرۆکایەتی ستراتیژی و تاکتیکی پێویستە لەم مەسەلانە تێبگەین.

ئەگەر چاوێك بە مێژووی PKKدا بخشێنینەوە، ئەوا نمونەی ئەو کەسە پاشکەوتووانەمان دێتە بەرچاو، کە بۆچوونی کۆنەپەرستانەیان لە رژێمی دەسەڵاتدار و تایبەتمەندییەکانی تیرە و هۆز وەرگرتووە، کە هیچ نیشتمانپەروەرێتیەکیان تێدانییە و دوورن لەبیری دیموکراسی و سۆسیالیزم و هەروەها شێوای بیرۆکراسیانەی رژێم و دەزگای جەندرمە و پۆلیس پەیڕەودەکەن.

ئێمە بۆ فەراهەمکردنی ناوەندێتیەکی پتەو، پێویستمان بە جۆرە کەسایەتیەك هەیە کە ئاسۆی فراوان و پشوو درێژ و ورە بەرز و چاونەترس و خولقێنەر بێ و، لە

بەردەم کاروباری ساکاردا نەبەزێ و لەرەوشی شەڕیشدا بزانێ چۆن تاکتیکەکان بخاتە گەڕ. ڕەنگە گەیشتن بەم تایبەتمەندیانە، زەحمەت بێ، بەڵام بەبێ ئەمانە سەرکەوتن مسۆگەر ناکرێت. هەروەها بە دوورکەوتنەوە لەم تایبەتمەندیانە مرۆڤ بەرەو هەلپەرستی دەڕوات و ئاسوودەیی تاکە کەسی خۆی بەبنەما دەگرێت و خۆی ماندوو ناکات و، لەسەر توانستەکان دەژی و لەناو گەلیشدا ئاغایەتی دەکات. بەڵام ئەو جۆرە کەسانە لەناو ئێمەدا جێگەیان نابێتەوە. گەلێك سەرکردەی بەمشێوەیە لەناو شۆڕشەکانی دنیادا دەرکەوتوون و، لەناو ئێمەشدا جار جار دەرکەوتوون. ئەوانە نوێنەرایەتی جۆری توێژی ناوەڕاست دەکەن، کە مەترسیەکی گەورەن لەسەر ڕێکخستن و شۆڕش. ئەمجۆرە کەسایەتیانە بەشێوەیەکی ڕاست و دروست لەڕاستی سەرۆکایەتی ستراتیژی نزیك نابنەوە، بەڵام PKK بەهۆی هێزی ستراتیژی و هۆشمەندی سەرۆکایەتیەکەی، ڕێگای لەبەردەم ئەم جۆرە کەسانە دەگرێت، یان جارێکیتر هەڵدەستێ بە بوونیادنانەوەیان، کە ئەمەش ئەرکی ناوەندی و سەرۆکایەتی ستراتیژییە. بەبێ بوونی ئەم دەسەڵاتە کۆمیتەی ناوەندی دەبێت بە ناوەندێکی هەلپەرست و بیرۆکرات. ئەمەش مەترسیەکی گەورەیە بۆ شۆڕش. لەبەرئەوە پێویستە سەرۆکایەتی ستراتیژی هیچ هەلێك لەبەردەم دەرکەوتنی بیرۆکراتیەتدا نەهێڵێتەوە و ڕێگا لە پێشکەوتنی بگرێت، چونکە ناوەندی بیرۆکراتی بە تێپەڕبوونی کات دەبێت بە ناوەندێك، کە مەترسیەکی جددی پێکدێنێت و، هەڵدەستێت بە کاری وێرانکاری و لەدوایشدا شۆڕش بەرەو لەناوچوون و پاکتاوبوون دەبات. ئەمە ڕاستیەکە و دەبێت بزانین کە هیچ شۆڕشێك بەبێ ناوەندێکی شۆڕشگێڕی نییە، چونکە بەبێ ئەمە دەرگا لەبەردەم دیماگۆجیەت دەکرێتەوە، کە مەترسیەکی گەورە پێکدێنێ. چەندە بنکەی پارتی لە ناوەندی پارتی دوور بکەوێتەوە، ئەوەندەش ئەو بنکەیە دەبێتە ناوەندێك بۆ دروستبوونی بیرۆکراتیەت و دیماگۆجیەت. ئەم دوورجۆرە زۆر جار لەگەڵ یەکدا دەکەونە سازشکاری و دەست بە داڕشتنی نەخشە و پلان دەکەن. تەواوی ئەم پەیوەندیانە لەئەنجامی لاوازی کەسایەتیەوە دەردەکەون، هەنگاونان بەشێوەیەکی سازشکاری و کوێرانە، خراپی و زەرە و زیان بە ڕێکخستن و بەو کەسەش دەگەیەنێ. لەوانەیە ئەو بنکەیەی پارتی، هەموو شتێك تێنەگات و، هەندێك ئاسۆی تەنگ بێت، بەڵام بەلایەنی کەمەوە دەبێ بزانن، ئەو ئامانجانە چین کە ناوەندی پارتی لەپێناویدا

خەبات دەکات و، پێویستە ناکۆکیەکانی نێو دەستەی کارگێری ببینێ و هەوڵبدات بۆ تێپەرکردنیان. هەروەها دەبێ ئامانجە ستراتیژیەکان بناسن و لەئاست خاڵەکانی هەڵخلیسکان، چاوپۆشی نەکەن و شارەزای چۆنیەتی هەڵسوراندنی کردارە سەربازیەکانی گەریلا و هەنگاوی پەرەگرتنی بەرخودان و سەرهەڵدانەکان بن. هەروەها دەبێ لەپێناو زاڵبوون بەسەر گرفتە رۆژانەییەکان، بەردەوام شێوازی پرۆسیسی سیاسی و سوپایی بەپێی رێبازی ئایدیۆلۆژی پیادە بکرێت.

بەرای من ئەزموونە گەورەکانی شانزە ساڵەی تەمەنی PKK بەسە، بۆئەوەی کەسایەتی سەرۆکایەتی تیایدا دەربکەوێت. شۆرشە مێژووییەکانی وەك شۆرشی ئیسلامی، فەرەنسی و بەلشەفیکیش هەر بەم شێوەیە گەشەیان کردووە و بەلووتکەی سەرکەوتن گەیشتوون. ئەم قۆناخەی ئێستامان، لە قۆناخی پێش ساڵی 1980 ناچێ، کە تێیدا تۆوی بنیادنانی سەرەتاییمان چاند، لەبەرئەوەی ئەو کاتە نەمان دەتوانی باس لە تاکتیك بکەین، چونکە لەو قۆناخەدا هێشتا رێکخستنی گەل و بزافێکی گەلەری بەهێز لەئارادا نەبوو و ئەرکی سەرەکیمان تەنیا تۆو چاندن بوو. بەلام لەساڵانی 1980 ــ 1990 مەسەلە لە تۆو چاندن دەرباز دەبێت و دەبێتە پرسی ئاواکردنی تاکتیك، بێگومان ئەمەش کارێکی گران بوو، چونکە سەرکەوتن لەرێگای پەرەسەندنی سەرۆکایەتی تاکتیکیەوە بەدی دێت.

کاتێك کودەتای سەربازی 12ی ئەیلولی فاشیست روویدا و جەنەراڵەکان هاتنە سەر حوکم، ناچار بووین بە تین و تاو پەرە بە تاکتیکی شۆرش بدەین. ئەگەر خاوەن هێزێکی تاکتیکی شۆرشگێری نەبووینایە، ئەوا نەماندەتوانی خۆمان لەو رەوشە رزگار بکەین، تەنانەت کەسیش نەیدەتوانی خۆی رزگار بکات. ئەوکاتە پێویست بوو تاکتیکی شۆرشگێری شیبکرێتەوە، چونکە بەبێ ئەمە دووچاری لەناچوون دەبووین. لێرەدا مانا و بەهای بەرخودانی زیندانیەکان دەردەکەوێتە روو. هەڤاڵ "مەزلۆم دۆغان" نوێنەرایەتی سەرۆکایەتی ئایدیۆلۆژی دەکرد و دەیتوانی زۆر بەئاسانی پێش بکەوێت، هەڤاڵ "خەیری" سەرۆکێکی رێکخستنی بوو، هەڤاڵ "کەمالیش" سەرۆکێکی سەربازی بوو. ئەو کەموکوریانەی لە چالاکیەکاندا دەرکەوتن وایکرد کە زیندانەکان پر بکرێن لە هەڤالان و ساوایی لایەنی تاکتیکیش وایکرد کە فاشیستەکان درندانە بەرببنە گیانی پر

لەسەروەرییان، کە سەرەنجام ئەوان و زۆر لە هەڤاڵانی دیکەشمان بەبێ بەزەییانە شەهید کران.

بەشێوەیەکی گشتی دوای ساڵی 1990، ئەو ساڵانەی کە پێویست بوو سوپا ئاوابکرێ و سەرکەوتنی مەزن لەناو گەلدا بەدی بێت، بۆ ئەمە بارودۆخ گونجاو بوو و، گەلێك دەرفەتیش هەبوو، بەڵام ئاشقبوونی سەرۆکایەتی تاکتیکی بۆ خوودی خۆی و پەرت و بڵاوکردنەوەی بەهاکان بە راست و چەپیدا و نزیکبوونەوەی بەشێوەیەکی هەلپەرستی. بەمرەنگە گەلێك تواناکاریان بەفیڕۆدا و بەمەش زیانێکی گەورەیان گەیاندە بزاڤەکەمان. لەبەر ئەوە بەپێویستمان زانی لەسەر ئەو کەسانە هەڵوەستە بکەین. ئەو لێکۆڵینەوە و شیکردنەوانەی کە لەماوەی 16 ساڵدا کردمان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا وێنەیان نییە. لێرەدا پرسیارێك خۆی دەردەخاتە پێش، کە دەبێ مرۆڤ بۆچی ئەوەندە یاری بە مێژوو و راستیەکانی پەرەسەندن بکات؟ بۆچی ئێمەش هەوڵ دەدەین بۆئەوەی ئەو بۆچوونانە راست بکەینەوە و بەشێوەیەکی دروست دایان بنێینەوە؟ بەڵێ هەتا دوایی لەسەر ئەو قۆناخ و ساڵانە راوەستاین، لەسەر ئەو بناخەیە هەڵسام بە شیکردنەوەی تێروتەسەل، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە دەمزانی لەم ساڵانەدا یان دەبێ سەرکەوین یان لەناودەچین، بەو هەستیارییە نزیکی ئەو ساڵانە دەبوومەوە. چونکە دەزگای "شەڕی تایبەت"ی هێرش و شەڕێکی بەرفراوانی لەدژی ئێمە راگەیاندبوو و، دەیویست لەو ساڵانەدا ئەنجام بگرێت. بێگومان ئەرکی سەرۆکایەتی ستراتیژییە، کە خۆی رێکبخات و ئەو ساڵانە بکات بە ساڵانی سەرکەوتن و لەبەرامبەر نەخشە و پیلانەکانی داگیرکەران رابوەستێت. بێگومان ئەو سەرکەوتنانەی کە بەدیهاتبوون، هەموویان لەئەنجامی هەوڵ و خەباتی سەرۆکایەتی ستراتیژییەوە بوون، کە هەڵسا بە پێشخستن و وشیارکردنەوەی گەل و پەرەپێدان و پێشخستنی خەباتی چەکداری و دارشتنی بنکە شۆڕشگێڕیەکەی. ئەوەش بەئاشکرا دەرکەوت کە ئەوەی نەیتوانی سەربکەوێت ئەو کەسایەتیانە بوون کە خۆیان نەگەیاندە ئاستی سەرۆکایەتی تاکتیکی. بەڵێ ئەمانە تووشی دۆڕان بوون، لەبەر ئەوە پێویستە ئەو کەسایەتانە بەلاوە بنێین. نزیکەی 16 ساڵە لەناو PKK دا ئەم کارە ئەنجامدەدەین، ئەمرۆش بەم شێوازە توانیمان بزاڤی PKK بکەین بە بزاڤی ئازادی و سەرکەوتنی بەردەوام.

لەبەرامبەر ئەو کەسە دۆڕاوانەی کە دەیانویست ئاستەنگی دروست بکەن

سەرکەوتین و، لەهەموو روویەکەوە تەگبیرمان وەرگرتووە و لەبەرامبەریدا پەرەمان بە خەباتدا و زیاتر تێیدا قاڵ بووینەوە. بەمەش توانیمان ئەو ساڵە بکەین بە ساڵێکی سەرکەوتنی مەزن، لەوە زیاتر بوو بە وەڵامێکی بەهێزی هەموو ساڵەکانی رابردووش.

لەوانەیە لە ساڵانی رابردوودا گەلێك بەها بەبێ هیچ مانایەك بەفیڕۆ چووبێ، بەڵام زانیمان چۆن ئەو بۆشاییە پڕ بکەینەوە و راستی سەرکەوتن لەخۆماندا بەرجەستە بکەین، بەتایبەتی لەساڵی 16 هەمیندا کە ساڵێکی پاڵێوراوە بۆ بەدیهێنانی سەرکەوتنێکی گەورە. کۆنگرەی پێنجەمیش دەبێتە وەڵامێکی گونجاو بۆ بەرجەستەکردنی ئەو راستیانە و هەموو ئەو بەهایانەی کە لەماوەی 16 ساڵدا خوڵقێنراون. جا ئەمە لەڕووی سیاسی، رێکخستن و سەربازییەوە بێت یان لەڕووی جێبەجێکردنی بڕیارەکان و فراوانکرنی شیکردنەوەکان. بەڵێ ئەمەیە راستی کۆنگرەی پێنجەمی پارتیمان. بە رادەی بەکارهێنانی تواناکاریەکان بە شێوەیەکی دورست و وەرگێڕانیان لەواری پراکتیکدا و قازانج کردنی شەرڤان و دابینکردنی پێویستیەکانی لۆجستیکی و جێگرتن و ئامادەکردنی هەموو گۆڕەپانەکان و جەختکردن لەسەر ئەنجامدانی ئەرکەکان، ئەوەندەش سەرکەوتنی مەزن بەدی دێت. لەبەرامبەر ئەوەش هەرچەندە بە شێوەیەکی بێ بەزەییانە و بەشێوەیەکی کۆن لە تواناکاریەکان نزیك ببینەوە، ئەوەندەش دووچاری شکست دەبین، بۆئەمەش پێویستە ئەو نزکبوونە هەڵانە بەلاوە بنێین.

بەڕای من دەبێت مێژوو PKK بەم شێوەیە هەڵسەنگێنرێ و پێویستە کادیری پارتی لەسەر ئەم بناخەیە لەخۆی بپرسێ؛ ئایا هۆیەکانی شکستی چین؟ و چۆن سەرکەوتن بەدیدێت؟ ئەمەش راستی ساڵی شازدەهەمینە، دەبێت لەسەر بناخەی قازانج کردن و هەڵسان بە ئەرکە پێویستیەکان نزیکی هەموو شتێك ببینەوە و، وەڵامێکی گونجاویان بدەینەوە. لەسەر هەمووانیش پێویستە کە شایەنی ئەم ساڵە مەزنە بن دەبێ کەس بەگوێرەی ناسینی شێوازی تایبەتی خۆی نزیکی شتەکان نەبێتەوە، بەڵکو بەشێوازی پارتی و هاوێشتنی هەنگاوی گونجاو ئەرکەکانی جێبەجێبکات.

ئەو شیکردنەوانەی کە تائێستا کردومانە، بەتایبەتی ئەوانەی کە بەبۆنەی شازدەهەمین ساڵ رۆژی پارتیەوە لەسەر هونەری سەرۆکایەتی و چۆنێتی پەرەپێدانی

لەناو PKKدا کردوومانــە، بەسـن بۆئـەوەی کـە نەخوێنـدەوار و شـوانێك بکـات بـە سەرکردەیەك لەهونەری سەرۆکایەتیدا. هەربۆیە تێنەگەیشتنی ئەم مەسەلانە یـان پێك نـەهێنانیان و کەوتنـە نێـو زەلکاوی بـەکرێگیراوی، یـاخوود بەشـێوەیەکی هەڵەشـەیی و ئاغایەتی، نزیکبوونەوە لێی گەلێك گیروگرفت دورست دەکات.

ئێمـە بـەهیچ شـێوەیەك رێگـا بـەوە نـادەین و، ئەوانـە تێکدەشـکێنین و لـەناویان دەبەین. ئەگەر مرۆڤ ئاقڵ بێت و لەناو خودی خۆیدا دەست بەشەڕی چینایەتی بکات و پێویستیەکانی جێبـەجێ بکـات، ئـەوا مرۆڤـە هەڵەشـە و دیماگۆجـەکان نـاتوانن لـەرێگا لابـدەن یـان دژبـەر بوەسـتن. ئـەو خەباتانـەی کـە لەبەرامبـەر هێـرش و پـەلامارەکانی دوژمنـدا کردوومانـە و ئـەو پێگەیانـەی کـە خستومانەتە ژێـر دەسـەڵاتمانەوە، هـەموو نەخشــە و پیلانــەکانی دوژمــنی پووچــەڵ کردۆتــەوە. ئێســتا دوژمــن ئامادەکــاری ئۆپەراسـیۆنێکی نـوێ دەکـات، هـەروەکو چـۆن پـێش ئێسـتاش دەیکـرد. ئێستا دوژمنـان خۆیان ئەڵێن: شەڕ گەیشتۆتە دوا قۆناخی خۆی، و بەگوێرەی ئەوەش خۆی ئامادە دەکات و هێزەکانی تەیار دەکات. ئەرکی سەر شانی ئێمەش پووچەڵ کردنەوەی هـەموو نەخشـە و پیلانەکانیانـە. پێویسـتە دروشمـی ئێمـە "خۆپێشخسـن و چـۆك پێـدادانی هێزەکـانی دوژمن و تێکشکاندنیان بێت، پێویسـتە نەکەوینـە بـواری خیانـەت و غەفڵەتـەوە، بـەڵکو سەرکەوتن بەدی بێت و جەختی لەسەر بکرێت". ئەگەر بەمشێوەیە نزیك ببینەوە ئـەوا دەتوانین بە شێوەیەکی مسۆگەر سـاڵانی داهـاتوو بکـەین بـە سـاڵانی سـەرکەوتن. تـەواوی ئـەو تایبەتمەندیانـەی کـە لـەناو PKKدا باسمـان لێـوەکرد، تایبەتمەنـدی سـەرۆکایەتی سـتراتیژی و تـاکتیکین، کـە پێویسـتە بـە گـوێرەی ئەوانـە بەرێوەبچـن و لـە کەسـایەتی خۆتاندا بەرجەرستەی بکەن. ئەمەش مانای گەیشتنە بە کرۆکی پرسـەکە و بـە بنچینـە گرتنیـەتی لـە هـەموو گۆڕەپانەکانـدا لەسـەر بناخـەی "سـەرۆکایەتی تـاکتیکی تـا چـەند دەتوانێ ئەمە پێك بهێنێت. ئەوانـە کـێن کـە خـاوەن هەڵوێستی سوورن لەسـەر خـەبات کـردن و شـایەنی ئـەم مەسـەلانەن و دەتـوانن تواناکاریـەکان بەشـێوەیەکی دورسـت و لەجێگای خۆیدا بەکاربهێنن و تان و پۆی گوتاربێژی گونجاو بۆئەمە هەڵبـژێرن؟ هـەموو شتێك بەم پێودانگە دەکرێت".

لەو باوەڕەدام کـە بـەدیهێنانی هیـوا و ئافرانـدنی ئـەو جـۆرە کەسـایەتییە شـتێکی ئاستەم نییە. کۆنگرەی پێنجەم پێویستە ئەو مانایە لەخۆیدا بەرجەستە بکات و وەڵامـی

ئەو قۆناخە بداتەوە. لەسەر ئەو بناخەیەش سەرۆکایەتیەکی تاکتیکی وەها دورست بکات، کە بتوانێت کەموکوڕیەکان بەلاوەبنێت و بەئاسانی رۆڵی خۆی ببینێت. ئەمەش شتێکی زەحمەت نییە. چونکە کرۆکی مەسەلەکەمان روون کردەوە و، لەهەموو گۆڕەپانەکانیشدا تۆوی ئەمە هەیە و بارودۆخیش بۆ تێپەڕاندنی هەموو کەموکوڕیەکان و رزگاربوون لە شێواز و نزیکایەتە کلاسیکیەکان و ئافراندنی سەرۆکایەتییەی ژیر و هۆشمەند، کەسایەتیەکی پێداگر، دڵسۆز و جۆشکراو بە هیوای ئازادی، گونجاوە. بەڵێ هیچ هۆیەك کە ببێتە ئاستەنگ بۆئەمە، لەناو ژیانی شۆڕشگێڕیدا نییە. زەمینەی ئافراندنی ئەمجۆرە کەسایەتیە هەیە. ئەو شتانەی کە پێویستن، بەهەر شێوەیەك بێت دەبێت پێکی بهێنن. ئاستەنگیەکانیش لەخۆیانەوە نامێنن، بەڵکو لە رێگای شەڕی شۆڕشگێڕیەوە بەلاوەدەنرێن. بەڵام بەمەرجێ کە شەڕ بە شێوەیەکی راست و دورست و بەگوێرەی تاکتیك بەڕێوەببرێت و، گەمە بە تاکتیك و دەسەڵاتی"صلاحيات" ناوەندی و بنکەی پارتی نەکرێت. ئێمە بەهیچ کلۆجێك ئەوە پەسند ناکەین و رێگا بەمەش نادەین. لەوانەیە لە رابردوودا، نەمان توانیبێ ئەمەئەنجام بدەین، بەڵام ئەمڕۆ لەهەموو لایەنێکەوە دەتوانین پێی بگەین. سەرەتا ئەو کەسەی کە دەبێ بەم کارە هەڵسێ، سەرۆکایەتی تاکتیکیە.

کۆنگرەی پێنجەمی پارتیمان و ساڵی 1995 دەبێت بە ساڵی دارشتنی کۆڵەکە و پرەنسیپەکانی راستی سەرۆکایەتی ستراتیجی و تاکتیکی، بە بەرجەستەکردنی ئەم ساڵەش بە شێوەیەکی راست و دورست، دەبێتە ساڵی کاروانی شەڕ لە پێناو بەدیهێنانی سەرکەوتن و، دەبێتە ساڵێکی بێ کەموکوڕی، یان ساڵێك کە زۆر بەدەگمەن کەموکوڕی تێدا دەربکەون. بەمەش سەرکەوتن دابین دەکەین. بە سووربوون و جەخت کردن و تەگبیر وەرگرتن و هێزی رێکخستنی PKK و هۆشمەندی سەرۆکایەتیە ستراتیژیەکەی، دەتوانین هەڵە و کەموکوڕیەکان نەهێڵین و ئاستەنگیەکان یەك لە دوای یەك بەلاوە بنێن. بۆیە پێویستە بە باشترین شێوە ئەوە ببینن کە سەرۆکایەتی ستراتیژی لەناو راستی گەلدا خۆی بوونیاد نا و ئێستاش دەتوانێ زۆر بەئاسانی ئەو ئاستەنگیانە تێبپەڕێنێت. هەربۆیە، لە سەرۆکایەتی تاکتیکیش دەخوازرێت کە مانایەك بە خۆی ببەخشێ، چونکە ئاوابوونی سەرۆکایەتی و گەیشتن بەراستیەکانی بە پەرەسەندنێکی

مێژوویی دادەنرێت. بەڵام سەرۆکایەتی تاکتیکی ناتوانێت بە نزیکایەتی کلاسیك، فێڵ بازی گوندێتی، چەنەبازی و شێوازی بۆرژوازی بچووك، ڕۆڵی سەرەکی خۆی بگێڕێت. ئەگەر ئەرکەکانتان بە باشی پێك بهێنن و هەموو تواناکاریەکان بخەنە خزمەتی پێکهێنانی تاکتیك و هەروەها ئەگەر بزانی کەی و لەکوێ شێوازی گەریلا پەیڕەو بکەی و چۆن چەك و پێویستیەکان دابین بکەی و، جێگای گونجاو بۆ کار و جێگرتن هەڵبژێری، بەکورتی ئەگەر بە باشی سوود لە هەموو تواناکاریەکان وەربگری، ئەوا زۆر بە ئاسانی خۆت دەسەلنێنی. هەر تەنیا بەم شێواز و نزیکبوونەوەیە دەتوانرێ ژیان قازانج بکرێ. لەنێو سەرۆکایەتی PKKدا بنچینەی ئەو شتەمان روون کردەوە کە پێویستە لەجیاتی فەرمیەتی دەوڵەت پەیڕەو بکرێن، ئەمانەش بە هێزی چارەسەری هەموو کێشەیەك دادەنرێن.

بزاڤی PKK تەنیا بزاڤێکی بەشێك، یان رزگاری نیشتمانی، یاخوود دیموکراتی نییە، بەڵکو PKK، بزاڤی لە بنچینەوە بونیادنانەوەی مرۆڤ و ئاواکردنی ژیانێکی نوێیە. PKK بەم شێوەیە خۆی هەڵسەنگاندووە و ئەم شێوازەی پەیڕەو کردووە و ڕێکخستنی خەبات و ژیانی نوێی خۆی ئەنجامدەدات. لەبەرامبەر فەرمیەتی دەوڵەتی تورکیا و داب و نەریتی کۆن و هەموو نەخشە و پیلانەکانی ئیمپریالیزم و جیهانی سەرمایەداری رادەوەستێ و، لەپێناو ژیانێکی نوێ و ئافراندنی مرۆڤی ئازاد، بەهێزی رەخنە هەڵساوە بە پیادەکردنی شەڕێکی مەزن. PKK بزاڤی هیوای ژیانێکی نوێیە، ئەمەش لەهەموو روویەکەوە روون کراوەتەوە و دەبینرێ و، هێز بەو کەسانە دەبەخشێ کە دەیانەوێت خۆیان بگەیەننە ئاستی مرۆڤایەتی راستەقینە. وورە و باوەڕی ئەو کەسانە بڵند دەکاتەوە کە بەهای پرسەکان دەزانن. هەرچەندە دوژمنی بزاڤەکەمان زۆریش بن، بەڵام دیسان باوەڕی PKK بەخۆی و، هێز و توانا بونیادنەرەکەی، دەتوانێت بەرامبەر هەموو ئەو درۆ و ریاکاری و خراپەکاریانەی کە مرۆڤیان بەرەو ئاژەڵێتی بردووە، رابوەستێت و جارێکی دیکە مرۆڤ بکاتەوە بە مرۆڤێکی ئازاد. ئێمە هیوای ژیان دەدەین بەو کەسانەی کە وەك ماسیەکی دوورە ئاویان لێهاتووە، دەیان کەین بە مرۆڤێك کە بتوانن لە هەموو روویەکەوە پرسەکان قازانج بکەن، بەڵام بە مەرجێك دەبێت بتوانن نوێنەرایەتی پارتی بکەت و شایەنی ڕێکخستن بن. لەوەش زیاتر دەبێت ئابووری و رۆشنبیری و کۆمەڵگای خۆیان ڕێکبخەن، بەکورتی دەبن بە مرۆڤێکی کامڵ و

خاوەن باوەڕ بە ئازادی.

PKK ڕێگای ڕێز و خۆشەویستی بێ سنووری لەبەردەم مرۆڤدا ئاوەڵاکردووە. واتە PKK مانای ڕاستی مرۆڤایەتی مرۆڤ بەمرۆڤ دەبەخشێ و، کرۆکی ڕێبازی ژیانی بۆ ئاشکرا دەکات. ئەو شەڕەی کە PKK لەلایەنی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و سەربازیەوە بەڕێوەی دەبات، تەنها بۆ ئەوەیە کە ژیانێکی نوێ و ئازاد بە مرۆڤ ببەخشێت. لەبەر ئەوە پێویستە  بەهەڵە تەماشای شەڕ نەکەین، چونکە شەڕ ڕووداوێکی تاکتیکی و خوێن ڕژاندن نییە، بەڵکو ئەمە شەڕێکە لە پێناو گەیشتن بە ڕاستینەی مرۆڤایەتی. هەر ئەمەشە مانای ڕاستەقینەی ئەو شەڕە مەزن و بەرخودانەی کە لەپێناو شەڕی ژیان و مرۆڤایەتیدا کراون. لەکاتی هەڵسەنگاندنی ڕاستیەکاندا دەبینین PKK توانیویەتی ئەو مرۆڤە دۆڕاوانەی کە لە ڕێز و خۆشەویستی دوور کەوتوونەتەوە، بگۆڕیت بۆ مرۆڤێکی خاوەن هەستی مەزن و هیوای ژیانی نوێیان تێدا بچێنێت و، لاوازی و بێ هێزیەکەیان بگۆڕێت بۆ هێزێکی مەزن و لەبن نەهاتوو. هەروەها توانیویەتی لەناخی ئەم کەسانەدا گیانی قوربانی، فیداکاری، جەسارەت. هەست و نەستی بڵند و ڕۆحی بەرپرسیارێتیان تێدا بچێنێت. ئەوەش بەسە بۆ ئەوەی بزاڤەکەمان بەرەو سەرکەوتن بڕوات. قۆناخی ئەمڕۆی بزاڤەکەمان لەم ئاستە بەهێزەدایە، لەبەرئەوە دوژمنانی ناوخۆ و دەرەوەش هەرچەندە هێرش بکەنە سەرمان و نەخشە و پیلان دابڕێژن یان، بیانەوێت تواناکاریەکان بخەنە دەست خۆیان و لەسەری بژین، دیسان سەرناکەون. چونکە ئەو خوڵقکاریەی کە لەناو PKKدا دورستکراوە لە توانایدا هەیە زۆر بەئاسانی هەموو ئاستەنگیەکان بەلاوە بێت و هەنگاوێکی مێژوویی بهاوێژێت. بۆ بونیادنانی مرۆڤایەتی و مرۆڤێکی نوێ، پێویستە بۆ چوونە کلاسیکیەکان بە کۆیلایەتی و یۆتۆپیای درۆزنانەشەوە تێکبشکێنرێن و هەموو مەترسیەکانیان دەستنیشان بکرێن. پێویستە مرۆڤی نوێ هەر لە بچووکترین تا گەورەترین خانە لەخانەکانی لەشی بونیادبنرێتەوە، ئەمەش ئەرکێکی مرۆڤایەتی و مێژووییە، کە پێویستە ئەنجامی بدەین. بۆ ئەمەش هەتا دوایی ڕێگا لەپێشتان کراوەیە. ئێمە ئەمە لەراستی خۆماندا بەرجەستە دەکەین، تا دوا پلە مرۆڤ هەڵدەسەنگێنین و هەڵدەستین بە ئاواکردنەوەیان و بەهیچ شێوەیەکیش لەم کارە پاشگەز نابینەوە. تەنانەت ئەگەر بە تەنیاش بمێنینەوە، دیسان هێز و ئارەزوو

و سـووربوونی ئێمـه بـۆ بونیادنانـەوەی مـرۆڤ لاواز نابێـت. بەهـەمان هێـز و تینـیش بـەردەوام دەبـین بـۆ ئاواکردنـەوەیان. لـەژیانی ڕۆژانەمانـدا بەسـەرکەوتوویی ئەمانـە پێکدەهێنین، دۆست و دوژمنـیش دان بـەم ڕاسـتیەدا دەنـێن، چـونکە لەلایـەنی ماددی و مەعنەویەوە، سـەرکەوتنی گـەورەمان بەدەسـت هێنـاوە. ئەمـەش لەبەرئەوەیـە، کـە هـەر شتێك لەهەموو لایەنێکەوە هەڵدەسەنگێنین. مرۆڤی کلۆڵ و هەژار یـان ئەوانـەی خۆیـان بـۆ پێـنج فلـس فرۆشـتووە باشـیان دەناسـین، بـەڵێ بەچـاوێکی چـاککردنەوە و پـێش خستنەوە لێیان نزیك دەبینەوە و خەبات دەکەین لەپێناوی ڕزگارکردنی مرۆڤ لەم ئاستە نزمەی ئێستای. مرۆڤ ئەگەر هەوڵ و ڕەنجی خـۆی بـە شـێوەیەکی بـاش بـەکار بیهـێنێ و خـۆی بگەیەنێتـە ئاسـتی کەسـایەتیەکی شۆڕشـگێڕ و بـاوەڕی بـەخۆی هـەبێت، ئـەوا دەتوانێت ژیان و تاکتیك ڤازانج بکات. گەیشتن بە ئاستی ڕێکخستن لەڕێگای گەیشـتن بـە شۆڕشگێڕی ڕاست و دورستەوە دەبێت. کاتێك پرسی ژیان هەڵدەسەنگێنین، دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە ئەو ژیانە سووك و کەوتووە و بەهیچ شێوەیەك شایەنی مرۆڤ نییە. ئەو ژیانەی کە ڕژێمی فەرمی دەوڵـەت بەسـەر گەلـدا دەیسـەپێنێت لـە ئاسـتی مرۆڤـدا نییـە، بـەڵکو سووکایەتی کردنـە بـەژیانی مرۆڤایـەتی. لەبـەر ئـەوەی ئـەو ژیانـە بۆگـەن بـووە، پێویستە خۆتانی لێ ڕزگار بکەن. بێگومان ئەمەش ڕاسـتیەکی مێژووییـە. هـەر ڕژێمێك کاتێك دەگاتە دوایی خۆی، بە شێوەیەکی بێ وێنە هەڵدەستێت بە تێکدانی هـەموو بـەها مرۆڤایەتیەکان. ئەمەش لە سەردەمی"نیرۆن"دا بـە باشـی دەرکـەوت، کـە لـەو کاتـەدا بـە شێوازێکی زۆر دڕندانە و خوێناوی هێرشی دەکردە سەر مرۆڤایەتی.

بەڵام کاتێك تەماشـای شۆڕشـەکەمان دەکـەین، دەبیـنین کـە هێزێکـە نوێنەرایـەتی ڕزگـاری مرۆڤایـەتی دەکـات و لـە خۆیشـیدا ئەمـە بەرجەسـتە دەکـات، لـە پێنـاو ژیـانی مرۆڤایەتیدا خـەبات و تێکۆشـان دەکـات. لەسـەر ئـەم بنەمایـە ڕێـز لـە مـرۆڤ دەگـرین و دەڵـێین ئەگـەر دەتـەوێت بـە ئازادیـەکی شـیاو بگـەیت، ئـەوا دەبێـت لـەم پێنـاوەدا شـەڕ بکەیت. PKK زۆر بە بوێرییەوە ئاماژە بەمە دەکات. جەسـارەت و فیـداکاری و مـەزنی PKKش لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. چونکە بە بێ ئـەم تایبەتمەندیانـە مـرۆڤ ناتوانێـت شایەنی مرۆڤایەتی بێت. هەر ئەمەشە لەناو هونەری سـەرۆکایەتی PKKدا بـەدی دێـت و بەرجەستە دەکرێت.

بەکورتی دەتوانین بڵێین پارتیمـان، گـەورەترین نوێنـەری مرۆڤایەتیـە و، بزاڤێکـە

لەپێناوی ئەمەدا خەبات دەکات و، هەڵدەستێت بە ژیاندنەوەی سۆسیالیزم کە رژێمە سەرمایەداری و ئیمپریالیزمیەکان دەیانەوێت تێکیبشکێنن و بەتەواوی پاکتاوی بکەن. لەم رووەوە سەرکەوتنمان بەدەست هێناوە. ئێمە لەسەرەتادا ئەم پرسە لەچوارچێوەی دەوڵەتی تورکیادا کە بۆتە زیندانی گەلان زیندوو دەکەینەوە و، لەرێگای خەباتێکی دیموکراتی گەلەری لەناو خودی تورکیادا، ئەم دیوارە دەڕوخێنین. بۆئەمەش کەسایەتیەکی دیموکراتی کە بتوانێت لەبەرامبەر رژێمی دەسەڵاتدار رابوەستێ و باوەڕی مەزنی بەخۆی هەبێت، هەروەها کەسایەتیەکی شەرڤان کە بتوانێت هەنگاوی سەرکەوتوو بهاوێژێت، بونیاد دەنێین.

PKKسەرکەوتنی ساکار و بچوك پەسند ناکات، هەروەها ئەو کەسانەش پەسند ناکات کە چاویان بڕیوەتە هەلی هەزران، بەڵکو PKK هەوڵ دەدات لەسەر بنکەی سەرۆکایەتی شۆڕشگێڕ کەسایەتی مرۆڤ بونیادبنێ، ئەمەش پێویستی بەرێبازێکی ئایدیۆلۆژی و تاکتیکێکی راست و دروست هەیە، کە بتوانێ لەکات و شوێنی گونجاودا مانای خۆی هەبێت؛ کەسایەتیەك کە هەتا دوایی لەگەوهەر و ستراتیژ و تاکتیکدا قووڵ ببێتەوە. بێگومان ئەمەش پێویستی بە هەوڵ و تێکۆشانێك هەیە کە چرکە بە چرکە رەخنە بکات و، هەرگیز لە بیرکردنەوە نەکەوێت و چاوپۆشی لە هیچ شتێك نەکات و، بەبەردەوامی لە هەنگاوەکانیدا سەرکەوتن بخوڵقێنێ. ئەمانە ئەو مەرجە پێویستیانەن بۆ ئەو کەسایەتیانەی کە دەخوازن تەڤلی ئێمە ببن. جارێکی دیکە دووپاتی دەکەمەوە ئەگەر بەم شێوازە شەڕ بکەن، ئەوا خۆتان دەگەیەنن بە راستی هونەری سەرۆکایەتی. هەرچەندە ئاستەنگیەکانی رێگاتان گەورە بن، دیسان ناتوانن هەنگاوەکانی سەرکەوتنتان رابگرێت، ئەو کاتەش کەسایەتیتان سیمای جوانی بەخۆیەوە دەگرێت. جوانی مانای پەروەردە و نزیکبوونەوەیەکی لۆژیکی لە هونەری سەرۆکایەتی دروست و گەیشتنە بە ئیرادەی شۆڕشگێڕی PKK و بەرجەستەکردنی لەخوددا دەبەخشێت.

بۆئەمەش رێگا لەبەردەمتاندا کراوەیە، بەبێ ئەمەش ناتوانن داوای جوانی بکەن، هەتا ئەگەر داواشی بکەن نایگەنێ. ئەمەیە یاسای سەرۆکایەتی لەناو PKKدا. ئەگەر ژیانتان دەوێت، ئەوکاتە بەجددی لەپێناو جێبەجێکردنی بنچینە راستەکانی هەوڵبدەن، چونکە بەبێ ئەمە بەدووچاری پاکتاوی و مەترسی نەمان دەبنەوە. لەبەر ئەوە پێویستە

باوەڕ بەو ژیانە بکەین کە دەمانگەیەنێتە سەرکەوتن و بەئارەزوویەکی مەزنەوە لە ئامێزی بگرین، ئەمەش ئارەزوو و شێوازی سەرەکیمانە. پێویستە تەنیا ساتە وەختێکیش ئەوە لەبیر نەکەین کە تەنیا لەرێگای گەیشتن بە هونەری سەرۆکایەتی و پەروەردەکردنی خود و لەسەر ئەو بنەمایە و دیاریکردنی رێرەوی خەبات بەگوێرەی ئەو بنەما و شێوازەی سەرۆکایەتیەوە دەگەین بەو ژیانە. بۆ سەرکەوتنیش پێویستیمان بەمە هەیە.

مـن هەر لەسەرەتاوە لەسەر ئەم بناخەیە بەرێوە دەچم، لەئێستاش بەدواوە هەموو ئەو شتانەی کە لەسەر شانی منن، بلندیان دەکەمەوە، چونکە ئەم بەر پرسیارێتیە، مانا و شێوەی ژیانە. لەو کاتەوەی ئێمەتان ناسیوە، ئێمە بەمرەنگەین، ئەو شتانەی کە دەمێنن ئەرکی ئێوەن، پێویستە پێی هەلسن و، هەموو بارودۆخێکدا شایەنی ئەم هونەرە بن.

سەرەرای هەموو ئەو زۆر و زەحمەتیانەی کە هاتوونەتە رێمان دیسان ئێمە ئەو رێچکەیەمان گرتووە و دەخوازین لەسەر ئەو بنەمایە بەرێوە بچین. پێویستە ئێوەش شێوەی ئەم رێگایە لەخۆتاندا بەرجەستە بکەن. لەراستیدا هێز و توانای ئێوە بەشی ئەوە دەکات و، رەوشیشتان گونجاوە، ئەوەی دەمێنێ تواناکاری بخرێتە بەردەمتان و ئەرکی ئێوەش ئەوەیە کە بەشێوەیەکی باش بەکاریان بهێنن.

بەمرەنگە 16 هەمین سالرۆژی پارتیمان هەلدەسەنگێنین، پێویستە ئێوەش نوێنەری ئەمە بن بۆئەوەی لە کۆنگرەی پێنجەمدا ئەنجامی بدەن. ئەگەر بەو پێودانگانەی کە بۆمان دیاریکردن نزیك ببنەوە، ئەوا سەردەکەون. راستی سەری سال بەمرنگەیە و پێویستە ئێوەش لەسەر ئەم بنەمایە لێی نزیك ببنەوە. خوازیارین ئەم سالانە بکەن بە سالی بونیادنانەوە و ئافراندنی ژیانێکی نوێ. ئەگەر بەم شێوەیە نزیك ببنەوە، ئەوا لەو باوەرەدام کە شایەنی قۆناخی ئێستا دەبن. ئەگەر بتوانن ببن بە شایانی پارتی و گەل، ئەو کاتە دەبن بە شایەنی مرۆڤایەتیش. بەمرەنگەش رێزتان لێدەگیردرێ. وتەیەك هەیە دەلێ:"پێویستە وەکو مرۆڤ بژیت و، نابێت لەدژی ئەمە رابوەستیت"، ئێمە تەنیا بەوە رازی نابین، بەلکو بە پێچەوانەوە ئەگەر ئەمانە باش پێك بهێنن ئەو کاتە ئێمەش وەکو هەموو بزاڤە مێژووییەکان دەبین بە بزاڤی (مەفتوحات) ڤەبوونەکان. ئێمە شەرڤانی ئەو بزاڤەین کە گەیشتۆتە ئەم ئاستەی پەرەپێدان.

پێویسته وەك زریان بەرەو ئامانجەکان هەنگاو بهاوێژن و خۆتان له وخەیاڵه رزگار بکەن کە وەکو ئاستەنگێك وایە لەبەردەمتاندا. ئەوکاتەش دەتوانن سەربکەون. ئایا هیچ رێگایەکی دیکەتان لەبەردەمدایە بۆ ژیان؟ باوەڕ ناکەم، چونکە رژێم بەرەو لەناوچوون و نەمان دەچێت و ناتوانێت هیچ شتێکتان بداتێ. ژیانی کۆن بە داب و نەریتە ناکۆکیەکانەوە کە ئێوە لێوەی هاتوون هیچتان ناداتێ، ئایا ژیانێکی مردوو چیتان دەداتێ؟

لەبەرامبەر ئەمەدا کاروانی سەرۆکایەتیمان ژیان دەبەخشێ. ئەمەش لەرێگای شێوازەکەیەوە بەدەر دەکەوێت. پێتان ناڵێین ئێوە ناچارن ئەم ژیانە هەڵبژێرن، بەلام پێویسته بەدڵ و بەئارەزوو و خۆشیەوە بەرەو پیریەوە بچن.

پەرەپێدانی هونەری شەڕ و بەهێزکردنی پەیوەندی گەل بە ژیانی سیاسیەوە شتێکی زەحمەت نییە، هەروەها هەڵبژاردنی شێواز و تان و پۆ زێدە گرفتێکی گەورە نییە. من بەو شێوەیە دەستم پێکردووە و بچوکترین زەحمەتیشم نەبینیوە. بۆچی ئێوەش وەها نابن؟ بێگومان پێویست دەکات لەسەر ئەم بناخەیە دڵنیا بن لە سەرکەوتنتان. بەڵێ بەمرەنگە دەگەینە راستیەکان، بارودۆخیش ناچارمان دەکات کە ئەم کارە بکەین، چونکە بەبێ ئەمە سەرکەوتن مەیسەر نابێ. پێویسته بەرامبەری شەڕی تایبەتی دوژمن و ئەو تایبەتمەندیانەی کە دوورن لە مرۆڤایەتیەوە و هێرش و پەلامارەکانی کە لەقۆناخەکانی مێژوودا وێنەیان نییە، بێ بەزەییانە هەڵسین بە داسەپاندنی شەڕی شۆڕشگێڕی و شێوازەکەی. ئەوەش وامان لێدەکات کە سەر بکەوین. بێجگە لەمەش هیچ رێگایەکی دیکەی ژیانمان لەبەردەماندا نییە، هەتا ئەگەر هەشبێت، ئەوا هەزاران جار لەمردن خراپترە. لەسەر ئەم بناخەیە 16 هەمین ساڵرۆژی PKK لەهەموو ئەندامانی پارتی پیرۆز دەکەین و هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازین.

*بژی 16 هەمین ساڵرۆژی دامەزراندنی PKK !

*بژی سۆسیالیزم و دیموکراتی و شەڕی رزگاریمان!

*بمرێ ئیمپریالیزم و کۆلۆنیالیزم و کۆنەپەرستی بەهەموو شێوەکانیەوە!

سەرۆکایەتی پارتی
1994/11/26

# شێوازەکانی سەرۆکایەتی و پێشکەوتنی بەدرێژایی مێژوو و لەڕۆژی ئەمڕۆماندا

## رۆڵی سەرۆکایەتی لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا

لەقۆناخەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا سەرۆکایەتی مانای دەستەبەرکردنی بواری گۆڕان و پێشکەوتنە. سەرۆکایەتی لەو قۆناخەدا شوێنی مێشك، ئاراستەکەر، رێنیشاندەر، هێزی باڵادەست، یاسا و دەستور و توانای کێشکردن دەگرێتەوە، کە خاوەن تواناکاری و لێهاتووییەکی لەڕادەبەدەرە و هێز بە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەبەخشێت. هەر لەچاخی کۆمەڵە مرۆڤەکانی سەرەتاوە بگرە تاوەکو رۆژی ئەمڕۆ، بەبێ هەبوونی سەرۆکایەتیەك کە داینەمۆی وەرچەرخانی کۆمەڵگا بەڕێوەببات، ئاستەمە مرۆڤەکان بتوانن ببنە کۆمەڵگایەکی مرۆڤایەتی. چونکە وەك ئاماژەمان بۆ کرد ئەمجۆرە سەرۆکایەتیانە وەك ئەقڵ و مێشکی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی و هەمموو بوونەوەرێکن. بەکورتی بەبێ سەرۆکایەتی، ناتوانرێ بیر لەکۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی بکرێتەوە، بەڵام ئەوەی جێگای داخە ئەوەیە کە بەدرێژایی مێژوو ئەم سەرۆکایەتیانە فۆرمێکی تاکەکەسیان بە خۆوە گرتووە، یاخود ئەمڕۆ بە دکتاتۆر، پادشا، سوڵتان، ئیمپراتۆر و...هتد ناودەبرێن. جا ئەگەر تەنها لەسەر ئەم زاراوانە راوەستین، ئەوا بۆمان ئاشکرا دەبێت کە کاتێ قۆناخەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لاواز دەبن و لەبەردەم پەرەسەندنێکی زێدە گرنگدان، هەلومەرجێکی وەها دێتە ئاراوە کە ملکەچی ئیرادەی تاکەکەس بن. لێرەدا ئەم پرسیارە خۆی لەپێشمان زەق دەکاتەوە؛ بۆچی دەبێ تاکەکەسەکان پێشکەوتنێکی مەزن بەدیبهێنن؟

لەڕاستیدا نەك تاکەکەس، بەڵکو کۆمەڵگا پێویستی بە گەشەکردن و پێشکەوتن هەیە و دەیەوێ لەشوێنی "تیرە و عەشیرەت"، ببێتە کۆمەڵێکی مرۆڤایەتی گەورەتر. ئەو کاتە ئەرکێکی نوێ دەردەکەوێ کە سەرۆك عەشیرەت ناتوانێ پێی هەڵسێ، بەڵکو

پێویستی بەیەکێکە کە لەئاستی ئەو پێشکەوتنەدا بێت و بتوانێ وەڵامی ئەو یەکە زەبەلاحە بداتەوە و لەکۆمەڵگا خاوەن تێڕوانینی زانستیانە، لێهاتوو، ژیر، زیرەك و بەتوانابێت، تابتوانێ کۆمەڵگا ڕێکبخات و بیگەیەنێتە ئاستێکی گەلێك پێشکەوتووتر.

ئەو کەسانەی کە بەم ئەرکە هەڵدەستن، ناویان دەبێتە **"سەرۆك"**، کە لەوانەیە سەرۆکی عەشیرەتێك، یان پادشا ، یاخود سوڵتان یان ئاغایەك بێ. لەچاخی کۆمۆنەی سەرەتاییدا کەسایەتیەکان ناویان لەخۆیان نا **"سەرۆك عەشیرەت"**. کەچی لەقۆناخی کۆیلایەتی ناوی خۆیان کرد بە **"ئیمپراتۆرە"** پیرۆزەکان. بەڵام لەچاخەکانی ناوەڕاست ناوی خۆیان کردە **"مەلیك و پادشا"**. بێگومان ئەمەش هۆی تایبەتی خۆی هەبوو، چونکە دەربازبوون بۆ سەردەمی کۆیلایەتی سەبارەت بە کۆمۆنەی سەرەتایی دواکەوتووە، کارێکی ئێجگار گرنگ و مەزن بوو، لەبەرئەوە ئیمپراتۆرەکان بەرگێکی پیرۆز لەخۆیان دەکەن و بەو رەنگە خۆیان نیشاندەدەن. هەروەها سەبارەت بە گۆڕان بۆ قۆناخی کۆیلایەتیش لەبەرئەوەی گرنگی و بایەخی خۆی هەبوو، ئەوا ئەو کەسانەی بەم کارە هەڵدەستان وەك **"خواوەند"** تەماشا دەکران. لەڕاستیدا زاراوەی خودا هەر لەو سەردەمانەدا دەرکەوت. ئەوەش مانای ئەوەیە کە کۆمەڵگا دەیەوێت بەرەنگاری دواکەوتوویی و کۆنەپەرستی خۆی ببێتەوە و لەبەرامبەر زۆری و زەحمەتی ژینگە راوەستێت. بۆ ئەمەش پێویستی بەهێزێکی خودایی دەبێت کە حیسابی بۆ بکرێت و کاروباری دەسەڵات بەڕێوە ببات.

بەڵێ! ئەمە کارێکە لەناواخنەوە گەلێك ناکۆکی لەخۆوە گرتووە، بەڵام راستیەکە نەك تەنیا لەبواری سیاسی، بەڵکو لەبواری هونەر و ئایین و چالاکیە ئابووریەکانیشدا تا رۆژی ئەمڕۆمان بەردەوامە. کەوابێ هەریەك لەبوارەکان **"مەلیك، سەرۆك یان رەهبەر"** تایبەت بەخۆی هەیە. بەڵام سیاسەت بە پێشکەوتووترین و فراوانترین شێوەی دادەنرێت. سەرۆکایەتی سیاسی پێشکەوتووترین سەرۆکایەتییە، سیاسەتیش لەناو هونەرەکاندا بەرزترین هونەرە.

بەڵام شێوەکەی دیکەی سەرۆکایەتی؛ بریتیە لەسەرۆکایەتی ئەو قۆناخەی کە بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە؛ واتە **"کۆنەپەرست"**ە کە هەرەسهێنن. هەروەکو چۆن سەرۆکایەتی بەرزبوونەوە و پێشکەوتن هەیە، ئەوا بەهەمان شێوەش سەرۆکایەتی

دواکەتن و روخاندن هەیە. بە واتایەکی دیکە سەرۆکەکانی ئەو کۆڕ و کۆمەڵانەی کە لەقۆناخی گەندەڵی و رووخاندا ژیان بەسەردەبەن، رۆڵێکی مەزنیان هەیە. بۆ نمونە، نیرۆن لەسەردەمی رووخانی ئیمپراتۆریەتی رۆمانیدا دەرکەوت، هەروەها سوڵتانەکانی عوسمانیش لەکاتی رووخاندنی قۆناخی دەرەبەگایەتیدا سەریانهەڵدا. سەرۆکە فاشیستەکانیش بەهەمان شێوە لەسەردەمی قەیرانەکانی سەرمایەداریدا دەردەکەون. ئەمانەش هەموویان لەداسەپاندنی کۆنەپەرستی و زۆرداری و جینۆسایدیبەسەر کۆمەڵگادا رۆڵێکی مەزن ئەگێڕن. ئەم کەسایەتیانەش بەلایەنی کەم بەڕادەی شێوازەکەی دیکەی سەرۆکایەتی، خاوەنی دەسەڵات و فڕوفێڵ و توانان. شیاوی ئاماژە پێکردنە کە لەنێوبردن و جینۆساید هونەرێکە بەڕادەی هونەری بەرزبوونەوە و ژیانەوە و، لەنێوانیاندا تەنیا جیاوازیەکی بچووك هەیە.

لەم رۆژانەدا وتوویژێکی چڕوپڕ دەربارەی دیموکراتی و سەرۆکایەتی دیموکراتی دەکرێت. کەوابێ سەرۆکایەتی دیموکراتی چییە؟ و پێویستەچۆن پێکبێت؟.

سەرۆکە دیموکراتەکان نزیکترین سەرۆکن لە گەل و پەیوەندیان لەگەڵ نەپچڕاوە و، بەو تایبەتمەندیانەی لەگەڵیدا بەدەستیان هێناوە گوزارە لەخۆیان دەکەن. سەرۆکە دیموکراتییەکان هەر لەڕۆژانی یەکەمی کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتیەوە بگرە تا رۆژی ئەمرۆمان تایبەتمەندی خوداوەندی پیرۆزیان بەخۆیانەوە نەلکاندووە. ئەوانە لەو سەرۆکانە نین کە سوود لەتایبەتمەندی زۆرداری و چەوساندنەوە وەربگرن، وێڕای ئەمەش ئیمتیازات و شتی دیکە بە رۆڵی سەرۆکایەتی خۆیان رەوا نابینن، بەڵکو لەسەر بنەمای پێویستبوونێکی لەڕادەبەدەر بە گەل، یان بە عەشیرەت ــ ئەگەر عەشیرەتبێ ــ، یان بەنەتەوە ــ ئەگەر نەتەوەبێ ــ و ئەگەر کۆمەڵەیەکی فراوانتریش بێت، هەڵدەستن بەگێڕانی رۆڵی خۆیان. لەبەرئەوە پێویستیان بە زۆر و کوتەك، دامودەزگای تایبەت، دەزگای ئاسایش، ئیستخبارات، ئەشکەنجە و....هتد نییە.

لەم روانگەیەوە دەتوانین بڵێین؛ سەرۆکە دیموکراتیەکان ئەو کەسانەن کە گوزارشت لەئیرادەی گەل دەکەن و کاروبارەکانی بەڕێوەدەبەن. ئەمجۆرە سەرۆکانە لەمیانە قۆناخەکانی خەباتی گەلان بۆ سەربەخۆیی و ئازادی دەردەکەون و هێزی خۆیان لە گەلەوە وەردەگرن. بەحوکمی ئەوەی کە لەنێو خودی ریزەکانی گەل سەرهەڵدەدەن و هەتا دوایی بە گەلەوە پەیوەستن، ئەوا هیچ پێویستیەکیان بەو شێوازانە نییە کە

دووریان دەخاتەوە لێی، یا دیوارێك دروست دەكات لەنێوانیاندا. جا هەتا ئەوانە هێزی خۆیان لەگەڵەوە وەربگرن و بێ سنوور پابەندبن پێی، چ پێویستی بە زۆر و كوتەك دەكات؟.

ئەمجۆرە سەرۆكانە بەتایبەتی لەقۆناخە مێژووییە دژوارەكاندا دەردەكەون، لەرۆژگاری ئەمرۆشماندا ئەمجۆرە سەرۆكانە بەرێژەیەكی زۆر بەرچاو دەردەكەون. ئەگەر ئەمجۆرە سەرۆكایەتیانە لەبەرچاو بگرین و بیكەین بە پێوەرێكی بنەرەتی، ئەوا زۆر بەئاسانی دەتوانین سەرۆكایەتی بەگشتی یان سەرۆكی هەر وڵاتێك بناسین و بزانین دیموكراتە یان دیكتاتۆر و كۆنەپەرستە.

## گرنگی سەرۆكایەتی سیاسی

هەڵوەستەكردن لەسەر هەموو بوارەكانی سەرۆكایەتی كارێكی پێویستە، بەڵام بێگومان سەرۆكایەتی سیاسی هەمیشە سەرەكی و بنچینەییە. ئەو سەرۆكایەتیە هی هەموو بوارەكانە؛ هەر لەهونەرەوە تا دەگاتە ئابووری، بۆیە پێویستە لەرۆڵی كەم نەكەینەوە. بەگوێرەی ئەو شیكردنەوانەی دوایی، دامەزراوێكی سەرەكییە لەسەرچاوەی دەسەڵاتدا كە رێگا واڵا دەكات و پەیوەستە بەسەرۆكایەتی ئابووری، هونەری و سەربازیەوە. كاتێك سەرۆكایەتی سیاسی دەبێت بەدەسەڵاتێكی باش، دەتوانێ سەرۆكایەتی سەربازیش بەباشترین شێوە ئاراستە بكات و تواناكاری پێویستیش بە سەرۆكایەتی چالاكیەكانی هونەری و ئابووری دەبەخشێ. لەسەر ئەم بناخەیە ئەگەر سەرۆكایەتی سیاسی ژیر نەبێ، ئەوا سەرۆكایەتی سەربازیش لێهاتوو نابێ. باشترین نمونەش لەسەر ئەم رەوشە، كوردستانە كە زوو دەتوانێ ببێتە ئامرازێك بۆ خەڵكی دیكە و ببێتە سەربازێكی چاك و لەبواری هونەریش سەرۆكایەتییەكی باش نەبووە، چونكە **هونەر لەلای ئێمە مردوو و بێ گیانە**، وێڕای لەو هەلومەرجەی كە سەرۆكایەتی سیاسی تێیدا بەهیچ شێوەیەك لەشێوەكان هەبوونی نییە. هەروەها گەلەكەمان سەرۆكایەتیەكی ئابووریشی نییە و رووبەڕووی تاڵان و برۆی كۆڵۆنیالیزم هاتووە.

كاتێك سەرۆكایەتی سیاسی دەست بە پەرەسەندن دەكات، ئەوا هونەر و ئابووری و هەروەها سەرۆكایەتی سەربازیش بەدوایەوە گەشە دەكەن و دواتریش هەموو چالاكییە

کۆمەڵایەتیەکانی دیکە پەرەدەسێنن، بەڵام کاتێ سەرۆکایەتی سیاسی بەرەو سڕبوون و پاشەکشە و هەڵوەشانەوە دەچێ، ئەوا لەگەڵیدا سەرۆکایەتی هەموو بوارەکانی دیکە پەرتەوازە دەبن. لەبەر ئەم هۆیەیە کە هەمیشە دەگوترێ: **سەرۆکایەتی سیاسی رۆڵێکی تەواو و لەبەرچاوی هەیە، بەڵکو رۆڵی کلیل دەبینێ**. لەسەرووی هەموو سەرۆکایەتیەکانی دیکەوە دێت و سەرچاوەی هەموو سەرۆکایەتیەکانە. بەڵام ئاخۆ راستی ئەو پرسە لەڕەوشی ئێمەدا چۆنە؟

ئەگەر رۆشناییەك بخەینەسەر مێژوومان، ئەوا لەسەر بناخەی ئەو ڕوونکردنەوە گشتیانەی کە لەسەرەوە باسمان کردن، بۆمان دەردەکەوێ کە **مێژووی سەرۆکایەتی خیانەتکارانە، یاخود باشتر بڵێین مێژوویەکە کە سەرۆکایەتی گێلی، نەفامی و خیانەتکاری تێدا زاڵە و ئەوەندەی نەماوە یەکسانبن لەگەڵ سەرۆکایەتی دوژمنان**. ئێمە نەتەوەیەکین و وڵاتمان هەیە، کەچی فەرمانڕەوایی دەسەڵات و سەرۆکایەتی لەدەستی خەڵکی دیکە دایە. لەدەست ئەو بێگانە و داگیرکەر و تاڵانکەرانە دایە کە خێر و بێر و دەوڵەمەندی وڵاتەکەمان بەکاردەبەن. ئەمجۆرە مێژووەی کە لەژێر دەسەڵات و فەرمانڕەوایی سوڵتانەکان پێش دەکەوێ (لەمێژوودا پێی دەگوترێ سەردەمی پاشا و سوڵتانەکان)، جگە لەسەرۆکایەتی خیانەتکارەکان هیچی دیکەی لێ دەرناکەوێ، جگە لەمێژووی خیانەت هیچی دی نییە. لەسەر ئاستی گەلیشدا تاریکی و مێژوویەکی نەفرەتلێکراو و گێلایەتی زاڵە.

لێرەدا پرسیارێك خۆی قوت دەکاتەوە، کە چۆن تووشی داگیرکردن هاتین؟ ڕەنگە ئەمە بەگەلێك هۆکار راڤە بکرێ، وەك هێزی دوژمنان ـ هێزی ئێمە ـ هۆکارەکانی جوگرافیا و .... هتد. بەڵام گرنگ لەمەدا هەر سەرۆکایەتییە. نمونەی سەرۆکایەتی باو لەوکاتەدا، نمونەی سەرۆکایەتی بێگانە بوو. بەڵام ئەوانەی لەریزەکانی گەل دەردەچن و هەوڵی بەدەسەڵاتبوون دەدەن، خاوەن سروشتێکی خیانەتکاریان هەیە بۆ بەدیلگرتنی گەلەکەمان. ئەوانەی کە هاریکاری بێگانە دەکەن، ئەگەر بە نەزانیش بێ و وا لێکبدەنەوە کە بە گەل و دۆزەکەیانەوە گرێدراون، ئەوا هەر پاڵپشتیەك و یارمەتیەك کە پێشکەشی دەکەن، ئەوە دەکەوێتە ناو چوارچێوەی گێلی و نەفامی. رەنگە وەهاش بزانن کە کارێکی باشیان ئەنجامداوە، کەچی لەڕاسیدا دەکەونە خزمەتی دوژمن. راستە

نیازەکانیان باشە، بەڵام ئەو نیازانەیان بەس نییە بۆ دوورکەوتنەوەیان لەخزمەتکردنی دوژمن. ئەمانەش لەگەڵ گێلەکان دەپۆلێنرێن و، نمونەیان لە مێژووماندا گەلێك زۆرن.

بەڵام ئەوانەی کە دەمێننەوە، ئەوانەن کە لەژێرەوەن ـ ئەوانە وەکو گاڕانن، دەتوانرێت بەگەڕبخرێن و بەشداری شەڕیان پێ بکرێت. بێگومان گاڕان ـ بەلایەنی کەمەوە ـ هەڵسوکەوتی دیاری کراوی لەگەڵ دەکرێ. بەڵام ئەو گەلەی کە گەلێکی بێگانە ـ تەواوی بەدوژمنی خۆی دەبینێ، ئەوا لەشوێنێکدایە زۆر خراپترە لەوەی کە گاڕان تێیدایە، بەڵێ! ئا ئەمەیە ئەو مێژووەی کە شێواندنێکی ترسناکی رەوشی گەلەکەمانی لەدوای خۆیەوە حەشارداوە. لەسەر ئەم بناخەیە ئاسانە بۆ ئێمە لەوە بگەین کە بۆچی سەرۆکێك ئەوەندە کەوتۆتە خزمەتی دوژمن و بووە بەماشە و ئامرازێك لەدەستی داگیرکەردا. هەوەها بۆمان ئاسانە لەوە بگەین کە بۆچی گەلەکەمان لەگاڕان کەمترە، وێڕای ئەو هەوڵەی ئەنجامی داوە؟ لەم روانگەیەوە ناکرێ راستی گەلەکەمان لەگەڵ هیچ گەلێکیتر بەراوردبکرێ، یان لەگەڵ هیچ قۆناخێکی مێژوویی، بەتایبەتی لەمیانەی گوێڕایەڵی بۆ داگیرکەران و کلکایەتی بێگانە، خزێنراوەتە ناو ئەو هەلومەرجە ناهەموارەوە. ئەمە ئەو هۆکارە راستەقینانەمان بۆ روونەدەکەنەوە کە شاراوەن لەبەردەم پێشکەوتنی کەسایەتی تا ئەو رادە ترسناکە، ئەمەش بەجۆرێك دەردەکەوێ کە هیچ پشت و پەنا و هێزێکی نییە و دابڕاوە لەهەر بەهرە و توانایەك، کەسایەتیەکی نەزان دەرك بەوە ناکات کە چ هی خۆیەتی، چ هی دوژمنە، بەڵکو لەحاڵەتێکدا دەگات بەو سنوورەی کە ژیانێکی خیانەت و رۆچووناوی بۆ خۆی دەبینێ کە تێیدا خۆی بە مرۆڤێکی سروشتی، ئازاد و سەرفراز دەژمێرێت. ئەمەش ترسناکترین چەمکی باوە.

کاتێك مرۆڤێك خۆی بەئازاد دابنێ و وەهاش نەبێ و خۆی لەبارێکی وەها هەڵقورتێنێ تا ببێ بە ئامرازێك بۆ هەموو شتێ، ئەوا ئەو کەسە خراپترینیانە. **بەبێ سێ و دوو ئەو شێوە ژیانە لەناو سەرۆکایەتی PKK هەر لەیەکەم قەڵەمبازیدا رەتکرایەوە.**

## راستی کەسایەتی سەرۆکایەتی لەکوردستان

ئەگەر زیاتر لەژێر رۆشنایی ئەو راستیانەی کە لەسەرەوەدا باسمان لێوەکرد، بابەتەکە فراوان بکەین، ئەوا بەئاشکرا بۆمان دەردەکەوێ کە کەسایەتی کورد راستی دوژمنی لەخۆیدا بەرجەستە کردووە. بەو ئاستەی کە دوژمن لەکوردستاندا هەیە، بەرادەیەکی ئەوتۆ بەگێلی و خیانەتکاری و بەراستی دوژمنەوە گرێدراوە، کە سایکۆلۆژیەتی گاران لەخۆیدا بەرجەستە دەکات. بە جۆرێك ناتوانێ ببێتە هیچ، جگە لەکەسایەتیەکی نەفرەت لێکراو و چارەڕەش، هەروەها نابێتە کەسایەتیەکی سەرکردە و خەباتگێڕیش. جا ئایا دەتوانین بەبێ شیکردنەوەی ئەو کەسایەتییە و بەخستنەبەر لێکۆلینەوە و گفتوگۆ و رەخنەی قووڵ، بژین؟

پەندێکی پێشینان هەیە دەڵێ "کەسایەتی فولانی ناتوانێ شارۆچکەیەك بونیاد بنێ، بەڵکو تەنانەت گوندێکیش". بەلام ئەو جۆرە کەسایەتیەی باسمان لێوە کرد، بگرە ناتوانێ کۆشکێکی بچوکیش دروست بکات، زیاتر لەمەش ئەو کەسایەتییە ناتوانێ حەزەکانی رۆژانەی خۆی تێر بکات. جا با هەر یەکێك بیر لە رەوشی خۆی بکاتەوە و خۆی لەکورتە بالایەك کەمتر نەبینێ کە لە ولاتێکدایە خەریکە مێژووەکەی بەپیتی بریسکەدار دەنوسرێتەوە. زۆربەی ئەوانەی خیانەتکارن لەکاتێکدا کە کەمترین رێزیان بۆ خۆیان نییە و وەکو پێویست جوانی ولاتەکەیان نابینن، ئەگەر بشیبینن، ئەوا وەکو پێویست سوودی لێ نابینن. ئایا کەسێك هەیە ئەم پرسیارانەی لەخۆی کردبێت؟ ئایا ژیان لەولاتێکی وەهادا دەچێتەسەر؟ ئایا لەوانەیە رۆژێك ببێتە شتێك؟ و ئەوانەی ئەم پرسیارانە دەکەن لەجیاتی ئەوەی بە ئەرکی سەرشانیان هەڵسن، هەڵدێن. واتە هەموو لەحاڵەتی هەلاتن و گەیشتنن بە ئاستێکی بەرز لە***هەڵندەران*** و بەشێوەکی تایبەتی هەوڵدەدەن بۆ ژیانێك کە لەبۆتەی دوژمندایە. ئەو مرۆڤە کێیە و دەبێ بەچی؟ دەبێ چ ناوێکی لێ بنێین؟ با بیر لەمێژووی ئەو کەسانە بکەینەوە، ئەوانە خۆیان بە سەرکردە دادەنێن و بەئەندازەی پلەو پایەیان، کە لەدامەزراوەکانی دوژمندا وەریان گرتووە. بە واتایەکیتر بەئەندازەی ئەو شوێنەی کە لەژێر سایەی سیستەمی کلکایەتیدا دەستیان کەوتووە، خۆیان بە سەرۆکایەتی پرۆفیسیۆناڵ دەزانن. بیر و باوەڕی باوی ئەوانیش وەك کەشتیوانێکن کە کەشتیەکانیان لەنقوم بوون رزگار کردووە. ئەوان خۆیان بەپیاوی توانا و فەرمی و شەریف و بەرێز دادەنێت، ئەوەش گەورەترین هەڵەیە، لەوەش زیاتر دەبێتە سەرچاوەی گێلی و نەفامی و بەرەو خیانەتکاری و کەوتنی لەمرۆڤایەتی دەبات.

**PKK به واتایەك لە واتاكان بریتییە لە دیتنی ئەو راستیانە و یاخیبوون لە بەرامبەریان.** كەواتە سەرۆكایەتی گەل و ولات لەلای ئێمە، یەكەمجار بە دیتنی ئەو راستیانە دەستپێدەكات. جا بەدیتنی ئەو راستیانەی سەرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە حەقیقەتی ولاتێك و گەلێكی جیاواز هەیە، كە لەم ولاتەدا دەژین. ئەمە هەنگاوێكی سەرەتایە، بەلام ئەم هەنگاوە زۆر گرنگ و پێویستە.

ئێمە لەبەردەم كەسانێكین كە ولاتەكەیان بە تەواوی لەبیركردووە، یان روونتر بلێین كەسانێكن وەلامیان بۆ پرسیاری ئایا دەبێ من ولاتم هەبێ، نییە. تەنانەت ئەو كەسانە پێویستی ئەوەش نابینن كە ئەمجۆرە پرسیارانە لەخۆیان بكەن، هەروەها وەلامیشیان بۆ پرسیاری ئایا دەبێ ئێمە گەلێكی جیابین، نییە. تەنانەت ناشیانەوێ ئەم پرسیارە لەخۆیان بكەن. لەمانە هەمووی خراپتر ئەوەیە كە دەگوترێت:"تا چ رادەیەك من توركم ـ ئێراقیم ـ سوریم ـ ئێرانیم..؟". ئەو راستیەش ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە كەسایەتی خۆمان لەدەستداوە. جا چۆن دەتوانرێ رێگای ژیان بۆ ئەو كەسانە بدۆزرێتەوە كە نكۆلیان لەخۆیان كردووە، بەرادەیەك بۆ بەجەستەكردنی ئەو جۆرە كەسایەتییە لەدامەزراوەكانی دوژمندا كاریان كردووە؟ ئەمەش ناكۆكیەكە كە بەئاشكرا لەمرۆڤی ئێمەدا دەبینرێت. دواتریش دێت لەرێگای ژیان دەگەرێت. ئەمەش گەورەترین خەیالێتی. لەتوانای هەر مرۆڤێكدا هەیە كە تێبینی ئەو جیاوازیە بەرفراوانە بكات لەنێوان داواكارییە تایبەتییەكانی مرۆڤی ئێمە و راستیەكانی ژیانی رۆژانەدا. لێرەوەش گەورەترین تێكچرژاوی دەردەكەوێ، ئا ئەوەیە سەرچاوەی ئەو ناكۆكیە ئاشكرایە كە ئێمە بەگێلی ناوی دەبەین؟ هۆیەكانی ئەم ئالۆزیە نامۆییەی كە لەكەسایەتی كورددا هەیە بۆ ئەو ناكۆكیە دەگەرێتەوە. بەواتایەكی دیكە ئەمە نەك هەر تەنیا ملكەچ كردنە، بەلكو راكردنە لەراستیەكان كە هەموو سنوورەكان دەبەزێنێ. ئەمەش تا رادەیەك ئەوە دەگەیەنێ كە هەتاكو ئەو ترس و تۆقاندن و بێبەشكردنە لە رێگای ژیاندا هەبێ، ئەوا جگە لەچوونە ژێر سایەی سەرۆكایەتی دوژمن نەبێ ـ كە بەم رەوشەی بردین ــ هیچی دیكە ناگەیەنێ. ئەمەش خراپترین كۆیلایەتی هاوچەرخ لەخۆیدا دەنوێنێ، هەروەها ئەمە خۆ هاوێشتنی كۆیلەیە بۆ باوەشی ئاغاكەی. ئەمەش تەنها لەبواری هزریدا نەماوەتەوە، بەلكو كاریگەری لەهۆش و گیان و هزر و دۆزی هەر كەسێكدا دەبێت.

ئەوەی لێرەدایە بەتەنها نامۆبوون و شێواندن و لادان نییە، بەڵکو کۆششکردنە بۆ ئەوەی لەمەلیکێك مەلیکتر بێت. کاتێك لەئەنجامدانی ئەمەشدا شکست دێنێ، ئەوا دەبێتە کەسایەتیەك، کە وەك مینێکی شێتی لێدێت و نازانرێت کەی و چۆن و لەکوێ دەتەقێتەوە؟ لەهەمانکاتدا ئەم هەلومەرجە لەبویەری ئێمەدا دەرکەوتنی نمونەی کەرترین و لاڵترین و کوێرترین کەسایەتی دەنوێنێ. لەبەرئەوەی نمونەی کەسایەتیەکە کە نکۆڵی لەخۆی دەکات و بەمرادەیە خۆی دەخاتە باوەشی دوژمنەوە. هەربۆیە ئەم کەسایەتیە نمونەی کەسایەتیەکی کوێر و بێ ویژدان و شێتە، لەم گۆشە نیگایەوە دەتوانین بگەین بە ناوەرۆکی کەسایەتی تاکەکەسی لەوڵاتی ئێمەدا. لەخودی ئەم ناکۆکیانەشدا گەندەڵی ـ خراپەکاری ـ توانەوە ــ دزی و تالان و هەموو کەموکوڕییەکی دیکە هەڵدەقوڵێ. تەماشا بکەن! ئەگەر بڕەخسا بوایە ئێستا هەموو دەبوون بە دز و جەردە و گێل و نەفام و خزتمەکاری دوژمن. کەوابێ چۆن دەتوانین ئەم جۆرە کەسایەتییە بە کەسایەتیەکی بەرێز لەقەڵەم بدەین؟

لەسەر ئەم بناخەیە ئەگەر بمانەوێ راستی PKK لەخۆوە بگرین، یاخود بخوازین راستی سەرۆکایەتییەکەی لەخۆوە بگرین، ئەوا دەبێ دەرك بەوە بکەین کە بەمشێوەیە لەرووداوەکانی گۆڕەپانی وڵات و پەیوەندیەکان و دیاردەکانی دەڕوانێ. هەروەها بەمشێوەیە دەڕوانێتە هەموو دیاردەکانی کۆمەڵگا. **دیالەکتیکی PKKش کە پێویستە لەخۆماندا بەرجەستە و نوێنەرایەتی بکەین ئەوەیە.** ئەگەر خاڵی دەستپێکردنی بەمشێوەیە بێت، ئەوا زۆر سروشتییە کە لەچارەسەرکردنی ئەم نەخۆشیانەدا سەرکەوێت و بە تێپەڕبوونی کات رێچکەی کۆمەڵگاش راستبکاتەوە. بەواتا لەبەربەستکردنی ژیان و دژ بە نکۆڵیکردن و سنوور دانان بۆ گێلی و بێ ئاگایی سەردەکەوێ.

جەختکردن لەسەرئەوەی کە لەتوانادا هەیە ئەم وڵاتە ببێتە وڵاتی ئێمە و گەلیش ببێتە گەلی ئێمە، هەروەها جەخت کردن لەسەر بەرهەمهێنانی بیر و سیاسەتێك، ئەگەر بکرێ رێڕەوێکی سیاسی بۆ ئەم مەبەستە دیاری بکرێ و لەبواری رێکخستنیشدا هەوڵی لەپێناودا بدرێت. ئەمانە هەموو تایبەتمەندی سەرۆکایەتی PKK و چۆنێتی پەرەسەندنی بوون لەقۆناخی ئایدیۆلۆژی، کە ناوی دەبەین بە کرۆکی رێکخستن و شێوە سەرەتاییەکەی.

## PKK دەرکەوتنێکی سەرۆکایەتیە لەکوردستان

دەرکەوتنی سەرۆکایەتی لە PKKدا دەرکەوتنێکی جیاواز و دیارە، بەو مانایە دەرکەوتنێکی نوێ و مێژووییە، هەر بەر ئەمەشە کە هەلی پەرەسەندنی خۆی بەدیدێنێ، چونکە لەبەرامبەر بویەرێکی بەستەڵەك و بەتەواوەتی داخراودا، هەلی ژیان دەخولقێنێ. هەروەها توانای سەرلەنوێ دامەزراندنی وڵاتێکی لەبیرکراوی لە قوڵایی مێژوودا دێنێتە کایەوە. هەتا ژیانیش بۆ گەلی ئەم وڵاتە دەڕەخسێنێ. سەرۆکایەتی لە PKKدا دەرکەوتنێکی هزریە و هەر لەم پێناوەشدا دەست دەکات بە چالاکیەکانی پڕوپاگەندە بۆ ئەوەی بگۆڕدێت بۆ رەوتێکی کرداری و چەمکێکی ئاشکرا. هەر لەسەرەتاوە مەزنایەتی PKK لەم خاڵەدا بەرجەستە بووە. هەر ئەمەش بۆتە هۆی تێگەیشتنی لەگروپە سەرەتاییەکانمان لەکاتی دروستبوونیاندا.

قۆناخی سازکردنی گروپی یەکەم، مانای دورستبوونی ناوك یان چاندنی تۆوی یەکەم دەبەخشێ، ئەوەش مانای خۆ ئامادەکردنە بۆ پێکهێنانی بڵندترین ئاست. لەو قۆناخەدا چالاکیەکانی هزری ئایدیۆلۆژی و شێوازێکی خەبات باڵادەست دەبێ کە دەستە و گروپی بچوك پێی هەڵدەستن، کەچی شێوازی سیاسی و سەربازی تا رادەیەك لەخۆوە دەگرێ، بەڵام بەسیاسی بوون و پێگەیشتنی سەرۆکایەتی ئەم گروپە بچوکانە لەقۆناخەکانی دواییدا دێتە ئاراوە. پێکهێنانی گروپی سیاسی و سەرۆکایەتی سیاسی چی دەگەیەنێ؟

بەسیاسی بوونی دەستە و گروپێك بەرپەرچدانەوەی سیاسی باری دوژمن و پاشان سیاسەتی دەوڵەت هەروەها بەرپەرچدانەوەی کلکایەتی و گێلی و نەفامی و سایکۆلۆژییەتی گاڕان دەگەینێت.

ئەم سروشتی بەرەنگاربوونەوەیە هەر لەسەرەتاوە لەسەرۆکایەتی PKKدا هەیە، ئەو دیاردە سیاسیەی کە لەکۆتایی حەفتاکاندا پەرەی سەند و لەگەڵێك بۆنەدا باس و

لێدوانمان لەسەر کرد، پەرەسەندنی هەمان ئایدیۆلۆژییە کە لەسەرەتای حەفتاکانەوە دەرکەوت و گەشەی کرد. بێگومان پێشبینی لەوە نەدەکرا کە گرووپی ئایدیۆلۆژی هەر لەسەرەتای دروستبوونیەوە دووچاری فشاری دەوڵەت ببێت، چونکە هێشتا ئەوەندە پەرەینەسەندبوو کە پێویست بەوە بکات زۆر و کوتەك بەرامبەری بەکاربهێنرێت، بەڵام هەر لەسەرەتاوە هێرشی هزری هەبوون، لەو کاتەدا ئەوانەمان بە سۆسیالیزمی شۆڤێنی و میللیگەرای سەرەتایی ناودەبرد، بەواتا شەڕ تەنیا لەبواری ئایدیۆلۆژی سنووربەند کرابوو. بەڵام قۆناخی سیاسی ( کە لەدوای قۆناخی ئایدیۆلۆژی دێ ) مانای بەرپەرچدانەوەی راستەوخۆی دەوڵەت و هاوکارانی دەگەیەنێت، دواتریش رۆڵی زۆر و کوتەك دەستپێدەکات. دوابەدوای ئەم هەنگاوەش پارتی بەفەرمی ڕاگەیەنرا، ئەمەش مانای گەیشتن بە شێوازێکی رێکخراوەیی ئاست بڵندتر دەگەیەنێت.

بەم شێوەیە کۆچکردن بۆ دەرەوەی وڵات گەلێك واتای مەزن لەخۆوە دەگرێت. مادام سەرۆکایەتی سیاسی نایەوێت رووبەڕووی لەنێوچوون ببێت ئەوا هیچ رێگایەکی دیکەی لەبەردەمدا نەماوە جگە لەکۆچکردن نەبێ بۆ دەرەوەی وڵات. هەروەك چۆن لەهەموو شۆڕشە گەورە و بچووکەکانی جیهانیشدا ئەمە روویداوە، بۆ نموونە ـــ سەرۆکایەتی شۆڕشی فەرەنسی پەنای بۆ ئینگلتەرا برد و، سەرۆکایەتی شۆڕشی بەلشەفی پەنای بۆ ئەوروپا، شۆڕشی ئیسلامیش پەنای بۆ مەدینەی منەوەرە برد. ئەم کۆچکردنە لەهەمانکاتدا مانای ئامادەکاری و پێشخستنی لایەنی سەربازیش دەگەیەنێت. چونکە ئەگەر لەجێگایەکدا زۆر و کوتەکی کۆنەپەرستی بەرفراوان پەیڕەو بکرێت، ئەو کاتە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم رەوشە پێویستە پەنا بۆ زۆر و کوتەکی شۆڕشگێڕی ببردرێت. هەرئەمەش بوو کە ئێمە لەدوای سالانی هەشتاکان هەڵساین بە پێشخستنی لەناو PKKدا.

لێرەدا سەرنجتان بۆ ئەوە رادەکێشین کە زێدە ناچینە نێو قووڵایی مێژووەوە، چونکە پێشتر ئەمانەمان لەبابەتەکانی دیکەدا باسکردووە. بەڵکو لێرەدا هەوڵدەدەین کە چۆنێتی چارەسەری پێکهاتەیەکی نوێ لەڕووی سەرۆکایەتییەوە و ئاشکراکردنی لایەنەکانی تیۆری و فەلسەفی و بگرە ئەخلاقیش روون دەکەینەوە، چونکە ئەمە بەتەواوەتی رەوشێکی جیاوازە. سەرۆکایەتی پێکهاتەیەکی لەهەموو پێودانگە باوەکان و ئەوەی کە گەل و ئەوەی کە دوژمن دان بە شەرعیەتیدا دەنێت جیاوازە، بەواتایەك

لەواتـەکان ناچـارە کـە بەمشـێوەیە بێـت و خـۆی هەڵبسـتێت بـەپێکهێنان و بـەدیهێنانی شەرعیەت بۆ خۆی.

شتێکی دیکەش هەیە کە لەم ساڵانەدا جێبەجێیکرا و شایانی ئاماژە پێکردنـە، کـە تیایدا ئەو هەڵوێستانە دەرکەوتن و مامەڵەیان لەگەڵ سیاسەت و ئایـدیۆلۆژی و تەنانـەت لەگەڵ خەباتی چەکداریشدا دەکرد. ئەمەش بەس نییە، لەساڵی 1985 بەرێژەیەکی زۆر داخـراوی دەرکـەوتن، هـەروەها لەسـاڵانی دیکەشـدا ئـەم داخراویـە (انغلاقـات) دەبینـرێ. هـۆی سـەرەکی ئەمـەش گیروگرفتـەکانی گەشـەکردنە، کـە کادیرەکـان بـە دەسـتیەوە دەیانناڵاند، چونکە هەرقۆناخێك تایبەتمەنـدێتی و گیروگـرفتی تایبـەت بـەخۆی هەیـە. سـاڵی یەکـەم ـــ 15یـەمین ـــ سـاڵی 20م هەریـەك لـەم سـاڵانەدا خـاوەنی گیروگرفـت و تایبەتمەنـدی خۆیـەتی. ئـەم کـارەش ڕەنگدانـەوەی ئاسـتی کۆمەڵایـەتی کـۆنی کەسانێکە لەناو پارتیدا، هەرچـەندە ریزەکـانی پـارتی فـراوانتربێ ئەوەنـدەش زیـاتر تایبەتمەنـدی کۆیلایەتی و بەکرێگیراوێتی و کۆلۆنیالیزمی زیاتر دزە دەکاتە نێو ریزەکانی پـارتی. ئـەم راستیانەش زیاتر دەرکەوتن، هەرچەندە پێشەنگایەتی پێشبکەوێ و سەرۆکایەتی PKK جێگیربێ. هەرچەندە شوێنەواری نامۆیە و دوژمنکاریـەکان بگوازرێنـەوە نێـو رێزەکـانی پارتی، بەو رادەیەش رەنگدانـەوەی کاریگەریـەکانی کۆیلایـەتی و گێلـی و خیانـەت زیـاتر دەبن. ئەگەر تێکۆشـەرە بـەتواناکان و سـەرکردە وشـیارەکان وەکـو پێویسـت وەڵامـی ئـەو کاریگەریـە نەدەنـەوە، ئـەوا ئـەو خراپەکارییـەی لـەنێو ریزەکـانی پـارتی بڵاودەبێتـەوە، تارادەیـەك لەهەشـتاکان و نەوەتەکانـدا ئـەو شـتەمان رووبـەڕوو بـۆوە، هـەروەها ئەمـە تووشی شۆڕشەکانی دیکەش هاتووە. بـۆ نمونـە بـا تەماشـای شۆڕشـی روسـیا بکـەین، ئـەو دیاردەیەی تیایدا دەرکەوت لەکاتێکدا کە لەدەروازەی سەرکەوتندا بوو، بەڵام سەبارەت بە شۆڕشی فەرەنسا ئەوا لەدوای سـاڵانی نەوەتەکانـدا ئـەم رەوشـە بـەهۆی بـوونی سـەرکردە گەورەکان ژیانی دەکرد، دەتوانین ئەمەش ناوی لێبنێین بـەرەو راسـتڕەوی چـوون یـاخود، گۆڕانی بۆرجوازیەت بۆ دۆخێکی کۆنەپەرستانە. بەڵام لەشۆڕشی ئیسلامدا، ئـەم بویـەرە دەرکەوت و بەرەو گەڕانەوە بۆ دواوە دەستیپێکرد کـە هێشـتا تـەرمی پـیرۆزی پێغەمبـەر بەخاك نەسپێردرابوو.

بەکورتی لەوانەیە هەموو شۆڕشێك کاتێ دەگاتە لوتکە دووچاری هەوڵی راکێشانی بەرەو راستڕەوی ببێ. بەڵام رەوشی لای ئێمە هەندێك جیاوازە. نەك دوای بەدەست هێنانی سەرکەوتن، بەڵکو گەلێك پێش سەرکەوتن، بگرە هەتا لەو کاتانەی کە گروپە سەرەتاییەکانی پارتی ئاوا دەبوون رووبەڕووی گەلێك تەقەلای لەمجۆرە بووینەوە کە دەیانویست بەرەو راستڕەویمان ببەن. چونکە ئەو زەمینەیەی کە پشتی پێدەبەستڕێ زەمینەیەکی یەکجار لاوازە و زۆر بەتووندی بەرەو دوژمن هەڵپە دەکات. لێرەدا پێویستیی هەمەلایەنی هەیە کە دەبێ لەسەرۆکایەتیدا بەرجەستە بن، هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو کە بە پێویستمان زانی ئەو هەموو شیکرنەوە و لێکۆڵینەوانە بنوسین.

## ئەو گیروگرفتانەی دەبنە ئاستەنگ لەبەردەم نوێنەرایەتی کردنی سەرۆکایەتی

ئێمە بەردەوامین لەگرنگی پێدان بەشیکرنەوەکانمان دەرهەق بە خەباتکاری شۆڕگێر، ئەمە یەکێکە لەتایبەتمەندییە جیاکەرەوەکانی سەرۆکایەتی PKK، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لێرە کەسی وا هەیە رێگا بەخۆی دەدات لەناو ریزەکانی سوپا و پارتی لەسەر ئاستە جیاجیاکانی گەمە بکات. سەرەڕای هەموو ئەو توانا و بارانەی رەخسێنراوان دەکەوتە واری دژایەتی پێودانگەکانی پارتی. بەڕای ئێمە پێویستە لەناو ئەو راستییە مێژوویی و کۆمەڵاتی و نەتەوەییەدا لەهۆیە سەرەکیەکانی ئەم دیاردەیە بکۆڵینەوە.

بەڵام ئەمە تەنها بەس نییە بەڵکو لێرەدا چەندەها هۆی دیکە هەنە پەیوەستن بە لایەنەکانی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و رێکخستنی، هەروەها هۆکارێکی دیکەی کاریگەر کە بریتیە لەو لاوازیەی کە دووچاری کۆمەڵەکانی نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی هاتووە.

تەنانەت ئەوانەی لەڕووی ئایدیۆلۆژی و سیاسی بەتوانان دیسان کەموکوڕییان هەیە لەبەرجەستەکردن و نوێنەرایەتیکردنی سەرۆکایەتی. تا ئێستاش گەلێك هەڤاڵی ئێمە هەن کە ئامادەی تەواوی خۆیان بۆ شەڕی پارتیزانی نیشان دەدەن، هەروەها ئەتوانن چەك بەشێوەیەکی باش بەکاربهێنن و بێ سنوور ئازا و قارەمان و گیان لەسەردەستن و هەموو شتێکیش لەپێناو پارتیدا بەخت دەکەن. بەڵام شێوازی

بــەختكردنیان گرفتێكــی جددییــە لەجێبــەجێكردنی پێداویســتیەكانی ئــەم هونــەرە. بێگومان ئەوە تایبەتمەندیەكە كە دەتوانرێت لێی تێبگەین، چونكە ئێمە خاوەن داب و نــەریتێكی دەوڵەمەنــدین، دامــەزراوی رەســەن و كــۆن و هــەروەها خــاوەنی مامۆســتا و وانەبێژی بەتوانانین و، دواتر هەڤاڵانمان هەرچۆنێك رێكبكەوێت و، بەتێگەیشتنە گشتی و رووكەشــەكان، هەڵدەســتن بــە جێبــەجێكردنی ئــەم هونــەرە. ئەمــە لەكاتێكــدا كــە جێبــەجێكردنی ئــەم هونــەرە پێوســتی بــە وردەكــاری هەیــە، زیــاتر لــەوردەكاری نەشــتەرگەرێك، چــونكە دكتــۆرێكی نەشــتەرگەر گرنگــی بــە نەخۆشــییەك یــان چــەند نەخۆشییەك دەدات، بەڵام سەركردە و خــەباتگێران گرنگــی بــەكاروباری ملیۆنــەها مــرۆڤ دەدەن و هــەر یــەكێك لەوانــە بــە پزیشــكی ملیۆنــەها دادەنــرێ، لەبــەر ئــەوەش داوای بەرجەستەكردنی هەستیاریەكی زیاتری لێدەكرێت. گومان لەوەدا نییە كە ئاستەنگیەكان بەخێرایی لەزیادبووندان و تائێشتاش كاریگەری كۆیلایــەتی و گێلــی و خیانــەتكاری هــەر بەدەوامە، هەروەها چەندەی دوژمن توندوتیژی شــەڕی تایبــەتی بەرزبكاتــەوە و تــەركیز لەسەر ســەپاندنی بــەكرێگیراوێتی بكات، لەســەر ئــەو تایبەتمەندیانــە، ئەوەنــدەش زیــاتر ئاســتەنگیەكان زێــدە دەبــن. ئەمانــە كورتــەی ئــەو شــتانەن كــە لــەناو PKK دەكــرێ. هــەروەها ئەمانــە وەهمــەكانی هەڵســوكەوت كردنــی لەگــەڵ شــێوازی ســەرۆكایەتی و هەڵوێستە هەڵەكانن. سەرۆكایەتی PKK كەم تا زۆر وتووێــژی لەســەر هــەموو ئەمانــە كردووە و بەردەوامیشە و زۆر بەوردی ئەمانــەی روونكردۆتــەوە كــە هەڵوێســتە هەڵــەكان بەرامبەر سەرۆكایەتی، خەباتگێڕ كێیە؟ تایبەتمەندی و ئەركەكانی چین؟ گەریلا كێیــە؟ و ســەركردەی گــەریلا كێیــە؟ بەمــەش هەوڵــدراوە كــە وەڵامــی هــەموو ئــەو ئاســتەنگیانە بدرێتــەوە. بێگومــان تائێســتا جــۆرە پێشــكەوتنێ لەســەرۆكایەتیدا هاتۆتــەدی و هێڵــی ئایدیۆلۆژی و سیاسی بە تەواوەتی باڵادەستە، لەسەر ئاستی پــارتی و جەماوەریشــدا. بــەم مانەیــە ئــەتوانین بڵــێین كــە رێكخســتنی پێشــەنگ بــە كــرداری هەیــە، بــەڵام ســەبارەت بەخـــەباتگێر و كۆمیتـــەی ناوەنـــدی كارەكـــە جیـــاوازە، وەك ســـەرێكی بچـــوك وان لەجەستەیەكی مەزندا، واتــا بــەڕادەی گەشــەكردنی جەســتە، مێشــك گەشــەناكات. یــاخود دەتوانین بڵێین لەو كاتەی كە جەستە گەشەدەكات و مێشك بە رۆڵی خۆی هەڵناستێت و لەپتەوكردنی ئێسقانەكان، ئــەوا ئەوكاتــە بڕبــڕەی پشــت و پەراسوەكانیش بەشێوەیەكی

ساختە گەشە دەکەن، واتە پەراسوی ساختە ئێسقانی راستەقینە نین. ناتوانین نکۆڵی لەوە بکەین کە جەستە بەشێوەکی ناهاوسەنگ گەشەدەکات و هەروەها ئەم پێناسەیەش بە پێناسەیەکی گشتی دەمینێتەوە. لەبەرئەمە پێویستە لەسەرمان بەشێوەیەکی قووڵتر ئەمە شیبکەینەوە. سەرۆکایەتی PKK پشتی بە شێوازێك بەستووە کە هەر لەسەرەتاوە دڵنیا بووە لەڕاستی و دورستی ئەم شێوازە هەر بۆیە پێمان باشە ئاماژە بەم شێوازە بکەین زمان بەڵکو یارمەتیمان بدات لەتێگەیشتنی سەرۆکایەتی بەشێوەکی باشتر، ئەگەرنا، لێکۆلینەوەی مێژوو و مێژووی پارتەکان بە گشتی و مێژووی بزاڤە رزگاریخوازەکان بەتایبەتی و تەنانەت مێژوویPKKش بەتەنها بەس نییە بۆ دابین کردنی سەرکەوتوویی. لەم حاڵەتەدا پێویستە لەسەر ژیان و شێوازی ئەو خەباتگێرانە بکۆڵینەوە کە سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە، بۆ ئاوەلاکردن و ئاشکراکردنی لایەنە پۆزەتیفە چاکەکانیان، ئەمەش سوودێکی زۆر دەگەیەنێتە ئەو کەسانەی کە ئەیانەوێت فێرببن، بەواتایەکی دیکە لەسەر خەباتگێرەکانمان پێویستە کە لەشێوازەکانی ئێمە و ئەوانی دیکەی سەرکەوتوو بکۆلنەوە، نمونەکانیش لەچوارچێوەی پێغەمبەران عیسا و موسا سنووربەند ناکەین، بەڵکو پێویستە لەسەر هەموویان بکۆڵنەوە. عیسا، موسا، محەمەد، ئەسکەندەر، تزار، ناپلیۆن، لینین، ماو، هیتلەر و مۆسۆلینی، لەشێوازی هەریەك لەم پێغەمبەر و سەرۆکانە واتا و پەندی زۆریان لەسەر سەرۆکایەتی تێدایە و پێویستە فێریان ببن.

واتە پێویستە کەسایەتی سەرۆکایەتی شیبکرێتەوە بۆ مەبەستی فێربوون، هەروەها ئەمەش بەتەنیا بەس نییە، چونکە ئەوانەی تەنها لەم نمونانەیان کۆڵیەوە سەرکەوتوو نەبوون لەشیکردنەوەی هەموو شتێك و، تەنیا بە لێکۆڵینەوەی مێژوو بەبێ لێکۆڵینەوەی PKK و سەرۆکایەتی PKK و ئەو جەنگەی کە PKK پیادەی دەکات، کارەکە ئالۆزتر دەکات بە رادەیەك هەندێ جار ناتوانرێ لێی دەربچیت.

لەسەر ئەم بناخەیە لێکۆڵینەوە و وردبوونەوە لەشێوازی سەرۆکایەتی PKK هەلێکی مەزن دەداتە مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی ئەنجام. لەچۆنیەتی بەڕێوەبردنی کارەکانمان بکۆڵنەوە، ئەمەش بەتەنها بەس نییە، بەڵکو بەچاکی لەخۆوەی بگرن.

ئێوە هاتوونەتە ناو ریزەکانی پارتی و ژیانی خۆتان لەپێناویدا داناوە، بەلام لەبنگەیەکی کۆمەلایەتی زۆر دواکەوتوو هاتوون، لەگەڵ خۆتان تایبەتمەندی خێڵەکی

سەرەتایتان هێناوە، هەروەها گێلی و کۆیلایەتی و تێکڕا کاریگەریە نامۆیەکانتان هێناوە، لەبەرامبەر ئەمەشدا شێوازێکی ئێمە هەیە بەتەواوەتی دژی ئەوەیە!

ئەو ناکۆکیەی کە لەنێوان سەرۆکایەتی PKK و کادیرەکانیدا هەیە لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. کادیرەکان وێڕای ئەو خواستەکەی بەپەلە و هەوڵە بەردەوامانەی کە لەم پێناوەدا خەرجی دەکەن دیسان وەکو پێویست سەرناکەون لەرامالینی ئەو ناکۆکیانەدا. بۆچی؟

لەوانەیە لەبەرئەوە بێت کە کادیر هەندێك تێڕوانینی خۆی بۆ سەرۆکایەتی و بۆ دوژمن تێکەڵ بەیەك دەکات یان بەهۆی داب و نەریتەکانی ژیانی خۆی شتەکانی لێ تێکەڵ و پێکەڵ دەبێت و وەك سەرۆك عەشیرەتێك یان ئاغا یان سەرۆك جەندرمە یان وەك دەسەڵاتێکی سەپێنراو بەسەریاندا تەماشای سەۆکایەتی دەکات. یاخود لەژێر کاریگەری کولتوورێکی بەمشێوەیە لەسەرۆکایەتی دەڕوانێت.

لەبەر ئەوە ئەوشیکردنەوانەی کە سەرۆکایەتی ئێمە دەیانکات زەبرێکی کوشندە دەگەیەنێتە هەموو ئەوجۆرە شتانە. لەبەر ئەم هۆیەشە ئەوانە سەریان سووڕدەمینێ و خۆیان دەهێنن و دەبەن و دەڵێن نەخێر ئاوا نییە. لێرەدا تەنگژەکان دەست دەکەن بە چوونە ناو هەبوونیانەوە و بێ توانایی بەسەریاندا زاڵ دەبێت. وەك ئاشکرایە لەئەنجامیشدا ئەوانە دەکەونە نێو ئەو هەڵانەوە کە مێشك پەسندیان ناکات.

لێرەدا دووبارەی دەکەینەوە و دەڵێین: باش لێکۆلینەوە لەسەر شێوازی سەرۆکایەتی بکەن ئەمە لەپێناوی خۆتانە نەك لەپێناوی ئەو، سەرۆکایەتی خاوەنی شێوازی خۆیەتی کە خۆی بوونیادی ناوە و بەردەوامیش پەرەی پێدەدات لەتوانای کەسیشدا نییە لەبەرامبەری رابوەستێت.

کەسایەتی سەرۆکایەتی بریتیە لەهەموو شتێك و هەر ئەو کەسایەتیەیە کە تەگبیری پێویست لەبواری ئایدیۆلۆژی و سیاسی وەردەگرێ بەتایبەتی دژی دوژمنە دەرەکی و ناوەکیەکان، سەرۆکایەتی PKK بەو ئاستە یان ئاستێکیتر بەمجۆرە تەگبیرانە هەڵساوە بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئەو دوژمنانەی کە هەر لەسەرەتاوە بەم سەرۆکایەتیەیان دەگوت:"کوردستانت لەکوێ بۆ هانین، کورد و PKKت لەکوێ هێناوە

و، ئەو شەڕەت لەکوێ هێنا.؟ پارچە پارچەت دەکەین تا دەگەڕێیتەوە هۆشی خۆت".
بەڵێ ئەمەیە دروشمی دوژمن.

بێگومان ئەوەی هەنگاو و دەرکەوتنی یەکەم ئەنجام بدات و بوێر و چاونەترسیشە بۆ هەموو بەرپەرچ دانەوەیەك و، دەرك بەوە دەکات کەچی بەسەر دێ و بەگوێرەی ئەمەش تەگبیری خۆی وەردەگرێ، بەڵام ئەوەی دوژمنی خۆی باش نەناسێ و، هەر لەرۆژی یەکەمەوە دەخنکێ. با بگەڕێینەوە مێژووی نزیکمان و سەرهەڵدانی شێخ سەعید بۆ نمونە وەربگرین و هەر لەهەفتەی یەکەمەوە سەرکردەکان لێیان تێکچوو نەیانزانی چی بکەن، هەوڵیان دەدا شتێك ئەنجامبدەن، بەڵام دوژمن مۆڵەتی نەدان و دوژمنی هۆڤ هەموو جۆرە تیرۆر و تۆقاندنێکی بەکارهێنا، بۆ توند و تۆڵ کردنی کۆنترۆڵی خۆی و، ئەوەی تریش هەڵدەخەڵەتێنێ و هەڵدەسێ بە خەڵەتاندنی سەید رەزا، وەك چۆن منالێك هەڵبخەڵەتێ، ئەمەچەند جارێك دووپات دەکاتەوە، جارێك ئەوە هەڵدەخەڵەتێنێ جارێکیتر ئەوەی دیکە تا بەم شێوەیە بتوانێ بەردەوام بێت هەتا رۆژگاری ئەمڕۆمان.

بەڵام مەسەلەکە لەگەڵ PKK بەتەواوی جیایە لەم بارەیەوە دۆغو پەرینچەك و سلێمان دەمیرەل دەڵێن:"PKK هیچ هەر رۆژێك لەرۆژان وەکو ئێستا کە تێیدایە بەهێز نەبووە"، ئەمە راستە! ئەی بۆچی سەرمان لێ نەشێوا و لەکارەکانمان دۆش دانەماین؟ ئاشکراشە کە ئێمە خاوەنی سوپایەکی سەد هەزاری نەبووین، نەك تەنها ئەوە بەڵکو کاتێك دەستمان بەخەباتیش کرد قەرزدار بووین، دەستمان کرد بە پرۆسەی کرداری بەوپەڕی ئازایەتی. گرنگ لێرەدا ئەوەیە کە بەشێوەیەکی ڕاست لەرۆڵی سەرۆکایەتی بگەین، هیچ شتێکمان لەلایەن خواوە بۆ نەهاتۆتە خوارەوە، شتی وەها هەر روویندەداوە. وێڕای ئەمەش مرۆڤی کورد بە نەشونمایەکی تایبەتی گەشەی کردووە، گەشەکردنێکی زۆر خراپ، گەشەکردنێك کە دوورە لەسەرپەرشتی و چاودێری خێزان و دەورووبەری کۆمەڵ و دامەزراوە کۆمەڵاتەتیەکان. لێرەدا ئازایەتیەك هەیە ئەویش لەوێوە سەرچاوە دەگرێ. لەو باوەڕەشدان کە هەندێك دامەزراو هەیە سەرۆکایەتی پشتی پێدەبەستێ، کە ئەویش پشت بەئەمە یاخود ئەو، پشت بە خودا دەبەستێت. بێگومان ئەو تێگەیشتنە هەر لەسەرەتاوە تێگەیشتنێکی هەڵەیە لەسەرۆکایەتی، لەوانەیە هەندێك بپرسن و بڵێن: ئەمە چۆن دەبێ؟ سەرۆکایەتی ئەمەی روونکردۆتەوە لە شیکردنەوەکانیدا کە پێویست

نەبوو روونی بکاتەوە، سەرۆکایەتی تواناکاری پێشخستنی لەکەش و هەوایەکی نائومێدی و داماوی و لاوازی کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتیدا ئاشکرا کردوو و دەریخستە روو.

هەروەها جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە مرۆڤی کورد هەتا مۆخی ئێسقانی لەبوویەرێکی ئیفلاس و لێکهەڵوەشاودا دەژی، ئەوەی هیچ هیوایەکی نەبێ ناتوانێ بیر لەوە بکاتەوە: پێوستە لەسەر چی و چۆن متمانە بکات؟ هەلومەرجەکەش ئەو کاتە مژدەهێنەر نەبوو بۆ گەشەکردن و جیاکردنەوەی پەیوەندییەکان.

سەرۆکایەتی لەشیکردنەوەکانی پێشوودا باسی لەمە کردووە کە لەسەر خەڵکی ژێر ئەوەندە هەیە پەند و وانەی لێ وەربگرێ، لەوەدا چەندەها گرنگی پێدان هەیە، دیارە سەرۆکایەتی زۆرجار ئاماژەی بۆ کردووە، بەڵام ئەو گرنگ پێدانانەی چین؟ کە لەگوندەکان باوە بێجگە گرنگ پێدانە ساکار و سادەکان نەبێ، بە بەرفراوانی شیکردۆتەوە و پێویست ناکات جارێکی دیکە بۆی بگەڕێتەوە.

گرنگی مەسەلەکە ئەوەیە سروشتی کەسایەتی خەباتگێڕ بزانین کە دەتوانرێ بەهۆیەوە هەنگاوی دەرکەوتنی سەرۆکایەتی ئەنجام بدرێت و هەروەها جیاوازەیەکانی ئەو کەسایەتیە لەگەڵ سەرجەم کەسایەتیەکانی دیکە بزانرێ. بە واتایەکیتر پێویستە ئەو چۆنایەتیەی کە سەرۆکلیەتی PKK پێی هەڵسا لەدروستکردنی گروپی یەکەم تێبگەین و هەرسی بکەین و لەکاتێکدا کە هەر کەس خەریکی ژیانی خۆی بوو لەنێو کۆمەڵێك لە برادەر و ناسیاو و هەتا مۆخی ئێسقانیان لەکۆمەڵگای مرۆڤایەتی سەرەتایی یان خێزان یا تیرەگەری یا خێڵەکیدا دەژیان. هەروەها پێویستە چۆنایەتی بیرکردنەوەی ئەو تاکە کەسەش بزانین لەدروستکردنی گروپی یەکەم، ئەو مەسەلەیە کە پێویستە لەسەریان بوەستین، کاریگەرییەکانی دەوروبەری چی بووە و کاریگەری تاکە کەس چیبوو؟ لەهەموو ئەمانەش گرنگتر دەرفەتی سەرکەوتن چیبوو؟

بەئاشکرا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەگەر مرۆڤ ژیر نەبێ لەوانەیە بەسەر بڕین باجەکەی بدات، ئایا ئەمە شێت بوو؟ یان ئەو پەیوەستبوونێکی پتەو بوو بە پرەنسیپە باڵاکان تاپلەی پیرۆزی؟ ئەمەش شایەنی توێژینەوە و لێکۆلینەوەیە. ئایا پێویستی لەڕادەبەر لەوە هەبوو؟ ئایا پێویستیەك هەبوو پرەنسیپێکی دیاریکراو بسەپێنێ؟ یاخود ئەمە نەخۆشیەك بوو دووچاری قۆناخی چەپەر هاتبوو؟ پێویستە لەکاریگەری هەموو

ئەوانە بکۆڵینەوە لەسەر ئەو دەرکەوتنەی کە سەرۆکایەتی PKK بەدەستی هێنا. دواتر ئایا ئەمە لێزانینێکی تاکتیکی بوو؟ بەمانایەکی تر ئایا کەش و هەوا ئەو هەلەی رەخساند و مرۆڤی هاندا بۆ پیادە کردنی؟ لەوانەیە هەموو ئەو فاکتەرانە رۆڵی خۆیان بگێڕن لەپێکهاتنی یەکەم دەرکەوتنی سەرۆکایەتی، ئەمانە هەموو چۆن جێبەجێکران؟ بێگومان روونکردنەوەی ئەمە بەدوور و درێژی مەحاڵە. لایەنە راستەکان چی بوون؟ و تواناکاری هزری چی بوو؟ توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی دەوروبەری ئەوکات و هەلودەرفەت و تواناکاری لەو پەڕی گرنگی دایە، سەبارەت بە خەباتگێڕان. بە واتا و دەرکەوتنێکی شێواو و رەمەکی نەبوو وەك وابوۆی دەچن، بەڵکو دەرکەوتنێك بوو و خاوەن تایبەتمەندی خۆی بوو، سەرۆکایەتی PKK هەڵەی گونجاوی دیبێ یاخود پرەنسیپەکانی دیبێت، یا لەوانەیە بە راکێشانێك راکێشێنرابێت، رەنگە کەوتن و بێ ئومێدی و ماندووبوونی دیبێ وەك بەدکارێك لەبەرامبەریان دەرکەوتبێ، یان لەوانەیە داخوازی بەدەستهێنانی پێشکەوتنی زیاتری هەبووبێ، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەش دیسان لەسەر خەباتگێڕە ژیرەکان پێوەستدەکات هەڵسن بە توێژینەوە و لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی ئەو دەرکەوتنەی سەرۆکایەتی PKK لەهەموو لایەکەوە لەبەرئەوەی گەلێك وانە و ئەزموونی بەنرخی تێدایە، سەرەڕای ئەوەی کە دوژمنیش زۆر بە بەفراوانی بەم کارە هەڵدەستێت، بەڵام تائێستا سەرکەتوو نەبووە لەناسینی راستی سەرۆکایەتی PKK.

لەسەرەنجامدا وەها دەردەکەوێ هەڤاڵان تا ئەوپەڕی رووکەشانە و شێواوانە هەڵسوکەوت دەکەن لەگەڵ دەرکەوتن و پەرەسەندنەکان، کە دواتر سەرۆکایەتی بەوپەڕی ووردی و ئاگاداری ئەنجامی داون، ئا لێرەدا کارەسات دەستپێدەکات. هەر هەڤاڵێك بەهەر جۆرە دەرکەوتنێ هەڵسابێ لەبەرچاو هەنگاوە بنچینەییەکانی کارەکانی یاخود بێ تێکەڵاوبوون لەگەڵیداو، ئێمەش بەوپەڕی توانامانەوە تێدەکۆشین تاکو رێگا لەم کارەساتە بگری.

## هۆیەکانی ناهاوسەنطی لەنێوان کادیر و سەرۆکایەتی

هەروەك لەسەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد، هیچ شتێك لەخۆیەوە پەیدا نەبووە، نە ئەو هەنگاوانەی کە ناومانە و نە ئەو قۆناخانەی کە بڕیومانە، بەڵکو تەنانەت هەناسەدانیشمان کارێکی وا ئاسان نەبوو، هەروەك هەندێك کەس لەو باوەڕەدان. لەبەرامبەر ئەمەشدا هەریەك لەئێوە بەجۆرێك و بەشێوەیەك هاتۆتە ناو ریزەکانی

شۆڕشەوە لەبەرئەوە لەسەر هەموو هەڤالان پێویستە کە هەریەك بەدوای سەرچاوەی تەڤلیبوونی خۆیدا بگەڕێت. هەریەکێکتان بۆ ئازایەتی خاوەنی بۆچوون و تێگەیشتنی تایبەتی خۆیەتی. بۆ ئازایەتی فیداکاری، هەروەها هەریەك لەئێوە خاوەن ئاستێکی جیاوازە لەهۆشیاری و گرنگی پێدان و هێزدا. بەڵام پێویستە هەموو ئەوە بزانن کاتێك ئێوە هاتن هێزێکی ئامادە و شێوە ژیانێکی ئامادە هەبوو، ئەم هۆکارانەش کەم یان زۆر رۆڵێکی کاریگەریان هەبووە لەسەر تەڤلیبوونی ئێوە. بەڵام تەماشای هەلومەرجی سەرۆکایەتی و چۆنیەتی دەستپێکردنی بکەن.

هەروەك ئاشکرایە لەهەلومەرجێکی بەتەواوی جیاواز و دژواردا و بە ئیمکانێك کە بەنەبوو دادەنرێ و لەناو کەموکوڕیەکی بێ سنووردا دەستپێکرد، وەك کەسێك وابوو کە زۆر بەوردی کاری رستن و چنین بکات. یاخود وەکو تینوویەك بەدڵۆپەدان ئاو بخواتەوە، یان وەك ئەو کەسەیە کە لەماراسۆندا لەتەنگەبەرترین شوێندا رابکات. وێڕای هەموو ئەمانە دیسان گەیشتە پێکهاتەیەك کە کەس بە خەیاڵیدا نەدەهات، جا ئەگەر چۆنییەتی هێنانە کاییەی ئەو پێکهاتە و بەشداربوونی هەندێ لەهەڤالان بەراورد بکەین بەڕادەیەکی زۆر ناکۆکیەکانمان بۆ دەردەکەوێ. ئەمەش گەلێك خەون و خەیاڵی ترسناك لەلایەن ئەو هەڤالانە دروست دەکات بەتایبەتی ئەوانەی کە هەوڵیاندەدا بەشێوازێکی هەرزان ببن بە ناوەندی هێز و رێگاکانی بەهێزبوون بخەنە دەست خۆیان، بە واتایەك لەواتاکان هەموو هەڤالان لاواز بوون، چونکە پارسەنگی هێز بەلای دوژمندا بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوشدا هەندێك لەوانە خۆیان زۆر بەهێز دەبینی. ئەمەش دیارە ناکۆکیەکی جددی بوو لەنێوانماندا، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە PKKیان وەك سەرچاوەیەك بۆ بەدەستهێنانی هێز بەکار دەهێنا. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە بۆ دەربازکردنی لایەنی لاوازی کەموکوڕی و بۆ بوونیان بەخاوەنی هێز PKK یان بەکاردەهێنا.

زۆر جار گوێتان لەوە دەبێ کە دوژمن رۆژانە ناو و ناتۆرەی نوێ بەکار دەهێنێت کە ئاماژە بۆ هێزی PKK دەکات. بەڵام وەك دیارە هەندێك لە هەڤالانی ئێمە نازانن چۆن ئەم چەکە بەکاربهێنن و شارەزا و کارامە نین لەبەکارهێنانیدا. ئەمەش دیسان ناکۆکیەکی ئاشکرایە بۆ نمونە ئەگەر بڕوانینە هێزی وتەی ئەم رێکخستنە و چۆنیەتی

دەربـڕین لەئایـدیۆلۆژی و سیاسـەتەکەی، هـەروەها بڕوانینـە ئـەو چـۆنیەتیەی کـە سەرۆکایەتی لەمەوە گوزارشتی لەهەموو ئەمانە کردووە لەڕێگای هەزاران وتار و وانەوە.

بـەڵێ! مەبەستمان ئەوەیـە، کـە هەوڵـدانی هـەرزان بـۆ بەدەسـتهێنانی هێـز بـەبێ هەوڵ و کۆششی پێویست، لەگەڵ خۆیدا کارەسات دەهێنێ. ئـەو هەڵوێسـتە لەکوردسـتاندا چـەند بـەربڵاوە! سـەرەڕای ئـەوەش ئـەو جـۆرە کەسانە نـەخاوەن توانـای قسـەکردنن و نـەخاوەنی ڕەوانبێـژی و هێـزی بیـانوون، لەسـەر ئـەم بناخەیـە بۆمـان دەردەکـەوێ کـە هەنـدێك لەهـەڤاڵانمان وەکـو پێویسـت سـەرنەکەوتوون لـەئامادەکردنی خۆیـان و چارەسـەرکردنی ناکۆکیـە خۆییـەکانیان و لەسـەر بنگـەی خـەباتکردنیش خۆیـان ئامادە نـەکردووە، لـەم لایەنەشـەوە کەموکوڕیـەکانیان بەئاشـکرا دەردەکـەوێت. بەڕاسـتی کەموکوڕی جددیشن، بەڵام بـا بڕوانینـە سـەرۆکایەتی! ئەمـە وەك ئـەوانی دیکـە نییـە و کارامـەیی بەدەسـتهێناوە و هـەزاران جـار گفتووگـۆ و توێژینـەوە لەسـەر کارێـك دەکـات. بەڵێ! ئەم پارتە بەم کارامەییە دروست بوو، کەچی هەندێ هەڤاڵ هەن بێ ئەوەی ئەمـە بە پێویست بزانن ئەڵێن ئێمە ئەندامی پارتین. ئەمـە هـەرگیز نابێـت، لەسـەر هـەمووان پێویسـتە ئـەوە بـزانن کـە ئێمـە چـۆن یەکـەم پارچـە چـەکمان بەدەسـتهێنا. مانـای بەدەستخستنی دەمانچەیەك لەو ڕۆژەدا چی دەگەیەنێ؟ هەڵوێستەکانی یەکەم و سـەرەتا چیبوون؟ توانـا بەردەستەکان چیبوون؟ ئازایـەتی ئەوکاتـە لـە چ ئاستێکدا بـوو؟ بـەبێ زانـینی هـەموو ئەمانـە و بـەبێ وەڵامدانـەوەی هـەموو ئـەم پرسـیارانە، نـاتوانرێ ئـەو کەسانەی کـە دێـن و دەبیـنن هەرشتێك ئامادەیـە بـە شـەرڤانی راسـتەقینە بـژمێردرێن، تەنانەت ئەگەر چەکی گرانیش بەکاربهێنێت، ئەمە ناکۆکیەکی دیکەیـە لـەنێوان ڕەوشـی هەڤالان و سەرۆکایەتیدا.

تا ئێستا باشمان لـەبیرە کـە دابینکردنـی پارچـە چـەکێك لـەو قۆناخـەدا چـەندەها ساڵی دەویست، هەروەها تەقاندنی یەکەم گوللەش چەندەها ساڵی دەویست، دوژمن لەبـەر تەقاندنی هەر گوللەیەك دەیـەوێ دەستگیرت بکـا و جیهانەکـەت بگـۆڕێ بـۆ تاریکییـەکی ئەنگوستەچاو. ئێستاش دوای ئەوەی چیاکان بەتەواوی ئازاد کراون، هەنـدێ هـەڤاڵ دێـن دەڵێن 100٪ دەبین بە خەباتگێڕێکی نمونەیی، کەچی لـە ڕاستیدا هـەرگیز بەمشێوەیە نییە تائێستاش سەرۆکایەتی بۆ دابینکردن و پاراستن و چاککردنەوەی چەکی ئەم جـۆرە کەسانە بێوچان کاردەکات، هەر ئەویش بەرپرسـیارێتی ئـەوانی خسـتە ئەسـتۆ. سـەرەڕای

ئەوە دەبینین جارناجارێ هەندێ لەهەڤاڵانمان هەندێ چالاکی ئەنجامـدەدەن بـێ ئـەوەی حسابی 24 کاتژمێر بۆ دوای چالاکیەکە بکەن، لەم حاڵەتەدا مانای ئەوەیە کـە لەوانەیـە لە ماوەی ئەو 24 کاتژمێرەدا رووبەڕووی لەناوبردن بێت، بەڵام سەرۆکایەتی حساب بـۆ هەموو شتێك دەکات و تەگبیری پێویستیش دەگرێت بۆ ئەوەی ئەمە روونەدات. ئەمـەش ناکۆکیەکی دیکەیە لەنێوان هەڤاڵان و سەرۆکایەتیدا.

بەڵێ ئێمە بەشێوەیەك رووبەڕووی بەرەنگاری ئەمجۆرە کەسانە بووینەوە کـە بـیر ناکەنەوە، لەڕاستیدا ئێمەدا لەبەردەم گێلاندایین. لەبـەردەم بێچـارەییداین، بـەڵام ئەوانـە دەبیـنین کـە سـەرەڕای ئـەوەش خۆیـان بـە سـەرۆکایەتی PKKدا ئـەنێن. هەریـەکیان لەناکاو هەوڵدەدات و دەڵێت: منیش لە PKK م، ئەوا هەموو هێز و هـەموو دەسـەڵاتێك تایبەتە بەخۆم، ئەمە وەهمێکە لەڕاستیدا ـ هەوەك دەگوترێ ـ ئەگەر ناوی چـی لێبنێـی ئەوا باوەڕ دەکات کە بەڕاستی وایـە و، ئەگـەر نـاوی سـەرکردەی لێبنـێن ئـەوا بانگەشـەی ئەوە دەکات، ئەوا ئەو بەڕاستی خۆی بەسەرکردە دادەنێت. ئەمەش ناکۆکیەکی دیکەیە.

ئەمانـە هـەمووی وەهمـن، وەهمـی سـەرۆکایەتیەکە بەسـەر کەسـدا زاڵ دەبـێ، ئایـا سـەرۆکایەتیش بەمشـێوەیەیە؟ لەڕاسـتیدا نـەخێر چـونکە هەڵوێسـتەکانی سـەرۆکایەتی لەهەڵوێسـتەکانی هـەمووان ووردتـرە و هەوڵـەکانی چـەندین جـار لەهەوڵـەکانی گشـتی زیاترە. مادام سەرۆکایەتی بەم شێوەیەیە و ئـەوانیش کـەم تـا زۆر دەرك بـە ناکۆکیـەکان دەکەن، لەبەرچی لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئەمە نەکرد، بۆچـی لێـی وورد نەبنـەوە؟ بۆچـی پەندیان لەو دەرس و وانانـە وەرنـەگرت؟ ئەگـەر پێشـکەوتن و پەرەسـەندنیان بویسـتایە ئـەوا هـەر لـەژوورەوە چارەسـەریان بـۆ ناکۆکیـەکانیان ئەدۆزیـەوە، هـەر بۆیـە پێویسـتە هەڵوێسـتیان دیـاری بکـەن، پێویسـتە لـەناکۆکی لاوازیـدا بگـەن بـەهێزێ، لـەناکۆکی تێگەیشـتندا خۆیـان بگـەیێنن بـەرەوانی تێگەیشـتن و لەگـەڵ بـوونی پەیوەنـدی بـۆ پەیوەندی بەرفراوان و لە بێ توانایی دیاریکردنی رێگا و شێوازەکان و لەنـەبوونی ژمـارە و چەك و جبەخانە، بۆ ژمارەیی و پـڕ چـەك و جبەخانـە. بـەمانای ئەنجامـدانی ئـەوەی پێویستە ئەوەی کـە نییـە و بـڕینی ئـەو مەودایـەی کە پێویسـتە بـبڕدرێ. ئەمەیـە تاکـە شێوازی راست و دروست.

هەموو دیاردەکان دووپاتی ئەوە دەکەنەوە کە ئـەو شـێوازەی سـەرۆکایەتی PKK بـەخۆوەی گرتـووە، هـەوڵی سـەرکەوتنی بەدەستخستووە و خـاوەنی هێزێکـی تـەواوە بـۆ گەیشـتن بەسـەرکەوتن. جـا ئەگـەر بەتـەواوەتی نوێنەرایـەتی ئـەوە بکـرێ لەگـەڵ نوێنەرایـەتی کردنـی دەربـڕی مێـژووە راسـتەکەی، ئامانجـەکانی، شـێوازەکانی و بنکـە جەماوەریەکەی و خەباتگێرانی، ئەوا بـێ سـێ و دوو سـەرکەوتن بەیـەکجارەکی بەدەست دێـنێ. رەنگـە لەقۆناخـەکانی رابـردوو بەمشـێوەیە بـە ئاشـکرایی بەرجەسـتە نـەکرابێ و ئێسـتاکە گەیشـتۆتە ئاسـتێك بەئاسـانی دەتـوانرێ دەرکـی پێبکـرێ و نوێنەرایـەتی ئـەو سەرۆکایەتیە بکرێت و دواتریش بـە واقیعیـەتێتکی مـەزنتر تـەڤلیبوون ئەنجامبـدرێت و بەگوێرەی پێویست نوێنەرایەتی بکرێـت. لەلایـەکی تـرەوە ئەمرۆکـە توانـای سـەرکەوتن لـەو خاڵەنـەدا هەیـە کـە پێشـتر لـەتوانادا نـەبوو سـەرکەتنی تێـدا دەسـتەبەر بکرێـت لەپێکهێنانیانـدا. ئەمـەش وا لـەکادیری تێکۆشـەر دەکـات کـە رۆڵـی خـۆی باشـتر ببـینێ، بەجۆرێك رۆڵێکی واقیعبینانەی بێ پایان، وێڕای ئەو خەباتگێڕانەی کە دەڵێن ــ لەسـەر ئاسـتی پێشـەنگایەتی بـەم کـارە هەڵدەسـتین ــ کەواتـە پێویسـتە لەسـەریان ئـەو ئەرکـە بەگوێرەی بناخە و تایبەتمەدیەکان جێیەجێ بکەن.

بەڵام ئەو گیروگرفت و ئاستەنگیانەی کە لەم بوارەدا هەیە، زۆر بە راشکاوی و تێر و تەسەلی گفتوگۆمان لەسەر کرد، لەبەرئەوە گرنگی زێدەتر بە قۆناخی داهاتوو دەدەین، لەسەر ئاستی تێگەیشتن و بـەخۆوەگرتنی راسـتی سـەرۆکایەتی. جا لەگـەڵ گفتوگۆکردن لەســەر هــەموو بوارەکانیــدا بەوپــەڕی ئازادانــە و گەیشــتن بەئــەنجام، واتایــەکمان پێدەبەخشێ ئەویش گەیشتنە بە سیستەمی سەربازی (زنجیرەی سـەربازی). بـەو مانایـە پێشـەنگایەتی پـارتی لـەقۆناخی داهـاتوودا دەبێـت بەپێشـەنگی سـوپا بەشـێوەیەکی بـەرفراوان، پێویسـتیەکانی سـەرۆکایەتی لـەناو سوپادا بخاتـە دەست خـۆی. واتـا دەبێتـە قۆنــاخی ســوپابوونێکی تــەواو لەهــەموو روویەکــەوە، ئەمــەش مانــای ئەوەیــە کــە تایبەتمەندیەکانی پێشەنگایەتی هەمان تایبەتمەندی سەرۆکایەتییە.

لەســەر ئــەم بناخەیــە، تایبەتمەنــدی ئەنــدامێکی پــارتی بــاش، تایبەتمەنــدی گەریلایەکی باشە. ئەمەش خۆی لەخۆیدا هـەلێکی گونجاوە پێویسـتە گرنگییـەکی زۆری پێبدرێ، دەتوانین بڵێین ئەمە وا لەژیان دەکات  مانایەکی هەبێت و، ئەمـەش بەمانایـەك گوزارشت لە لەدایکبوونێکی نوێ دەکات. لێرەدا پێویستە نەکەوینە نێو خـەون و خـەیاڵ

و، بە زێدەڕۆیی سەیری تواناکانی خۆمان نەکەین و، با هەموو بزانن کە بە راکردن بۆ ئەملا و ئەولا شتێك جێبەجێ نابێت.

بۆ یەکەمجارە دیاردەی PKK بەتایبەتی شێوازی شەڕکردن و سەرۆکایەتیەکەی، ئەو هەلە دەرەخسێنێ بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێك کە لەپێناوی گەل و تەنانەت لەپێناوی تاکە کەسیشدا. لەوانەیە هێشتا هۆشیاری مێژوویتان کەم بێ. بۆیە هەوڵەکانتان چڕتر بکەنەوە لەپێناو گەیشتن بەو ئاستەی لێتان داوا دەکرێت. بەڵام ئاگاتان لەخۆتان بێ لەوەی کە لاوێتیتان نەتان سووتێنێ، یاخود کەم ئەزموونی بەرەو نەمانتان ببات. نابێ بەشێوەیەکی کوێرانە و بەهۆی نەزانی بەنیازی کەسایەتی خۆ بەگەورە زانین، لەگەڵ ئەم قۆناخە ئاوێتە ببن. لەهەمان کاتدا دەبێ بزانن کە لاوێتی و خوێن گەرمی هەلێکی گونجاوە بۆ دەستەبەرکردنی تایبەتمەندیەکانی سەرۆکایەتی و بەدەستخستنی دەرفەت لەم بوارەدا، شێوەی سەرۆکایەتی لای ئێمە باشترین نمونەیە بۆ ئەمە، لەتوانای هەر یەکێکتاندا هەیە کە بەو ئاستە بگەن، بۆئەمەش پێویستیتان تەنها بە دان بەخۆداگرتن و پاکی هەیە. لێرەدا تەنها ئەوە ماوە دووپاتی بکەمەوە و بڵێم؛ پێویستە لەسەر هەریەکێك لە ئێوە بەو ئاستە بەرزە بگەن لەتێگەیشتن و هەوڵ و کۆشش بکەن بۆ داسەپاندنی ئەم چەمکانە لەسەر دەوروبەری خۆتان. تەنها بەچڕکردنەوەی هەوڵ و کۆششەکانتان و دان بەخۆداگرتنتان بەو ئاستە دەگەن. چونکە لەڕاستیدا شێوازی سەرۆکایەتی، واتا مرۆڤ دان بەخۆدابگرێت، یاخۆد بەمانای تەرخانکردنی خۆ وەکو پێویست بۆ بەرزبوونەوە و گەیشتن بە ئاستی شێوازی سەرۆکایەتی سەرکەوتوو، کە تەنها ئەو دەتوانێ سەرکەوتن بەدەستبهێنێ و بەرجەستە کردنی مەزنایەتیە بێ سنوورەکەی. لەکاتێکدا کە تێکڕای شێوازەکانی دیکە رۆچوونە و دوورن لە بەدەستهێنانی هەر ئەنجامێك.

جا ئەگەر لەم چوارچێویەدا دەستتان بە کارکرد، تەنها ئەو کاتە رۆڵی سەرۆکایەتیان دەردەکەوێت کە جێگای گرنگی پێدان بێت و، تەنانەت ئەنجامیش بە دەستدەهێنن. ئەمە لەئێوە دەخوازرێ، هەر ئەمەشە داخوازی مێژووی گەلەکەمان کە بەئێوەی رادەسپێرێ و فەرمانتان پێدەدات و بۆی لەخواردن و خواردنەوەش گرنگترە. بۆیە پێویستە ئەمە نوێنەرایەتی راستی سەرقافڵەی هەموو چالاکیەك و کردەوەکانتان

بێت. هەڵوێستی راستیش کەخۆی لەنزیك بوون لەناوەرۆکی مەسەلەکە بەپێویست و حسابێکی وورد بۆ هەموو ئەگەرێك و هەوڵدان بەئاستی پێویست دەنوێنێت، هەل و دەرفەتێکی پێگەیشتوو و کراوەتان پێدەبەخشێ، تەنانەت سەرکەوتنیش. هیوادارین لەقۆناخی داهاتوودا شێوازی سەرۆکایەتی باڵ بەسەر هەموو چالاکیەکاندا بکێشێ.

ئەزموون و تواناکاری بەتەواوی لەبار و گونجاون بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئامانجە. کارەکە بەم شێوەیەیە و پێویستە تێکڕای هەڤاڵان شێوازی شەڕکردن لەخۆیاندا بەرجەستە بکەن و هەموو ئەرکەکانیشان لەقۆناخی داهاتوودا جێبەجێ بکەن، ئەوانەی جێبەجێ کراون و ئەوانەش کە جێبەجێ نەکراون، هەڤاڵانیش هەموویان لەئاستیدان و شایانی ئەون.

لەسەر ئەم بنەمایە پێویستە لەسەر تەواوی هەڤاڵان بەشداری قۆناخی ئایندە بکەن و بەبێ گوێ دانە ئەرکی گەورە و بچوك، وەکو دەرەنجامێکی سروشتی شێوازی سەرۆکایەتیمان مەحاڵە هەر دەبێ بەگوێرەی ئەو بڕۆین. وەك پەیوەستبوونمان بە راستی گەلەکەمان و خەباتمان. دەبێ دەرك بەوەش بکەین کە ئەمەش یەکێکە لەپێویستیەکانی شێوازی هەنگاونان بەرەو سەرکەوتن. چونکە سەرکەوتنیش ئەرکێکە لەئەرکەکانی ژیان. پێویستە دەرك بەوە بکەین کە لەتوانامان‌دا نییە ئەوەی لەدەستمان چووە و ژیانیش بەتەواوی بگەڕێنینەوە، تەنها بەم شێوازە نەبێت.

هەروەها پێویستە ئەوەش بزانن کە چۆن رووبەڕووی ئەو قۆناخە دەبنەوە. ئەمەش بۆخۆی ئەو دیاردەیەیە کە پێی دەڵێین PKK، بەشداربوونی راستەقینەش لەناو PKK هەر بەمشێوەیە و شەڕکردنیش بە چەکی ئەو و هێرش بردنیش بۆ سەر دوژمن بەهەمان شێوەیە. ئێمە لەسەرۆکایەتیدا بەمشێوەیەمان کردووە، ئایا دنیا تەواو بوو، یا قیامەت هەڵسا؟ نەخێر هەرگیز! بەڵکو ئەوەی ئەنجامماندا راست بوو.

ئەمەش سروشتییەو خوازراوە. تەنانەت لەوەش زیاتر پێویستە لەسەر هەمووان هەل و دەرفەتی لەبار بقۆزنەوە و لەدەستی نەدەن و هەموو شتێکیش بخەنە خزمەت بەدیهێنانی سەرکەوتن و، هەر کادیرێکیش پێویستە ببێ بە خاوەن سەرکەوتنی مەزن.

لەرۆژگاری ئەمرۆماندا رەوشی سیاسی و ئایدیۆلۆژی کوردستان گەلێك دواکەوتووە و، تەنانەت پێچەوانەی رێڕەوی شارستانی مرۆڤایەتیە.

سەدان ساڵە لەماوەی قۆناخی دەسەڵاتی بێگانە داگیرکەرەکاندا، بەتایبەتیش لەقۆناخی دەسەڵاتی سەرمایەداریدا و لەلایەن داگیرکەرانی رژێمی دەسەڵاتداری تورك، فارس و عەرەبەوە ژێرخانی کۆمەڵایەتی گەلی کوردستان پارچە پارچە کراوە و ناسنامە و هێزی کاری لێ زەوتکراوە، هەروەها لەراستی خۆی و مەیدانە جۆراوجۆرەکانی پێشکەوتنی شارستانیەت لەپێش هەر شتێکیش لەبواری سیاسیەت و ئایدۆلۆژیاوە دوورخراوەتەوە.

ژیانی کۆمەڵایەتی گەلەکەمان بەگوێرەی ژیانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دواکەوتووە، لەکاتێکدا مرۆڤایەتی لەرێگای ململانێ لەگەڵ هێزە داگیرکەر و سروشتیەکاندا توانیویەتی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی وەها بخوڵقێنێت کە لەبەرزترین ئاستی پێشکەوتندا بێت. بەڵام تائێستا کۆمەڵگای کوردستان لەئەنجامی دەسەڵاتی داگیرکەریدا لەژێرخانێکی پەککەوتووی ناکۆك لەگەڵ داب و نەریتەکانی تێکۆشانی مرۆڤایەتیدا دەژی.

تەواوی پەیوەندیەکانی چینایەتی کۆنەپەرستانە کە پاشماوەی سەردەمی کۆیلایەتین، تا دەگاتە سەرمایەداری لەپێکهاتەی کۆمەڵگای کوردستاندا بەیەکەوە و لەناو یەکتردان. ئەوەی لەکوردستاندا باوە بریتییە وابەستەیی بە داگیرکەرانەوە، ئەوەش لەئەنجامی بەکرێگیراوێتی هێزە دەسەڵاتدارە نێوخۆییەکانەوە بووە، کە لەهەر ئاستێکدا پێی هەڵساون. سەرەڕای ململانێی گەلەکەمان لەگەڵ ئەم بارە دژوارەی سروشت و هێزەکانی دەسەڵاتداری بێگانە، بەدرێژایی مێژوو تاوەکو رۆژی ئەمرۆ، کەچی رەوشی کۆیلایەتی و پاشکۆیەتی گەلەکەمان هەر بەردەوام بووە.

ئەو هێزە ناوبراوانە گەلەکەمانیان بەتەنیا لەژێر دەسەڵاتداری داگیرکەریدا هێشتەوە و بەهۆی کاریگەری ئایدیۆلۆژی بێگانە کولتووری نەتەوایەتی و کەسایەتی نەتەوەیی لەلا بەرجەستە نەبووە و لێی دوورکەوتۆتەوە. هەر لەساڵانی پەنجاکانەوە

لەگەڵ هاتنی سەرمایەداری بۆ باکووری رۆژئاوای کوردستان، چینە دەسەڵاتدارەکانی ناوخۆ خۆبەدەستەوەدان و بەکرێگیراوێتیان گەیاندە بڵندترین ئاست. ئەمەش کرداری پارچەکردنی کولتووری، ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتی لەنێو ریزەکانی گەلدا خێراتر کرد. بۆئەوەی بتوانرێ گەلێك بخرێتە ژێر کۆنترۆڵ و دەسەڵاتەوە، ئەوا پێویستە سیاسەت و ئایدیۆلۆژیایەکی بەسەردا بسەپێنرێت. داگیرکەری تورکیا بە پشتبەستن بە سیاسەت و ئایدیۆلۆژیایەکی گشتی هەموو رەفتار و کردەوەیەکی نامرۆڤانەی دەرهەق بە گەلەکەمان ئەنجامداوە.

هەروەها ئایدیۆلۆژیایەکی شۆڕشگێڕی گرنگیەکی گەورەی هەیە لە وشیارکردنەوەی کۆمەڵ و رزگارکردنی بیروبۆچوون و چەمکەکانی تایبەت بە ژیانی رۆژانە و دوارۆژی کۆمەڵگا و، جۆش و خرۆشدانی بۆ راپەڕین لەدژی هێزە داگیرکەر و فەرمانڕەوا و دەسەڵاتدارەکان.

ئەو گەل و چینانەی کە نەبوونەتە خاوەن ئایدیۆلۆژیایەکی تایبەت، ئەوا لەمێژوودا بەردەوام دووچاری لەناوچوون و تواندنەوە دەبن. ئەگەر ئەو گەل و چینە چەوساوانەی لەبەرەنگاربوونەوەی هێزەکانی دەسەڵاتی ناوخۆ و داگیرکەری خۆیان نەکەن بەهێزێکی سیاسی، ئەوا ناتوانن کۆت و پێوەندەکانی کۆیلایەتی تێك بشکێنن.

بوونی چین و گەلە چەوساوەکان بەهێزێکی سیاسی تەنها لەرێگای شیکردنەوەی راست و دروستی رووداو دیاردەکان و بەپشت بەستن بە ئایدیۆلۆژیایەکی وەها دەبێت، کە ئامانجەکانی تێدا بەئاشکرا ببینرێت و لەگەڵ دروستکردنی ئەو رێکخراوانەی کە ئامانجیان رزگاری کۆمەڵایەتی و نیشتمانییە.

رژێمی داگیرکەری تورکیا زۆر بەباشی گرنگی سیاسەت و ئایدیۆلۆژی دەبینێ و دەزانێت کە چۆن لەدەستی گەل و چین و گەلە زۆر لێکراوەکاندا دەبێتە ئامرازێك بۆ بەدیهێنانی رزگاری. بۆیە گەلەکەمانی لەژیانی سیاسی و ئایدیۆلۆژی دوورخستۆتەوە و لەپێناو تواندنەوەی گەلەکەمان لەبۆتەی نەتەوایەتی تورکدا و رێگاگرتن لەوەی کە بگاتە بیرکردنەوە و تێڕوانینێکی سەربەخۆ، لەڕووی هزریەوە کردویەتیە پاشکۆ خۆی.

هەروەها لەبواری سیاسیەوە لەهەلومەرجی سەختی داگیرکەریدا، دوژمنایەتی لەگەڵدا کردووە. پێشخستنی زنجیری پیلانە دەستووریەکان و، رێگەی لەدەرکەوتنی هەر رێکخستنێك گرتووە کە بەناوی گەلەکەمانەوە بێ. هەروەها ئەو رێکخستنانەی کە

لەکۆمەڵگای کوردستاندا سەریانهەڵداوە و لەژێر چاودێری و فەرمانی ئەواندا بوون، لە ڕێگای ئەو پارت و دەزگا و دامەزراوانەی لەسایەی ڕەوشی ئەوکاتە دەرکەوتن، پێکهاتەی سیاسی کۆمەڵگای کوردستانیان پێشێل کرد و لەیەکتریان جیا کردەوە. لەکاتێکدا باس لەئایدیۆلۆژیا دەکرێت گەلی کوردستان وەها تێدەگات کە یەکێکە لە مەزهەبەکان (ئایینزاکان)، یاخود لەڕێگای وتار و وتاربێژی لە جەژنە فەرمیەکاندا بەرگریکردنە لە شۆڤێنیزمێتی تورک. هەروەها وەها لەسیاسەت تێدەگەن کە بریتیە لە بەشداریکرنی هەڵبژاردن بۆ هەرچوارساڵ جارێك. بەو ڕەنگەش یەکێك لە بەکرێگیراوەکان دەنێردرێتە پەرلەمان بۆ پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندیە تەسکەکانیان، بە شێوەیەك کە فرتوفێڵ و گەمەکانی دەرەبەگایەتی دەخەنە ڕوو.

هەروەك چۆن لە ڕابردوودا سیاسەت و ئایدیۆلۆژیا ڕۆڵێکی گەورەیان لە ژیانی گەل و چینە ستەملێکراوەکاندا گێڕاوە، ئەوا ئەمڕۆکەش لەپێناو ڕزگاری چین و گەلاندا ڕۆڵێکی بەهێزتر دەبینێت. بەڵام سەبارەت بە گەلەکەمان ئەوا سیاسەت و ئایدیۆلۆژیا ڕۆڵێکی گەورەتر دەبینێ، چونکە بۆئەوەی گەلەکەمان لە داگیرکەری و ڕژێمی دەرەبەگایەتی کۆمپرادۆر ڕزگاری بێت، ئەوا پێویستە ببێتە خاوەن سیاسەت و ئایدیۆلۆژیایەکی سەربەخۆ.

داگیرکەری تورك هەموو شێوازێك دەگرێتە بەر بۆ ئەوەی ڕێگە لەبەردەم ئەو پێشکەوتنە ئایدیۆلۆژی و سیاسیانەی گەلەکەمان بگرێت کە بەدی هێناوە. لەم پێناوەشدا ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتی ریفۆرمیستەکان و شۆڤێنیزمە کۆمەڵایەتیەکانیان پەرەیان پێدراوە، کە هەمان ڕۆڵ دەبینن. هەروەها هەردوو ڕێکخستنەکە وەهای دەخەنە ڕوو کە گوایە ئەمە شەرعییەتێکی هەیە. بۆئەمەش کۆلۆنیالیزم و شۆڤێنیزمە کۆمەڵایەتیەکان لەسەر بنەمای ئەو شەرعیەتە دەجووڵێنەوە. دیسان وەهای دەخەنە ڕوو کە گوایە گەلەکەمان بەشێکە لە گەلی تورك و بەو ڕەنگەش ئاو لە ئاشی داگیرکەران دەکەن، بۆ تواندنەوەی گەلەکەمان لە بۆتەی نەتەوەی توركدا.

بۆرژوازی نەتەوەیی و پاشکۆ و پاشڤەڕۆیی ناوخۆ کار دەکەن بۆ تێکدان و شێواندنی خەباتی شۆڕشگێڕانەی گەلەکەمان لە ڕێگای داواکردنی بەجێگەیاندنی هەندێ ریفۆرم. بەمجۆرەش تێدەکۆشن بۆ درێژەدان بە تەمەنی ڕژێمی داگیرکەریانەی تورك. لە

کوردستاندا بۆئەوەی بتوانرێت لەیەك کاتدا لەبەرامبەر ئایدیۆلۆژیای دەزگا داگیرکەریەکان کە بەئامانجی لەناوبردنی گەلەکەمانە پێویستە خەباتێك لەدژی شۆڤێنیزمی کۆمەلایەتی کە خۆی وەها نیشان دەدات گوایە نوێنەرایەتی هێزێکی جەماوەری دەکات، پێشبخرێت. دەبێ ئەوەش بزانین کە بەراکێشانی گەلەکەمان بۆنێو خەباتی بۆرژوازیەتی ناوخۆ و نکۆلێکردنی نیشتمانی، رزگار بوون نایەتەدی.

خەبات و تێکۆشانی ئایدیۆلۆژی گرنگیەکی گەورە و ژیانی هەیە و بەئەنجامدانی سیاسەت و ئایدیۆلۆژیایەکی سەربەخۆی گونجاو دەخولقێنێ. پێویستە لەسەر کادیران بەشێوەیەکی راست لە خەباتی سیاسی و ئایدیۆلۆژی تێبگەن، هەروەها پێویستە گرنگی و بایەخی ئەو خەباتە لەناو ریزەکانی جەماوەردا بزانن. ئەمرۆکە لەسەر کادیران پێویستە بە تێروانین لەسەر سیاسەت و ئایدیۆلۆژیا وەکو ئەلقەیەکی سەرەکی، هەموو چالاکیەکانی رێکخستن بخرێتە ژێر رۆشنایی لێکۆلینەوە و، هەروەها پێویستە داواکاریەکانی گەل و ئەو رەوشەی کە تێیدا دەژی بناسرێن و هەلوێستێکی یەکلاکەرەوە لەدژی هەموو ئەو جۆرە سیاسەت و ئایدیۆلۆژیایانەی کە لەدژی تێکۆشانی گەلەکەمان پیادە دەکرێن، وەربگیردرێ. پێویستە لەسەرمان ئەو هزر و هەلوێستە تێبگەین کە لەخزمەتی بەرژەوەندیەکانی گەل و نیشتماندایە.

پێکهاتنی تۆوی ئایدیۆلۆژیا لەئەنجامی پێشکەوتنی مرۆڤ بوو، کە توانی قۆناخی سەرەتایی دەرباز بکات و خۆی لەجیهانی ئاژەلان رزگار بکات و کۆمەلگایەکی سەربەخۆ پێکبهێنێت و پرۆسە و پرۆگرامی بەهەرمهێنان بەدەست بێنێت.

ئایدیۆلۆژیا شتێکی تایبەتە بەمرۆڤ. ئەو گیانلەبەرانەی نەگەیشتوونەتە ئاستی بەمرۆڤبوون، ناتوانن ببنە خاوەنی ئایدیۆلۆژیا، چونکە گیانەوەران پەیوەستن و ملکەچی ئیرادەی سروشتن.

بۆ تێگەیشتنی چۆنیەتی دەرکەوتنی ئایدیۆلۆژیا و ماناکەی، پێویستە تێبگەین کە بیرکردنەوە و لۆژیك "زمان" پەیوەستە بەکرداری بەرهەمهێنانەوە، چۆن لەلای مرۆڤ پێشکەوتووە، پێویستە بەشێوەیەکی قوول و ئاشکرا لەبنەما مادییەکانی تێبگەین.

بۆئەوەی مرۆڤ بتوانێ بژیت، ئەوا ناچار دەبێت پێویستیە سەرەکیەکانی ژیان "خواردن و خواردنەوە"دابین بکات. کاتێك مرۆڤ گەیشتە ئاستی بیرکردنەوە، ئەوا بەشێوەیەکی بەردەوام رووبەرووی رەوشی سەرەکی بەرهەمهێنانی بەروبوومە مادییەکان

دەبۆوە. ئەوساکە مرۆڤ بە پشتبەستن بە بەروبوومی رووەك و گیانەوەران و شتی تـرەوە ناچاربوو دەست بە بەرھەمهێنان بکات.

لەسەرەتای قۆناخی جیابوونەوەی مرۆڤ لەجیهانی ئـاژەڵان گرفتێکـی سـەرەکی کـە رووبـەڕووی مـرۆڤ دەبـۆوە، پاراسـتن و پارێزگـاریکردنی خـۆی بـوو. بۆئـەوەی مـرۆڤ بەردەوامی بەژیانی خۆی بدات، دەبوایە بزانێت کە چ جۆرە ماددەیـەك بەرھـەمی بهـێنێ و چۆن ئەم بەروبوومە زۆر و زەوەند دەبێ. بـەو شـێوەیە و لەسـەر ئـەو بنەمایـە هـزری مرۆڤ دروست بووە. هەروەها مرۆڤ لەپێناو پاراستنی قەوارەی خۆی گرێـدراوی پرۆسـەی بەرھـەمهێنان دەبێـت و لەناخـەوە هەسـت بـە کـەمی بەرھـەم دەکات. ئەمـەش بنـەمای هەموو بیرکردنەوە و تێڕوانینێتی.

مێشـك ئـەو ئەندامەیـە کـە تـوانی ئایـدیا "هـزر" بهێنێتـە کایـەوە، هـەروەها بـۆ گەیشـتن بەئاسـتی مرۆڤایـەتی بەرادەیـەکی گـەورە پەیوەسـتە بـەوەی کـە مێشـك ببێتـە خاوەنی توانـای بیرکردنـەوە، لەلایـەکی دیکەشـەوە ئـەو ئایدیایـەی کـە مێشـك بەرھـەمی دەهێنێت، پێویستی بە ئامرازێکی دەربڕین هەیە کە ئەویش زمانە.

ئـەو قیـژە و هـاوار و دەنگـە ئاژەڵیانـەی کـە لـەکاتی کارکردنـدا لەلایـەن مرۆڤـی سەرەتاییەوە دەردەچوون، گەلێك جیاوازیان لەگەڵ دەنگی ئاژەڵانی دیکەدا هەبوو، لەڕێی لەیـەك جیاکردنـەوەی ئـەو هـاوار و قیژەکردنـە و بەخسـتنە سـەر و زیـادکرنی چـەند دەنگێك، سەرەتای کرداری درکاندن لەلایەن مرۆڤەوە دەردەکەوت و پەرەیدەسەند.

هـەوەها بـۆ نوێکردنـەوەی پرۆسـەی بەرھـەمهێنان، مـرۆڤ بـووە خـاوەنی هەنـدێ ئامرازی سەرەتایی و بەهۆی زمان و ئایدیاوە مرۆڤ تـوانی پرۆسـەی بەرھـەمهێنان زیـاتر قـووڵ و فـراوان بکـات. لەگـەڵ هـەنگاونانی مرۆڤایـەتی بـەرەو پرۆسـەی بەرھـەمهێنان هەندێ لەو پرسیارانەش سەریان هەڵدا؛ چۆن دەتوانرێـت زیـاترین بـەروبووم بهێنرێتـە بەرھەم؟ چۆن و کەی دەتوانرێت پرۆسـەی بەرھـەمهێنان پیـادە بکرێت؟ لەگـەڵ پرسـی بوونە خاوەن دەزگایەك بۆ هەڵسان بەو کارە و چۆن دەتوانرێت بەرھـەمهێنان بـەردەوام بکرێت؟ هەروەها گەیشتنی ئایدیا بە ئاستێکی ڕێکخراو و کاریگەر و چالاکانە، ئەو شـێوە تیۆر و نەخشەکێشانەی دەسەپاند کـە بـەگوێرەی ئـەوە بتوانرێـت چالاکیە کرداریـەکان پەرەیان پێبدرێت.

لەســـەرەتادا بەرهـــەمهێنان بـــریتی بـــوو لـــە راوکـــردن و کۆکردنـــەوەی ئـــەو بەروبوومانـەی سروشـت پێشکەشـی مرۆڤـی دەکـرد؛ شـێوەی ئـەم بەرهەمهێنانـەش پێـك هاتنی کۆمەڵگای سەرەتایی سەپاند، کە جۆرێکی رێکخستنی کۆمەڵایەتی سەرەتایی بـووە. ئەو شێوە رێکخستنە لە کۆبوونەوەی چەند کەسێك لەدەوری یـەکتری بـۆ خۆپاراسـتن لـە گیانەوەرە درندەکان، پێك هاتبوون. هـەروەها بۆئـەوەی ئـەو کۆمەڵانـە بتـوانن پـەرە بـە چالاکیەکانی بەرهەم هێنان بدەن، ئەوا پێویست بوو لەسەریان کە شوێن و پەناگەی ئـەو ئاژەڵانە پێبزانن کە راودەکرێن، یاخود درندەن بۆئەوەی خۆیانی لێ بپارێزن یان ئەوانـە کە دەتوانن ماڵییان بکات و سوود لە بەروبوومەکانی ببینێت. لە پاشـانیش بـەکارهێنانی سروشت بۆ خزمەتی خۆیان و نیشتەجێ بوون لە زەوییە بە پیتەکان و دروست کـردن و داهێنـانی کەرەسـتە و ئـامێرە سـەرەتاییەکان لـە سروشـت، بـووە هـۆی ئـەوەی کـە هـزری رێکخـراو ببێتــە رەوشــێکی داســەپاو بەســەر کۆمــەڵگادا. بەواتەیــەکی دیکــە بۆئــەوەی مرۆڤایەتی دەسکەوتەکانی بپارێزێ و خۆی بگەیەنێتە ئاستێکی بڵندتر، ئایدیۆلۆژیا بۆی بوو بە شتێکی پێویست.

کەواتـە ئـەو ئایدیۆلۆژیایـەی کـە هـەڵقووڵاوی ژیـانی مرۆڤـە و لەسـەر ژێرخـانی پێکهاتنی مادديانە و بەپلەیەك لەسەر بنەمای کۆمەڵە سـەرەتاییەکانەوە دوایـش لەسـەر بنەمای چـین و نەتـەوەکان راوەسـتاوە، بریتیـە لـە رەنگدانـەوەی هـەموو رەنگێکـی ژیـان لەئاستی هزریدا، کە لەپێناو بەرژەوەنـدی ئـەو کۆمـەڵ و چـینانە پێکهـاتووە، بریتیـە لـە کۆمەڵێك بیروڕای رێکخراو سەبارەت بە دوارۆژ و ژیانی رۆژانەی ئـەو کۆمـەڵ و چـینانە. بەدەرکــەوتن و پێکهــاتنی ئایــدیۆلۆژیا گــەلێك هــەل و دەرفــەتی گونجــاو هەڵکــەوت، بەتایبەتیش بۆ کۆمەڵگا سەرەتاییەکان کە هەستیان بە پێویستیەکی زۆری بەرهەمهێنان و خێروبێـرە ماددیـەکان و خۆپاراسـتن و ئافرانـدنی پێشـکەوتنە گـەورەکان و پاراسـتنی دەسـکەوتە کۆمەڵایەتیـەکان دەکـرد. ئەمڕۆکـە مرۆڤایـەتی بۆتـە خـاوەنی ئـەو ئـامرازە کاریگەرە بۆ هێنانەدی هەموو ئەوانە.

ئەو کۆمەڵە سەرەتاییانەی مرۆڤایەتی کە بۆ خۆپاراستن لەدژی هێـرش و پـەلامار و تالانکردنی کۆمەڵەکانی دیکە، کە گەیشتوونەتە ئاسـتێکی بـەرزتری کۆمەڵایـەتی، ئـەوا ئیـدی ئایـدیۆلۆژی ئـەوان نـەیتوانی رۆڵـی خـۆی لـە پاراسـتنی بـوون و رێکخسـتن و سامانەکانیان بگێڕێ. تەنانەت ناتوانێ سەربەخۆیشیان بپارێزێ (سەربەخۆیی خێڵ).

کاتێك مرۆڤایەتی گەیشتە ئەو ئاستەی پەرەسەندن، بۆ دەربازکردنی ئەو کۆسپ و ئاستەنگیە نوێیانە، ئیدی بەرەو پێکهاتەی سیاسی سەرەتایی هەنگاوی هاڵێنا و ئەمەش دەربڕینێکی زۆر چڕی ژێرخانی کۆمەڵگایە و ئەو بیر و بۆچوونانەی دەرفەت دروست دەکەن بۆ پاراستنی هەبوونی کۆمەڵایەتی، کە پاشان لە کۆمەڵگای چینایەتیدا بوو بەدەزگایەکی فەرمی، بەو شێوەیە و لەسەر ئەو بنەمایە سیاسەت سەریهەڵداوە.

سیاسەت و ئایدیۆلۆژیا بەشێوەیەکی تۆکمە گرێدراوی بەرهەمهێنانن، لەسەربنەمای بەرهەمهێنان سەرهەڵدەدەن و پارێزگاری لە بەرهەمهێنان دەکەن. زێدەبوونی بەرهەم بە قۆناخی دابەشکردنی کاردا تێپەڕ دەبێت و، لەسەرەتاکانی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی کار لەنێوان ژن و پیاودا دابەشکراوە و، لەگەڵ تێپەڕبوونی کات و زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان و گرێدراو لەگەڵ کرداری پەرەسەندنی بەرهەمهێنان، خانەدان دەرکەوت و یەکەمجار دەستی کرد بە کۆکردنەوەی بەرهەم و لەپاشانیش ئاژەڵداری و کشتوکاڵ دەرکەوتن، لەپاش ئەمەش پیشە و کاری دەستی سەریهەڵدا. ئەمەش دابەشکردنی کاری بەسەر بەرهەمهێنانی هێزی بازوو و بەرهەمهێنانی مێشکدا سەپاند. ئەمەش بەیەکەوە و لەهەمان کاتدا بووە هۆی پەرەسەندنی سیاسی و ئایدیۆلۆژی.

لەگەڵ بەرەو پێش چوونی بەرهەمهێنان و رێکخستنی کۆمەڵایەتی مرۆڤایەتی و لەناو گەرمەی کۆشش و ململانێ دژ بە سروشت و کۆمەڵگاکانی دیکەدا و، لەبەر پێویستی ژیان بەخشین و بەو دەسەڵاتدارێتیانەی ئامادەکراون، ئەوا سیاسەت لەکات و چۆنیەتی تێکۆشانی دەکۆڵێتەوە، لەگەڵ ئەوەی کە بەچ شێوەیەك دەتوانرێ لەژیانی پراکتیکیدا رێکخستنی گونجاو بۆ ئەو تێکۆشانە بەرەو پێش ببردێ. لە قۆناخی کۆمۆنی سەرەتاییدا ئەو سەرکردانەی کە توانیان لەهەندێك کاردا سەرکەوتن بەدیبهێنن، بوونە مایەی رێزگرتنی کۆمەڵ. ئەوانەی بۆ پارێزگاریکردنی بەرژەوەندیەکانی کۆمەڵگا بەپێی ئەو ئایدیۆلۆژیایەی کە ئاستێکی دیاری کراوی هەیە و هاوتەریبە لەگەڵ ئەو پیشکەوتنەی بەرهەمهێنان کە مرۆڤایەتی پێی گەیشتووە، سیاسەتێکیان داڕشت. ئەو شتەش راست و درووست بوو، بەڵام لەگەڵ چڕبوونەوەی بەرهەمهێنان ئایدیا زیاتر چڕکرایەوە و سیاسەت زیاتر قووڵ بۆوە و، بووە پێویستیەکی وەها کە دەستبەرداری

لێنـــەکرێت و لەگــەڵ چــالاکیەکانی بەرهــەمهێنان و پەرەســەندنی کۆمەڵایــەتی یــەك بگرێتەوە.

دابەشــکردنی کــار رێگــە خۆشــکەر بــوو لەبــەردەم خۆڵقانــدنی سیســتەمێکی کۆمەڵایەتی پێشکەوتووتر لە سیستەمی پێشتر، کە تایبەتمەندی جیاوازی چینایەتی تێدا بەدی دەکرا.

قۆناخی زیادبوونی بەرهەم ئەو قۆناخەیـە کـە تیایـدا جیابوونـەوە لـەنێوان کـاری بـازوو و کـاری هـزری دەسـتپێکرد و، لـەم قۆناخەشـدا ئـەو کەسـانەی کـە کـاری هـزری دەکەن، بەبێ ئەوەی بە هیچ کارێکی هێزی بازوو هەڵسن و رەنجێکی بازوو بدەن، توانیان بـژین. بـەو رەنگـەش لەسـەر بنـەمای یـەکێتی نێـوان عەشـیرەتەکان و هێـزە سیاسـیەکان هاتنە کایەوە و لـە دواییـدا بـووە هـەنگاوێك بـۆ درووسـتبوون و هاتنـە کایـەوەی هـەموو دەزگا و دامەزراوەکانی تر. ئەو سیستەم و رێکخستنە کۆمەڵایەتیەی کە لەم قۆناخەدا لە شـێوەی یـەکێتی خێـڵ و عەشـیرەتەکاندا دەرکـەوت، شـتێکی رێکـەوت نـەبوو، بـەڵکو پێداویسـتییەکانی پاراسـتنی چالاکیەکانی بەرهـەمهێنان و دەسـکەوتە کۆمەڵایەتیـەکان پێکهێنانی ئەو یەکێتیانەیان دەسـەپاند، بۆئـەوەی ببێتـە ئامرازێـك بـۆ ئاراسـتە کـردن و بەڕێوەبردنی سیاسەتێك بەناوی ئەو سیستەمەوە.

کەواتە ئەو سیاسەتەی لەسەربنەمای بەرهەمهێنانی کۆمەڵاتی و دابەشکردنی کـار هاتۆتە ئاراوە، واتا دەربڕینی چڕوپڕی ئابوورییە کە ئەویش لە بورای کرداریدا پرۆگـرام و سیستەم و رێکخستنی کۆمەڵگا و چین و گەل بەرجەستە دەکات. بـەکورتی ئایـدیۆلۆژیا و سیاسەت ئەو شتەیە کە دەکەوێتە خزمەتی پێشکەوتنی بەرهەمهێنان و پارێزگاری لـێ دەکات و لەسەر بنەمای بەرهـەمهێنان سـەریانهەڵداوە و هەریـەکێك لەوانـەش سـەربەخۆ نوێنەرایەتی دەزگا و دامەزراوێك دەکات. ئایدیۆلۆژیـەت بریتییـە لـە رێکخسـتنی هـزر و تیـۆری ئـەو نەخشـانەی لـە بەرزکردنـەوەی ئاسـتی بەرهـەمهێنانی کۆمەڵایەتیـدا رۆڵـی خۆیـان دەگێـڕن. ئـەو پەرەسـەندن و پێشکەوتنانەی کـە مرۆڤایـەتی لـەم بـوارەدا بـەدی هێناوە، بەتەنیا بەس نییە و پێویستیان بە بەرنامە و نەخشـەی وەهـا هەیـە کـە بتـوانن ئەو ئایدیۆلۆژیایە بخەنە واری کرداری و ژیانی و پراکتیکیەوە.

لێرەدا سیاسەت رۆڵی خۆی دەبینێ و ئەو پرۆگرام و نەخشانە دروست دەکـات کـە دەربڕی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگان، هەروەها لەنێو دەزگا و دامەزراوە جۆراوجۆرەکانی

ژیانیشدا بەرجەستە دەبێ. لەپشتەوەی هەر دامەزراوێکدا، ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت هەیە، بەڵام خودی ئەم دەزگا و دامەزراوانە ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت نین.

ئەگەر کۆمەڵ بکەوێتە نێو قەیران و تەنگژەوە، ئەوا رزگارنەبوون لەم قەیرانە تەنگژاویە دەبێتە هۆی پارچەبوونی گەل و کۆمەڵگا و سەرهەڵدان و دەرکەوتنی چەندین ئایدیۆلۆژیای شێوێنراو و جۆربەجۆر. بۆیە دروست نەکردنی زەمینەی هێنانەدی پەرەسەندن پێشکەوتن، دەبێتە مایەی بێ ئومێدی و هیوا بڕانی ئەو جەماوەرەی کە لەژێر کاریگەری ئەو ئایدیۆلۆژیایەدا دەژی و بەرەو ملکەچ بوون و لادان هانی دەدات.

## گرنکی و بایەخی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت لەپەرەسەندنی کۆمەڵایەتیدا

ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت کاریگەری بەرچاویان لە هانتە ئاراوەی زیادبوونی بەرهەمهێنان لەچاخی کۆمۆنەی سەرەتاییدا هەبوو. ئەو ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتەی کە لەکاتی بەرهەمهێناندا دەکەوێتە خزمەتی ئەو ژیانەی کە یەکسانی و رێکخستنی تاکەکانی کۆمەڵ رێکدەخات، ئەوا هاوکات لەگەڵ چڕبوونەوە و زیادبوونی بەرهەمهێنانی ماددی پەرەیسەند و بووە خاوەن پێکهاتەیەکی ئاڵۆز. لەکۆتاییەکانی کۆمەڵگای کۆمۆنەی سەرەتایی قۆناخی بەربەریەتی باڵا و لەئەنجامی گەشەسەندنی رەنج و هەوڵی مرۆڤ بەشێوەیەکی زیاتر و پێشخستنی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و دەرکەوتنی پیشە، لەئەنجامی هەڵسانی ئایدیۆلۆژیا بەئاوەڵاکردنی بوار لەبەردەم رێکخراوبوونی کۆمەڵگا و ئەو سیاسەتەی کە بەرژەوەندی کۆمەڵگای دەپاراست، رێگای لە پارچە پارچەبوون دەگرت. بەهۆی هەموو ئەمانەشەوە کۆمەڵگا توانی بەرهەمهێنان زیاد بکات و بەرهەمێکی زیاتر لە پێویستی خۆی بەدەست بهێنێت.

تا ئەو کاتە نەدەبوو هیچ گیروگرفتێك دەربکەوێت، چونکە شتە بەرهەمهێنراوەکان بەشێوەیەکی یەکسان و دادوەرانە بەسەر هەموو تاکەکانی کۆمەڵدا دابەش دەکران، با تێر نەکردنی پێداویستیە ماددیەکانی کۆمەڵگا بخەینە لایەك، چونکە لەگەڵ دەستپێکردنی ئەو رەوشە نوێیە، ئەوا مەسەلەی هەرە گەورە بۆئەوەی کە "کێ"

ببێتـە خـاوەنی ئـەو بەرهەمـە زیـاد و سـادە و سـاکارەی کـە دەرکەوتۆتـە روو، ئـەو مەسـەلەیەش هـەموو هەڵوێسـتە ئایـدیۆلۆژی و سیاسـیەکانی سـەراوژێرکرد؛ کـە بـواری لەبـەردەم رێکخسـتن و سیسـتەمی کۆمەڵایـەتی ئـاوەڵاکردبوو بـۆ وەسـتان لەسـەر پێیـان. ئەمەش کۆمەڵگای بەرەو فەیران و تەنگژە ئاراسـتە کـرد و نوێنەرایـەتی ئـەو قۆناخـەی کرد کە لەپێناوی مرۆڤایەتیدا پێویست بـوو. بێگومـان ئـەو پرسـە شـێوازەی چارەسـەری لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبوو، لەبەرئەوەی کۆمەڵگا سەرەتاییەکان کە لەشێوەی یەکێتی خێڵ و عەشیرەتەکان رێکخرابوون، ئەوا سەرکردەکانیان بۆ هێزی خۆیان پشتیان بـە کۆمـەڵگا دەبەست، بەهۆی ئەوەی کـە ئەوانـە هەنـدێك خزمـەتگوزاری گـرنگ و باشـیان پێشـکەش دەکرد، ئەوا دەستەیەکی رێکخراو لەوانە توانیان دەست بەسـەر بەرهـەمی زیـاددا بگـرن. ئەمەش لەقۆناخی بەربەریەتی باڵادا دەرکەوت.

ئـەو کۆمەڵـە سـەرەتاییانەی کـە بەیەکـەوە شـەڕ و کاریـان بـەڕێوە دەبـرد، ئـەوا تاکـەکانی ئـەو کۆمەڵـە بڕیارەکانیـان لەلایـەن زۆرینـەوە وەردەگـرت،"واتـە بڕیارەکـان بەشـێوەیەکی کۆمـەڵ (هـەروەزی) دەردەچوون". لەسـەر بنـەمای یەکسانی لەنێوانیانـدا دەژیـان و بەرەزامەنـدی خۆیـان سـەرکردەکانیان هەڵدەبـژارد. ئـەو کۆمەڵـە سـەرەتاییانە گـەواهی ئـەوەن کـە چـۆن لەدواییـدا سـەرکردەکان هێـرش و پـەلاماریان کردۆتـە سـەر بەهاکانی کۆمەڵگا و چۆن زەبروزەنگیـان لـەدژی تاکـەکانی کۆمـەڵ بـەکارهێناوە، تـاوەکو دەست بەسەر بەرهەمی زێدە و ئامرازەکانی بەرهەمهێناندا بگرن.

هەروەها لەبەرامبەر ئەمەشدا تاکەکانی کۆمەڵگا نەیانتوانی هەڵوێستێکی راست و دروستی ئایـدیۆلۆژی و سیاسـی وەربگـرن، بـۆ روونکردنـەوەی نەهێشتنی ئـەو رەوشـە. چونکە لەم قۆناخەدا شتی بابەتیانە بریتی بووە لە دابەشکردنی کاری نـوێ بـەپێی ئـەو جیاوازیـە چـینایەتیەی کـە ئەوکاتـە دەرکـەوت. پەرەسـەندنی موڵکـداری تایبـەتی و ئامرازەکـانی بەرهـەمهێنان کـە پەرەسـەندنی هێنایـەدی، ئاسـتی بەرهـەمهێنانی بەرزکردەوە. پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی تەنها لەرێگای کار دابەشـکردنی "هـزری، مـاددی، هێزی بازوو"وە دەتوانرا بەدی بهێنرێت.

پـاش دەرکـەوتنی بناخـەی مـاددی بـۆ پێکهاتـەی هێـزە دەسـەڵاتدارەکان، ئـەوا دروستبوون و پێکهێنـانی ئایدیۆلۆژیـەکان بۆتـە بەشـتێکی حـەتمی. سـەرکردەکان لـەڕێی ململانێـوە لـەپێناوی دەست بەسـەرداگرتنی بەرهەمـدا دەسـتیان بەخـەبات کـرد لـەدژی

ئایدیۆلۆژیای خێڵەکانی کۆن کە یەکسانی تێدایە و هەڵسان بە شێواندنی ئایدیۆلۆژی ئایینی کە لەنێو کۆمەڵگا بڵاو ببۆوە. بۆئەوەی بکرێتە داردەستێکی سروشتیانە لەپێناو خزمەتکردنی بەرژەوەندیەکانیان، بەهێزی ئایدیۆلۆژیاوە بنەمای شەرعی"یاسایی"دەسەڵاتی خۆیان سازکردووە، بەشێوەیەك خۆیان ڕێکخست کە بوون بەهێزێکی دەسەڵاتدار بەسەر کۆمەڵگادا.

ئایدیۆلۆژیای کۆنی خێڵەکی لەتوانایدا هەبوو سەرکەوتن بەدی بێنێ و ڕەوڕەوەی مێژوو بگەڕێنێتەوە دواوە. لەسەرەتای دروستبوونی کۆمەڵگای چینایەتیدا هێز و ڕەنجی مرۆڤ بەشێوەیەکی دژوار قۆرخ دەکرا. هەروەها بارودۆخی بەرهەمهێنان بەئاوێتەبوونی لەگەڵ شێوازی نوێی بەرهەمهێنان (شێوازی بەرهەمهێنانی کۆیلایەتی) بووە هۆی ئەوەی کە ژیانی بەشی هەرە زۆری کۆمەڵگا بگاتە ئاستێك کە نەدەتوانرا بەرگەی بگیردرێت. هەرچەندە ئەم شێوازە بەرهەمێکی زۆری بەدیهێنا، بەڵام سەرکردەکان بە پشتبەستن بە مافی دەسەڵاتدارێتی کە کۆمەڵ پێی بەخشیبوون، کۆمەڵگایان خستبووە ژێرباری فشار و چەوساندنەوە و لەڕێی زەبروزەنگەوە ڕەنجی ڕەنجدەرانیان قۆرخ دەکرد. بەمەش دەسەڵات و سەرکردایەتی خۆیان گۆڕی بەرەو دەزگایەکی سیاسیانە کە دەزگای دەوڵەتە، هەنگاویان هاوێشت. دەوڵەتیش بەگوێرەی خۆی دیلەکانی شەڕ و ڕەنجدەران و هەژارانی ناو کۆمەڵگای کردە کۆیلە و بەمەش بوار لەبەردەم هێنانە دی بڕێکی زۆرتری لە بەرهەمی زێدە ئاوەڵا بوو بۆ بەرژەوەندی ئەو کەسایەتیەی کە دەستی بەسەر ئامرازەکانی بەرهەمهێنادا گرتبوو. پێشکەوتنی کۆمەڵگای چینایەتی قۆناخێکی پێشکەوتنخوازیە لەمێژووی پێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا، چونکە بەهۆی کۆمەڵگای چینایەتیەوە توانرا پێشکەوتنی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، تەکنیکی، زانستی و هونەری بهێنرێتە دی. هەروەها لەگەڵ دەرکەوتنی بەرهەمی سەربار (الانتاج الزائد) بەشێکی کۆمەڵ بەبێ ئەوەی بەشداری لە بەرهەمهێنانی ماددیدا بکات، توانی خۆی بە بەرهەمهێنانی هزریەوە خەریك بکات، بەتایبەتیش لە بوارەکانی ئایدیۆلۆژیا، سیاسەت و هونەردا. هەروەها ئەو پەرەسەندن و پێشکەوتنەی کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەبواری ڕۆشنبیریدا هاتۆتە ئاراوە، تەنها لەخزمەتی پرۆسەی پەرەپێدان و چڕکردنەوەی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و شێوازی بەرهەمهێنانی کۆیلایەتیدا بووە.

لەم قۆناخەدا ئایدیۆلۆژیا رۆڵێکی گرنگی لە بایەخدان بە بەرهەمهێنانی هزری و ماددی و، بەرگریکردنی لە پێویستی هەبوونی چینە دەسەڵاتدارەکان بینی. لەمەشدا بوارێکی فراوانی لەبەردەم رێکخراوبوونی دەوڵەتی ڕەخساند. هەروەها رۆڵێکی گرنگی لە هاتنەکایەی ئەو پەرەسەندنانەی کە لەبواری زانستی، هونەری و فەلسەفیەوە بەدیهاتوون هەبووە. هەروەها دەوڵەتیش لەلای خۆیەوە خەباتی دەکرد لەدژی ئەو کەسانەی کە لەبەرامبەر ئەو شێوازەی بەرهەمهێنان بەرخۆدانیان دەکرد.

ئەو گۆڕانکاریەی کە ئایدیۆلۆژیای چینە دەسەڵاتدارەکان لە کۆمەڵگای چینایەتیدا هێنایەدی، بریتیبوو لە ئاسانکردنی پرۆسەی بەکارهێنان و قۆرخکردنی رەنجی مرۆڤ. هەروەها چینە دەسەڵاتدارەکان کە بەهێزی ئایدیۆلۆژیاوە سەرکەوتنیان بەدەستهێنا تا دوا رادە دەسەڵاتی خۆیان پتەو کرد و ژیانی کۆمەڵایەتیان خستە ژێر رکێفی خۆیان. لەو کاتەدا ئەوانەی جڵەوی هێزی سیاسەت و ئایدیۆلۆژییان گرتبووە دەست، لەبوارە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا، پێشکەوتن و پەرەسەندنێکی مەزنیان هێنایەدی. بەڵام کۆیلەکان کە "کۆمەڵە"یەکی سەرەکی بەرهەمهێنان پێك دەهێنن، لەهەموو شێوەکانی ئەو پێشکەوتن و پەرەسەندنانە بێبەش بوون. بەو شێوەیە بۆ بەردەوامکردنی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی، ئەوا پێویستی بەوە دەکرد کە مرۆڤایەتی ئەم قۆناخە دەرباز بکات.

لەبەر ئەوەی ئەو دەزگایەی بەناوی دەوڵەتەوە دەرکەوت و بە رێگای زەبروزنگ هەڵدەستا بە چەوساندنەوەی رەنجدەران، بووە هۆی ئەوەی کە چینە رەنجدەرەکان هەست بە تامەزرۆییەك بکەن بۆ پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی کۆن، کە ئەو پەیوەندیانە نوێنەرایەتی قۆناخێکی دەکرد، بەڵام بەمانەوەی رێکخراوی زەبروزنگ وەك خۆی کە دەوڵەتە، ئەوا لە سەرەتادا سیاسەت رۆڵێکی پیشکەوتووانەی بەخۆیەوە بینی، چونکە پارێزگاریکردن لە ژێرخانی کۆمەڵایەتی شتێکی پێویست بوو. ئەمەش بە پارچە پارچەکردن و هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندیە کۆنەکانی بەرهەمهێنان دەبوو، کە ببوونە کۆسپ و ئاستەنگ لەبەردەم هێزەکانی بەرهەمهێنان و بنیادنان و ئاواکردنی پەیوەندی تازە لە جێگەیاندا.

لە هەلومەرجێکی وەهادا کە زەبروزەنگ رۆڵی پێشکەوتووانەی لەمێژووی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیدا بینی، ئەوا سیاسەت رۆڵی خۆی گێڕا و، ئەم رۆڵەشی لەمێژووی

پێشـكەوتنی مرۆڤایەتیـدا وەك ڕۆڵێكـی پێشـكەوتووخوازانە بـوو. ئـەو سیاسـەتەی كـە بەئامانجی هێنانە دی پێشكەوتنی كۆمەڵایەتی سەریهەڵدا، وەكو ئامرازێك لەپێناو كۆسپ دروسـتكردن لەبـەردەم دەسـەڵاتی ئـەو چـینانەی كـە زاڵ ببـوون بەسـەر هێـزە كۆمەڵایەتییەكاندا بەكار نەدەهات. بەڵام ئایـدیۆلۆژیای دووەم لـە كۆمـەڵگای چینایەتیدا دەركەوت، دژ و ناكۆك بوو لەگـەڵ ئـەو فشارە سیاسـی و كۆمەڵایـەتی و ئابووریانـەی كە چینە دەسـەڵاتداراكان پـەیرەویان دەكـرد، كـە ئایـدیۆلۆژی چینە زۆرلێكراوەكـان بـوو. هەرچـەندە كۆیلـەكان بـە ئامـانجی رزگـاربوون لـە كـۆت و پێوەنـدەكان تـا رادەیـەك سـەرهەڵدانیان لـەدژ زۆرداری چـینە دەسـەڵاتدارەكان ئەنجامـدا، بـەڵام نـەیانتوانی سـەركەوتن بەدەسـت بێـنن و بـەئاواتی خۆیـان بگـەن. چـونكە نوێنەرایـەتی هێزێكـی كۆمەڵایـەتی پێشـكەوتووخوازیان نـەدەكرد و نـەیانتوانی سیاسـەت و ئایدیۆلۆژیایـەكی رێكخراو واقیعیانە دابرێژن. هـەروەها ئـەو هێـزە بەرهەمهێنـەرە تازانـەی كـە لەهـەناوی كۆمەڵگای كۆیلایەتیدا دەركەوتن، پێش هەموو شـتێك لـە ئاسـتی هزریـدا بـوونی خۆیـان نیشاندا و، شتێكی ئاشـكرا بـوو كـە لـەدژی ئـەو سـەرخان و پەیوەندیانـەی بەرهـەمهێنان درێژە بەخەباتی ئایـدیۆلۆژی خـۆی دەدات، كـە بوونەتـە كۆسـپ لەبـەردەم پەرەسـەندنی پێشكەوتنیان. لە ڕێی ئەو خەبات و تێكۆشانەش، ئەو ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتەی كە پێشتر ڕۆڵێكـی گرنگیـان دەبـینی، هەڵسـان بەنەهێشـتن و پاكتـاوكردنی كۆسـپ و تەگـەرەكان لەبـەردەم پێشـكەوتنی هێزەكـانی بەرهـەمهێنان. ئێسـتاكە دەیـانبینین بوونەتـە كۆسـپ لەبەردەم پێشكەوتنی ئەو هێزانـە. بەمشێوەیە و لێـرەدا گرنگـی ئایـدیۆلۆژیا و سیاسـەت بەتەواوی دەردەكەوێ.

بـۆ پێشخسـتنی هێزەكـانی بەرهـەمهێنان، پێویسـتە ئـەو سیاسـەتە كۆنـەی كـە بەردەوامە لەنانەوەی كۆسپ و تەگەرە، دروستكردن لە گۆڕەپاندا نـەمێنێ و لـەناو بـبرێ. بـە پێچـەوانەی ئـەوەش ڕەوشـی مەترسـی رووخـان و لەناوچـوون دەردەكـەوێت. ئـەم ڕەوشەش سەرتاپای كۆمەڵگا بەرەو پارچەبوون و هەڵوەشانەوە دەبات. ئەو كۆیلایەتیـەی كە بەزەبروزەنگ و فشار بەڕێوە دەبرا، گەیشتە سنوورێكی گاڵتەجاڕیانە و گوێنـەدان بـە بەرهـەمهێنان و ڕێكخسـتن و كۆمەڵایـەتی. ئەمـەش ڕێـی لەبـەردەم دابـەزینی داهـاتی بەرهەمهێنان خۆش كرد و ئەو دەزگایانەی لە ئارادا بوون لەگەڵ ڕێكخستنی كۆمەڵایەتی

بێ کاریگەر دەکرد و لەیەکتری دوور دەخستنەوە. کردنەوەی گرێ کوێرەی ئەو رەوشەش تـەنها بـە رێگایـەك مـەحاڵ بـوو، ئـەویش سـەرلەنوێ قازانجکردنـەوەی کۆیلەکانـە بـۆ بەرهـەمهێنان. ئەمـەش بـە هێشـتنەوەی شـێوازەکانی بەرهـەمهێنان لـە قـازانج و بەرژەوەنـدی کۆیلـەکان و بـە بەسـتنەوە و گرێـدانی مـرۆڤ بـە زەوی کـە ئەمانـە هێـزی بەرهەمهێنانی کۆمەڵگا پێکدەهێنن. لە راستیدا ئەمـەش رزگـاربوونی تـەواوی کۆیلـەکان ناگەیەنێت، بەڵکو ژیان لەچواچێوەی ئەو هەلومەرجە تازەیەشدا هـەر مانـای کۆیلایـەتی دەگەیـەنێت. ئـەم شـێوە چارەسـەریەش کـە کۆمـەڵگای لەپارچـەبوون رزگـار کـرد، بـۆ مرۆڤایەتی بە قۆناخێکی پێشکەوتووانە دادەنرێت.

لە رەوشێکی بەمشێوەیەشدا تاکـە هێزێـك کـە بتـوانێ سـەرکەوتن بـەدی بهێنێـت؛ ئـەوا بـریتین لـە نوێنـەرانی هێـزە بەرهەمهێنـەرە تازەکـان، بـەڵام ئەوانـەش بـەبێ ئایـدیۆلۆژیا و سیاسـەت نـاتوانن رۆڵـی خۆیـان بگێـڕن. بەتایبـەتیش بـۆ بانگەوازەکـەیان لەپێناوی ژیان و شـێوازەکانی بەرهـەمهێنانی نـوێ، دەبوایـە بـڕواو متمانـە بـە کۆیلـەکان بهێـنن. چـونکە بـەبێ سـەرکەوتن لەمـەدا نـاتوانرێ سیسـتەمی کـۆن لـەناو ببردرێـت و سیستەمی تازە ئاوا بکرێت. هەروەها لەم قۆناخەدا ئایدیۆلۆژیا بەتـەنها رۆڵـی پێشخسـتن و پەرەپێـدانی چـینە ئامـاژە پێکراوەکـان و نەهێشـتنی ئاسـتەنگی لەبـەردەم پێشـکەوتنی کۆمەڵایـــەتی نـــەدەبینی و بـــەس، بـــەڵکو ئـــەو چـــینانەش لەســـەرپێیان رادەگـــرن. پەرتەوازەبوون و لەیەك پچڕانی چالاکیەکانی بەرهەمهێنان دەبێتە مایەی دواکـەوتنێکی ترسناك بۆ مرۆڤایەتی، چونکە لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندیەکان، مرۆڤ بەرامبەر چـین و کۆمەڵگا بەتەنیا دەهێڵێتەوە، ئەمـەش وای لـێ دەکـات بکەوێتـە رەوشـێکی ئـاژەڵ ئاسـا. کەواتە ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت مەرجی سەرەکی و بنەڕەتین بۆ ناسینی چینەکان و گەلان و چۆنیـەتی پەرەسـەندن و سـەقامگیرکردنی وڵاتپـارێزی. لـە کاتێکـدا کـە ئایـدیۆلۆژیا و سیاسـەتی چـین و نەتـەوە چەوسـێنەرەکان، ئـامراز و داردەسـتێکە بـۆ رووتاندنـەوە و داگیرکردنـی گـەلانی دیکـە. لەهـەمان کاتـدا ئایـدیۆلۆژیا و سیاسـەتی چـین و گەلـە چەوساوەکان ئامراز و رێگای گەیشتنە بە رزگاری و ئازادی.

هـیچ قۆناخێـك لـە قۆناخـەکانی مێـژوو بـەبێ ئایـدیۆلۆژیا و سیاسـەت نییـە، ئـەم راستیەش لە هـەبوونی چـین و گـەل و نەتـەوە و وڵاتـدا خـۆی شاردۆتەوە، هـەروەها بـە درێـژایی مێـژووی کۆمـەڵگای چـینایەتی، ئایـدیۆلۆژیا و سیاسـەت رۆڵێکـی گرنگیـان لـە

خزمەتکردنی ئەوانەی کە بایەخ و گرنگی ئەو دوو شتە دەزانن و لێی تێگەیشتوون بینیوە. بەڵام ئەو چین و گەلانەی کە لەگرنگی و بایەخی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت نەگەیشتوون، ئەوا لەناو چوون و هەبوونیان سڕاوەتەوە.

هەر چین و گەلێك ئەگەر نەتوانێ ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتێکی ڕێك و پێك و گونجا و لەگەڵ ڕاستی مرۆڤایەتی خۆی بخولقێنێ، ئەوا ناتوانێ خۆی لەدژی بەتاڵان بردن و چەوساندنەوەی چینایەتی و بێگانە بپارێزێت. بەکورتی لێرەدا ڕۆڵ و گرنگی خەباتی سیاسی کە وەکو کۆڵەکەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی وایە، لە زۆربەی ئەو کۆمەڵگایانەدا کە لەناو ململانێ و هەڵئاوسانی نێوان پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان و هێزە بەرهەمهێنەرەکاندایە، ئەوا سەرەتا خەباتێکی ئایدیۆلۆژی و پاشان خەباتێکی سیاسی لەنێوان ئەوانەی کە نوێنەرایەتی هێزەکانی بەرهەمهێنانی کۆن و نوێ دەکەن، دەردەکەوێت. لەکۆتاییدا ئەو خەباتە لەسەر دەوڵەت چڕ دەبێتەوە و دەبێتە ململانێ لەپێناو پارێزگاریکردن و پاراستنی دەوڵەت یان بۆ لەناوبردن و نەهێشتنی دەوڵەت و ئاواکردن و بوونیادنانەوەی دەوڵەتی نوێ لەسەر شوێنەواری دەوڵەتی پێشوو.

سیاسەتی شۆڕشگێڕانە، ئەو دەوڵەتە لەنێو دەبات و دەیڕوخێنێت کە پارێزگاری لە پەیوەندیە کۆنەکانی بەرهەمهێنان و ئەو سەرخانە دەکات کە بۆتە ئاستەنگ و کۆسپ لەبەردەم پێشکەوتنی هێزە کۆمەڵایەتیە نوێیەکان. هەروەها سەرخان و دەوڵەتێکی نوێ لەسەر پاشماوەکانی ئەوەی پێشوو ئاوا دەکات کە نوێنەرایەتی پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنانی نوێ بکات، ئەمەش لەڕێگای شۆڕش کردنەوە ئەنجام دەدرێت. هەروەها تەنیا بە ئەنجامدانی شۆڕشە، کە کۆمەڵگا لەپێکهاتەی کۆنەپەرستانەی کۆن و هەموو جۆرەکانی پەرت و بڵاوی و سڕبوون ڕزگار دەکرێت و سەرلەنوێ بەپێی داخوازیەکانی قۆناخ دادەڕێژرێتەوە. ئەو خەباتە سیاسیەی کە لەڕێیەوە دەتوانرێ گەل لە سڕبوون و چەوساندنەوە ڕزگاری بێت ئەو خەباتە خەباتێکی شۆڕشگێڕییە و، ڕزگاری چین و گەلان لەڕێگای ئەو خەبات و تێکۆشانە شۆڕشگێڕییە دەبێت کە کاریگەری ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتێکی پەرت و بڵاو و هەموو شێوەکانی دیکەی نامۆبوون ناهێڵێت و لەناویان دەبات. ئەو سەردەمەی ئێمەش هەموو ڕەگەزە نیگەتیفەکانی کۆمەڵگای چینایەتی لەهەناوی خۆیدا هەڵگرتووە کە میکانیزمی فشار و پێشێل کردنیان بەرەو پێش بردووە.

بۆئەمەش خەبات و تێکۆشانی چین و گەلان لەدژی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتی دەوڵەتی کۆلۆنیالیستی سەرمایەداری کە فراوان بووە و بۆتە بارێکی گران بە سەرشانی کۆمەڵگاکانەوە. بۆیە سازکردنی شۆڕش بەپشت بەستن بە ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت وەکو پێویستیەکی سەرەکی ژیان وایە لەپێناو رزگاری گەلان و، بەپێچەوانەی ئەمەشەوە ناتوانرێ چاوەڕوانی دوارۆژێکی ئازاد بۆ ئەو چین و گەلانە بکرێت کە لەژێر دەسەڵاتداری داگیرکەری و سەرمایەداریدا ماونەتەوە.

## جۆرەکانی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتی دەسەڵاتدارەکان لەمێژوودا

جۆری یەکەم بریتیە لەئایینی سروشتی "تۆتەم" کە رێکخەری بیر و بۆچوونەوکانی خەڵکە دەربارەی ژیان و رووداوە سروشتیەکان، ئەمەش واتە "تۆتەم" رەنگدانەوەی نەخشەی هزری و کۆمەڵە سەرەتاییەکانە کە بەشێوەیەکی سەربەخۆ وەکو یەکەیەکی بەرهەمهێنانەکان وابوون، بۆ کۆمەڵگا سەرەتاییەکان"خێڵەکان" کە پەیوەست و گرێداو بە پەیوەندیەکانی خوێن. هەروەها ئەو خێڵانەی کە هێزەکانی بەرهەمهێنانیان جیاواز و بچوك بووە رازی نەدەبوون بەوەی کەهیچ کەسێك لەخێڵەکەیان وون بێت یاخود یەکێکی لەدەرەوە بێتە ناو ریزەکانی ئەو خێڵە. هەربۆیە سروشت و خووی ئەو خێڵانە بەدیل گرتنیان پەسند نەدەکرد و نەدەبوونە دیل، هۆیەکەشی بریتیە لە کۆتایی لاوێتی تۆتەم. هاوکات ئەمەش کۆتایی خێڵ دەگەیەنێت. ئەم وتەیەش بۆ ئەو خێڵ و عەشیرەتانە دەگرێتەوە کە هێزەکانی بەرهەمهێنان و کەرەستەکانی بەرهەمهێنانیان زیاتر پێشکەوتووە. هەروەك چۆن ئایدیۆلۆژیا "ئایین"ەکانی ئەو خێڵ و هۆزانەی بە شێوەیەکی سروشتی پێکهاتبوون، هەروەکو چۆن هیچ ئارەزوو و مەیلێکیان بۆ کۆیلایەتی و فراوانبوون پەسند نەدەکرد، ئەوا بەهەمان شێوەش هیچ کامیان کۆیلایەتیان پەسند نەدەکرد.

دابەشکردنی کار، بەرهەمهێنان، ئامێرەکانی بەرهەمهێنانی پەرەپێدا و گەیاندیە ئاستێکی بەرزتر، چونکە هەر دابەشکردنێکی نوێ لەکاردا پێشکەوتن و بەرزبوونەوەی زیاتری بەرهەمهێنان دەهێنێتە کایەوە و، بەرزبوونەوەی بەرهەمهێنان بە بەردەوامی لەئەنجامی دابەشکردنی کار لەنێوان ژن و پیاودا لەبواری راوکردن و کۆکردنەوە،

بەخێوكردنی ئاژەڵ و كشتوكاڵ كردن، كشتوكاڵ و پیشە دەستیەكان پێشكەوتنێكی گەورەی لەهێزەكانی بەرهەمهێنان هێنایە دی. ئەمە بووە مایەی دابەشبوون و جیابوونەوی رەنجی بیر و هێزی بازوو و، هەروەها بووە هۆی هێنانە دی جۆرێكی تازەی رێكخستنی كۆمەڵایەتی و زیادبوونی بەرهەم. لەپێناوی زیادكردنی بەرهەم و بەرزكردنەوەی بەرهەمهێنان و پارێزگاریكردن و بەرگریكردن لە بەرامبەر پەلامار و بەتاڵان بردنی خێڵەكانی دیكە، یەكێتی نێوان خێڵ و عەشیرەتەكان سازكرا، ئەمەش بە كۆبوونەوەی چەند خێڵێك لەدەرەوەی یەكتری لەشێوەی رێكخستنی سادە و ساكاردا كە بووە هۆی گۆڕان و گواستنەوەی بەرەو رێكخستن و دامەزراوەكانی دەوڵەت و لایەنە سیاسیە بەهێزەكان.

ئەو كۆمەڵگایانەی كە لەسەرەتادا بەو شێوەیە رێكخراو بوون و، لەدابەشكردنی بەرهەم سیستەمی كۆمۆنەیان دەپاراست، بەڵام بەرزبوونەوەی ئاستی بەرهەمهێنان و بەیارمەتی و هاوكاری بەرهەمهێنانی بیر ئەم زیادبوونەی بەرهەم كە پێویستیە سەرەكیەكانی كۆمەڵگای تێپەڕ دەكرد، لەلایەن ئەو سەركردانەی كە دەسەڵاتیان رەزامەندی تاكەكانی كۆمۆنەیان وەرگرت و لەپاشان ئەو دەسەڵاتەیان لەدژی ئەوان بەكارهێنا و دەستیان بەسەر بەرهەمی زیادە گرت. بەمەش جیاوازیەكی چینایەتی قووڵ لەناو كۆمەڵگادا دەركەوت و بەمشێوەیە دەوڵەت وەكو ئامرازێك دەركەوت بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەكانی دەسەڵاتداران و بەرێگای دەوڵەتەوە كۆمەڵیان خستە ژێر ركێفی خۆیان و دەستیانكرد بە چەوساندنەوەیان.

هەر لەو قۆناخەشەوە، ئەو كەسانەی مامەڵەیان لەگەڵ بەرهەمهێنانی هزریدا دەكرد، لەپێناوی خۆسەپاندن بەسەر كۆمەڵگادا كاریان دەكرد و بانگهێشتی ئەوەدابوون كە گوایا ئەوانە هەڵبژێردراون و بەبێ ئەوان كۆمەڵگا ناتوانێت بژیت.

لەهەر قۆناخێك لە قۆناخەكانی پێشكەوتنی كۆمەڵگادا، ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتی دەسەڵاتدار رەنگدانەوەی پەیوەندیە باوەكانی بەرهەمهێنانە. واتای ئەمەش ئەوەیە كە ئەو چینانەی دەسەڵاتیان بەسەر بەرهەمهێنانی مادیدا هەیە، ئەوا ژیانی سیاسیش لەژێر دەسەڵاتی ئەواندایە. ئەمەش دەربڕینێكی چڕوپڕی واتای ئەو ئابوورییە دەگەیەنێت كە گرێدراوە بە ژیانی هزری كۆمەڵگاوە.

دەوڵــەتی کۆیلایــەتی ئامرازێکــە بــۆ پاراســتن و پێشخســتنی بەرژەوەنــدی کۆیلـەدارەکان، کـە ئەمـەش ئاستی بەرهـەمهێنان لـە رێگـای یەکخستنی رەنـج و توانـای خەڵکێکی زۆرەوە لەچاو رابردوو بـەرزتر دەکاتـەوە. هـەروەها بەرادەیـەکی زۆر کۆنترۆڵ کردنــی مــرۆڤ دێتــەدی و پەیوەندیــەکانی خــوێن هەڵدەوەشــێنەوە. لەگــەڵ پێکهێنــانی ناسنامەی تاکەکەس لەسەر بنەمای دەوڵەت، دەستکرا بـە بەرنامەرێـژ کـردن بـۆ گۆڕینی خێڵە بێگانەکان بۆ کۆیلە و، دەرەنجامی ئـەو فراوانبوونـەی کـە لەشـێوەی کۆکوژیـەکان و تاڵانکردن و کاولکاری ئەنجامـدرا، پەیـدابوون و دەرکـەوتنی کۆیلایـەتی لەگـەڵێك شوێنی وەکو هیند و رۆژهەڵاتی ناوین و کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاستی لەگەڵ خۆیدا هێنا.

ئــەو دەوڵەتــە بێگانەیــەی کــە لەســەر بنــەمای پــەیڕەوکردنی زەبــروزەنگ و سـەرکوتکردنی توندوتیـژی گـەل و عەشـیرەتەکانی دیکـە و کۆیلـەکان دامـەزرا، بەچـەند شێوەیەکی جۆراوجۆر دەردەکەوت، وەکو پاشایەتی، ئارسـتۆکراتی و تیـۆکراتی، هـەروەها ئـەو پاشایانەی کـە هێـزی سیاسی دەوڵـەتیان خستە ژێـر ئـیرادەی خۆیـان و بانگەشـەی خوداوەندیان دەکرد، بەرادەیەکی وەها خۆیان سەپاند کە پرسە هزریـەکانی خەڵکیشیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان.

ئایـدیۆلۆژیای کۆیلایـەتی کـە داوای پەرستنی پاشـا خوداوەنـدەکانی دەکـرد، بـەڵام هەموو پاشاکان لەدژی ئایینە سروشتیەکان دەردەکەوتن. ئەمەش هۆکار و ئامرازێك بـوو بـۆ پاراسـتنی سیسـتەمی کۆیلـەداری، بـەئامانجی بـەکارهێنان، رووتاندنــەوەی رەنــج و توانـاکـانی مـرۆڤ. ئەمـەش بەدزیـەکی گـەورەی رۆژانـە دادەنرێـت، بـەئامانجی پاراسـتنی ســامانی خــاوەن کۆیلــەکان و، رێگــاگرتن لەســەرهەڵدان دژی خــاوەن کۆیلــەکان و چاودێریکردنی بەرژەوەندیەکانیان.

هـەروەها دەبیـنین کـە خوداوەنـد و ئـەو بابەتانـەی کـە لـەو شـێوەیەن دەتـوانێ هەرشـت بکـات و، ئـەوەی لەهـەموویان گـرنگتر بـووە بریتییـە لـە سـتایش کـردن و بەرزکردنەوەی کاری هزری و بچووك روانـینی بەرهـەمهێنانی مـاددی. ئەمـەش لەلایـەن زۆربەی خەڵکەوە ئـەوەی دروست دەکـرد کـە خۆیـان و بـەروبوومی رەنجیـان ببەخشـنە خـاوەن ئـەو کۆیلانـەی کـە بەرهـەمی مـاددی و کولتـووری کۆمەڵایـەتیان خسـتبووە ژێـر دەسەڵاتی خۆیان و رێگەیان لەبەردەم پێشکەوتنی کولتووری و هزری و ...هتددا گرتبوو.

هەرچەندە کە کۆمەڵگای کۆیلایەتی گەلێك شارستانیەتی بەرزی ئافراند، لەبوارەکانی گەردوونناسی، بیرکاری، فەلسەفە و ماف، بەتایبەتیش پەرەسەندنی هونەر لە یۆنان و رۆما، کە گەیشتبووە لوتکە، بەڵام ببوە کۆسپ و ئاستەنگ لەبەردەم چینە زۆرلێکراوەکانی کۆمەڵگا، لەسەرووی هەمووشیانەوە کۆیلەکان.

هەروەها لەبەرامبەر ئەو فشارە زۆرەی سیستەمی کۆیلایەتی، بۆئەوەی خەڵکی ئازاد نەکرێنە کۆیلە و، بوونی ئارەزووی گەلە بندەستەکان بۆ ئازادی و پاراستنی وڵاتە سەربەخۆکان بۆ گەلان، ئەو شێوازە نوێیەی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت لەخزمەتی تێکۆشان لەدژی خاوەن کۆیلەکان هاتنە ئاراوە. ئەگەرچی کۆیلەکان نەگەیشتنە ئەو ئازادییەی کە دەیانویست، بەڵام ئەو تێکۆشانە کاریگەرییەکی گەورەی لە نەهێشتن و لەناوبردنی سیستەمی کۆیلایەتی هەبوو. ئەمەش بەئاشکرایی لە مێژووی یۆنانی کۆن دەردەکەوێ، کە لەبواری فەلسەفەدا پڕبوو لە ململانێی نێوان ئایدیالیزم و دیالەکتیك لەلایەك و لەنێوان ماتەریالیزم و ئایدیالیزم لەلایەکیتر.

سیستەمی کۆیلایەتی کە هەموو جۆرەکانی چەوساندنەوە و توندوتیژی بەسەر کۆیلەی تیا پەیڕەو دەکرا. کاتێك رەنجی مرۆڤیان فۆرخکرد و کردیان بە ئامرازێکی سەرەکی بەرهەمهێنان، ئەوا ئاستی بەرهەمهێنان نزم بوەوە و سیستەمی کۆیلایەتی گەیشتە ئاستێك کە بووە ئاستەنگ لەبەردەم پێشکەوتنی هێزەکانی بەرهەمهێنان. نوێنەرانی هێزەکانی بەرهەمهێنانی تازەش کە لەهەناوی کۆمەڵگای کۆیلەداریدا دەرکەوتبوون، لەئاستی ئایدیۆلۆژیدا بۆ سەپاندنی بەرژەوەندییەکانی بەرهەمهێنان کە رێك و گونجاو بوو لەگەڵ پێشکەوتنیان دەستیان بەخەبات کرد. لەپێناو ئەمەشدا پێویست بوو کە چین و توێژە ستەم لێکراوەکان بۆ تێکۆشان بێنە ریزی خۆیان. ئەمەش بەرازی کردن و باوەڕ پێهێنانیان بە پێویستی ئەنجامدانی ئەو خەبات و تێکۆشانە دەکرا.

ئایدیۆلۆژیای دەرەبەگایەتی کە لەچوارچێوەی ناکۆکیەکانی کۆمەڵگای کۆیلەداریدا لە شێوەی ئاییندا دەرکەوت، لە ململانێی خۆی لەگەڵ خاوەن کۆیلەکاندا هەوڵی قازانجکردنی کۆیلەکانی دەدا، ئەوەش بە سۆز و بەڵێندان بە کۆیلەکان کە زەوی و ئازادیان دەدرێتێ. بانگکردنیان بۆ سیستەم و رێکخستنی کۆمەڵایەتی نوێ، لەگەڵ ئەوەشدا لەناوچوونی سیستەمی کۆیلایەتی لە بەرژەوەندی کۆیلەکاندا بوو، چونکە

کۆیلەکان بە ڕێگای ئەم ئایدیۆلۆژیایە لەم ڕەوشە ڕزگاریان دەبوو، کە ئەو کاتە وەکو ئامێرەکانی بەرهەمهێنان بوون. ئیدی کۆیلەکان پەیتا پەیتا دەبوون بە خاوەن بەشێکی بەرهەم و ئامێرەکانی بەرهەمهێنان. بەو شێوەیە لە بەرامبەر ئایدیۆلۆژیای کۆیلەداری کە هێز و گەورەیی و خاوەنی کۆیلەکان نیشان دەدات کە بە خوداوەند و تایبەتمەندی خوداوەندی پێناسەدەکران ئایدیۆلۆژیای ئایینی دەرەبەگایەتی سەریهەڵدا. ئایدیۆلۆژیای ئایینی باسی لەوە دەکرد کە خاوەنی قۆناخێکە تیایدا هێزێکی ڕۆحی لەسەر هەمووشتێك دەسەڵاتدارە، کە ئەویش خودایە و لە مادده جیایە و ناتوانرێت ببینرێ. هەروەها سەرکردە نوێیەکانی کۆمەڵگا دەرکەوتن کە ئەوانیش بریتی بوون لە پێغەمبەران و پاپاکان، کە لەسەر زەوی خۆیان بەنوێنەری خودا دادەنا.

ئایدیۆلۆژیای ئایینی دەرەبەگایەتی کە ڕوخسار و ئاکاری"فتح"ی لەناوەڕۆکی خۆیدا هەلگرتووە، لە هەمان کاتدا خاوەنی گەوهەری ئەو کۆمەڵگایانەیە کەتیایدا بلاوبۆتەوە. ئایدیۆلۆژیای دەرەبەگایەتی و گەیاندنی چین و توێژە چەوساوەکان بۆ ڕەوشێکی سەقامگرتووی نامۆبوون لە ڕەنج و خودی خۆیان، هەروەها بەهەموو توانایان کاریان دەکرد تاوەکو ئەزەلیەتی ئەو سیستەمە لە مێشك و دەروونی خەڵك بچەسپێنن. ئەم ئایدیۆلۆژیایە موڵکایەتی تایبەت بە بەشێکی پیرۆز دادەنێ و پاراستنی ژێرخانی دەرەبەگایەتی دەماگیری ئایینی مەیسەر دەرکرد و، فەرمانی ئەوەی دابوو کە ئەو کەسانەی لە فەرمانی دەرەبەگەکان دەردەکەون، بەتوندی سزابدرێن. بەم شێوەیە لەژێر ناوی "خودا" موڵکایەتی تایبەتیان خستبووە ژێر دەستی خۆیان.

هەروەها بە پشتبەستن بەو ئایدیۆلۆژیایەی کە نوێنەرایەتی دەکات، دەرەبەگەکان لەدوای قازانجکردنی پشتگیری کۆیلەکان لە ڕێگای سازکردنی جووڵانەوەیەك و هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی کۆیلایەتی و پێکهێنانی هەندێ چاکسازی و گۆڕانکاری کە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانیان دەگونجا، ئەمەش لە شێوەی کەرت و دامەزراوەکانی ئیمپراتۆریەت، ئەو دەوڵەتەیان دورست کرد، کە پارێزگاری لە بەرژەوەندی چینایەتی یان دەکات. ئەو دەوڵەتە فیۆدالیانەی لە ڕێگای تێکدان و تالان و فراوانبوون لەسەر خاکی گەلانی دیکە و داگیرکردن بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای دەرەبەگایەتی "فەتحکەر"دا دەسەڵاتی خۆیان بەسەر گەلاندا سەپاند. لەئەنجامی ئەو فراوانخوازیەدا گەلێك کۆکوژی و شەڕ بەرپابوون، وەکو شەڕەکانی مەسیحیەت لە ئەوروپا و ئیسلام لە

خۆرهەڵاتی ناوین و باکووری ئەفریقیا و بوودایی لە باشووری ئاسیا، ئەو ئایدیۆلۆژیانە دابەش بوون بۆ سەر چەند جۆرێکی جیاواز، کە بەشێك لەوانە گەلانیان لەناو دەبرد و بەشێکی دیکەیان رۆڵێکی گرنگیان لە دورستبوون و پێکهاتنی گەلان وەکو نەتەوە بینیوە. هەروەها دەرەبەگەکان فشارێکی کەمیان دەخستە سەر کۆمەڵگا و چینی کۆیلەکان، لەگەڵ ئەوەشدا چەوساندنەوەی چینایەتیان بە شێوەیەکی زیاتر چەسپاند. ئەوەش بە دەرخستنی شێوازی بەرهەمهێنان و پەیوەستبوون بە زەویەوە بوو. هەروەکو رەوشی کۆیلایەتی هەڵسان بە بەخشینی گۆڕەپانەکان بۆ بەرهەمهێنان و، لە بەرامبەر ئەمەشدا لەو سەردەمەدا گەلان بەردەوام بوون لە خەبات کردن بە شێوەیەکی بەهێز.

هەروەها مۆدیلی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی رێگای لە پێشکەوتن و پەرەسەندنی تەکنەلۆژیای بەرهەمهێنان دەگرت و بەدرێژایی سەدەکانی ناوەراست هیچ پەرەسەندنێکی بەرچاوی لە زانستیدا نەهێنایە دی. لەگەڵ ئەوەشدا توندڕەی ئاینییان لەگەڵ زانستدا ناکۆك دەبینی. لەلایەن دەرەبەگەکانیشەوە ئەو پێشکەوتن و پەرەسەندنە هونەری و زانستیەی کە پاشماوەی سەردەمی کۆیلەیەتی بوو، پشتگوێ خرا. بۆیە پێویست بوو لەسەر بنەمای شێوازی بەرهەمهێنانی تازە زانست خۆی رزگار بکات.

ئایدیۆلۆژیا ئایینیەکانی دەرەبەگایەتی کە رەنگدانەوەی پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنانی دەرەبەگایەتی و گرێدان بە خودا و گوێڕایەڵی کردنی دەرەبەگ و پاشاکانیان کردە یەك و، هەروەها لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا بووە کۆنەپەرستی و کۆسپ و تەگەرە لەبەردەم پێشکەوتنی هێزەکانی بەرهەمهێنان و پێشکەوتن و پەرەسەندنی زاستیانەی ئایدیۆلۆژیا. هەروەها لە پێناو پاراستنی پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنانی دەرەبەگایەتیدا بوو بە تلیاك بۆ سڕکردنی چین و گەلە زۆرلێکراوەکان، بەڵام جوتیارە ئازادەکان بە بەکارهێنانی هەموو شێواز و ئامرازەکانی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت دەستیان بەخەباتێکی چڕوپڕ کرد و لەدژی سیستەمی کۆیلایەتی و لەپێناو پاراستنی سەربەخۆیی گەلان و رزگارکردنی چینە زۆرلێکراوەکان. ئەو خەباتەش بەهۆی ئەو ستەم و زۆرداریەی دەرەبەگایەتی کە بەسەر جوتیارە ئازادەکان و گەلان پەیڕەوی دەکرد، گۆڕەپانێکی بەرفراوانی لە دونیادا گرتەوە. لە کاتێکدا کە ــ دەمارگیری ئایینی و بنبەستبوونی ئابووری و پێکهاتەی دواکەوتووی ئایدیۆلۆژیا ــ لەسەدەکانی ناوەڕاستدا

ڕێگایان بە لەدایکبوون و دەرکەوتنی ئایدیۆلۆژیایەکی تر نەداوە و کردوویانەتە شتێکی ئاستەم. بەمجۆرە خێرایی ململانێی نێوان چەوساوە و چەوسێنەران تەنها لە شێوەی شەڕە مەزهەبییەکان بەردەوام بوو، تەنانەت بۆرژوازیش کە دەرکەوت وەك چینێکی تازە گەشە و پەرەسەندنی دەستپێکرد، لەسەرەتای خەباتکردنی لەدژی دەرەبەگایەتیدا شێوازی مەزهەبیانەی گرتۆتە خۆی، وەکو پرۆتستانت لە ئەڵمانیا و ئەنگلیکی لە ئەنگلتەرا و کلفانی لە فەرەنسا و، هەموو ئەمانەش بریتی بوون لە گۆڕین و لەڕێ لابردنی ئایینی مەسیحی بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانی بۆرژوازیەت.

کاتێك سەرمایەداری وەکو مۆدیلێك و شێوازێکی تازەی بەرهەمهێنان لە هەناوی کۆمەڵگای فیوداڵیدا گەشەی کرد، ئەوا ئەو بنبەستبوونەی دەرەبەگایەتی شوێنی خۆی بۆ دینامیکیەتی سەرمایەداری و دۆگماتیزمیش بۆ زانست چۆڵکرد. هەروەها زانستیش لە ماوەیەکی کورتدا لەدژی فشار و گوشاری ئایینەکان راپەڕی، چونکە نەدەتوانرا بەبێ پێشکەوتن و پەرەسەندنی زانست بۆرژوازیەت پێش بکەوێ. بەو شێوەیە ململانێ و شەڕێکی چینایەتی لەدژی دەرەبەگایەتی بووە شتێکی پێویست. لەم شەڕەشدا بۆرژوازیەت کەڵکی لە لاوازی دەرەبەگایەتی وەرگرت کە لەناوخۆیان لە ململانێدا بوون و گەلیش لە رەوشت و هەڵسوکەوتی دەرەبەگایەتی بێزار ببوو.

دادوەری بۆرژوازی بریتییە لەڕەنگدانەوەی ئەو گۆڕانکاریانەی لەلایەنی بنەمای ئایدیۆلۆژیاوە لەدژی بەرژەوەندی دەرەبەگەکان دروست دەبن. برایەتی بۆرژوازی بەواتای رێکخستنی خەڵکی دیکەش دێت. ئەو کەسانەی کە خاوەنی هەمان کولتوور و زمان و لەسەریەك خاکدا دەژین، لەدژی پارچەگەرێتی دەرەبەگایەتین و ئەم رێکخستنەش لە چوارچێوەی یەکێتیەکی ئابووریانەدا دەبێت. بۆ بەرگری کردن لە ئازادی بۆرژوازییەت بەواتای کاری ئازاد و سەربەستی و دوور لەڕێکخستن دێت. بەو رەنگە بۆرژوازیەت وەکو هێزێکی جەماوەری لەنێو یستەمی دەرەبەگایەتی سەریهەڵدا.

بۆرژوازی نەتەوەیی کە دروشمی "ئازادی و دادوەریی و برایەتی" کردە ئامانجی خۆی، لەسەرەتادا و لەبەر ئەوەی کە دیموکراسی و زانستی بوو هەموو چین و توێژە چەوساوەکانی کێشایە ناو جووڵانەوەکە و خۆیشی رۆڵی سەرۆکایەتی لەو شۆڕشدا بینی.

بزووتنەوەی بۆرژوای دیموکراتی کە لەسەر بنەمای نەتەوایەتی بۆرژوازی بووە هێزێکی سیاسی و لەماوەیەکی کورتدا لە هەموو روویەکەوە بەسەر دەرەبەگایەتیدا

سەرکەوت. شۆڕشە بۆرژوازییەکان گەلێك پێشکەوتنیان لەبوارە جۆراوجۆرەکانی وەکو بەرهەمهێنان و تەکنەلۆیا و زانست و فەلسەفە و...هتدا بەدەستهێنا، پڕبوون لە ململانێ. نموونەی ئەو شۆڕشانەش لە شۆڕشی فەڕەنسادا دەرکەوت. بۆرژوازییەت لە ناوەڕاستی سەدەکانی نۆزدەهەمدا جگە لە ئیرلەندا، زنجیرەیەکی شۆڕشی لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا بەرپاکرد و لەسەر بنەمای سنووری نەتەوایەتی، دیموکراسیەتی بۆرژوازی دامەزراند.

بەلووتکە گەیشتنی نیشتمانپەروەری و نەتەوایەتی، لەپێناو بونیادنانی دەسەڵاتی زهنیدا، بۆرژوازییەت دەسەڵاتی سیاسی گرتە دەست. هەروەها دروشمی برایەتی، دادوەری و ئازادی، کە بۆرژوازییەت بۆ ڕاکێشانی سەرنجی جەماوەر بەکاری دەهێنا، ڕێگای نەدەدا تاوەکو ئەو دروشمانە بگەنە وڵاتە کۆلۆنیکراوەکانی ژێردەستیان. نەك تەنها ئەمە، بەڵکو حەزیان نەدەکرد جەماوەری ئەو وڵاتانە هەست بە پێویستی ئازادیش بکەن. چونکە کاتێك بۆرژوازیەت دەسەڵاتی سەقامگیر و پتەو کرد، تەنها بەخستنە ژێر دەستی بازاڕەکانی ناوخۆ تێر نەدەبوو، لەبەرئەوەی لەلایەك پەرەسەندنی بەردەوامی تێکڕای بەشەکانی پیشەسازی، پێویستی بە هەبوونی بازاری دەرەوەی بەسەر بۆرژوازیەتدا دەسەپاند، لەلایەکی دیکەشەوە بۆرژوازیەت بەبێ ئەفراندنی نوێ و تازە بەشێوەیەکی بەردەوام ناتوانێ بژی. بۆیە شۆڕشی پیشەسازی هەڵسا بە خێراکردنی پەرەسەندنی تەکنەلۆژیا. ئەو ژێرخانەی کە سەرمایەداری ئافراندی، ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتێکی هاوچەرخی هێنایەدی، هاوکات لەگەڵ ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتە جۆراوجۆرە جیاوازەکانی تر کە دەسەڵاتیان زاڵ بوو بەسەر دونیادا، هەوەکو چۆن بەرهەمهێنانی ماددی گۆڕانی بەرسەدا هات، بەهەمان شێوە ئەو گۆڕانە بەرهەمهێنانی کولتووریشی گرتەوە و نەتەوەکانی بە یەکترییەوە گرێدا. سەرمایەداری بە خولقاندنی کار دابەشکردنی فراوان لە ئاست و چوارچێوەی وڵات و دونیادا، چەوساندنەوە و بەرهەمهێنانی زیاتر چڕکردەوە. لەگەڵ چڕکردنەوەی بەرهەمی پیشەسازی و کۆکردنەوەی پرۆلیتاریا لەیەك شوێندا، هەرچەندە ئەمەش لەژێر سەرکردایەتی خودی بۆرژوازی دابوو، بەڵام بەردی بناخەی یەکگرتنی لەنێوان پرۆلیتاریادا جێگرکرد.

بۆرژوازییـەت کـە خـاوەنی شـێوازێکی دووڕووییـە، کـاتێ هەسـتی بـەوە کـرد کـە کەوتۆتە ژێر فشاری پرۆلیتاریا و ڕۆژ بە ڕۆژ ئەو فشارە زیاتر دەبـێ، یەکسەر گۆڕانێکی راسـتەوخۆی دەسـتپێکرد لـە پێشکەوتووخوازیەوە بـۆ کۆنەپەرسـتی و پاشـڤەڕۆیی، لـە نیشتمانپەروەرییەوە بەرەو کۆسمۆپـۆلیتکی. هـەروەها کاتێـك کـە پرۆلیتاریـا لەبەرمبـەر دادوەری بۆرژوازیـدا خاوەنـدارێتی بەکۆمـەڵێ ئـامرازە بەرهەمهێنـەرەکانی خسـتە ڕوو، یـەکگرتنی پرۆلیتـاری جیهـانی بەلەرامبـەر برایـەتی بـۆرژوازی و ئـازادی راسـتەڤینەی پرۆلیتاری لەبەرامبـەر ئـازادی رووکەشـی بۆرژوازیـەت رووی خـۆی لەشـۆڕش وەرگێـڕا و سۆڤیەت و کۆسمۆپۆلیتیکی دەرخستە ڕوو. هەروەها پەیمان بەستنی بۆرژوازیـەت لەگـەڵ هەموو شێوەکانی کۆنەپەرستی، تەنانەت دەرەبەگایـەتیش. لەهـەمان کاتـدا ئایـدیۆلۆژیای بۆرژوازی هیچ دوو دڵ نەبوو لەخۆگونجاندن لەگەڵ ئایین و هەنگاونان بەرەو ڕێککەوتن لەگەڵ نوێنەرایەتی ئایین لەپێناوی دژایەتیکردنی کۆمۆنیزمدا.

ئیمپریالیزم کـە دوا قۆنـاخی بـاڵای کۆمـەڵگای چینایەتیە، بـەهۆی چـڕکردنەوەی سـەرمایە و بەرهـەم، پێشکەوتنی سیاسـەتی گەیانـدە لووتکـە. هـەروەها گەیشـتنی هێـزە سیاسیەکان بە لووتکە، واتای گەشتنی ئامرازی زەبروزەنگە بۆ ئاستی هەرە کاریگەر.

هــەموو شــێوازەکانی دەوڵــەت و ئۆلیگارشــی و فاشــیزم و...هتــد لــە وڵاتــە سەرمایەداریەکان ڕەنگی خۆیان لەناو هەموو بوارێکی گۆڕەپانەکانی ژیانـدا بڵاوکـردەوە. هەروەها بۆرژوازیـەت لـە مـاوەی هـەردوو شـەڕی گـەورەدا ژیـا و بەژێرکـەوتوویی تیایـدا دەرچوو و سێ لەیەکی ئـەو زەویانـەی داگیری کردبـوو، لەدەسـتیدا و بـۆ درێـژە پێـدان و بەردەوامکردنی تاڵانکاری لـەبواری ئایـدیۆلۆژی و سیاسـەت و بـێ و زەبروزەنگدا هـەموو شێواز و ڕێبازێکی بەکارهێنا.

لەگــەڵ دەرکــەوتن و پەرەســەندنی ســەرمایەداریدا، پرۆلیتاریــاش دەرکــەوت و پەرەیسەند، بەشێوەیەك وەها کاریگەری کرد کە لەناو ریزی بزووتنەوە دیموکراسیەکانی بۆرژوازیدا جێگـای خـۆی گـرت، بـەڵام بۆرژوازیـەت لـە ئـەوروپای ڕۆژئـاوادا کـە گەیشـتە دەســەڵات، بـەرەو کۆنەپەرسـتی و پاشـڤەڕۆیەتی ئاراسـتە و ڕێـڕەوی گـرت. بـەو جـۆرە پرۆلیتاریا بەشێوەیەکی سـەربەخۆ دەسـتی بەشـەڕ کـرد. هـەروەها سۆسـیالیزمی زانسـتی وەکـو دەرئــەنجامێکی کـار و خـەباتی مـارکس و ئـەنگلس دەرکـەوت کـە ڕێنماییکـەری شـەڕێکی بـەو جـۆرە بـە ئایدیۆلۆژیایـەکی شۆڕشـگێڕی و کـرداری ڕێکخـراو دادەنرێـت.

بەگوێرەی سۆسیالیزمی زانستی کە بەردەوام دەوڵەمەند دەکرا بە پێشکەوتنی زانستی، کۆمەڵایەتی، سیاسی و ئەزموونەکانی خەباتی چینایەتی، کە خۆی لە شیکردنەوەی هەلومەرجە بابەتیەکان دەبینێتەوە و بەرگری و پارێزگاری دەکات، لە یەکگرتنی سەرجەم پرۆلیتاریای جیهانی، بەبێ جیاوازی لە خەبات و تێکۆشان ڕێنماییان دەکات، بەوەی کە پێویستە لەسەر پرۆلیتاریا ململانێی چینایەتی خۆی لەدژی بۆرژوازیەتدا وەکو هێزێکی سیاسی ڕێکبخات و هەموو چین و توێژە چەوساوە و زوڵم لێکراوەکانی تر کە لەلایەن سەرمایەداریەوە دەچەوسێنرێتەوە بکێشێتە لای خۆی، بەمەستی خەبات کردن بەشێوەیەکی ڕێکخراو لەژێر سەرکردایەتی و ڕێبەرایەتی خۆیدا.

هەروەها چۆنیەتی پەیرەو کردنی شێوازە جۆراوجۆرەکانی خەبات بۆ ڕووخاندنی دەسەڵاتی بۆرژوازی بەشۆڕشی پرۆلیتاریا و ڕێکخستنی ئابووری سۆسیالیستی و نەهێشتنی چینە چەوسێنەرەکان و پاشماوە و کاریگەریەکانی کۆمەڵگای چینایەتی و گەیشتن بە کۆمەڵگای بێ چین و پارێزگاریکردنی، پێویستە دیکتاتۆری پرۆلیتاریا ئاوابکرێت.

سۆسیالیزمی زانستی کە لەئەنجامی تێکۆشانی پرۆلیتاریا دەوڵەمەند دەبێ و بەگوێرەی هەلومەرجی تایبەتمەندیەکانی هەر وڵاتێك جێبەجێ دەکرێت و، لەبەرامبەر لێکهەڵوەشاندنەوەی نەتەوەپەرستی بۆرژوازیەت کە جەختی لەسەر پێویستی گۆڕان و هەنگاونان بەرەو قۆناخێکی نوێ تر کردبوو، گۆڕان بۆ نیشتمانپەروەری. پرۆلیتاریا لەدژی کۆسمۆپۆلۆتیکی بۆرژوازی و نێونەتەوەیی پرۆلیتاریا لەدژی شۆڤێنیزمی بۆرژوازیەت چەکێکە کە هەرگیز شکست ناهێنێ و لەپێناو ئاواکردنی ڕێگا لەبەردەم تێکۆشانی شۆڕشگێڕانەی پرۆلیتاریا.

پرۆلیتاریا لەو خەباتی چینایەتیەی کە پەیرەوی کردووە و بەو ڕێبەرە ئایدیۆلۆژی و شۆڕشگێڕانەیەی خۆی گەلێك ڕێکخراوی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی دروست کردووە. لەپاش تاقیکردنەوەی کۆمۆنەی پاریس لە ساڵی 1871 و شۆڕشی یەکەمی ڕوسیا لە ساڵی 1905 دا، پرۆلیتاریا لەهەموو لایەنێکدا خۆی نوێ کردووە، لەئەنجامی پچڕاندن و تێکشاندنی ئەڵقەی هەرە لاوازی دەسەڵاتی ئیمپریالیزم، لە شۆڕشی ئۆکتۆبەری ساڵی 1917 ی ڕوسیادا، دەسەڵاتی گرتە دەست.

پرۆلیتاریا کاتێك بنگەیەكی شۆڕشگێڕی وەكو دیكتاتۆری پرۆلیتاریای لە روسیا بەدەست هێنا، بەمەش توانی ئاستی خەبات و تێكۆشانی خۆی نەك تەنها لە ئەوروپا، بەڵكو لە تەواوی وڵاتانی دونیا و، بگرە لە وڵاتە داگیركراوەكانیش بەرز بكاتەوە و، بەوەش لە ژێر كاریگەری شۆڕشی ئۆكتۆبەردا گەلانی وڵاتە داگیركراو و پاشكۆكان وشیار بوونەوە و لەبەرامبەر چەوسانەوە و زۆرداری داگیركەران بەرخۆدانیان دەستپێكرد.

سەرەڕای ئەوەی بۆرژوازی بچووك و ناوەڕاست بە سوودوەرگرتن لە رەوشی لەبار و هاریكاری نێودەوڵەتی لە هەندێ داگیركەران شۆڕشی دیموكراتی بۆرژوازیان هەڵگیرساند و سەربەخۆیی سیاسیان بەدی هێنا، كەچی بە هەڵبژاردنی رێگای بەكرێگیراوی و پاشكۆیەتی بۆ ئیمپرالیزم، دەستبەرداریان لە شۆڕش كرد و بەمەش سیاسەتی نەتەوەیی بۆرژوازی نابووت بوو.

سۆسیالیزمی زانستی كە ئایدیۆلۆژیای چینی كرێكاری جیهان و وڵاتە داگیركراوەكان بوو و بڵاوبۆوە. ناوەرۆكی نێونەتەوەی سۆسیالیزمی زانستی، لەگەڵ فاكتەرە بەهێزەكانی گەلانی بندەست بووە مەشخەڵێكی رۆشنگەری رێگای سەربەخۆی ئەو گەلانە. ئەو خەبات و تێكۆشانە كە لەناو گەلانی وڵاتە ژێر دەستەكانی وەكو چین، ڤێتنام و.... هتد پەیرەو دەكرا لە رێی راوێژكردن و سوودوەرگرتن لە سۆسیالیزمی زانستی، هەروەها لەگەڵ سوود وەرگرتن و لەبەرچاوگرتنی ئەو بارودۆخە گونجاوەی لەدوای شەڕی دەروونی درێژخایەن دەركەوت، لەمیانەی ئەم تێكۆشانە چەندین سەركەوتنی بەدی هێنا و دیموكراتی گەلێری دامەزاند.

بەو رەنگە لەئەنجامی ئەو خەبات و تێكۆشانە یەك لەدوای یەكەی گەلانی ژێردەست و شۆڕشەكانی ئەوروپای رۆژهەڵات، سۆسیالیزمی زانستی زیاتر دەوڵەمەند بوو و، بەدەست هێنانی سەركەوتنی گەلان لەو بوارانەی خەباتیان تێدا دەكرد، ئەو سەركەوتنانە جەختیان لەسەر ئەو راستییە كردەوە كە سۆسیالیزمی زانستی تاكە رێگای رزگاربوونی گەلانی بندەستە و پرۆلیتاریای هەموو جیهانە.

پرۆلیتاریا كە لە سێ یەكی دنیادا دەسەڵاتی گرتە دەست، حوكمڕانێتی ئایدیۆلۆژی و سیاسی و ئابووریانەی خۆی داسەپاند.

ئەم شەڕە شۆڕشگێڕیانەی خۆی لە هەموو بوارە كۆمەڵایەتی و چینایەتیەكان لە دژی ئیمپریالیزمی بەردەوام و درێژە پێدا.

ئایدیۆلۆژیای سۆسیالیزمی زانستی کە لەناو گەلانی دنیا بڵاوبۆوە، لەکاتێکی زۆر درەنگدا کەوتە نێو کوردستان. لە بەرامبەر مایەپووچ بوونی سیاسەتەکانی بۆرژوازی بچووك بوو کە کۆکەرەوەی تاریکایی سەدەکانی ناوەڕاست و چەوساندنەوەی کۆلۆنیالیستی ئیمپریالیزم بوو. سۆسیالیزمی زانستی کە لە کوردستاندا بڵاو بۆوە، لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا دەستی پێکردوو و وەکو تاکە ڕێگایەکی ڕزگاری گەل و نیشتمان خۆی سەلماند.

## ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت لە کوردستاندا

لەلایەنی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتەوە دواکەوتنێك باڵی بەسەر کوردستاندا کێشاوە، کە پاشکۆی دەرەوەیە لەبواری ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتەوە، ئەمەش دەرەنجامی ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتی و ئابووریەیە کە ئەمڕۆکە لەژێر سایەی چەوساندنەوە و توندوتیژی بێگانەوە دروست بووە. ئەو ئایدیۆلۆژیایەی ئەمڕۆکە لەناو کۆمەڵگای کوردستان باوە و لەئەنجامی بارودۆخی مێژووییانەی سەخت پێکهاتووە، بریتیە لە ئایدیۆلۆژیای خیانەت و تەسلیمکاری چینە دەسەڵاتدارەکانی ناوخۆ، کە لەسایەی ئایدیۆلۆژیای نکۆڵیکەرانەی نەتەوەی سەردەست پێکهاتووە.

پێشکەوتنی نەتەوەیی لە وڵاتی ئێمەدا بەهۆی چەوساندنەوەی ئابووری و سیاسی و رۆشنبیری بێگانە زۆر بە لاوازی ماوەتەوە، لەبەر ئەمەیە، کە ناکۆکی چینایەتی بە رادەی پێویست گەشەی نەکردووە و، ئەم رەوشەش بۆتە هۆی دروستبوونی تەگەرە و دەرکەوتنی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتێك کە لە خزمەت بەرژەوەندی چینە چەوساوەکاندا بێت، لە رەوشی نەبوونی ژێرخانێکی پێشکەوتووی ئابووریدا ئەوا چاوەڕوانی توانای پێشکەوتن و گەشەکردنی بنەمای هزری ناکرێت و، بەهۆی مانەوەی ئەو رادەیە دواکەوتوویی ژێرخانی ئابووری لە کوردستان و دواکەوتوو بنەمای هزری، ئەوا ڕێگای لە بەردەم دەرکەوتنی بیری کلکایەتی کردنی بێگانە لەبواری نەتەوەیی و چینایەتیدا داکردەوە و، بەهۆی دواکەوتوویی لایەنی ئابووری، ئایدیۆلۆژی و سیاسی لە وڵاتەکەماندا، ئەوا رژێمی چەوسێنەری بێگانە زۆر بەئاسانی توانیویەتی درێژە و بەردەوامی بە دەسەڵاتی خۆی بدات و توانی راستی ستەمکاری خۆی بشارێتەوە و چەوساندنەوە بە شێوەیەکی گەورەتر ئەنجام بدات.

ئەو پێکهاتە ئایدیۆلۆژی و سیاسیەی کە ئەمڕۆ لە کوردستاندا باوە و سەرچاوەی لـە نەتەوایـەتی و شۆڤێنیسـتی سـەرمایەداری و ئیمپریـالیزم لەلایـەك و لـەپاشماوەی سەدەکانی ناوەڕاست لەلایەکیتر، وەرگرتووە. ئەو پێکهاتەیە هیچ خزمـەتێکی بچووکیشی پێشکەش بـە پەرەسـەندن و پێشکەوتنی گۆمـەلگای کوردستان نـەکردووە، بـەڵکو کـار و خەباتی بـۆ پاراسـتن و مانـەوەی رەوشـی بـە تـالان بردنـی ژێرخـان و چەوساندنەوەی و پاشکۆیەتی بۆ دەرەوە کردووە.

ئەو پێکهاتە ئایدیۆلۆژی و سیاسیەی کە لەسەر ژێرخـانێکی دواکـەوتوو دامـەزراوە بـۆ لـەناوبردنی کۆمـەلگای کوردسـتان ئاراسـتە دەکرێـت، بـۆ نەهێشـتنی ئـەو ژێرخانـە ماددییە دواکەوتووەش پێویستە ئەو پێکهاتە ئایدیۆلۆژی و سیاسیە تێك بشکێنرێت کە جگـە لـەوەی دەیپـارێزێ و خزمـەتی دەکـات، ئـەوا دەخـوازێ چـین و توێـژەکانی کوردستانیش لە چواردەوری خۆی کۆبکاتەوە. پێویستـە بـۆ پێشخستنی تێکۆشان لـەدژی دوژمن و یەکخستنی دۆستان، ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتی ئەو چین و توێژانـە بناسـین و بـە شێوەیەکی راست و دروست هەڵیانسەنگێنین.

ئەو دواکەوتووییەی کە لەلایەنی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت کە لەولاتەکەمانـدا هەیـە و، ئەو کلکایەتی و دواکەوتنە هزرییـەی لـەناو گەلەکەماندایـە بـە رێکـەوت و لـەناکاوەوە دەرنەکـەوتوون، بـەڵکو دەرکـەوتنی هـزری گرێـداوێتی و نکـۆڵێکردن لـە نەتـەوە و پاشـکۆیەتی، پرۆسـەیەکی دوور و درێـژی مێژووییانـە لـەخۆوە دەگـرێ. تێگەیشـتن لـە ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتی چین و توێژەکانی کوردستان، هەروەها بۆ تێگەیشتن لەپرۆسـەی بلاوبوونـەوەی ئایدیۆلۆژیا و سیاسـەت لـە وڵاتەکەمانـدا، ئـەوا پێویست بەتوێژینـەوە و لێکۆڵینەوەیەکی وردبینانە لـە پرۆسـەیەی پێکهێنـانی هێـزە کوردییـە دەسـەڵاتدارەکان و پەرەسەندنی پێکهاتنی کۆمەڵایەتی لە کوردستاندا دەکات.

## أ ـ ئەو ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتەی کـە لـە ژێـر دەسـەڵاتی دەرەبەگایـەتی بێگانەدا دروست بووە.

### 1 ـ جۆری ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتی بێگانە: ـ

ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت لـەلای هێـزە داگیرکەرییـەکان هۆکارێك بـوو بـۆ سـەلماندنی شەرعیەتی داگیرکردن و بەرەو پێش بردن و رووتاندنەوەی سەرچاوە دەوڵەمەنـدەکان و

زاڵکردنی دەسەڵات بەسەر گەلاندا. هەموو چینە چەوسێنەرەکان لە دوای بەهێزکردنی دەسەڵاتی خۆیان لەناوخۆدا دەکەونە کارکردن بۆ فراوان بوون رووەو ئەو وڵاتانەی کە خاوەن سەرچاوە دەوڵەمەندەکانی سامانن، هەروەها گرنگی بە شوێنی جوگرافی و ستراتیژی خۆیان دەدەن.

وڵاتی ئێمەش (کوردستان)، کە خاوەنی سەرچاوە دەوڵەمەندەکانی سامانی سروشتی و زەوییە بەفەڕ و بەپیتەکانە، لەلایەن گەلێك لە دەوڵەتانەوە دووچاری دەستبەسەر داگرتن و داگیرکردن هاتووە.لە سەردەمە جیاجیاکاندا لەلایەن فارس، مەکدۆنی، یۆنانی (گریکی)، رۆمی و ساسانییەکانەوە کوردستان بۆتە گۆڕەپانێکی شەڕ لەنێوانیاندا. سەرباری ئەوەی ئەو دەوڵەتانە دەسەڵاتیان بەسەر کوردستاندا هەبوو، بەڵام نەیانتوانیوە چاودێریەکی رێکخراو و بەردەوام لەبواری سیاسی، رۆشنبیری و ئابووری بەسەر وڵاتەکەماندا ئەنجامبدەن، بەڵام ئەو شەڕە داگیرکاری و دەست بەسەرداگرتنانەی ئەنجامیان دەدا، زەرەر و زیانێکی گەورەیان گەیاندۆتە ئابووری و رۆشنبیری کۆمەڵگای کوردستان.

لە کاتێکدا کە هەردوو ئیمپراتۆریەتی ساسانی و بێزەنتی لەماوەی گۆڕانیان لە کۆیلایەتییەوە بۆ دەرەبەگایەتی بەردەوام لە ململانێی نێوان خۆیاندا بوون. ئیمپراتۆریەتی عەرەبی ئیسلامی دەرکەوت کە لە نیمچە دوورگەی عەرەبیدا شوێن پێی خۆی گرت و، لە ناوەڕاستی سەدەی حەوتەم بەولاوە وڵاتەکەمانیان داگیرکرد. عەرەبەکان کە پشتیان بە ئایدیۆلۆژیایەکی بەهێز و فراوانخوازی وەکو ئیسلام بەست، توانیان لە ماوەیەکی کورتدا دەست بگرن بەسەر کوردستان و خۆرهەڵاتی ناویندا. هەروەك چۆن سیستەمی دەرەبەگایەتیان داسەپاند، بەهەمان شێوەش ئاستەنگیەکی گەورەیان لەبەردەم رۆشنبیری و زمانی کوردیدا نایەوە، چونکە ئایدیۆلۆژیای ئیسلامەتی بەتەواوی بۆ بڵاوکردنەوەی زمان و رۆشنبیری عەرەبی بەکار دەهێنرا.

ئایدیۆلۆژیای ئیسلام کە ئەو کاتە لە تێکدان و رووخاندنی بەهاکانی زمان و رۆشنبیری کوردیدا رۆڵی بینی، بەرپرسیارێتیەکی گەورەی دەکەوێتە ئەستۆ سەبارەت بەو نامۆبوونەی ئەمڕۆکە بەدژواری هەستی پێدەکەین. ئەو کلکایەتی و پاشکۆیەتیەی کە لە ئاستی هزریشدا زاڵە لەوەوە سەرچاوەدەگرێت. لەکاتێکدا کە ئەو ئایدیۆلۆژیایە

توێژێکی کۆمەڵایەتی کە لە ئاغا و دەرەبەگ و سەرۆك خێڵەکان روویان تێکرد، خزمەتی پەرەسەندنی نەتەوەکانی تورك، فارس و عەرەبی دەکرد، بوو بەگەورەترین کۆسپ لە رێی پێشکەوتنی نەتەوایەتی کورد. ئایدیۆلۆژیای ئیسلامێتی کە نامۆبوونی بەشێوەیەکی بەردەوام پەرەپێدا، تاوەکو رۆژی ئەمرۆمان هەرە کاریگەر و بڵاوترین ئایدیۆلۆژیای بێگانەیە کە لەکوردستاندا باوە. هەرچەندە کە هەر لە سەدەی دەیەمەوە دەسەڵاتی عەرەبی بەسەر کوردستاندا نەما، بەڵام کاریگەری ئایدیۆلۆژیای ئیسلامی تا رۆژی ئەمرۆمان هەرماوە و بۆتە ئامرازێك بەدەستی چینە دەسەڵاتدارە ناوخۆییەکانەوە.

تورکەکان لەناوەراستی سەدەی یازدەهەمەوە لە رۆژهەڵاتەوە رووەو ئەم زێدە هاتن. هەرچەندە کە گەلێك دەوڵەتیان دروستکرد وەکو "سەلجوقی و سەلجوقی ئەنادۆڵی، قەرەقۆین، ئاکقۆین، ئارتووك ئۆغلار"، سەرباری هەوڵەکانیان بۆ دەست بەسەرداگرتنی کوردستان، بەڵام نەیانتوانیوە کار بکەنە سەر زمان و رۆشنبیری کوردی و لاوازی بکەن و نەیانتوانیوە هیچ رژێمێك دروست بکەن بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی سیاسی، بەڵکو بەپێچەوانەوە کەوتنە نێو پرۆسەی توانەوەیەکی چڕوپڕ لە بۆتەی زمان و رۆشنبیری کوردیدا.

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کە لە سەدەی چواردەهەمدا لە ئەنادۆڵ دروست بوو لەسەدەی پازدەهەمدا بەخێرایی پێشکەوت، هەروەها ئیمپراتۆریەتی سەفەویش بەم شێوەیە پێشکەوت و هەردوو ئیمپراتۆریەت لەسەرەتای سەدەی شازدەهەم بەولاوە لەگەڵ یەکتری کەوتنە شەڕ و لە کوردستاندا فراوان بوون. عوسمانیەکان کە سوونی مەزهەب بوون و سەفەویەکانیش شیعەبوون ململانێیەکی تونـدی ئایدیۆلۆژیان بەڕێوەدەبرد، ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە گەلی کورد بۆلای خۆیان رابکێشن. هەروەها سوڵتان "یاوز سەلیم" کە سوودی وەرگرت لەوەی کە زۆربەی دەرەبەگە کوردەکان پشتگیریان لێکرد، بەشێکی گەورەی لە کوردستان داگیرکرد. سەرەڕای ئەوەش نیوە دورگەی عەرەبی و باکووری ئەفریقاشی خستە سەر سنووری خۆی و توانی دەوڵەتی مەمالیکی لە میسر لەناو ببات. بەو رەنگەش دەسەڵاتداری و زاڵبوون بەسەر کوردستان و ململانێیەکی دوور و درێژ لەنێوان عوسمانیەکان و شاهنشای ئێران بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوام بوو.

لەکاتێکدا کە دەرەبەگایەتی لە ئەوروپا لەقۆناخی هەڵوەشاندابوو و سەرمایەداری گەشەی دەکرد، لەو کاتەدا دەوڵەتی عوسمانی هێشتا نوێنەرایەتی هێزێکی ناوەندی

دەرەبەگایەتی دەکرد و توانی ئیمپراتۆریەتێکی دەرەبەگایەتی داگیرکەری ئاوابکات بە بڵاوبوونەوەی لەگۆڕەپانێکی فراوان، کە لە ئەفریقیا و رۆژهەلاتی ناوین و بەشێکی ئەوروپا پێکهاتبوو. لەبەر ئەوەی کە ئەو دەوڵەتە نوێنەرایەتی دەرەبەگایەتی دەکرد و دەرەبەگایەتیش لە گۆڕەپانی جیهانیدا لە قۆناخی رووخان و لەناوچووندا بوو و، نوێنەرایەتی کۆنەپەرستی دەکرد و چەوساندنەوەیەکی چینایەتی و نەتەوایەتی لەسەر گەلان پیادە دەکرد.

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کە دەستی بەسەر ئەم پارچە خاکەدا گرت لە باڵکانەوە تاوەکو نیوە دوورگەی عەرەبی و لە ئەفریقیاوە تاوەکو کوردستان درێژ دەبۆوە و، پشتی بە دەسەلاتی دەرەبەگایەتی دەبەست کە بەتایبەتمەندێتی بەتورککردنی داگیرکەریانە جیادەکرایەوە. ئیمپراتۆریەتی عوسمانی حوکمێکی چەوسێنەرانەی بەردەوامی پەیڕەو دەکرد بۆ پیادە کردنی هەمان ئیدارەی سیاسیانەی لەسەر کوردستان کە لە ئەنادۆڵ پیادەی دەکرد، هەر لە سەدەی شازدەهەم بەولاوە "گەورەی گەوران" گەورەی مانجاق و تورکە عوسمانیەکان توانیان بەشێوەیەکی قووڵ سیاسەتی بەتورککردن جێبەجێ بکەن، ئەمەشی بە پشت بەستن بەهێزی بەڕێوەبردن لەناوجەرگەی شاراکاندا ئەنجامدەدا.

سوڵتانەکانی عوسمانی و شاهەنشای ئێران بۆئەوەی بتوانن دەسەلاتی خۆیان بەسەر کوردستاندا زیاتر سەقامگیر و بەردەوام بکەن، سوودیان لە جیاوازی مەزهەبی وەرگرت و وەکو ئامرازێکی ئایدیۆلۆژی بۆ جۆشدانی ئاژاوە لەنێوان ریزەکانی گەل و پارچە پاچەکردنی یەکێتی ریزەکانی بەکارهێنا و، لەهەمانکاتدا بەهۆی ئیستغلال کردنی مەزهەبەکانی ئیسلام، نەتەوایەتی خۆیان بەرەو پێش برد.

ئەو هێزانە هەڵسان بەتێکدان و خراپکردنێکی گەورە لە زمان و رۆشنبیری کوردیدا. زمانی فارسی و عەرەبی شوێنی زمانی کوردی گرتبۆوە و، بە ئیستغلال کردن و بەکارهێنانی ئایینی ئیسلام لەلایەن ئەو هێزانەوە، کوردان وەکو ئامرازێك بۆ ململانێ بەکارهێنراون و کوردستانیش بوو بەگۆڕەپانێك بۆ ئەو شەڕانەی کە لەنێوانیاندا رووی دەدا. بەو شێوەیە دەسەلاتی داگیرکاری لە لایەنی سیاسی، ئابووری و رۆشنبیری تاسەدەی بیستەم بەردەوامی کرد و کوردستانیش لەو ماوەیەدا بەخنکاوی لەنێو سڕبوونێکدا مابۆوە.

2 ــ ئـەو ئایـدیۆلۆژیا و سیاسـەتەی کـە لـەژێر دەسـەڵاتی چەوسـاندنەوەی بێگانە لە کوردستاندا پێکهاتووە: ـ

دەسـەڵاتی عـەرەبی لـە کوردسـتاندا لەسـەرەتای ناوەڕاسـتی سـەدەی حەوتەمـەوە دەسـتی بـە گەشـە کـردن کـرد. لەهەمانکاتـدا بـووە بـە هـەڵگری نموونـە و فـۆرمی بەرهەمهێنانی دەرەبەگایەتی و هاوشان لەگـەڵ پێشـکەوتنی دەرەبەگایـەتی لەکوردسـتاندا لەسایەی دەسەڵاتی عەرەبیدا ئایـدیۆلۆژیای ئیسلام بەسـەر وڵاتەکەمانـدا جێگیرکـرا، کـە ئامرازێکـە بـۆ بڵاوبوونـەوەی عەرەبـەکان و تـەعریبکردن، هـەروەها هاوکـات لەگـەڵ ئەمەشـدا چـینی دەرەبـەگی نـاوخۆش رۆڵێکـی گـەورەی لەبڵاوبوونـەوەی ئایـدیۆلۆژیای ئیسلامدا بینی.

بــەهاتنی ئیســلام و گــرتنی جێگــای ئــایینی زەردەشــتی کــە ئایــدیۆلۆژیای سەربەخۆخوازی کوردەکان بوو، لەپاش ئەوەی ئایدیۆلۆژیای ئیسلامی کە بووە ئامرازێکی گەورەی دەسەڵاتی بێگانە، بوو بە سەرچاوەیەك بۆ نکۆڵی کردنی نەتەوایەتی و کلکایەتی دەرەوە کە تائێستاکە ئێمە بەشێوەیەکی قووڵ لەژێر کاریگەریەکانیداین.

لەبەر ئەوەی خێڵە تورکەکان نەیانتوانی رژێمی داگیرکەری بەهێز دروست بکەن و بـەهۆی لاوازی دەسـەڵاتی عەرەبـەکان بەسـەر وڵاتەکەمانـدا هـەر لەناوەڕاسـتی سـەدەی دەیەمـەوە تـاوەکو سـەرەتای سـەدەی شـازدەهەم هـەل و دەرفـەت رەخسـا بـۆ پێشـکەوتنی عەشیرەتە دەرەبەگەکانی کورد. لە جەزیرە و هەکاریش گەلێك میرنشـین دروسـت بـوون، لـە پـێش هـەموویان میرنشـینی "مـەروانی"یـە کـە رووبـەرێکی فراوانـی لـە کوردسـتاندا خستبووە ژێر دەسەڵاتی خۆی. سەرەڕای ئەوەش فشاری زمانی عـەرەبی بـۆ سـەر زمـان و رۆشنبیری و کوردی هەر بەردەوام بووە، چونکە ئایدیۆلۆژیای ئیسلام بـەزمانی عەرەبیـە و ئـەو ئایدیۆلۆژیایـە بـووە هـۆی پاراسـتن و پارێزگـاریکردنی بەرژەوەندیـەکانی سـەرۆك عەشیرەت و چینە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان کە ئـەوان بـۆ خزمـەتکردنی بەرژەوەنـدی چینایەتیان ئەم بەرپرسیارێتیەیان وەرگرتبوو. هەروەها سیاسەتی ئەوانـە بـۆ گرێـدان و پەیوەستبوون بەهێزە دەرەکیەکانەوە چوارچێوەی ئاگادارکردنـەوە و ئامۆژگـاری کردنـی تێپەڕ نەدەکرد و، بەم شێوەیە هیچ بوارێکی ژیانیان لەبەردا نەمایەوە، جگە لـەبوون بـە بەکرێگیراو و خیانەتکار و لەسەر ئەم کارەشیان بەردەوام بوون.

سەرەڕای پێشکەوتنی پاشکۆیەتی و کلکایەتی کردنی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتی هێزە بێگانەکان لە نێو چینە دەرەبەگە دەسەڵاتدارەکان، ئەگەرچی بە شێوەیەکی لاوازیش بووبێت، بەڵام بیروبۆچوونە سەربەخۆکانیش تا ئەوکاتە بە بەردەوامی هەبوونی خۆیان دەپاراست. لەو ماوەیەدا گەلێك وڵاتپارێز دەرکەوتن نمونەی ئەوانە "***ئەحمەدی خانی***"یە کە خزمەتێکی شکۆداری بە پێشکەوتنی زمان و رۆشنبیری کوردی کرد. ئەمەش بەدانان و نووسینی پەرتووکە وێژەییەکانەوە بووە.

هەر لەسەرەتاکانی سەدەی شازدەهەمەوە هەردوو دەوڵەتی سەفەوی لە رۆژهەڵات و عوسمانی لە رۆژئاوا دەستیان بە داگیرکردنی کوردستان کرد و، لە ئەنجامی جێگیربوونی دەسەڵاتیان بە شێوەیەکی کردارییانە لە ***پەیمانی قەسری شیریندا*** و لەپاش ململانێیەکی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و سەربازی دوور و درێژ، کوردستان بەسەر دوو پارچە دابەشکرا، هەروەها رەوشی بنبەستبوون و بەرەو دواوە گەڕانەوەی بەسەر کۆمەڵگای کوردستاندا سەپاند.

دروست نەبوونی دەوڵەتێکی ناوەندی لە کوردستاندا دەرفەتی ئەوەی رەخساند کە دەسەڵاتی عوسمانی و سەفەویەکان بەئاسانی بێتە دی.

پێش هەمووشتێك لە کوردستاندا، پێشکەوتنی بەرهەمهێنانی دەرەبەگایەتی لەسایەی دەسەڵاتی بێگانەدا بوو، شان بەشانی ئەوەش پێشکەوتنی پێکهاتە و ژێرخانی کۆمەڵایەتی بەهەمان رادە و ئاست لە ژێر کاریگەری دەسەڵاتی بێگانەدا بوو. چینە دەسەڵاتدارە دەرەبەگەکانی کوردستان بە پشتبەستن بە نۆکەرایەتی کردنی هێزەکانی بێگانە لە دەسەڵات و حوکمڕانی خۆیان بەردەوام بوون، هەروەها ئەو ژێرخانە کۆمەڵاتیەی کە لەگەڵ پەیوەستبوون بە دەرەوە هاتبوونە کایەوە، لە رەوشێکی پارچە پارچەییدا بوو. لەسەر ئەو بنەمایەش کۆمەڵێك یان زنجیرەیەك لە سنوورە دەرەبەگایەتیەکان دروست بوون، بە شێوەیەکیتر فشاری دەسەڵاتی بێگانە گەلیان ناچاری ئەوە کرد کە لەدەوروبەری دەرەبەگ و سەرۆك عەشیرەتەکان کۆببنەوە. جا تەواوی ئەوانەش سەربەخۆیی عەشیرەتی و دەرەبەگایەتیە لەیەك جیاوازەکانیان بەرەو پێش برد. بەمەش کۆسپ و ئاستەنگ لەبەردەم دروستکردنی دەوڵەتێکی ناوەندی دروست بوو.

له کاتێکدا که کورد نەیتوانیوە ئیسلام وەکو ئامرازێك بۆ بەرخۆدانی نەتەوایەتی بەکار بهێنێ، بەڵکو بەپێچەوانەوە، ئیسلام رۆڵێکی گەورەی بینیوە لەوەی کە کوردان سەربەخۆیی خۆیان لە دەست بدەن، چونکە ئایدیۆلۆژیای خێڵە کوردیەکان کە لەژێر کاریگەری ئیسلام دروستبووە، ئەو ئایدیۆلۆژیایەیە کە تەسلیمکاری و نۆکەری و نکۆڵیکردن و کلکایەتی و گرێداوی بۆ دەرەوە بەرەو پێش برد.

سەرەڕای هەبوونی خێڵە کوردیە بەهێزەکان لە سەرەتای سەدەی شازدەهەمدا، بەڵام ئایدیۆلۆژیای ئەوان کە ئایدیۆلۆژیای نکۆڵیکردن بوو و پشتی بە هێزە دەرەکیەکان دەبەست. ئەمە وای لێکرد کە رۆڵی سیاسەت لە بەکرێگیراوی و نۆکەرایەتیدا ببینن.

هەبوونی دوو دەوڵەتی فراوانخواز، شاهەنشایەتی لە ئێران و عوسمانیەکان لە دەرەوە، تەگەرە و ئاستەنگیان دروست دەکرد لەبەردەم ئافراندنی دەوڵەتێکی ناوەندی لە رێگای زاڵبوونی دەسەڵاتی عەشیرەتێك بەسەر ئەوانی ترەوە، ئەمەش جگە لە چەمکی بەکرێگیراوێتی و نۆکەرایەتی بێگانەکان و هاوسەنگی هێز لەنێوان دەرەبەگە کوردەکان، شتێکی دیکەی لێناکەوێتەوە.

سیاسەتی چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانی نێوان خێڵە کوردییەکان لە رێی دەسەڵاتی ناوەندی ئێران و عوسمانیەکان تاوەکو رۆژی ئەمڕۆمان هەر بەردەوامی کردووە، لە کۆنەوە ناکۆکیەکانی نێوان کوردەکان لەلایەن "سەید مانجاق" و ئەوانی ترەوە چارەسەر دەکران و ئەمڕۆکەش لەلایەن کارگێڕە داگیرکەریەکان و بەرپرسیاری ئەمنیەت و ئەفسەرە سەربازیەکانەوە چارەسەر دەکرێن. بەکورتی لەو ماوەیەدا ئایدیۆلۆژیای تەسلیمکاری لەلایەن خێڵە کوردیەکانەوە بەرەو پێش براوە. ئەمەش بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە لەڕووی ئابووریەوە گرێدراوی هێزە بێگانەکان بوون.

وەك دەرئەنجامێکی سروشتی و ئاسایی ئەو ئایدیۆلۆژیایەش، سیاسەتی بە کرێگیراوی لێ کەوتۆتەوە، ئەمەش بە روونی لە "**کتێبی شەرەفنامە**"دا دەبینین کە **شەرەفخانی بەدلیسی** لەو کتێبەدا سیاسەتی خێڵە بەکرێگیراوە کوردەکان روون دەکاتەوە و لەناوخۆدا لەسەر شێوەی خودموختاری و لە دەرەوەش پشتبەستن بە سوڵتانەکانی عوسمانی و شاهنشاکانی ئێران بوو. بۆیە لەبەرامبەر داواکاری سوڵتان "یاووز"ی عوسمانی بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرێك بۆ عەشیرەتە کوردییەکان، وەڵامی "**ئیدریسی بەدلیسی**" بریتی بوو لەوەی کە ناتوانرێت ئەو کارە بکرێت، بەهۆی لەیەك نەگەیشتنی

نێوان خۆیان، لەبەرئەوە پێویستە **ئیدریسی بەدلیسی** کە خۆی وەکو نوێنەرێکی خێڵە کوردیەکان بپالێورێت، ئەم رەوشەش ئەوە دیار دەکات کە خێڵە کوردیەکان تا چ رادەیەك لەناوخۆیانـدا دژ بـە یـەکگرتن بوونـە و تـا چ رادەیـەکیش خیانـەت و بـەکرێگیراوی لەناخیاندا رەگی داکوتاوە.

لەجیاتی بەرەو پێش بردنی ئەو بیر و بۆچوونانەی کە خزمەتی سەربەخۆیی و یەکێتی گەل و وڵات دەکەن، سەربەخۆیی خێزان، پاشکۆیەتی، کلکایەتی عەشیرەتگەری و موریدایەتی بەرەو پێش بردرا. بۆیە ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتێك کە لەبەرژەوەندی چین و توێژەکانی گەلدا بێت، پێشنەکەوت.

بەدەسەڵات گەیشتن و زاڵبوونی رۆشنبیری و زمانی تورکی و فارسی و عەرەبی، بوونە مایەی لاوازی و پێشنەکەوتنی زمان و رۆشنبیری کوردی و، لەئەنجامدا تا ئەو کاتە دەستکەوتەکانی رۆشنبیری و زمانی کوردی هەر لاواز دەکران.

بۆیـە شتێکی مسۆگەربوو کـە دوابکـەون. هـەروەك چۆن بڵاوکردنـەوەی زمـان و رۆشنیری بێگانە، لەلایەن چینە دەسەڵاتدارە کوردەکان کاریگەری کردە سەر بـەرەو دواوە گەڕانەوەی زمان و رۆشنبیری کوردی، لەهەمان کاتدا ئەوەش بووە مایـەی توانـەوەی ئـەو هێزانە لە بۆتە و چوارچێوەی کولتوور و رۆشنبیری بێگانـەدا. تـا ئەمڕۆکـەش پرۆسـەی تەعریب و تەتریك و تەفریسی خێڵە کوردیەکان هەر بەردەوامە.

لەسـەرەتای سـەدەی شـانزەهەمەوە ئەگـەر لەکوردسـتاندا، دەوڵـەتێکی ناوەنـدی و ئەگەر رۆشنبیریەکی بەهێز دروست ببوایە و زمانی کوردی وەکو زمانێکی فەرمی پەرەی پێبدرایـە و، لەگـەڵ ئەوەشـدا هەسـتی نەتەوایـەتی کـورد پێشـبخرایە، ئـەوا خـەباتی چینایەتی و پەرەسەندنی ئابووری دەگەیشتە ئاستێکی بڵند. چونکە لەو قۆناخەدا زمانی کـوردی لەتوانایـدا هـەبوو رۆڵێکـی گـرنگ بگێڕێـت. بـەکورتی هـیچ گۆڕانکاریـەك لـە سیاسەتی خێڵە کوردیەکان و شاهنشاهیەتی ئێران و سوڵتانەکانی عوسمانی لە سـەدەکانی "16، 17، 18، 19" دا رووی نـەداوە، تـەنها گۆڕانێـك کـە بووبێـت بریتیبـووە لـە پارچەکردنی هاوسەنگی هێز بەلای عوسمانیەکان یاخود ئێرانیەکاندا، خێڵە کوردیەکانی وەکو بەکرێگیراویان لێهاتبوو و، لەسەرەتای سەدەی بیستەم سەرباری سەرەڕۆیی سـەرۆك

خێڵ و ئاغاکان و یاریکردن بەخێر و بێرەکانی کوردستان؛ نکۆڵیان لە هەبوونی وڵاتێك کرد کە بەکوردستان ناودەبرێت.

## ب ـ ئەو ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتەی کە لەکوردستاندا لەژێر دەسەڵاتی سەرمایەداری بێگانەدا درووست بووە:

### 1 ـ سیاسەتی ئیمپریالیزم لەکوردستاندا:

لەبەرامبەر تاریکی دەرەبەگایەتیدا، سەرمایەداری لەبوارە رۆشنبیریەکان، زمان، زانست و ئابووریدا گەلێك پێشکەوتنی خوڵقاند. لەسەدەی نۆزدە بەولاوە بازاڕێکی جیهانی دروستکرد بەبێ ئەوەی هیچ گۆڕەپانێك لە دونیادا بهێڵێتەوە کە کۆڵۆنیکراو نەبێت و، پرۆسەی دابەشکرنی جیهان لەنێوان دەوڵەتە ئیمپریالیستە بەهێزەکان بە زیادکردنی ناردنە دەرەوەی سەرمایە روویدا. لەبەرئەوەی خاوەنی هێزە پێشکەوتووەکانی بەرهەمهینان و هێزی بەرهەمهێنان زاڵ بوو، ئەوا پێوەگرێدان و پەیوەستبوون بەخۆیەوەی داسەپاندە سەر شێوازی کۆنی بەرهەمهێنان و ئەو چینەی نوێنەرایەتی دەکات، لەگەڵ ئەو ژێرخانەی کە پشتی پێدەبەست. هەروەکو چۆن لەقۆناخی کۆیلەداریدا ئەمە بەسەر سەرۆك عەشیرەتەکاندا سەپێنرا کە دەوڵەتیان پێکهێنابوو، بەهەمان شێوەش لەدەرەبەگایەتیدا خاوەن کۆیلەکان بە دەرەبەگەکانەوە گرێدران و لەسەرمایەداریشدا دەرەبەگەکان ملکەچی سەرمایەداران کران.

سەرمایەداری لەو وڵاتە پاشکۆیانەی کە دەستی بەسەردا گرتبوو وای لە چینە دەرەبەگەکانی ئەو وڵاتانە کرد کە بکەونە خزمەتکردنی و لەئەنجامی ناردنە دەرەوەی کاڵا چینێکی کۆمپرادۆری بەکرێگیراو پێکهات، بەڵام بەهۆی ناردنە دەرەوەی سەرمایە، بۆرجوازیەکی بەکرێگیراوی ئیمپریالیزم لەرێگەی دەست بەسەرداگرتنی ئایدیۆلۆژیاوە لەدایك بوو. هەروەها هاوکات لەگەڵ ناردنە دەرەوەی سەرمایە، نەتەوایەتی بۆرجوازی تەسلیمکار و ریفۆرمیست لەناوەوەی داگیرگەکان دروست بوون. ئایدیۆلۆژیا ئایینیەکان کە بەکرێگیراویان بۆ ئیمپریالیزم ریکخست، بوونە ئامرازی بەکرێگیراوێتی لە داگیرگەکاندا و، دەرەبەگە کۆمپرادۆرەکانیش هیچ ئایدیۆلۆژیایەکیان پێکنەهێنا، جگە لەو ئایدیۆلۆژییانەی باسیان لێوە کرا.

بەڵام نەتەوایەتی بۆرجوازی بچووك كە لەهەندێك وڵاتان نیوە سەربەخۆییەكی هێنایەدی، ئەوا لەئەنجامی ترسانی لە بزووتنەوەكانی پرۆلیتاریا، رێگەی نۆكەرایەتی كردنی ئیمپریالیزمی بەرنەدا و، ئایدیۆلۆژیای پێشكەوتووی پرۆلیتاریا بەخێرایی وەكو هێزێكی سیاسی و بزووتنەوەیەكی نوێ لەسەر توێژە گەلەریە چەوساوەكان یەك لەدوای یەك رەنگی دایەوە.

با ئێستاكەش بگەڕێینەوە سەر سیاسەتی ئیمپریالیزم لە كوردستاندا، لەنیوە دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا بۆ دەست بەسەرداگرتنی زەویەكانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانیەكان، ململانێیەك لەنێوان ئینگلتەرا و فەرەنسا و روسیای قەیسەری لە ئارادابوو، بەڵام لەبەر بوونی هاوسەنگی لەهێزدا هیچ یەكێك لەوانە نەیدەتوانی بە شێوەیەكی تەواو بگاتە ئامانجەكانی خۆی. ئینگلتەرا دەیویست كەنداوی عەرەب بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و لەوێشەوە بەرەو باكوور پەل بهاوێژێت و لەم رێگایەشەوە دەست بەسەر زەویەكانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و بەو شێوەیەش دەست بەسەر كوردستاندا بگرێت. هەروەها فەرەنساش دەسەڵاتی خۆی بەسەر كەنارەكانی رۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاستدا سەپاند و، لەوێشەوە دەیویست بەرەو سوریا و كوردستان هەنگاو بهاوێژێت، كە ئەمەش لەگەڵ بەرژەوەندیەكانی گونجاو بوو. لەكاتێكدا كە روسیای قەیسەری بە بەردەوامی لەشەڕدابوو لەگەڵ عوسمانیەكان لە قەفقاسیا و بالكاندا بۆئەوەی كەناڵە ئاوییەكان بخاتە ژێر ركێفی خۆی و لە قەفقاسیاوە بەرەو باشووری كوردستان رێگە بگرێ. بەو شێوەیە ناكۆكی بەرژەوەندیەكانی ئەو هێزانە و رێكنەكەوتنیان بووە هۆی دەركەوتنی هاوسەنگیەكی بەو شێوەیە. هەروەها بە سوود وەرگرتن لە هاوسەنگی ئەم هێزەش تەمەنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی درێژ كرایەوە و، لەهەمانكاتدا ئینگلیزەكان بە دوای زەمینەیەكی گونجاودا دەگەڕان، بۆ هێنانەدی مەبەستە باسكراوەكانیان توانیان ئیمپراتۆریەت بەخۆیانەوە گرێبدەن و بیكەنە نیوە داگیرگەیەك. لەگەڵ كۆتایی سەدەی نۆزدەهەمیش ئیمپریالیزمی ئەڵمانی خواستی بەشی خۆی لە داگیرگەكان وەربگرێ بۆ ئەم مەبەستەش، چاوی بریە رۆژهەڵاتی ناوین و پشتگیری و هاریكاری پێشكەش بە ئامانجەكانی تورانیزمی تورك كرد كە لە چوارچێوەی "اتحاد و تەرەقی"دا رێكخراو بوو، هەروەها سەركەوتوو بوو لەگەڵ راكێشانی ئیمپراتۆریەت بەلای خۆیدا لەشەڕی

دابەشكاری یەكەمدا كە تیایدا تێكشكانی بەخۆیەوە بینی. لەدوای ئـەو شـەڕە زەویـەكانی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی دابەشـكراو لـەو ماوەیـەدا پـەیمانیی سـیڤەری سـاڵی 1920 ئەنجامدرا، كە تیایدا هاتووە دەوڵەتێكی ئەرمەنی دابمەزرێت، كە لە قەرس و ئەرزەڕۆم و ئەلازخ پێكدێت و، لەباشووری ئەویش كوردسـتان لـە ئۆتۆنۆمیـەكی لەسـایەی پارێزگـاری ئینگلیزەكاندا بێت؛ بەڵام ئەو پەیمانییە تەنها وەكو مەرەكەبێكی سەر كاغـەز مایـەوە و، سیاســەتی روســیای قەیســەری لــە دەرەنجــامی شۆڕشــی ئۆكتۆبــەردا لــە ئارادانــەما. ئینگلیزەكانیش كە بەسـەركەوتوویی لەشـەڕدا دەركـەوتن؛ كەنـداوی عـەرەبی و ئێـراق و باشووری كوردستانیان داگیركرد. هەروەها فەرەنساش لوبنان و سـوریا و بەشـی رۆژئـاوای باشووری كوردستانیان داگیركرد. لەهەمانكاتـدا بزووتنـەوەی بـۆرژوازی بچـووكی رزگـاری نیشتمانی توركیـا دەسـتیكرد بـە ئـاواكردنی دەوڵـەتێكی سـەربەخۆ لـە چوارچێوەی ئـەو سـنوورەی كـە پـەیمانیی ئاگربەسـتی مەنـدەرەس لـەدوای شـەڕ ئامـاژەی پێكردبـوو و، كەمالیسـتەكان لـە سازشـكردن لەگـەڵ ئینگلیـز و فەرەنسـیەكان و راكێشـانی دەرەبەگـە كوردەكـان بـۆلای خۆیـان توانیـان هێرشـی داگیركردنـی یۆنانیـەكان بـۆ سـەر ئـەنادۆڵ بووەستێنن.

بــەهۆی جیــاوازی ئــاینی و نــەبوونی بــاوەڕی چــینە دەســەڵاتدارەكانی كــورد، بەكرێگیراوی و نۆكەرایەتیكردن بۆ ئینگلیز و فەرەنسیەكان زۆر پێشكەوتنی بەخۆیـەوە نەبینی، بەڵكو دەرەبەگ و سەرۆك خێڵە كوردەكان لەژێر كاریگەری ململانێی ناوخۆیی و داگیركاری فەرەنسی و ئینگلیزی كە لەباشوورەوە دەهاتن، جارێكی دیكـە گەڕانـەوە سـەر بەكرێگیراوێتی كـردن بـۆ بۆرژوازیـەتی تـوركی، هـەروەكو چـۆن لـە سـەدەی شازدەهەمدا بوونە لایەنگری عوسمانیەكان.

ئایـدیۆلۆژیای ئیسـلامی كـە كلكایـەتی نكـۆڵیكردنی نەتـەوەیی بـەرەو پـێش بـرد، ئایدیۆلۆژی چینە دەسەڵاتدارە بـەكرێگیراوەكانی كـورد بـوو، بـەڵام سیاسـەتی ئـەم چینە وابەستە بوو بە دەوڵەتی توركیاوە. لەخزمەتی بەرژەوەندیە چینایەتیەكانیدا هەڵدەسـتا بـە چەوسـاندنەوە و رووتاندنـەوەی توێـژەكانی گـەل. هـەروەها بەدرێـژایی مێـژوو ئـەو هێزانە وەها راهاتبوون كـە خۆیـان لەگـەڵ بارودۆخـە جیاوازەكـان بگـونجێنن و توانایـان هـەبوو كـە خۆنـوێ بكەنــەوە بـۆ بــەكرێگیراوێتی كــردن بــەگوێرەی بەرژەوەندیــە تایبەتیەكانیان.

لەچارەکی یەکەمی سەدەی بیستەم کاتێك هەلومەرجی دەرەکی بۆ سەربەخۆیی لەباربوو کەچی هێزێکی وەها لە ئارادا نەبوو کە بیقۆزێتەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە تەنیا هێزی دەرەبەگایەتی هەبوو کە بەهەمان شێوەی رابردوو ئەویش هەر بەردەوام بوو لەسەر نۆکەرایەتی خۆی. لەئاکامی ئەم بەکرێگیراوێتیەشدا، شێوەی نوێ لە زاڵبوون و دەسەڵاتداری و سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی کوردستان سەریهەڵدا و، لەگەڵ ***پەیمانی لۆزانی ساڵی 1923*** دا کوردستان دابەشکرا بۆ چوار پارچە و کەوتە ژێردەسەڵاتی کۆماری تورکیا و ئێران و دەسەڵاتی عەرەبەکان کە لە ژێر بەرێوەبردنی " الانتداب "ی ئینگلیزی و فەرەنسی دابوون. بەو رەنگەش دەرکەوتنی نەتەوایەتی کوردی تێکدراو و یەکێتی نەتەوەیی زیاتر پارچەکرا. بەسەرچاوە گرتن لەو دابەشکردنەش کوردستان لە کۆنەپەرستیدا گەیشتە رەوشی خنکان و نقووم بوون، لەدوای ئەمەش کوردستان لە هەموو بەشەکانیدا بەپێی سیاسەتەکانی نەتەوەی سەردەست رووبەرووی رەوشی نامۆبوون و رووتاندنەوە و چەوساندنەوەیەکی یەکجار خراپ کرایەوە.

بۆرژوازیەتی تورکی دوای ئەوەی زۆربەی دەرەبەگ و سەرۆك خێڵەکانی کرد بە نۆکەری خۆی، هەڵسا بەزیادکردنی ستەم و چەوساندنەوە بۆ پتەوکردنی دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئەو بەشەی کوردستان، کە ئەمەش وایکرد کاردانەوەیەك لەلایەن چین و توێژەکانی گەل درووست ببێت. هەروەها بۆرژوازیەتی تورکی دەسەڵاتی سەربازیانەی بەرەو پێش برد تاوەکو ئەو دەرەبەگە کوردانە سەرکوت بکات کە دەیانویست پارێزگاری لەهێزی سیاسی خۆیان بکەن و، لەسەر ئەو بنەمایەش دەزگاکانی سیاسی و دابەشکردنی کارگێری کە بریتیبوو لەناوچەکان، ناحیەکان و گوندەکان، هەروەکو خۆیان مانەوە بۆ ئەنجامدانی دواڕادە و پلەی رووتاندنەوەی ئابووریانە. ئەمەش هەروەکو رەوشی هەموو چینە بۆرژوازیەکان وایە لەسەردەمی ئێستاماندا، بۆرژوازیەتی تورکی بەبەستنی پەیوەندیە کۆلۆنیالیە نوێیەکانی لەگەڵ ئیمپریالیزم، بەرپرسیارێتی جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی سەربازگەی دوارۆژی ئیمپریالیزمی لەناوچەکەدا گرتە ئەستۆ. بەو رەنگە بەپشت بەستن بە دەسەڵاتی سەربازی و سیاسیانەی لە کوردستاندا، ئابووری خۆی بە رادەیەکی دیاری کراو بەرەو پێش برد لەرێگەی پەرەپێدانی سەرمایەداری دەوڵەتیانە و، وەکو بازاڕێك بۆ ساخکردنەوەی کەلوپەلەکانی بایەخێکی زۆری دایە کوردستان و، وەکو

سەرچاوەیەکی هێزی کاری هەرزان و ماددەی خاو بەکاری دەهێنا. ئەمەش لە رێگای دەست بەسەرداگرتنی خێر و بێرەکانی کوردستان بوو.

بۆرژوازیەتی تورکی تەنها وەکو سەرچاوەیەکی رووتاندنەوەی ئابووری سەیری کوردستان ناکات، بەڵکو وەکو گۆڕەپانێکیش بۆ فراوانبوون و بڵاوبوونەوەی نەتەوایەتی خۆی، بۆ ئەم مەبەستەش فشارێکی ترسناکی خستە سەر زمان و رۆشنبیری کوردی و دەستیکرد بە پرۆسەیەکی بەهێزی بە تورککردن، ئەمەش بە بەرەو پێش بردن و بڵاوبوونەوەی زمان و رۆشنبیری تورکی لەرێگای دەزگاکانی فێرکردنی کۆلۆنیالیستیانە و پەیوەندیەکانی دەوڵەتی و بازاڕەکان، هەروەها بۆ جێبەجێ کردنی ئەو کار و سیستەمە، زمان و رۆشنبیری کوردی کردە کەرەستەیەکی خاو بۆخۆی، جگە لەمەش تورکەکان لە کوردستان نیشتەجێ دەکران و نیوەی کوردەکانیش بەرەو ئەنادۆڵ راگوێزران، هەروەها لەئەنجامی ئەو فشار و گوشارە ئابووریەدا گەلی کوردیان ناچاری کۆچکردن بەرەو شارە تورکەکان و ئەوروپا کرد.

واتای ئەمەش بریتیە لەوەی کە دەوڵەتی تورکیا ئامرازێکی سەرەکی بووە بۆ داگیرکردنی سەربازیانە و دەسەڵاتی سیاسی و رووتاندنەوەی ئابووری و فراوان بوونی نەتەوایەتی تورکی لە کوردستان. پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لەکوردستاندا لەژێر سایەی دەسەڵاتێکی داگیرکەریانەی ترسناك و درندە پێکهاتووە.

## 4 ـ ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتی چینە کۆمەڵایەتیەکان لە کوردستاندا

لەگەڵ فراوانبوونی نەتەوایەتی چ لەقۆناخی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا بێت یاخود کۆماری تورکیادا، ئەوا رەگەزەکانی بۆرژوازیەتی ناوخۆ پێکهات، کە درێژکراوەی بۆرژوازیەتی تورکی بوو و، لەبۆتەی نەتەوایەتی تورکیادا تواوەتەوە و هەوڵێکی زۆریشی داوە بۆ بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری کوردی لە کوردستاندا، لەگەڵ کردنەوە و ئاوەڵابوونی بازاڕی کوردستان لەبەردەم سەرمایەداری کۆلۆنیالیستدا، دەرەبەگە کوردەکان ئەوانەی کە خاوەن سامان بوون، دەستیان کرد بە کڕین و فرۆشتنی کاڵای سەرمایەدارە تورکەکان کە لەوڵاتە ئیمپریالیستەکانەوە دەیانهێنا و، بەم شێوەیە چینێکی کۆمپرادۆری بەتوندی

گرێـدراو بـە سـەرمایەداری تـورکی گەشـەی کـرد و لەگـەڵ بەرژەوەندیـەکانی دەوڵـەتی تورکیادا ئاوێتە بوو.

چـینی دەرەبەگایـەتی کـۆمپرادۆر کـە لەلایـەك پشـتی بەئایـدیۆلۆژیای ئیسـلامی دەبەسـت، کـە سەرچـاوەی کلکایـەتی و نکـۆڵیکردنی نەتەوەییـە، لەلایـەکی دیکەشـەوە لەبۆتەی نەتەوایـەتی کـەمالیزمی تورکـدا دەتوایـەوە کـە لـە کوردسـتاندا تێکـدەری بـەها نیشتمانی و کۆمەڵایەتیەکانە، ئەو چینە بەپشت بەستن بـە دەوڵـەتی تـورکی خـەریکی ئەوە بوو کە چۆن بەشێوەیەکی قووڵتر گەلی کوردستان برووتێنێتەوە. لەبەرئـەوەی ئـەو چینە هـەموو بـەهاکانی کۆمـەڵگای خسـتە ژێـر پێـی خـۆی، ئـەوا چـینێکی ریسـوا و کۆنەپەرستی مێژووییانـە و کۆسـپ و ئاسـتەنگە لەبـەردەم پێشـکەوتن و پەرەسـەندنی کۆمەڵگا.

پێشـکەوتن و پـەرەسـەندنی سـەرمایەداری بـووە هـۆی پێکهـاتنی وورده بـۆرژوا لـە دەوڵەتـدا، سـەرمایەداری وورده بـۆرژوازی کـوردی بـەرەو پـێش بـرد کـە لەسـەر بنـەمای خزمـەتکردنی سـەرمایەداری داگیرکـەری تـورکی و لەچوارچێوەی بـارودۆخی دەسـەڵاتی دەرەبەگایەتی کۆمپرادۆردا دەرکەوت و، ئەمانە بـوون کـە لەناوەنـدی زمـان و رۆشـنبیری تورکی گەشەیان کرد و نمونەی پزیشك و پارێزەران و خاوەن پیشە سەربەستەکان لەگەڵ وورده بازرگانەکان بوو.

هەرچـەندە کـە بـۆرژوازی بچووك لەزۆربـەی وڵاتـانی دنیـادا خـاوەنی گیـانێکی شۆڕشگێرانە بوون و سیاسەتێکی سەربەخۆیان دارشت، بەڵام لـە کوردسـتاندا ئـەو چینە کـە بنـەما و بناخـە ماددیەکـەی بـەو شـێوەیە بێـت، ئـەوا ئایـدیۆلۆژیا و سیاسـەتێکی تەسلیمکاری و بەکرێگیراوی دادەڕێژێ، هەروەك چۆن گەدەی مرۆڤ زمان ناچاردەکات کە قسە لەسەر رەوشی گەدە بکات ئەگەر پڕ بێت یاخود بەتاڵ، ئەوا **پێکهاتـەی ماددی هـەر چینێك، ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتی ئەو چینە دیاریدەکات**.

وورده بــۆرژوازی کــورد لەســەر بنــەمای خزمــەتکردنی بۆرژوازیــەتی تــورکی لەچوارچێوەی دەزگاکانی دەوڵەتی تورکیا و چینی دەسەڵاتداری کـوردی دروسـت بـووە و، دروسـتکەری ئایدیۆلۆژیایـەکی نیشـتمانی سـەربەخۆیی نییـە، بـەڵکو بـە پێچـەوانەوە ئایدیۆلۆژیایەکی دروستکرد کـە هـەموو شـێوەکانی هەلپەرسـتی لـەژێر نـاوی سۆسـیالیزم

کۆدەکاتـەوە سـەر یـەکتری. ئەگـەر دەمـامکی سۆسیالیستی نەبووایـە نەیانـدەتوانی هـیچ شــتێك بەئــەنجام بگەیــەنن، چــونکە دەتــوانرا هــەموو چــەمکەکانی تەســلیمکاری و نکــۆڵیکردنی نەتــەوەیی و عەشــیرەتگەری و بنەماڵــەیی لەچوارچــێوەی ئایــدیۆلۆژیا ریفۆرمیستە ساختەکان لـەقۆناخی دەرکـەوتنی ئـەو کۆمەڵانـە "ڕێـی ئـازادی، DDKD، کاوە و رزگاری" دا ببینرێت. هـەروەها ئـەو جـۆرە وورده بۆرژوایـە بەتایبـەتیش کـەرتی وورده بازرگانەکان سەرەڕای ئـەوەی کـە بـەرگرییان لـە شـۆڤێنیزمی کۆمەڵایـەتی تـورکی دەکرد، ئەوا بەرگریان لە ئایدیۆلۆژیای ئیسلامی دەکرد کـە ئـەو ئایدیۆلۆژیایـەش نکۆڵی لە نیشتمان دەکرد. بەڵام سیاسەتی ئەو چینە کە گرێدراوی ئەو ئایدیۆلۆژیایە بوو، ئـەوا بۆ بەدەستخستنی بەشێکی کەمی ئەو رووتاندنەوەیـە ئاراسـتە دەکـرا، کـە دەرەبەگایـەتی کۆمپرادۆر و بۆرژوازیەتی تورکی پەیڕەویان دەکرد، هەروەها بۆ بەدەسـتهێنانی دەرفـەت و بـواری ژیــانکردن بــوو، بــەو شــێوەیەش وورده بــۆرژوازی داوای لــە دەرەبەگایــەتی کۆمپرادۆر کرد کە وەك نوێنەرێکی بەرژەوەندیەکانی دانی پێدا بنێت. ئەگەر نـا هـەموو بەرژەوەندیــەکانیان ســەراوژێر دەبــن، لەهــەمان کاتیشــدا دەیخواســت لــەدژی ئــەو بەرخۆدانەی کە بنکە و سەرچاوەی خۆی لەبزاڤی شۆڕشگێرییەوە دەگرێ پشتگیری بکـات، ئەمەیان لەلایـەك و لەلایـەکی دیکەشـەوە داوایـان لـە بـۆرژوازی تـورکی دەکـرد بۆئـەوەی زیـاتر گـەرەتنی ژیانیـان پـێ ببەخشـێت و بـواری کارکردنیـان بـۆ ئـاوەڵاتر بکاتـەوە و، سیاسەتی روتاندنەوە و چەوساندنەوەی دەوڵەت نـەرمتر بکرێتـەوە بـواری دیموکراتیـەت زیـاتر بێـت بۆئــەوەی هەنــدێك پایــەی ســەربازی بگرنــە دەسـت، بـەو رەنگـە ئەگـەر داواکاریــەکانی پەســند بکرایــە ئــەوا دەیــانتوانی زیــاتر گــەل هەڵبخەڵــەتێنن و بەبەرزکردنەوەی هەندێك دروشمی ساختەی نەتەوایەتی، بەڵێنی ئـەوە دەدات کـە ببێتـە هێـزی شۆڕشـگێڕانەی گـەل لـەدیاردەی دەرەبەگایــەتی و کـۆمپرادۆری و داگیرکەریـدا. لەکاتێکدا کە وەڵامی داخوازیەکانی نەدرێتەوە ئـەوا دەتـوانن خۆیـان وا نیشـان بـدەن کـە لەژێر ناوی رزگاری نەتەوەیی و شۆڕشگێڕی خەبات دەکەن."دەتوانرێت هـەموو ئـەوەش لەو بڵاوکراوانەیاندا کە زمانحاڵی ئەوانن بەرچاو بکەوێت"بەکورتی ئەو بەکرێگیراویـەی لەکۆندا چینە دەرەبەگـەکان جێبـەجێیان دەکـرد لـەکاتی ئێسـتادا وورده بـۆرژوازی پێـی هەڵدەستێت و لەسەر بنەمای پارتە سیاسیەکان، رێکخراوە.

لەپاش ساڵانی پەنجاکانەوە و پەیوەستبوون بە سیاسەتی ئابووریانەی ئیمپریالیزم و بۆرژوازیەتی تورکی ئەوا سوپای بێکاران دەرکەوت، ئەمەش لەئەنجامی ئەوەی کە ئەو گوندنشینانەی لەزەوییەکان دابڕابوون لەشارەکانیش شوێنی کارکردنیان دەست نەدەکەوت. لەسەرەتای پێشکەوتنی سەرمایەداری لە کوردستاندا، زۆربەی ئەو خەڵکەش روویان کردبووە مەترۆپۆڵە تورکیەکان و ئەوروپا و تەنانەت گەیشتبوونە ئوستورالیا و عەرەبستانی سعودی و ئەمریکا و، لەکاتێکدا کە تورکەکان بەشێکی ئەو خەڵکەیان خستبووە خزمەتی کارە گرانەکان و بەشەکەی دیکەشی وەکو کۆیلە لە کارگە و دەزگاکانی دەوڵەت بەکاردەهێنران و، بەبلاوە پێکردنی هێزی کرێکاری کوردستان بۆ سەرجەم ناوچەکانی دنیا ئاستەنگ و کۆسپ خرایە بەردەم دروستبوون و دەرکەوتنی چینی کرێکاری چڕوپڕی بە هێز لە کوردستاندا، هەروەها دەرکەوتنی چینی کرێکاری کوردستانی لەهەندەران لەسەر بناخەی سەرمایەداری دەوڵەتی داگیرکەر بوون لەجیاتی سەرمایەداری نەتەوایەتی هەروەك چۆن بێکاریەکی گەورەشی لێکەوتەوە، ئەوا ئەو بارودۆخە نالەبارە وایکرد کە دەستکەوتنی کار ببێتە مەسەلەی بەخت لە کوردستان و ئەو رەوشە لادانی هەلپەرستانە و بەکرێگیراوێتی لەنێوان کرێکاران پەرەپێ دەدات و رێگەی لەبەردەم توانەوەی نەتەوایەتی کردەوە. جگە لەمەش ئەوا بیروبۆچوونە ئایینی و عەشیرەتی و بنەماڵەییەکان تا ئێستاکەش لە گوێی کرێکاران دەزرنگێتەوە و لە پەیوەندیەکانی گوندێتی دانەبڕاون. ئەمانەش تایبەتمەندیە لاواز و نێگەتیفیەکانی پرۆلیتاری کوردستانن. لەبەر ئەوەی کە پرۆلیتار ئەو چینەیە کە لەرووخان و نەمانی دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی کۆمپرادۆر و داگیرکەری زیاتر سوودمەند دەبێت و خاوەنی ئەو ئایدیۆلۆژیا شۆڕشگێڕانەیە کە ئەزموونی گرنگی دەرخستووە لەسەرجەم تێکۆشان و خەباتی رزگاری نەتەوایەتی و چینایەتیەکان کە خۆی لە سۆسیالیزمی زانستیدا دەنوێنێ، ئەوا ئەو چینەیە کە لەو سەردەمەدا لە هەموو چینەکانی دیکە زیاتر شۆڕشگێڕانەیە. لە رێگەی پرۆگرامە شۆڕشگێڕیەکەشی دەتوانێ خەباتی دیموکراسی و سەربەخۆیی بگەیەنێتە سەرکەوتن. لەبەر ئەوەی کە زیاتر نزیکی چینە جووتیارەکانە کە نوێنەرایەتی هێزێکی گەورە دەکەن لەناو شۆڕشدا، ئەوا پرۆلیتاریا تاکە چینی پێشەنگە کە هەڵگری ئاڵای دیموکراسیەت و سەربەخۆیی وڵاتە، ئەو تایبەتمەندیانە

واتای لایەنە پۆزەتیف و بەهێزەکانی پرۆلیتاریای کوردستان دەگەیەنێ. سەرەڕای لاوازی پێشکەوتنی پرۆلیتاریای کوردستان لە رووی چۆنایەتیەوە ئەوا توانیویەتی بگات بە ئایدیۆلۆژیای شۆڕشگێرانە. هەرکە دەستی بە گۆڕان کرد بەرەو بوونی بە چینێکی سەربەخۆ، ئەوا لە پێناو دیموکراسیەت و سەربەخۆیی دەستی بەخەبات کرد و ئەو تایبەتمەندیانەش لە سالانی داهاتوودا زیاتر روون دەبێتەوە . کاتێك خاوەنی ئایدیۆلۆژیای هاوچەرخی دواڕادە پێشکەوتووانە بێت کە لەگەڵ تێکۆشان و خەباتی سیاسیانەدا دەکەوێتە نێو ژیان سەرەڕای بلاوبوونەوەی ئایدیۆلۆژیای هەلپەرستانە لە گۆڕەپانی جیهانیدا، ئەوا ئەو چینە دەتوانێ لە ماوەیەکی هەرە کورتدا ئاستی خەباتی خۆی بڵندتر بکاتەوە. بەکورتی چینی کرێکاری کوردستان خەریکە ببێتە چینێکی سەربەخۆ و لەدژی کۆنەپەرستی و داگیرکەری تورکی بۆ هێنانە دی ئامانجەکانی لە ئاواکردنی ولاتێکی سەربەخۆ و دیموکراتدا دەستی بە تێکۆشان کردووە.

ئەو گوندنشینانەی کە هەر لەسەدان ساڵەوە لەداوێن و لەژێر سێبەری چیاکانی کوردستاندا دەژین و تاوەکو سەر مۆخی ئێسقانیان هەست بە رووتاندنەوە و چەوساندنەوە دەکەن، لەبەرئەوەی بەرادەیەکی زۆر لەژێر چەوساندنەوەی ژەندرمەکان و رووتاندنەوەی وورده بۆرژوای شار و دەرەبەگە گوندەکاندا ماوەتەوە، ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی رق و کینێکی گەورەیان لەلا دروست ببێت. ئەم رق و کینەش وایان لێدەکات کە ببن بە هێزێکی گرنگ لەناو بزاڤی رزگاری نەتەوەیی و چینایەتیدا و لەبەرئەوەی کە چینی جوتیاران بەشێکی گەورەی هەژارانن و بەشێوەیەکی توند گرێدراو و پەیوەستن بە چینی کرێکارانەوە. ئەمە وایان لێدەکات کە ببنە ناوەند و دەوروبەرێکی گونجاو بۆ بلاوکردنەوەی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتی شۆڕشگێرانە لەنێوانیاندا، هەروەها ئەم چینە لە چینەکانی دیکەی کۆمەڵگا زیاتر پارێزگاریان لە خوو و نەریت و زمان و رۆشنبیری کوردی کردووە، بۆیە ئەو چینە هێزی سەرەکیە بۆ بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کوردستان. هەرچەندە چینی جوتیاران هێزێکی گەورەن بەڵام ناتوانێ ئایدیۆلۆژیایەکی تایبەت بەخۆیان بهێننە ئارا و ناتوانێ بەتەنیا خۆی رێکبخات، بەڵکو ئایدیۆلۆژیای چینەکانی دیکە وەردەگرێت کە بۆ خزمەتکرنی بەرژەوەندیەکانیان دروستکراوە و پەسندیان دەکات و لەلایەن ئەو هێزانەشەوە رێکدەخرێت. ئەمرۆکەش هەرچەندە کە بەشێکی گەورەی ئەو چینە لەژێر کاریگەری ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتی هێزە

کۆنەپەرستەکاندان، لەگەڵ ئەوەشدا زەمینەیەکی لەبارە بۆ بڵاوبوونەوەی بۆچوونەکانی سەربەخۆیی و ئازادی.

بەڵام لاوەکان ئەوا لەدەوروبەر و لەژێر کاریگەری کولتووری دەرەبەگایەتی کۆمپرادۆر و داگیرکەری و ئیمپریالیزمدا گەورە دەبن و پەروەردە دەکرێن. لەبەرئەوەی توێژی لاوان توێژێکە کە زوو دووچاری نەخۆشی دەبن و هەروەها ماوەیەکی کورت و خێراش چارەسەر دەکرێن و چاك دەبنەوە، چونکە توێژی لاوان زیندووترین و بەجووڵەترین دینامیکی توێژی کۆمەڵگان، بەواتای ئەوەی ئەو توێژە خاوەنی زەمینەیەکی لەبار و یارمەتیدەرە بۆ گۆڕان و پێشکەوتن.

لەهەموو وڵاتاندا لاوان خاوەن تواناکاری گەورەن و دەرفەتی ئەوەیان هەیە فێری زانیاری و زانست ببن و، بنگە و پێکهاتەی چینایەتیان هەرچیەك بێت ئەوا نوێنەرایەتی توێژێك دەکەن، کە کۆیلایەتی بۆ چینە دەسەڵاتدارەکان لەلای لاوان بەرادەیەکی زۆر کەم جێگەی خۆی دەکاتەوە. بۆیەش بە توێژە هەرە نزیکەکان دادەنرێت کە توانای نزیکبوونەوەیان هەیە لە ئایدیۆلۆژیای شۆڕشگێڕانە و ئەمەش یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی لاوانی کوردستان، هەر لەبەرئەوەشە جێگایەکی گرنگیان لەنێو بزافی رزگاری نەتەوەییدا گرتووە. لەکاتێکدا کە لە وڵاتانی دیکەدا لاوان دەتوانن کار بکەن و، هۆکاری دیکەی گرێدراو بە لاوانی کوردستانیش ئەوەیە کەناتوانن بۆخۆیان دەرفەت و بواری کارکردن بەدەست بخەن و دەرەبەگایەتی وەکو کۆسپێکی گەورە و بەردێکی رێگر وایە لەبەردەم پێشکەوتنی لاوان.

هەروەها هەموو چینەکان هەوڵ دەدەن کە ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتی خۆیان بەسەر لاواندا بسەپێنن و بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانیان بەکاریان بهێنن، چونکە هەبوونی دەسەڵات بەسەر لاوان بەواتای هەبوونی دەسەڵات بەسەر کۆمەڵگای دوارۆژ دێت.

جگە لەمەش ئەوا هەر چین و نەتەوەیەك ئەگەر بەگوێرەی ئایدیۆلۆژیای خۆی هەوڵی خوڵقاندنی بزاڤێکی رۆشنبیری نەدات، ئەوا ناتوانی بەرژەوەندیەکانی خۆی بپارێزێ و ئامانجەکانی بێنێتە دی. ئەمەش گرنگی و بایەخی بزاڤی لاوانی رۆشنبیر دەخاتە روو کە تا چەند گرنگیەکی ژیانییە، بۆیە دەبینین داگیرکەری تورك هەموو ئەو شێوازانەی کە لەتوانایدا هەیە بەکاری دەهێنێت بۆ تواندنەوەی لاوانی کوردستان

لەچوارچێوەی زمان و رۆشنبیری تورکیدا، ئەمەش لەپێناو بەکارهێنانیان لەخزمەتی بەرژەوەندیە داگیرکەریەکان، جگە لەمەش ووردەبۆرژوا و دەرەبەگایەتی کۆمپرادۆر هەموو هێزێکی خۆی دەخاتە گەڕ بۆئەوەی لاوان رووەو بەرژەوەندیە چینایەتیەکانیان ئاراستە بکەن. بەڵام سەبارەت بەگیانی شۆڕشگێڕی لەلایەن لاوانی رۆشنبیرەوە ئەوا گرنگی و بایەخێکی گەورەی هەیە و وەکو هێزێك وان کە دەتوانن رێگای کۆمەڵگا رۆشن بکەنەوە. هەروەها لەناو شۆڕشی رزگاری نەتەوەییدا لاوانی رۆشنبیر بەخاڵی هەنگاو هاوێشتن بۆ گەیشتن بە ئاستی ئەو کادیرانەی کە هەڵدەستن بە ئافراندنی ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتی تێکۆشانی شۆڕشگێڕانە کە پشت بە یەکگرتنی نێوان جووتیار و کرێکاران دەبەستێت و لە ماوەیەکی کورتدا لەلایەن دەستەیەکی رۆشنبیرانی شۆڕشگێڕ لەکوردستاندا ئایدیۆلۆژیای شۆڕشگێڕانە گەڵاڵە کراو بە بەرنامەیەکی داڕێژراو لاوان لەسەر بنەمای کادیری رێکخران، تا گەیشتن بەئاستی هێزی سیاسی و ئەمەش بەشێوەیەك بەردەوام دەبێت کە هەموو چین و توێژەکانی گەل بخرێتە نێو ریزەکانی خەبات و تێکۆشان و لەسەر ئەم بنەمایەش لەهەموو بوارەکانی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، سەربازی و رۆشنبیریدا خەباتێکی چڕوپڕ و بەرفراوان لەدژی چینە دەسەڵاتدارەکانی ناوخۆ و داگیرکەری تورکیدا پێش دەخرێت.

## کێشەی ژن و خێزان

لە کاتی باسکردنی ئەم مەسەلەیەدا، مەسەلەی پیاو و خێزانیشم بیردەکەوێتەوە. من ئێستاکە بیر لەوە دەکەمەوە لە کوێوە دەست پێبکەم و ئەو خاڵانەش چین کە دەبێ روون بکرێنەوە؟

من جدییەتی مەسەلەکە دەبینم، وەکو ئەو مرۆڤەی کە لەدۆخێکی ترسناکدا بێ و ئیتر دەبێ چۆن بخرێتە ژووری نەشتەر کارییەوە. جا چۆن دەتوانین هەڵوەستەیەك لەسەر بەشەکانی ئەم مەسەلەیە و بەتایبەت لایەنە خێزانیەکەی بکەین. خۆ ئەگەر لە گۆشە نیگای دەروازیەکەوە بۆ ئەم مەسەلەیە هەڵوەستەیەك بکەین، دیارە یەکەم شت بە خەیاڵی مرۆڤدا دێت ئەوەیە: کە کۆمەڵگا لە ژن و پیاو پێکدێت. ئەمە شتێکی واقیعییە، چونکە ناکرێ باسی کۆمەڵگایەکی بێ ژن و پیاو بکەین. کاتێك ئاماژە بۆ زاراوەی خێزان دەکەین، پێوەندی نێوان ژن و پیاو یا پەیوەندی هاوسەرێتی یان ئەوەی کە ناوی دێنن جووت بوون دەردەکەوێتە روو. ئەمە پێناسەی سادەی زاراوەی خێزانە.

کاتێکیش دەڕوانینە ئەو شێوەیەی کە ئێستا لای ئێمە هەیە، دەبێ بڵێین: خوایە ئەمە چی خێزانێکە چی بەسەردا هاتووە؟ ئەمە چ پیاوێتی و چ نمونەیەکە لە پیاو و ژن و خێزان؟ چۆن دەتوانین لەم بارە رزگار ببین؟ بەڵام بۆ ئەوەی مەسەلەکە ئاڵۆز نەبێ، دەتوانین بڵێین: زاراوەی خێزان خانووش دەگەیەنێ. ئێمە پشتگیری ئەم گوتەیە دەکەین کە دەگوترێت: باوك و دایك دوو بوونەوەری پیرۆزن، بەڵام پەیدابوونی ئەم دەزگایە لە کاتێکی یەکجار زووەوە لەلای ئێمە دەست پێدەکات. ئەمەش سەرچاوەی گیروگرفتەکانە. ئێمە زێدەڕۆیی ناکەین ئەگەر بڵێین: وەك گەرمی پێوی لێهاتووە، بەرزدەبێتەوە و دادەبەزێ و جێگیر نابێ. ئەگەر بتانەوێ لەئاستی کۆمەڵایەتی و نیشتمانی تێبگەن، ئەوا دەبێ مەسەلەی ژن و پیاو و خێزان و ژنهێنان و پەیوەندیەکان تێبگەن، چونکە ئێمە لە مەسەلەی نیشتمان و کۆمەڵایەتی قووڵ نابینەوە. ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ بێ هێزیمان لەڕووی رۆشنبیریەوە. ئێمە پێمان دەکرێت مەسەلەی خێزان بەباشی تێبگەین، چونکە پێوەی گرێداوین. جا بۆئەوەی لە زاراوەی خێزان و نیشتمانپەروەری و ئاستی کۆمەڵایەتی بەلایەنە جیاجیاکانیەوە تێبگەین، دەبێ کردەوەی ئەوانە پەیڕەو بکەین. دەتوانین گەلێك شتی پەیوەست بە نیشتمانپەروەری و بارودۆخی کۆمەڵایەتی بزانین، ئەویش لەڕێگای دەستپێکردنەوە بەخێزان دەبێت. لەبەر ئەم هۆیە بایەخ بەم مەسەلەیە دەدەین. بۆ ئەوە نا هەر کەسە و باسی خۆی بکات یا پەردە لەڕووی خەسڵەتەکانی ژن و پیاو لابدەین یاخود مەسەلەی کۆیلایەتی و ئازادی ژن دەربڕین، بەڵکو بۆئەوەی راستی نیشتمانپەروەری و ئاستی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و نەریت و

شەرەف و کەرامەت و پاڵەوانی و نزیکبوونەوەکانی دوژمن باش تێبگەن و هۆیەکانی کەوتن و تێکشکان بزانن.سەرەتا دەبێ زاراوەکانی سۆز و خۆشەویستی روونبکرێنەوە. دەمەوێ ئەو چەمکانە ریسوا بکەم کە تازە دەرکەوتوون. ئەگەر زۆر وریا نەبین، هەموو ئەوانەی کە ئێستا بەدیهێنراون هەرەس دێنن. ویستمان کە سیاسەتی ژنێك یان پیاوێکی تاڕادەیەك ئازاد بخولقێنین، ئەگەر رووبەڕووی ئەو لادانانەی کە لەم بارەیەوە سەرهەڵدەدەن خەبات و ململانێیەکی نێوخۆیی چڕوپڕمان نەکردبایە، ئەوا مەسەلەکە دەکەوتە بابەتی ناموس یا مەسەلەی کالا و شێوەیەکی لەوە ترسناکتریشەوە. ئەمەش بەرەو هەڵدێرمان دەبات و بەشێوەیەکی چڕوپڕیش دەردەکەوێ. ئەم بابەتە کارمان لێدەکات و دواتر کار لە خەباتیشمان دەکات.

لە کتێبی "شیکردنەوەکانی کانوونی دووەمی 1994"دا بەناوی "با لە کێشەکانمان تێبگەین و خۆمان بکەینە هێزی چارەسەری" لەسەر گەلێك لایەنی جیاجیای واتای نیشتمانپەروەری و ئەو ئەرکانەی کە هانمان دەدات ئەنجامی بدەین هەڵوەستەم کرد. بەلام ئەو مەسەلەیە لەو ئاکامانە فورستر خۆی دەنوێنێ کە ئەمڕۆکە دەردەکەون، چونکە لەسەر ئەم بابەتە و لەڕووی پەیوەندیەکانی ژن و پیاوەوە وتەیەك هەیە دەڵێت: "ئەوانە هەردوو باش یەکتری دەناسن"، بەلام بەپێی باوەڕی من بەشێوەیەکی یەکجار خراپ کار لەیەکتری دەکەن. خێزانەکەم لە نموونە کەم وێنەکانی ئەمەیە. مەڵێن: "تەنیا خێزانەکەی تۆ ئاوایە و دەتەوێ لە باردۆخی خێزانەکانی ئێمەشدا تاقی بکەیتەوە". ئەم جنێو و دەمەقڕە بەردەوامانەی کە لە خێزانەکەی مندا (واتە لەنێوان باوك و دایکمدا) روویان دەدا پاڵیان پێوە نام هەر بەزوویی هەست بەکاریگەری ئەم دەزگایە بکەم. باشترین شت کە کردیان ئەوە بوو راستی خۆیان بەڕوونی خستە روو. ئەمەش بواری ئەوەی پێدام کە بتوانم بەشێوەیەکی باشتر لە راستینەی ئەم بابەتە نزیك ببمەوە. بەلام خێزانەکانتان بەجۆرێکی ساختە و قەناعەتێکی زۆرەوە دەژین، بۆیە پێیان خەڵەتان.

ئەگەر لە خێزانەوە دەست پێبکەین، ئەوا لەهەر دەستپێکردنێکی دیکە زیاتر ئاکامی باشترمان دەداتێ؛ چونکە پەردە لادان لەسەر شێوازی خێزان و خوو پێوەگرتن و داب و نەریتی خێزان بۆ رۆشنبیریەکی بێ ئەندازەیی ئەقڵتان دەگەڕێتەوە. واتە زانینی زاراوەکانی هەر یەك لە باوك و دایکەوە تا دەگات منداڵان و هاوڕێ و پەیوەندیەکانی

برادەرایەتی، ئەمە بەچەند ئاکامێکی زۆر گرنگتان دەگەیەنێ، چونکە هێزی نزیکبوونەوەی راست و دروست لەلاتان یەکجار لاوازە. نزیکایەتیەکانتان ئێستا مۆری هەڵخەڵەتاندنیان پێوەیە. باسی چ شێوەیەك لە باوك و دایك بکەین؟ خۆ هەموویان دەستە پارچەن. باسی چ شێوەیەك لە منداڵانیش بکەین؟ هەموویان بەرەڵان، باسی چ ژنێك و چ پیاوێکیش بکەین؟ خۆ سەرتاپایان لە دۆخێکی رەشبینی ئاڵۆزدان و گۆشەگیرن و بەبێ چارەسەری لە واقیعدا دەژین. ئەگەرچی ئەم دەزگایە دەبوایە هێز بەم پەیوەندیانە ببەخشێ، کەچیبەپێچەوانە رۆڵدەگێڕێ. لەبەر ئەم هۆیەیە کە ئەم کێشەیە بایەخێکی گەورەی هەیە و لە کۆمەڵگاشدا بڵاوە و هەر لەبەرئەمەشە کە بەدەزگای سەرەکی ناوی دەبەن و هیچ شتێك جێگای ناگرێتەوە، بەڵام ئەو دەزگایە لای ئێمە رۆڵێکی وەهای بینی پێچەوانەی ئەوە بوو کە چاوەڕوان دەکرا. ئەوەش خاڵی کردنەوەی هێزی مرۆڤ بوو بەئامرازێك کە مرۆڤ لەژێر کێشەکانیدا بخنکێت. دیارە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ رۆڵی دوژمن لە نوقمکردنی ئەم دەزگایە.

وەك پێشتر گوتم: نامەوێ ئەو تایبەتمەندیانە دووپات بکەمەوە کە گەلێك جار روونمان کردنەوە. بە پێویستی نابینین سەبارەت بە مەسەلەی ژن و کۆلۆنیالیزم یا خێزان بەدرێژایی قۆناخەکانی مێژوو و بەتایبەت خێزان و رژێمی 12 ئەیلول هەڵوەستە بکەین، یاخود لە پەیوەندی نێوان ژن و بەشێوە گشتیەکەی و پەیوەندیە ئازاد و هەڵئاوساوەکان بتوێژینەوە. کاتێك باسی ئەوەمان کرد ژن و پیاو دەتوانن بەو شێوەیەی کە ئارەزوویانە و وەك ناچاریەکی سروشتی بێنە پاڵ بزووتنەوەیەکی ئازاد، بێگومان پەیوەندی نێوان ژن و پیاومان بە پەیوەندیەکی بنچینەیی دانا. خۆ ئەگەر هەستیار نەبووینایە و مشووری پێویستیمان نەخواردایە، ئەوا چەندین بەڵامان بەسەر خۆماندا دەهێنا، چونکە زۆربەی پەیوەندیە باوەکان دەرەنجامی پەروەردەی دوژمنن. سەرباری گێلییە باوەکە، ئەگەر شێوە راستەکە نەسەپێنین، لەشکرەکەمان بەتەواوی پەرەتەوازە دەبێ. لەپێناو بنیاتنانی نوێدا پێویستە تەڤلیبوونی راست ئەنجام بدرێ، بەڵام ئەگەر بایەخی بارودۆخەکەمان کەمکردەوە و لە شێوازی پارتی و نزیکبوونەوەی هەڤاڵبەندی دوورکەوتینەوە، هەروەها ئەگەر لە بنچینەکانی هاوشانی و ئازادیی راستەقینە دوورکەوینەوە، ئەوا پەیوەندیەکانی ژن و پیاو هۆی وەهامان بۆ دروست

دەکەن کەلەماوەی دوو رۆژدا پاکتاو بکرێین، ئەویش بەناوی ئارەزوو و خۆشەویستیەوە. تەنانەت من باسی ئەزموون و سەرنجی خۆم دەکەم و دەڵێم: **مرۆڤ چەندە بە جەرگ بێ، دەبێ ئەوەندەش واقیع بین بێ**، چونکە ناکرێت شۆڕشەکەمان بەڕێوەببەین ئەگەر پەردە لەسەر هەموو لایەنەکان لانەدەین، هەر لەنزیکایەتی لە مولکداری و دەرککردن بەوەی کە کێ کەڵك لەم نزیکبوونەوەیە وەردەگرێ و ئایا ئێمەین سوود وەردەگرین یان دوژمن؟ ئایا ئەمە بەلای ئازادی یان کۆیلایەتی دەشکێتەوە؟ ئەگەر نا ئێمە بەدڵنیاییەوە ناتوانین رێ لەم بەڵایە بگرین کە ئامانجی سەرنەکەوتنی هەموو هەوڵ و تەقەلاکانمانە.

هەندێك ژن هەن بەشێوەیەکی خەیاڵی دێنە نێو ریزەکەنمان. ئەگەر لە بەردەم ئەمەدا رانەوەستین و رێ و شوێنی بۆ دانەنێین، ئەوا بەبێ سێ و دوو دەبێتە هۆی لەنێوچوونمان، لەڕاستیدا کە من هەر زوو لەم مەسەلانە جیا بوومەوە. ئەمە ناڵێم بۆ ئەوەی ستایشی خۆم بکەم. ئەگەر نەمتوانیبایە هەر لە منداڵیمەوە ئەم پەیوەندیە بەشێوازی گومانکردن شیبکەمەوە، ئەوا لە مێژبوو کۆتایم پێدەهات. ئەگەر بەیەکێکی دیکە خەڵەتابام و بەو داب و نەریتە رازی ببوومایە کە باوانم و شێوازی نزیکبوونەوەیان دەیسەپێنن، هەر زوو دواییم بەخۆم دەهێنا. بەڵێ پەیوەندی کۆمەڵایەتی دەبەسترێت، بەڵام چۆن؟ هەستێکی زۆرم هەبوو و هەر لە حەوتساڵیمدا هەوڵمدا پەرە بەشێوازێکی تازە بدەم. بەڵام مەسەلەکە لەلایەن ئێوەوە هەر بەزوویی چارەسەر کرا، ئەمە جیاوازی نێوانمانە. ئێوە بەئاسانی دڵبەندی یەکدی دەبن و دڵداری دەکەن و ئارەزووتان دەردەبڕن. کەس نازانی ئەو غەریزە گەورانەی کە لەناختاندان لە چ پلەیەکدان. ئەگەر دەرفەتان دەست بکەوێ، مەگەر هەر خوا بزانێ چۆن غەریزەکانتان تێر دەکەن. ئەمە مافی ئێوەیە، ئێوە هەموو ئەوانەتان لەلا هەیە و بەوە تاوانبارتان ناکەم چونکە شتێکی یەکجار سروشتییە. غەریزەی سێکسی زۆر سروشتییە و، ئارەزووەکانی ژن و پیاویش ئارەزووی یەکجار سروشتین. لەبەر ئەوە رەخنەتان لێ ناگرین کە ئەم خەسڵەتانە لە کەسایەتیتاندا هەن. ئەمە ئەو واتایە ناگەیەنێ کە ئێمە نکۆڵی لە سروشت دەکەین. ئەمە هیچ پەیوەندیەکی بە واقیعەوە نییە. بەڵام مەسەلەکە تەواو پێچەوانەی ئەوەیە. هەمووتان دەزانن بەناوی غەریزە و ئەشقەوە چی بەسەر گەلەکەمان هاتووە. ئەوە چۆن و لەکوێوە هات؟ کێشەکە ئەوەیە کە ئێمە چۆن هەڵدەخەڵەتێین و کەسانی دیکە بەناوی پەیوەندی و نکۆڵیکردن لە یەکتری بەدرۆ و کۆیلایەتی نێو ئەم پەیوەندیانە

دەخەڵەتێنین؟ ئێمە گرێکەمان کردەوە. ئەمە لەکوێوە و چۆن دەردەکەوێ؟ داخۆ ئێمە ئەم واقیعەمان خوڵقاندووە؟ نەخێر، ئەوە دوژمنە کە سەدان ساڵە گەمەتان پێدەکات و برینەکەی وایلێکردووە و ئەستەمە ساڕێژ ببێت. بەڵام ئێمە بەدەرزی ئاژنێک تەقاندمانەوە تا هەست بەو واقیعە بکەن کە گیرۆدەی بوون. بەبێ پاساودان نەمانگوتووە: "**ئەم پەیوەندیانە پەیوەندی نۆکەری بابەتین**". چونکە ئەگەر رێگا لەبەردەم ئەم نۆکەرییە بابەتیە ئاوەڵا بکەین، ئەوا بزووتنەوە رزگارییە نیشتمانی و پارتیەکەمان پێکەوە هەرەس دێنێ. دیارە پێویستە مل بۆ یەکتری درێژ نەکەین و بەئاسانی نەبین بە کۆیلەی یەکتری. دەبێ رووبەڕی هەموو شێوە کۆیلایەتیەک ببینەوە و نەکەوینە نێو هەڵەی گەورە و بەوەی کە بکەوینە داوی چەند بارێکی غەریزەیی هەرزان بەها و پڕ سۆز یا ئەشقێکی هەرزانەوە. پێویستە خۆمان هەڵنەخەڵەتێنین بەوەی کە جێبەجێکردنی ئەم حاڵەتانە شتێکی راستە و دەستبەرداربوونی بۆ نییە. پێویستە هەموو حاڵەتێکی ئەشق و ئارەزوو، ئەگەر لەنێو ئەم چوارچێوەیەدا بن، نەهێڵین و دڵنیا بین لەخۆمان کە دەبێ لەسەر بنچینەیەکی دروست پەرە بەم لایەنانە بدەین با زۆریشمان پێ بچێ و چیمان هەیە لەم رێیەدا بیبەخشین

نازانم ئایا دەتوانین دەرببەین یا دان بەخودابگرین؟ ئەم کێشەیە تەواو هاوشێوەی هەڵوێستمانە بەرامبەر بە دوژمن. ئەگەر هەر بێ هێزییەک لەم مەسەلەیەدا دەرکەوت، ئەوا دەبێ بەرامبەر بەوە پەرە بە بەرخودان بدەین. ئێوە زیندە بەچاڵ کراون و بەناوی ئەشق و سۆزەوە هەرەستان پێهێنرا. چی لەوە تێگەیشتن؟ دەڵێن: ناتوانین بەبێ ژن یا پیاو بژین، ئێمە لەم بارەیەوە ئاماژەمان بۆ دوو پرسیار کرد، ئەو قسەیە راست نییە کە ژیان بەبێ ژن یا مێرد نابێ، ئێمە هەر لەزووەوە مەسەلەکەمان روون کردۆتەوە، پیاو ئامادەیە لە پێناوی ژندا و بەناوی شەرەفەوە هەموو شێوەیەکی بێ شەرەفی لێ بوەشێتەوە. بەچاوی خۆم ئەوەم دیوە، تەنانەت ئامادەیە لە پێناوی ژنێکدا نیشتمان و سامان و موڵکی خۆی بفرۆشێ. ژنیش بۆ پەیوەندیەکی ناقۆڵا خۆی بە پیاو دەبەخشێ و خۆی هەڵدەخەڵەتێنێ. ئێمە ئەوەمان بینی، بەڵام لێی دوور کەوتینەوە، ئەمە هەڵوێستێکی جوان بوو، من لێتان دەپرسم: ئێوە تا چ رادەیەک بیرتان لەم بابەتە کردۆتەوە؟ ئەمە پرسیارێکی لەجێی خۆیدایە، دەمەوێ پێتان بڵێم من مرۆڤێکم حەز

به ووردبوونەوە دەکەم و ئەزموونیش لە ژیانی خۆم وەردەگرم. واتە دەمەوێ بزانم ئەم پەیوەندیانە چ بە مرۆڤ دەدەن و چی لێ زەوت دەکەن؟ هەتا دایکیشم پێی دەگوتم: **"ئەی من دایکت نیم، کەواتە ماڤ خۆمە کە چۆن بمەوێ وەها هەڵسوکەوتت لەگەڵدا دەکەم"**. لە منداڵییەوە بیرم لەهۆی ئەو داواکاریە دەکردەوە، تا ئێستاش لەبیرمە مریشکێك هەبوو جووجەڵەکانی لەگەڵیدا بوون و لەژێر باڵیدا دەرۆیشتن. بەدایکم گوت: **"پەیوەندی من بەتۆوە وەکو ئەو پەیوندیەیە کە مریشکەکە بە جووجکەکانیەوە دەبەستێتەوە"**. لێکچواندنێکی ناڤۆڵایە، بەڵام من دەرمبڕی، پاشتر ئەنجامێکی راستەڤینە و واقیعیمان لێوەرگرت و، ئەمەش ئەوەبوو کە خێزانەکە خاوەنی هیچ پلان و هۆشیاری و بەرپرسیاریەك نەبوو. هەندێك رووداوی ژن هێنانیشم لە دەوروپشتی خۆمدا دی. هەندێکیان خەڵکی ناوچەی "چقور ئۆڤا" بوون و بە درێژایی ساڵ بۆ دابینکردنی پارەی شیربایی کاریان دەکرد، لەخۆم دەپرسی: ئەوە چییە روو دەدات؟ هەندێك کەس دەڵێن: کچەکەمان لە فلان جێوە برد و فلان کەس هات و ئەو برە شیربایییەی پێداین. مەسەلەی خوشکەکانیشم دی کە چۆن دەهاتن دەیانبردن، ئایا دەتوانین بڵێین ئەوانە چەند مەسەلەیەکی نائاسایین؟ سەرەتا بەم پرسیارانە دەستمان پێکرد. پاشان رووداوەکە گەورە بوو. رووداوێك هەیە خۆم تێیدا ژیام. لە کتێبی ***"داستانی ژیانەوە"***دا ئەم رووداوەم بۆ روون کردنەوە، سەرباری ئەوەی کە گەلێك کەس دەڵێن: "پەیوەندی جۆرێکە لە خوو پێوەگرتن و ئەرکێکی ئاسایە" بەڵام وێڕای دووری پەیوەندیەکانمان لەوەوە و تا رادەیەکی زۆر پشت ئەستووربوونی پەیوەندیەکانمان بە چەند بنەمایەکی سیاسیەوە، ئەگەر هەر لە سەرەتای دروستبوونی PKKوە بەشێوازێکی راست نزیکی پەیوەندی کردن بە ژنەوە نەبووینایە، ئەوا بەرێگای سەرتێداچووندا دەرۆیشتین و پێ بەپێ دەبووین بەنۆکەری دوژمن. جێی بایەخ نییە کە ئەو کەسەی وا بەرەنگارمان دەبێتەوە نۆکەرێکی راستەوخۆی دوژمنە یان نا، ئەگەر دژی ئەم شێوازەی کە بەسەر واقیعدا سەپێنراوە رانەوەستاباین، هێندە بەس بوو بمانبەزێنن. تا ئێستاکە بیردەکەمەوە ئاخۆ دەکرێت کەسێك پەیدابێ کە بەشێوازی ئێمە درێژە بەژیان بدات؟ ئەمە دەڵێم تابزانین ئەم مەسەلەیە تا چ رادەیەك ئاڵۆزە، چونکە جیاوازی لەنێوان نۆکەری بابەتی و خۆییدا نییە. ئەمە دەڵێم بۆ ئەوانەی هەندێکیان هەندێکی دیکەیان دەخەن و هەندێکیان دەخرێنە نێو دۆخێکی وەها کە شایەنی باسکردن نییە. یان بڕوانینە ئەوانەی کە دێنە

نێو ڕێزەکانمان بەشێکی هەرە زۆریان کەوتوونەتە نێو داوی ئەم پەیوەندیەوە. پەردەمان لەڕووی نموونەی وەها هەڵماڵیوە، هەیانە لەبەر ئەم هۆیە بۆ ماوەی چوار ساڵ نزیکی ڕێکخستن نەبۆتەوە و دەڵێت: "من پەیوەندی و خۆشەویستێکم هەبوو، ئێستاکە لێم دوورە، پەیوەندیمان پەرە پێنەدا کە حەزمان پێدەکرد، لەبەر ئەم هۆیەش منیش لە ڕێکخستن بێزار بووم و بەپارتیبوونم بەرجەستە نەکرد". ئێمە قووڵ بووینەوە و بینیمان جێبەجێ نەکردنی بەپارتیبوون و مەسەلەی چوونە نێو ریکخستن بەڕێژەی 99٪ پابەندی ئەم هۆکارەیە. ئەوانە نەبوونەتە سووپا چونکە دان بەگرفتەکانیاندا نانێن و چارەسەریان ناکەن. ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ زیادبوونی باری سەرشانیان و دواتر گیرۆدەبوونیان بە تەنگ و چەڵەمەوە و، ئیستاکەش ئەمانە دەردەکەون، چونکە شیکردنەوەکانی ئەم دواییە تاڕادەیەك ئێمەی خستە نێو جموجۆڵەوە.

دەڵێن پەیوەندی پابەندبوونی کوێرانە هەر لەیەکەم نیگاوە بێ ئاگایان پەیدابوون و ئاوابوون بەخۆشەویستی یەکدی، ئەمە شتێکی سەیرە! یەکەم نیگا چیی تێدایە؟ بەسەرهاتەکە لەوەدایە کە باوەڕیان پێ هەیە. بەیەکەوە گرێدان شتێکی شێلگیرە. ئێوە دەزانن ئێمەش بەیەکەوە گرێدانمان هەیە، بەڵام شێلگیر و ترسناکن. ئا لێرەوە لەمەودای هەڵخەڵەتاندن و نەبوونی واقیعبینی تێدەگەین. من تا ئەو رادەیە بەهێزم کە ناکرێت بەئاسانی بکەومە تۆڕی گەمەوە، هەمووتان ناتوانن هەمان ئاستتان هەبێ، بۆیە لە هەندێك بارودۆخدا مەسەلەی وەها دەردەکەون کە بەشێوەیەکی خراپتر لە دوژمن کاریگەری لە ڕێکخستن و سوپامان دەکەن. ئاخۆ ئەم مەسەلەیە لەخودی خۆیدا چ چەمکێکی هەڵگرتووە؟ لە سەرەتادا ئێمەش شێلگیرانە هەڵوەستەمان لەسەر ئەم مەسەلەیە نەکرد و گوتمان دەرگا کراوەیە بۆ ژن و پیاو بێنە نێو ڕێزەکانمان، پاشان ئەگەر بەهۆشیاری و وردەکاری لەسەر ئەو مەسەلەیە رانەوەستاینایە، ئەوا خراپیەکی وەهای لێدەکەوتەوە کە شەڕی بەرەو نابوودی و بەزین دەبرد.

جەربەزەیی و قوربانیدان، لە خەسڵەتەکانی کەسایەتی شۆڕشگێڕن، ئەگەر پێویست بکات یان ناچاربوو دەبێ ئەو بەڵێنانەی خۆی نەهێڵێ کە بەرەو گێلی و ناپاکی دەبەن. دەبێ پەیوەندی سۆزداری و ئاشقی خۆی نەهێڵێ. تەنانەت ئەگەر پێویستی کرد دەبێ ژنەکەی یان مێردەکەی خۆی تەڵاق بدات، یان وازی لێ بێنێ. ئەگەر ئەو کەسەی

ئەم هێزە لەخۆیدا بەرجەستە نەکات، ئەوا ناتوانێ خۆی بکات بە شۆڕشگێڕێکی کارا. ئەمە شتێکی روون و ئاشکرایە و لەسەر خودی خۆشمدا جێبەجێی دەکەم.

سەرباری هەموو رەخنەگرتنێك پەیوەندیم بە خێزانەوە هەبوو، بەڵام بەشێوە راستەکەی، ئێمە ئێستا مشتومڕ لەسەر مەودای پەیوەستبوونی مرۆڤ بە گوند و شار و نیشتمانەوە ناکەین، سەرباری رەخنەگرتمان ئێمەش پەیوەندی بنیاد دەنێین، بەڵام چۆن و کەی و بە چ شێوەیەك؟ ئەوە خاڵێکی گرنگە و تائێستا بەچڕوپڕی پێوەی سەرقاڵم. ئێمە ئەشق و سۆزمان گوت، بەڵام سەیرمان کرد ئێمەش لەگاریگەری دوژمن زیاتر لەئەنجامی ئەم ئەشقەوە خۆمان دەخەینە رەوشێکی یەکجار خراپەوە. بۆیە ئەم پرسیارەمان کرد کە چۆن پەرە بەم پەیوەندیە بدەین؟ هەندێك هەڵسەنگاندنمان لەو بارەیەوە کرد، ئەوە شتێکی ئاشکرایە کە تۆ ئەگەر ئەشقێکی مەزنت هەبێ ئەوا ئەم ئەشقە پێویستی بە نیشتمانێکە. ئەی بۆچی کار بۆ خوڵقاندنی گەلێکی ئازاد دەکەین؟ چونکە جەندرمە لەهەر کاتێکدا بیەوێ دەتوانێ ژنەکەت یا مێردەکەت زەوت بکات، ئەوسا دەتوانی چی بکەیت؟ ئێوە رۆژانە بەم پێیە رووبەڕوویان دەبنەوە، جنێو بەدایك و خوشك و براکانتان دەدەن، ئایا ئیتر چ مانایەکی ئەو پەیوەندیانە دەمینێ؟ وێڕای ئەوەش ئێوە پارەتان نییە؟ کەواتە چۆن دەستان لەو کچ و کوڕانە گیردەبێ کە حەزیان لێدەکەن، خۆ بۆ یەك پەیوەندی بەستن پێویستیتان بە 300، 500 ملیۆن لیرەی تورکی دەبێ، ئەم برە پارەیەتان لەکوێ بوو؟ لەبەر ئەمە مەحاڵە لەو هەلومەرجەدا کە دوژمن خوڵقاندوویەتی بتوانن پەیوەندی دابمەزرێنن و پەرەی پێبدەن و ناکرێ چارەی کێشەکەش لەو چوارچێوەیەدا بکەن، کە رژێمی دەوڵەت داینـاوە. ئەگەر پێشتر جۆرە پەیوەندی و سۆزێکی هەرزانتان هەبووبێ، ئەوا پێویستە شێلگیرانە دەستبەرداریان ببن. ئەم خاڵە پەیوەستە بەپاڵەوانێتیەوە، ئێمە لەرێگای شیکردنەوەکانمانەوە چارەسەریمان بۆ بارودۆخی خێزان و ژن و پیاو دانا و لەم راستەرێیەدا چەند هەنگاوێکمان هاوێشت تاوەکو هەندێك وەڵام بدەینەوە.

پێویستە هەوڵ بدەین زیاتر پەرە بە تێگەیشتنی هەندێ نموونە بدەین، چونکە خەریکە کێشەکە زیاتر قورس دەبێ، مەسەلەکە هەر بەچارەسەری دانانەوە ناوەستێ، بەڵکو پێویستە بەکردەوە بایەخ بەوەڵامی تەواویان بدرێ. پەیوەندیە کۆنەکانتان رووخاند ئەمە شتێکی جوانە، بەڵام پێویستی بە دامەزراندنی شتی تازە هەیە. ئەمە ئەو

خاڵەیە کە دەبێ بایەخی پێبدەین. واتە دەبێ شێوەی خێزان چۆن بێ؟ دەبێ پەیوەندی ژن و پیاو و پەیوەندی خۆشەویستی و سۆز چۆن بن؟

واتە چۆن دەبێ پەرە بە پەیوەندی ژیان بدەین؟ ئێمە ئەو ناونیشانەمان بۆ دانا "*دەبێ چۆن بژین*؟" گرنگ نییە لەڕابردوودا چیت کردووە، گرنگ ئەوەیە کە دەرخستنە روو و زانینی ئەو هەڵانە و ڕێگای چارەسەرکردنیان و کارکردنە بۆ ئەوەی چۆن شتی تازە بونیاد بنێین و پەرەی پێبدەین. ئەمە لە ڕێگای روونکردنەوەیەکی فراوان و پەرەپێدانی گفتوگۆیەکی ئازادەوە، بەبێ لادان و دووفاقی و ساختەکاری و خەڵەتاندن دەکرێ. دەبێ دژ بە نیشتمانپەروەری و شەڕی ئازادی و هێزی پێشڕەو نەبێت. بەو ڕێگەیە دەتوانین بۆ پشتگیری کردن ئەو زاراوانە روون بکەینەوە و بزانین ئەو شتە چییە کە پێمان دەکرێت بە پشتگیریکردن و خوڵقاندن و پەرەپێدانی پەیوەندی نێوانیان پەرەی پێبدەین. واتا رادەی پێویستیمان بەو پەیوەندیانە و هێزی دەربڕینمان بۆیان و چۆنایەتی شێوەی پەیوەندی دامەزراوی نێوان ژن و پیاو و چۆنایەتی راکێشانی ژن بۆ پەیوەندی هەیە. دەزانین ئەوە کێشانەوەیە بۆ بونیادنانی سوپای ژن و بونیادنانی پەیوەندی ئازاد و هاوشان لەئاستی لیژنەکاندا، بەڵام ئێمە هێشتاکە لەسەرەتای ڕێگەداین و گەلێك کاروبار هەن پێویستە جێبەجێ بکرێن، کە بۆ قووڵکردنەوەی شێوازی چارەسەرکردن ئەو ئەرکەی کە دەکەوێتە ئەستۆتان ئەوەیە کە خۆتان لەو کۆت و بەندە باسکراوانە رزگار بکەن، چونکە سۆز و ئەشق و ژنهێنان زنجیریان هەیە، کە ئەمە دەڵێم مەبەستم مانا پەتیەکەیان نییە، بەڵکو مەبەستم دابڕانتانە لە شێوە چەوتەکانی و راکێشانتانە بۆ شێوە راستەکەی.

بۆ نموونە: ئەگەر ژنتان هێنابێ یان ئاشق بن دەبێ لەشێوە چەوتەکانی دوور بکەونەوە. هەوڵی بونیادنانی تازە بدەن لە رۆح و هزرتاندا، چونکە سووربوون لەسەر هەڵە، بەواتای ژیان لە واقیعێکی کۆیلایەتی سەقامگیردا دێت و ئەمەش دەبێتە هۆی مردنتان. پێشتر باسی ئەوەم بۆ کردن کە هەندێك کادیرمان هەن نزیکەی چوار تا پێنج ساڵ لە خەباتدا ماونەتەوە، بەڵام هێشتا سوورن لەسەر پەیوەندیەکی سادە و ئارەزوویەکی بچووك، هەموو لە یاساکانی سوپا و ڕێکخستن و شەڕ پێشێل دەکەن. لەبەر ئەمە دەڵێین ئەمانە لەناختاندا تێك بشکێنن. ئەگەر ناتوانن دان بەڕاستیدا بنێن،

بەلایەنی کەمەوە لەناخەتاندا تێکیان بشکێنن. ئەگەر دەشتوانن دەبێ وابکەن کە من کردم، ئەوەتا کەموکوڕیەکانی خۆم دەخەمە بەردەم هەمووتان و تێدەکۆشم تا ئەو کەموکوڕیانە نەهێڵن، پێم وایە ئەمە شێوازە راستەکەیەتی. بۆچی هەندێ شت بشارینەوە. من تەواو لەو بڕوایەدام کە ئێمە باشترین شێواز پەیڕەو دەکەین، بە باوەڕی من خراپترین شت لەم بارەیەوە پەردەپۆش کردن و شاردنەوەیە و لەهەمووش ئەوانەش گرنگتر ئەنجامدانی ئەو هەڵانەیە بەرێگەیەك بۆ هەڵاتن لە رێکخستن، ئەمە پابەندبوونە بەچەند پەیوەندیەکی کۆنەپەرستانە و رەتکردنەوەی رێکخستنە، دوو نموونەی کەسایەتی هەن: کەسایەتی ساختە و کەسایەتی پیشەدار کە کەسایەتیەکە یاساکانی رێکخستن پەیڕەو دەکات، بەڵام ترسناکترین شێوەی کەسایەتی ئەو کەسایەتیەیە کە لەنێوان ئەو دوو کەسایەتیەدا دەژی، واتا لەسەر رێبازی میانڕەوییانەدایە، کە کەسایەتیەکە پێیەکی لەناو رێکخستن و ئەوی دیکەی لە دەرەوەدایە. هەرچی کەسایەتی رێکخراوەییە خۆی لەنێو رێکخستندا دەتوێنێتەوە، ئەم شێوە کەسایەتیە ئەگەر پەیوەندیەکی تایبەت و کۆمەڵایەتی ببەستێ، راست دەدەرچێ، پێچەوانەی ئەمە دەبێتە هۆی دووفاقی (الازدواجیة) و بەرپەرچدانەوە و هەموو چەشنە خاڵیکردنەوەیەکی یەکتر، کەموکوڕی لەوەدا نییە بڵێی: "لە رابردوودا وام کرد و خۆم هەڵخەڵەتاند"، بەڵکو پێم وایە دەبێ هەوڵبدەین پەیوەندی ئازاد و یەکجار مەزن لەم بارەیەوە بخولقێنین. کەس مافی ئەوەی نییە بڵێت: "من ئاشقم و حەز و ئەشقەکەم تا ئەو رادەیەیە"، بە پێچەوانەوە دەبێ پەرە بە وتووێژ بدەین، ئایا بەهای ئەشقی تۆ چییە و بەرەو کوێت دەبات و ئەو ئەشقەی کە تۆ باسی دەکەی چی تێدایە؟ رادەی ئەو زیانە دەزانن کە لەئەنجامی کاردانەوە لەپێناو ژنێك یا پیاوێکدا لێمانکەوت؟ ئەوە خاڵێکی گرنگە پێویستە پەردە لەسەر خراپیەکانی دەرەنجامی ئەو پەیوەندیە لابدەین، بۆ نموونە: جاروبار بیردەکەمەوە ئەگەر راستگۆ نەبوومایە و خۆم بکردایە بەدیلی هەندێك غەریزەی پیاوانە یا ئەگەر بە ژنێك هەڵخەڵەتابام، ئەوا گەورەترین بەڵام بەدەستی خۆم بۆ رێکخستن دروست دەکرد، بەڵام شێوازەکەی خۆمم پەیڕەو کرد و سەرەنجام دەبینین باشە. نابێ بڵێین: ئایا ئەمە بۆ پیاو دەشێت؟ بەتێڕوانینی من بۆ پیاو ناشێت، بۆ ژنیش هەر وایە.

دوو هەڵوێست هەن دووفاقی و خەڵەتاندنیان تێدایە. هەندێك لەناوچوون و بەناوی خۆشەویستیەوە هەموو شتێکی دوور لە خۆشەویستیان کرد و بەناوی غەریزەوە هەموو جۆرە تێك شکاندنێکیان پەیڕەو کرد. ئەمە هەرەسهێنانی لێدەکەوێتەوە. بەڵام نزیکبوونەوەی من لەپێناو ئازادیدایە. بۆچی کەسایەتی خۆم بەپەیوەندیەکی کۆن و بەناوی نەریتی میللیەوە پێوانە بکەم، ئایا بۆمن دەشێت؟ بۆچی مل بۆ ژیان درێژ بکەم؟ ئەگەر بووم بەخاوەنی ژنێك و کچێك، لە بێشەرمی و کۆیلایەتی بەولاوە گوزارشت لە هیچ شتێکی دیکە ناکات، چونکە هەڵکشان لە مەسەلەی ئازادیدا واتە هەڵکشان لەجوانیدا، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەوڵەی کە دراوە. هەوڵی جوانی دەبێتە هۆی گەشەپێدانی هێڵی جوانی. ئەم پەیوەندیە بێدادانە خزمەتی پاشقەڕۆیی دەکەن. بۆچی مل بۆ پەیوەندی خەڵەتاندنی نێوانیان درێژ بکەین؟ بەڵام ئێمە ڕێ بەو پەیوەندیانە دەدەین کە دەبنە هۆی ڕۆشنکردنەوە و پشت بە قەوارە و ئیرادەیەکی ئازاد دەبەستن و لەهەمانکاتدا ئەم پەیوەندیە پشت ئەستووربێ بە هەوڵ و خەبات. ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە من دەڵێم دڵداری مەکەن. ئەمە لە شیکردنەوەکانی دوایمدا دەرکەوت. گوتم بە ئەشق و بەپێی ئەشقی مەزن بناخەی پەیوەستبوون پەیدا دەبێ. ئەوانەی بەم شێوەیە دڵداری دەکەن، واتە بەئەشقی مەزنی نیشتمانپەروەری و ڕەنگدانەوەی لەشەڕدا، من ئەمە پەسند دەکەم. بەتێڕوانینی من ئەمە شێوازە ڕاستەکەیەتی کە شەرەف و کەرامەت دەگەیەنێ.

ئەگەر بەڕاستی ئەشق و هەوڵدانتان هەیە، ئەو کاتە دەبێ دژی دوژمنەکەتان بەکاری بهێنن و دەبێ ئیرادەی خۆتان بەو پێیە توندوتۆڵ بکەن. ئەگەر منداڵتان خۆشدەوێ، بیر لەو ڕووداوانە بکەنەوە کە بەسەر ملیۆنان منداڵدا دێن. پێویستە هەموویانتان خۆش بوێ. بەمەش دەبنە خاوەنی دڵی گەورە و واتان لێدەکات بەرێکخستنەوە بلکێن. هەروەها ئەگەر دایك و باوکتان خۆشدەوێ، بیر لە دایك و باوکە جگەر سووتاوەکان بکەنەوە. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە خولقاندنی کەسانێکی لێدەکەوێتەوە کە زەمینەیەکی فراوانی کردەوەیان هەیە. دواتر ئەمە شێوە ڕاستەکەیەتی، شێوەی دووەم یەکجار ترسناکە. ئێوە لە سایەی کاریگەریەکی زیاتردا دەژین. تەنانەت کاتێك دەرەتانی ئەوەتان نابێ پەیوەندی بەپێی میزاج و ئارەزووتان

بونیاد بنێن، هەڵوێستێکی نارەزاییانە نیشاندەدەن. هەتا کۆنترین هەڤاڵانم بەدەست ئەم هەڵوێستەوە دەناڵێنن و هەندێکی دیکەیان تەواو نکۆڵی لە مەسەلەکە دەکەن و وەکو پەیوەندیەکی شیاو دەروانن ئەو پەیوەندیانە، وەکو بڵێی خۆ لەم پەیوەندی بەستنە لادەدەن.

من دژ بەم هەڵوێستەم چونکە دژی سروشتە و شتێکی راست نییە و بۆیە ئێمە بە توونـدی دەکەوینـە پەرەپێـدانی پەیوەنـدی نێـوان ژن و پیـاو. ئـەوەتا دەڵـێین: "دیـارە شـتێکی گرانـە، چـونکە ئێـوە کۆیلـەن و شـەری کۆیلایـەتی دەکـەن". لەبـەر ئـەوە ئـەم ململانێیـە بەوپـەری قورسـی درێـژە دەکێشـێ. ئێمـە دژی هـەردوو هەڵوێسـتەکەین. هەڵوێستێکیان بـە حساب شـەر دەکات، کەچـی هەڵدێت. هەڵوێستەکەی دی ژیانـە وەك رەبەن و قەشە. بێگومان ئەوە هەڵبژاردنێکی تاکەکەسییە و ئێمـە دەسـتی تێوەرنـادەین. بەڵام نـاڵێین شـێوەیەکی راسـت و درووستیشـە. لەلایـەکی دیکـەوە لاوەکـان دەردەکـەون و دەڵێن: "ئێمە بەبێ ژن ناژین، یان بێ پیاو ناژین".

بەرهەڵسـتی ئەوانـەم کـرد و پـێم گـوتن: ئـەوەی کـە نـەتوانێ دەسـت بەسـەر غەریزەکانــدا بگــرێ، نــاتوانێ مــەزنی بــەدی بهــێنێ. واتــە پێویســتە ئــەم شــێوە بەرچاوخراوانە لەکێشـەکەدا هەڵبسـەنگێنین، چـونکە بـەبێ نرخانـدنی ئەوانـە نـاتوانین هیچ بکەین. کۆیلایەتی هەر لەمنداڵیەوە تا مردن دەست بەسەر مرۆڤی ئێمـەدا دەگـرێ. واتـە گـەورەترین کـۆنترا پێـی نـاکرێ دەرەنجـامی ئـەم پەیوەندیانـە رابپـەرێنێ. بـەبێ تێپەراندنی ئەمەش ناتوانین بە ئـازادی بگـەین. کاتێـك دەڵـێین بۆچـی نـابن بـە کـادیری ئازاد؟ بەمە رادەی گرێدانتان بە نیشتمانپەروەریەوە دەردەبرم.

ئەمە بابەتێکی قوورسە، بۆیە پێویستی بە هەوڵدان و شەرکردن لەپێناویدا هەیە. لە پاشەرۆژدا ئەم بابەتەتان لەگەڵدا باس دەکەین. من چۆنێتی تێگەیشتن لەم مەسەلەیە روون دەکەمەوە و درێژەی پێیدەدەم. سەرباری پەرەدان بە مشتومر کردن لـەم بارەیـەوە بـۆ گەیشـتن بـە شـێوازە راسـتەکان کـە دەتانباتـە سـەر چارەسـەرکردن. لـەوەش گـرنگتر دۆزینـەوەی ئامرازەکـانی چارەسـەر کردنـە و پەرەدانـە بـە پرسـیارکردن لەسـەر راسـتی نزیکبوونەوەی نێو گەریلا یا لە بوارەکانی ژیاندا بەگشتی و دەبێ ئامرازەکانی رێکخستن چۆن بن؟ لەهەمان کاتـدا ئـەم پەیوەندیانـە پەیوەنـدی دۆسـتانەن و دەبنـە رێگایـەك بـۆ گەیشتنمان بە ئامانجەکانمان. هەموو هەوڵێك بۆ روونکردنەوەی ئەم خاڵە دەدەین. ئێمە

هەندێك شیكردنەوەمان ئەنجامداوە و پشتگیری هەندێك نموونەی كەم وێنە دەكەین تا بەجەرگانە چەمكەكانتان دەربــڕن بە شێوازێكی وەها كە ئەنجامی هەبێ. پێویستە بڕواتان بەخۆتان هەبێ. وەك چۆن رووخاندن هەموو شتێك ناگەیەنێ، دەبێ بە بنیادنانێكی هەرزانیش رازی نەبین؟ ئەو ژیانەی كە بە ململانێیەكی بەردەوام بونیاد دەنرێت، ئەو ژیانەیە كە نارووخانرێت و یەكجار بەهادارە.

پێویستە بەشێوەیەكی زانستیانەتر لەم وانەیە نزیك ببینەوە و وانە بڵێینەوە و پەرەی پێبدەین بەشێوازێك كە وەڵامی پێداویستیەكانی پارتیمان بداتەوە، مەشقكردن شتێكی زۆر گرنگە. بنچینە درووستەكانی شەڕ و سەقامگیركردنی لەڕێگای مەشق كردنەوە دادەنرێن. ئێمە ئێستا تێدەكۆشین بۆئەوەی ئەوەتان بۆ ساز بدەین. من هەموو هەوڵێك دەدەم تا وانەكان وەربگرن، ئەوەش هەر بۆ ئێوەن، من گرەو لەسەر سەركەوتن دەكەم، هەر بۆ ئەوەنا كە كەموكوڕیەكانتان نەهێڵێم، بەڵكو بۆ ئەوەش كە ئەو كەموكوڕیانە بنەبڕ بكەم كە لە گۆڕەپانی خەباتی حزبایەتیدا رەنگدەدەنەوە. بەپێچەوانەی ئەوەوە، ئەو شەڕە كە دوژمن دەیكات سەركوتتان دەكات. بەڵام ئەم مەشقەی ئێمە بۆ ژێرخستنی دوژمن بەسە و ئاستی مەشق پێكردنیش بۆ سەركەوتنی كادیران لەشەڕدا بەسە، كەمێك بیر بكەنەوە، ئەگەر دەسكەوتەكان یەك لەدوای یەك بەدی نەهێنرێن. بێ سێ و دوو فرمان تێدەخرێت، هەندێك بەها بەكاربهێنن. بەڵام بۆ ئەوەی ئەركەكانمان راپەڕێنین و لە چوارچێوەی ژیاندا جێبەجێبكرێت. پێویستە هەموو هێزتان لە پێناو بەرپرسی خستنە ئەستۆدا دەرخەنە روو و خۆبكەن بە سەركردە، ئەركی سەرشانی هەر ئەندامێكی PKK دەست كردنێتی بە خۆشیكردنەوە و تێگەیشتن لە حزبایەتی و نزیك بوونەوە لەڕاستی مەشقكردن. دەبێ بایەخی مەشقكردن ببینین و سووربین لەسەر هەڵسوڕاندنی، چونكە تۆ ناتوانی شەڕی دوژمن بكەی كاتێك كەسێكی مەشق پێنەكراو لە پەناتدا بێ، لەم گۆشەنیگایەوە دەبێ مەشق بەخۆمان بكەین و ئەركەكانی خۆمان بەرامبەر بەپارتی بزانین، ئەوسا لەوە حاڵی دەبن كە چیتان لێ داوادەكرێت، بۆ جێبەجێكردنی شێوازی راست و دورست لە گشت شوێن و كاتێكدا. دەبێ ئەم شتە بەرجەستە بكەن و هەر بەم پێیە تا سەر وەریبگرن و سەركەوتن لە ئەركەكاندا ئەنجامگیر بكەن.

## کێشەی ماف و ئازادی ژن

بێگومان ئێمەش لەم رووەوە لەنێو گیروگرفتی گەورەدا دەژین. لەوانەیە هەندێك کەس بڵێن بێهودەیە، یاخود لەدەستدانی کاتە. باسکردن لەکێشەیەکی وەها و دانانی لە سەرەوەی کێشەکاندا، یاخود کەم دابنرێن لەبەشێکی جیانەبۆوە لە کێشەی رزگاریخوازی واقیعی گەلێك کە دووچاری جۆرەها هەرەشەی دڕندانە بووە و رووبەڕووی داگیرکەرییەك بوونەتەوە کە هیچ سنورێك ناناسێت و لە بەدیهێنانی پێشکەوتنە رۆشنبیری و سیاسیەکان دوور ماوەتەوە. لە کاتێکدا کە ئەم کێشەیە لە دەوڵەتە سەرمایەداریە پێشکەوتووەکانیشدا چارەسەر نەکراوە و تەنانەت لە دەوڵەتە سۆسیالیستەکانیشدا، بەڵام ئەگەر بێتو سەیری دڕندایەتی داگیرکەر بکەین لە سەر وڵاتەکەمان کە لەم تایبەتمەندیەدا جیاوازترە لە هەموو شێوەکانی داگیرکەرانی تر، ئەگەر بە وردی سنووری ئەو داگیرکەرییە لێك بدەینەوە، ئەوا بەروونی دەردەکەوێت کە کێشەکە لەگەوهەردا بریتیە لە کێشەی ژن، کە ئێمەش ئەوەندی لە تواناماندا بێت هەڵوەستەی لەسەر دەکەین. چونکە ئەو قۆناخە داگیرکەرییەی کە پێیدا تێدەپەڕین، بە شێوەیەکی پتەو پەیوەستە بەو رەوشەی کە ژن پێی گەیشتووە. ئەو رەفتارانەی کە سەدان ساڵە رووبەڕووی دەبێتەوە، ئەگەر لەرۆژگاری ئەمرۆماندا تێیدا قووڵ ببینەوە، ئەوا دەبینین کە سروشتی ملکەچی و سەردانەواندن لەلای ژن زۆر بەهێزە، بەشێوەیەك

کـە واقیعـی داگیرکـەری لەسـەر ئێمـە بـە تـەواوی لـە واقیعـی ژن دەچـێ. مەسـەلەی تواندنـەوەی کەسـایەتی بەشـێوەیەکی توونـد بـە سـلبیاتی پەیوەنـدی ژن و پیـاوەوە گرێـدراوە. ئەمـەش بنگـەی ئـەو پەیوەندیانەیـە کـە دەبێتـە هـۆی ئاشـووب و نـاڕێکی. نەبوونی خەبات و لادەری و شێواندنی گیروگرفتەکان دەبێتە بنچینەی هەموو جوڵانەوە کۆنەپەرستیەکان. کەسایەتی لەمیانـەی ئـەم پەیوەندیانـەوە تـا دواڕادە دەکەوێتـە ژێـر کاریگـەری ئـەو بارودۆخـەی کـە هەیـە و لەدوایشـدا نـاتوانین ئـەم گیروگرفتـە بـەهیچ شـێوەیەك پشـتگوێ بخـەین. لەهەمانکاتـدا راسـت نییـە و نـابێ گیروگرفتەکـە بـەپێی پێودانگەکانی پێشوو چارەسەر بکرێ، بێگومان مەبەستمان چارەسەرکردنی بە هەڵوێستی فەیلەسـوفەکان نییـە، هـەروەها مەبەسـتمان ئـەوە نییـە کـە نـاتوانرێ یەکسانی بـەدی بهێنرێـت لـە روانگـەی بەشـداربوونی ژن لـەبواری سیاسـەتدا، بـەڵکو پێویسـتە دوور بکەوینەوە لە کەوتنە ناو خەیاڵ. بـەڵام لـە کاتێکدا کـە ئێمـە دەکەوینـە نـاو قۆنـاخێکی شۆڕشـگێڕی گـرنگ و رووبـەڕووی چارەسـەرکردنی گیروگرفتـە ریشـەییەکان دەبینـەوە، پێویستە کـە بەلایـەنی کـەم تێـڕوانینی تیـۆری بخەینـە بەرچاو. ئەگـەر تاکـە کەسـەکان باوەڕییـان بـەخۆیان هـەبێت، پێویسـتە لـە پەیوەندیـەکانی رۆژانـەدا ئەمـە پێکبهـێنێ و رەنگ بداتەوە. ئەو شـتەی کـە دەبێتـە هـۆی کۆسـپێکی جـددی لـە پـێش بەرزبوونـەوەی شۆڕش، لەسەر ئەم بنچینەیە و لەم بوارەدا پێشنیار دەکەین کە هـیچ کەسێك بـێ چـەك نەمێنێ لەچارەسەرکردنی مەسەلە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیەکانـدا. هەرچـەندە ئاسـتێکی تیۆری و ئەزموونی کرداری سنووردایش بێت، بەلایەنی کەمـەوە چـەکدار بێـت. ئەگـەر نـا، ئـەوا زۆر شـت لەدەست دەدات. ئەمـەش لـە کاتێکدا کـە ئەگـەر ئاڵۆزیـەکان لـە سـەر رێکخستن و ئایـدۆلۆژیا و سیاسـەت لەپەیوەنـدی و چارەسـەرکردن و تواندنـەوەدا رەنگـی داوەتەوە. هەروەك بە ئاشکرایی دەبینرێت لە شێوازەکانی پەیڕەوکراوی شەڕی تایبەتی لـە رووبەڕوو بوونەوەی خەباتمانـدا کـە دوژمـن بـەم رەفتـارە پۆلیسـیانە لـە کـاری رۆژانـەدا پشت بەم گیروگرفتە دەبەستێت، لـەم روانگەیـەوە هـەوڵ دەدات ژەهـری خـۆی بڕژێنێتـە ناو پێشکەوتنە شۆڕشگێڕیەکانمان بە رەنگێك کە لاوازی و کەموکوڕیەکانمان لـەم بـوارەدا وەکو دیاردەی شۆڕشی چەواشە بەسەرماندا بسـەپێنێتەوە. دەربـارەی ئەمـەش دەتـوانرێ بگـوترێ کـە بـە رێگـای خێـزان و ژن و جەمسـەرێتی پەیوەندیەکانـەوە دوژمـن هـەوڵی

جددی لەپێناو پەرش و بڵاوی و لادان و لەناوبردنمان دەدات.

ئەم راستیەش بە تەواوی روون بۆتەوە، هەروەها ئەمە لە ریزی جوڵانەوەکانی تریشدا روویداوە، بەڵام لەلای ئێمە بە شێوەی نامۆتر پێشدەکەوێ و گەشە دەکات. لەمەش زیاتر وەکو فاکتەرێکە کە دوژمن پشتی پێ دەبەستێ. لەبەر ئەوە پێویستمان بە دانوستاندن هەیە دەربارەی ئەم گیروگرفتە و بنچینە تایبەتیەکانی خۆی، نەك بەشێوە ناسراو و کلاسیکەکانی. بێگومان لە دیاریکردنی تێروانینە راست و پوختەکان مەبەستمان دەرخستنی هێز و توانا نییە، بەڵکو دەمانەوێ ئاماژە بە هەبوونی ئەم گیروگرفتە و دەربڕینی هەندێ تێروانین بکەین بۆ ئەوانەی کە دەیانەوێ بیری لێبکەنەوە و هەندێك هەنگاوی کرداری بنێن. هەروەها ئەگەر دەیانەوێ پێشکەون و کەش و فەزایان بۆ ساف بکەین، ئەوا دەتوانین بۆیان دەستنیشان بکەین کە دەبێ چۆن پێشبکەون، تاوەکو بەو هۆیەوە بتوانن ئەم پێشکەوتنە بەدیبێنن.

کاتێك گیروگرفتە تایبەتیەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەرکەوت، رێگای چارەسەرکردنی ئەم گیروگرفتانەش هەر لەسەرەتاوە رووبەرووی شوێنەوارە دواکەوتووە هزریەکان بۆوە، بەشێوەیەك کە وابەستەی هەڵوێستە کۆمەڵایەتیە دواکەوتووەکان بوو. مرۆڤ لەسەرەتاوە نەیتوانیوە بەشێوەیەکی بابەتیانە لەم کێشانە بڕوانێت کە رووبەرووی بۆتەوە. لەبەرئەوەی ئاسۆی بیرکردنەوە و تێگەیشتنی مرۆڤ نەگەیشتبووە ئەو ئاستەی کە کێشە و ململانێی نێو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەرك پێبکەن. مرۆڤ لەو کاتەدا لەگەڵ سروشت لەململانێدا بووە و، لەتەنیشت هەمان ململانێی سروشتیدا مرۆڤ خولی دەخوارد، لەنێو پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتی دواکەوتوو کە تازە بەتازە کۆمەڵەی مرۆڤایەتی پێکدەهات و لە دنیای ئاژەڵ جیا دەبۆوە. لە پەرتووکە ئایینیەکاندا هاتووە کە مرۆڤ لە قۆناخە سەرەتاییەکاندا لە بەرامبەر گشت کێشە و ئاستەنگیەکان لە ململانێیدا خاوەن پرەنسیپی نموونەیی و رێگاچارەی پوخت بووە، بەڵام ئەم بۆچوونانە لەگەڵ زانست و زانیاریدا یەك ناگرێتەوە. وەك دەزانرێت لەو قۆناخەدا مرۆڤ لە لوتکەی بێ هێزیدا بووە و، بە وشکیەکی لە رادەبەدەر بە پرەنسیپی پیرۆزی خوداوەندەوە بەسترابۆوە، ئەویش وەك ئەو پیرۆزیانە بوون کە نەدەتوانرا دەستی لێ بدرێت. ئەوەش بەشێوەیەکی ناوشیارانە بوو، لە کاتێکدا کە مرۆڤ بووە خاوەن هێزی بیرکردنەوە، یەکەمین شت کە بۆی دەرکەوت ئەوە بوو لە بەرامبەر هێزی سروشتدا بە قووڵی هەستی بە بێ هێزی و

ئامادەنەبوونی خۆی کرد. لەو کاتـەدا  نـە تـەکنیکێکی پێشکەوتوو و نـە فەلسـەفەیەکی یارمەتیدەرانە هەبوو، هەوەرەها نە بۆچوونی درەخشانی ئایینی هەبوو، ئەمە لە کاتێکدا مـرۆڤ گـەورەیی خـۆر و مەترسـی ئـاوی رووبارەکـان و دیـاردەی هـەورە تریشـقە و بوومەلـەرزەیان دەبـینی و لەلایـەکی تـرەوە ئـەو دەرامەتانـەی دەبـینی کـە سروشـت بـە مرۆڤی دەبەخشێ. لەنێوان ئەو دیاردە و رۆڵانەدا مرۆڤ خواوەندی خۆی هەڵدەبـژارد. ئـا لێرەوە خوداوەندی ئاسمان و خێر و ئاگر و تێکڕای خواوەندەکانی تـر لەلایـەن مرۆڤـەوە هەڵدەبژێردران و دیاری دەکران. بەهۆی ئەمەشەوە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی خواوەنـدەکانی خۆیان لەو دیاردانـەدا دەستنیشـان کـردووە کە زیـاتر کـاری کردۆتـە سـەر ژیانیـان. هـەر لەبەرە ئەوشە کە دەبینرێ ئایینە سەرەتاییەکانی مرۆڤ لەسەر شـێوەی ئـایینی سروشـتی بـەدیهاتووە. مـرۆڤ لـەو دیـاردە سروشـتیانەی کـە کـەم یـان زۆر دەردەکـەوت ترسـاوە و بەچاوی پیرۆزیەوە سەیری ئەو دیاردانەی کـە کاریگـەریان لەسـەر ژیـانی مـرۆڤ هـەبووە، کردووە. پەرستگای تایبەتیان بۆ دیاردەکان دروسـت دەکـرد و بتیـان بـۆ دادەتاشـین. لـەو قۆناخەدا مرۆڤ لەپێناو شاردنەوەی بێ هێزیەکانی ناچاربوو خۆی فریوبدات. چونکە لـە قۆناخـە سـەرەتاییەکاندا باشـترین پەناگـە بـۆ مـرۆڤ خۆفریـودان بـوو. لـە قۆناخـە سەرەتاییەکانی پێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا دەبینرێت کە چۆن راستیەکان لەناو ئایینەکاندا شێوێندران و پاشماوەی هونەرەکەیان بەتەواوەتی سەرەوژێر کراوە. ئەو کاتە مرۆڤ وزە و توانایەکی زۆری لەو بتەدا بەرجەستە دەکرد کە خۆی دروستی دەکرد و، وەها لـەو بتـەی روانیوە کە گوایە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێ و دەتوانێ مـرۆڤ لـە کارەسـاتە مـەرگ هێنەرەکانـدا رزگـار بکـات و بیپارێزێـت. ئەگـەر بێـت و چـاوێك بـە مێـژوودا بخشێنین، ئەوا دەتوانین ئـەم کاریگەریـە لەسـەر کۆمـەڵگای مرۆڤایـەتی تـاوەکو رۆژگـاری ئەمرۆش دەستنیشان بکەین. بەڵام پێویستە بەگشتی بیر لەوە بکرێتەوە کـە خۆفریـودان نەبێت، چونکە کاریگەری ئەم پاشماوەیەی هزریان، تاوەکو ئێستاش مرۆڤی لـەناو خـەیاڵ و سـەرابدا هێشـتۆتەوە. شـیکردنەوە و باسـکردنی رەوشـی ئـەو رۆژگـارەی کۆمـەڵگای مرۆڤایـەتی و هەڵوەسـتەکردن لەسـەر تـەواوی هۆکـار و فاکتـەرەکان بەلامانـەوە کـارێکی سـەخت نییـە. ژیـانی ئـەمرۆشمان جـەخت لەسـەر ئـەم راسـتییە دەکـات، کـە کۆمـەڵگای مرۆڤایەتی لەسەرەتاوە هەوڵ و تەقەلای لێکۆڵینـەوەی زانسـتیانەی بـووە بـۆ دەرخسـتنی

راستیەکان داوە.

لێرەدا پێویستە زێدە بڕوا و متمانە بەو پەیوەندیە نەکرێت کە لەو کاتەدا هەبوون، چونکە مرۆڤ وشیار نەبووە و لەنێو بازنەی بێچارەیی گەورە و بێ سنووردا خولی خواردووە. بەواتایەکی تر ئەمە رەوشی رۆژگاری باب و باپیرامان بووە، ئەمڕۆش کاریگەری ئەم رەوشە بەئاشکرا لەسەر کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەبینرێ. بۆیە پێویستە گرنگیەکی تایبەتی پێبدرێت، بەڵام ئەمڕۆ ئەم داب و نەریتانە لەبەرامبەر پرۆسەی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی خاوەن بەهایەکی وەها نییە کە باسی لێوە بکرێت.

لەوانەیە کەسانێك هەبن بپرسن؛ ئایا مرۆڤ ناچار بوو خۆی بە خەیاڵی وەها ببەستێەوە؟ ئایا ئەگەر مرۆڤ پەنای نەبردبایە بەر ئەو هێزە مەعنەویەی کە باسکران، توانای ژیانی دەبوو یان نا؟ ئەگەر سەردەمی ئێستامان بگرینە بەرچاو بەوەی کە پێشکەوتنە زانستیەکان لە لوتکەدان و لەم پێشکەوتنەشەوە مەترسی چەکی ئەتۆمی لە ئارادایە و، بەهانا بردنە بەر و داوای یارمەتی کردنی یەکێتی سۆڤیەتی کۆن لە کەنیسە، دەگەینە ئەو راستییەی کە مرۆڤ خۆی لە گرێدان و وابەستە بوون بەهێزی مەعنەویەوە دەرباز نەکردووە. بەو مانایەی کە تەنیا بە پێشکەوتن لە بوارە زانستیەکاندا بەس نییە بۆئەوەی مرۆڤ بەشێوەیەکی ریشەیی خۆی لە گیروگرفتەکان رزگار بکات. ئێمە باوەڕمان بە زانست هەیە، وەکو شێوازێکی بنچینەیی لە چارەسەرکردنی گیروگرفتەکاندا هەڵمان بژاردووە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە دەسەڵاتی مرۆڤ لە حوکمکردنی بەسەر هەر شتێکدا رەهایە. بەو مانایەی کە زانست ئامرازێکی سەرەکییە بۆ خۆ رزگارکردن لە کەموکوڕیەکان، لەلایەکی دیکەشەوە ئامرازێکی بنچینەییە بۆ جەختکردنە سەر ئەم کەموکوڕیانە.

ئەوەی لێرەدا شایانی ئاماژە بۆکردنە ئەوەیە؛ کە ئەو پرەنسیپە بەرزانەی لەسەرەتای کۆمەڵگای مرۆڤایەتیەوە پەیدابوون، ئێمە ناتوانین دەستبەرداریان ببین. بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی لەلایەن ئیمپریالیزمی ئەمریکاوە، وەك خودایەکی سامناك لەبەرامبەر مرۆڤایەتیدا، کاریگەری هەمەلایەنەی کردە سەر یەکێتی سۆڤیەت. بەرەنگێك هەڕەشە و گوڕەشەکانی ئەمریکا یەکێتی سۆڤیەتی ناچار کرد بەناوی دانوستاندنی ئاشتیانە سەریان بۆ دانەوێنێ. هەموو ئەم شتانە جێگای سەرنج و بیرکردنەوەن. لە یەکێتی سۆڤیەت دانوستاندنی بەرفراوان کرا لەسەر ئەوەی ئەم

سیاسـەتە راسـتە یـان نـا، "رۆنالْـد ریْگـان"ی سـەرۆکی ئەوسـای ئـەمریکا بەشـێوەیەك هەڵسوکەوتی دەکـرد و دەجولاًیـەوە کـە وەکـو خواوەنـد و بـیر و بـاوەڕی هـەزاران ساڵەی بـەلای خۆیـدا راکێشـابێ. ریگـان، بەتـەنیا نوێنەرایـەتی هێـزی ولاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا ناکـات، بـەڵکو نوێنەرایـەتی هـەموو هێـزە خـەیاڵی و بیروباوەڕەکـانی تـەواوی قۆناخەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەکات و هەموویانی خستۆتە خزمەت خۆیەوە. ریگان سەری بەهەموو مزگەوت و کلێساکاندا دەکرد و هانای بۆ دەبـردن و دەیویست جارێکیتر بیانژێنێتەوە. لەبەر ئەم هۆیـە "نوێنـەرانی سۆسـیالیزم" خۆیـان زۆر تەنگەتاو و ناچار بـینی و بـەدوای رێگاچـارەیەکی سازشـکارانەدا دەگـەڕان. ئـەوەی کـە بەئاشـکرا لێـرەدا دەردەکەوێ ئەوەیە کە ئەگەر سۆسیالیزمی زانستی ئەم هێزانە لە حیسابی خۆی دانەنێ، ئـەوا ئـەنجام تـەنیا بـە خـەباتی هاوشـان لەگـەڵ پێویسـتیەکانی زانسـت بـەدی نایـەت. بەمانایـەکی دیکـە سۆسـیالیزم وەهـا دەسـەپێنێ کـە ئـەم کێشـەیە بەشێوازی جیـا جیـا و تایبەت چارەسەر بکرێت. بەکورتی ئەو بیروباوەڕانـەی کـە مـرۆڤ لەسـەرەتاوە پـەنای بـۆ بردووە و رووبەڕووی بۆتەوە لەپێناوی خۆ دەربازکردندا بووە، لەو لاوازی و بێ هێزیەی کە مۆرکی کۆمـەڵگای مرۆڤایـەتی ئـەو سـەردەمە بـووە. بـەڵام لـەم رۆژگـارەدا پێویسـتە نەکەوینە ژێر کاریگەری ئـەم بیروباوەڕانـە، بگـرە دەبـێ پێشکەوتنی دیـار و بەرچـاویش بەدی بهێـنین. ئەمـەش بەرپرسـیارێتیەکی گەورەیـە کـە بـەرۆکی گۆمـەڵگای مرۆڤایـەتی دەگرێـت. ئێمـەش لـەم روانگەیـەوە هەوڵـدەدەین چارەسـەری کێشـەکان بـەدی بێـنین. ئەمانەی سەرەوە وەکو شێوازێك روونکرایەوە بۆ چوونە ناو بابەتە سەرەکیەکەوە.

لەکاتی دەرکەوتنی دەزگای خێزاندا هـەردوو لایـەن (ژن و پیـاو) لەسـەر بنچینەی پرەنسیپی دروست هەڵسەکەوتیان لەگەڵ یەکتری نەکردووە، بەڵکو بەشێوەیەکی خۆڕسك لەئـەنجامی فشـاری سروشـت و غـەریزەی مـرۆڤ لەگـەڵ یـەکتردا هەڵسوکەوتیان بـووە. هەروەها ناتوانـرێ بگوترێت کە دەزگایەکی تەواو و بێ کەموکوڕی بێت، دەرکەوتنی مرۆڤ و ئاراستەی غەریزەی بەتایبەتی لەقۆناخە سـەرەتاییەکاندا لـە تایبەتمەندیـەکانی ئـاژەڵ دەچوو. هـەروەکو دەزانـرێ هەنـدێك لـە تایبەتمەندێتیـەکانی خێـزانیش لـەوە بـەدواوە پەیدابوون.

لەقۆناخە سەرەتاییەکانی پێشکەوتنی مرۆڤایەتیـدا، ژن هێزێکـی گـەورەی هـەبوو.

ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو ڕۆڵـەی کـە لـە بەرهەمهێنانـدا دەیبـینی. ڕۆڵـی ژن لـە کۆکردنـەوەی گـژوگیا و ڕووەك و بـەردەوامبوونی تـۆو و ڕەگـەزی مـرۆڤ و پـەروەردەی منـاڵان و بونیادنـانی شـوێنی حەوانـەوە، خـاوەن ڕۆڵێکـی گـرنگ و بەرچـاو بـوو. لێـرەدا دەشـێ بگـوترێ توانـای مـرۆڤ لـەو کاتـەدا پـێش نەکـەوتبوو، هـەروەها پێداویسـتی سوودوەرگرتن لە هێزی فیزیکی بـە شـێوەیەکی تایبـەتی دەرنەکـەوتبوو. ژنـیش بـەهۆی ئەوەی خاوەن مناڵ و کۆکردنەوەی بەرهەمە و دوای ئەوەش خـاوەن دەستپێشـخەریە لـە بەرهەمهێنانـدا، هـەر بۆیـە ئـەم قۆناخـەش مـۆرکی ژنـی لـەخۆ گرتبـوو. ئـەم قۆناخـە قۆنـاخێکی زۆر گرنگـە. کەواتـە: ڕاستی وەك ئـەوە نییـە کـە لـە بیروبـاوەڕە ئاییـنەکانـدا هاتووە، بەوەی کـە پیـاو هـەر لەسـەرەتاوە خـاوەن دەسـەڵاتێکی ڕەهـا بـووە و پێشـکەوتن لەژێر تەواوی دەسەڵاتی ئـەودا بـەدیهاتووە. ئەمـەش کارێکـە شـیاوی دانوسـتاندنە. وەکو دەزانرێ کە پەیڕەوکردنی ژن بۆ پیـاو لەئایینـە پێشکەوتووەکاندا لەگـەڵ گەشەسـەندنی کۆمەڵگای چینایەتیەوە هاتۆتـە دی، بـەڕەنگێك کـە ئـەم ئایینانـە بـێ سـنوور لایـەنگری پاشـکۆیەتی ژنیـان کـردووە. جگـە لەمـە هـەبوونی خوداوەنـدی ژن لـە کۆمـەڵگا سـەرەتاییەکاندا دەگەڕێتـەوە بـۆ بـەهێزی ژن لـەو قۆناخـەی کـە تیایـدا دەژیـا و خـاوەن شـوێنگەیەك بـووە، بەشـێوەیەك کـە ژن خـاوەنی پایەیـەکی بڵنـدتر بـوو لـەماوەی قۆناخەکانی زاڵبوونی ئایینە سروشتیەکاندا. بـەڵام لـە کۆمـەڵگای چینایەتیدا زاڵبـوونی توێژێکی کەمی مـرۆڤ بەسـەر توێـژە  فراوانترەکانـدا دەرکـەوت و بەشـێوەیەکی گرێـدراو بەمەوە، ژنیش کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەم توێژەوە. هۆی سەرەکی ئەمەش بـریتی بـوو لـە پێویستی کردنەوەی فراوانترین ڕووبەری ژینگە. هەروەها ڕاوکردن و لەمجۆرە چالاکیانە پێویستی بەهێزێکی فیزیکی هـەبوو، بـەڵام دەسـەڵاتی پیـاو لەسـەر ژن تـەنیا لەئـەنجامی پێویستی هێزی فیزیکـی ئـەوەوە نـەهاتووە، بـەڵکو لەئـەنجامی سـوود وەرگـرتن و دەست بەسـەرداگرتنی ئـەو زێـدە بەرهەمـەوە بـوو کـە بـەڕەنجی ژن بـەدیهاتبوو. بـەمجۆرە دەسـەڵاتی پیـاو بەسـەر ئـەم بەهایانـەدا زاڵبـوو. هەرچـەندە هێـزی فیزیکـی هەنـدێك خەسـڵەت بـە پیـاو دەبەخشـێت، بـەڵام لەسـەرەتادا سـوودی لێوەرنـەگرتووە. بـەڵکو ئـەم بڵندبوونەی خۆی کردە هێزێکی ماددی لەپێناو دەسەڵاتداربوون و دەست بەسـەرداگرتنی ئەو بەهایانەی کە ژن لە کۆمەڵگادا بەدی هێنـابوون. ئەوکاتـە بەرهـەمهێنان و دەسـەڵات بەدەسـت ژنـەوە بـوو، بـەڵام پیـاو بـەکاریهێنا و جڵـەوی گرتـە دەسـت خـۆی. واتـە

دەسەڵاتدارێتی پیاو دیاردەیەکە ڕاستەخۆ  بە دیاردەی دەست بەسەرداگرتنە (قۆرخ)وە گرێدراوە.

ئەگەر پیاو هەر لەسەرتاوە توانای خۆی بەکارهێنابا بەهۆی توانستی جەستەییەوە، ئەوا پێویست بوو هەر لە سەرتاوە دەسەڵاتدار بوایە و مۆرکی خۆی لە بەرهەمهێنانی ماددی و کۆمەڵایەتی بدایە. بەڵام ئەمە ڕووینەدا، بەڵکو بە پێچەوانەوە بە تەواوەتی بایەخی بە بەرهەمی کەڵەکەبوو دا. لە کۆمەڵگای کۆمۆنی سەرەتاییدا کە ژن تێیدا خاوەن پێگە بوو، بەها ماددیەکان زیاتر لە پێویستیەکانی کۆمەڵگا دەردەکەوتن. ئەوانەی کە بە ساختەکارانە شوێنێکی بەرزیان لە  کۆمەڵگادا گرتبوو، گرنگیان بە زێدەبایی دەدا و، لە مەدا سەرکەوتنیان بەدەستهێنا و دەستیان بەسەر ڕەنجی کەسانی تردا گرت و دەسەڵاتیان بە سەر کۆمەڵگادا سەپاند، هەروەکو چۆن پیاو دەستی گرت بە سەر ڕەنجی ژندا، بە شێوەیەکی تایبەتی کە پشتی ئەبەست بە هێزی فیزیکی خۆی، لە سەر ئەمە پیاو هێزی فیزیکی خۆی، کە لەسەرەتای قۆناخە سەرەتاییەکاندا شاراوە بوو، خەسڵەتێکی زۆری پێدا. هەروەها هەندێ بۆرە پیاوی لە دەوروبەری خۆی کۆکردەوە و شەڕی دەسەڵاتدارێتی دەستپێکرد. دەسەڵات بەسەر پارچەیەکدا لەگەڵ دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی کۆیلایەتی دەستی بە بەرفراوان بوون کرد. بێگومان دەسەڵاتی پیاو بەسەر ژندا بەم شێوەیە پێکهات. لەو حالەتەدا بەشێوەی چوونە ناخی ئەمەوە لەگەڵ لەدایکبوونی کۆیلایەتی، سەقامگیربوونی دەسەڵات بەسەر ژندا بەرەو پێش چوو. هاوکات لەگەڵ پێشکەوتنی دەسەڵاتداری بەسەر ژندا، کۆمەڵگای کۆیلایەتی لەدایکبوو.

ئەو دەسەڵاتەی کە پیاو بە سەر ژندا سەپاندی، لە دواییدا شێوەی باڵای لەخۆوە گرت. ئەوەی کە پیاو لەم بوارەدا ئەنجامیدا، دەسەڵاتدارێتیەکی بێ پایان بوو، هەروەها ئەو هێزە سیاسیەی بە دەستی هێنابوو، گەیاندیە ئاستی پرەنسیپەکانی پیرۆزی خواوەندێتی. خوداوەندەکانی ژنی کەم کردەوە بۆ ڕادەیەکی کەمتر، کە پاشماوەی ئایینە سروشتیەکان بوو. بەمجۆرە خواوەندە پاشاکانیش بێ سێ و دوو بوونە نوێنەری دەسەڵاتدارێتی. ئەمەش مرۆڤی بۆ ئاستێکی بەرز کردە کۆیلە و، دەسەڵات و شوێنی ژنی کەم کردەوە و گەیاندیە نزمترین ئاست. بەمە هەر لە سەرەتای پێشکەوتنی دەسەڵاتی

مرۆڤایەتیدا ژنی خستە ژێر دەسەڵاتداریتی، پێش ئەوەی کە هەبوونی خۆی بەدی بێنێت. هەروەك چۆن هەڵمەت و هێرش کرایە سەر کۆمەڵگا دواکەتووەکان، لەو بارودۆخانەدا ژنیش کەسایەتی خۆی لە دەستدا، یاخود بەر لەوەی کە قۆناخی پێشەکەوتنی ئازادبوونی خۆی ببڕێت، کەسێتی ژن کەم بایەخ کرا. ژن لەهەمان بارودۆخدا دەژیا، بەڵام بە شێوەیەکی قووڵتر دووچاری کاریگەری خراپی ئەو پاشکۆیەتیە دەبۆوە و رووبەرووی دەسەڵاتێکی بێ سنوور بۆوە کە تازە لەسەرەتای قوناخی سەلماندنی هەبوونی خۆیدا بوو، بۆ ئەمە هەر لەسەرەتاوە رووبەرووی خۆ ونکردن بۆوە، واتە ئەمە لەهەمان کاتدا دەبێتە هۆی لەدەستدانی ئازادی خۆی.

بێگومان کەسێتی ژن و خەبات و رۆلی ژن لەقۆناخە مێژووییەکاندا گرنگ بووە، دوای ئەمە گەلێك شێوازی پێشکەوتووانەی جۆراوجۆری بە دەستهێناوە. بەڵام هێشتا راستترە کە بووترێ؛ ژن بەردروام لەدەست وونبوون دەناڵێنێ.

هەموو گفتوگۆ و موشتوومڕێك لەسەر مەسەلەی ماف و ئازادی ژن بەبێ تێبەراندنی ئەو هەڵوێستەی کە لەئارادایە، تەنیا بە کارێکی گاڵتەجاڕی و بێ سوود دادەنرێ.

ژن و پیاو لەسروشتدا کار و ئەرکی یەکتری تەواو دەکەن. بەدرێژایی قۆناخەکانی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی هاوکاری یەکتریان کردووە بۆ بونیادنان و دورستکردنی هەموو شتێك و هەردووکیان بە هاوبەشی بەرەنگاری هێزەکانی سروشت بوونەتەوە. بە باوەڕی ئێمە ئەو وتەی کە دەڵێ: "ژن و پیاو بە شێوەیەکی وەها یەکتر ناچەوسێننەوە"، وتەیەکە کە لە راستیەوە دوورە.

لێك جوودابوونەوەی مرۆڤایەتی لە کۆمەڵگای بەرایی و دڕندەیی سروشتی پیاو، توانای لێکۆلینەوەمان لە ویژدان کەم دەکاتەوە. بۆیە بەئاسانی دەتوانین بڵێین جاران یاسای هێز لەو سەردەمەی کە هەستی ناوەوەی مرۆڤ رۆڵێکی بەرچاوی گێراوە، یاسایەکی باو بووە. دەست بەسەرداگرتنی هێزی بونیادنەر و رێکخستن، بەسەر چینەکانی کۆمەڵ و هەردوو رەگەزی ژن و پیاو بەربڵاو بێ سنوور بووە. لەرۆژگاری ئەمرۆشمان ڤەبوونێك لەپەیوەندیەکانی یەکسانی ئاڵوگۆڕ لەنێوان هەردوو رەگەزی ژن و پیاودا هەیە. ئەو ئازار و چەوسانەوەیەی کە لە رابردوودا ژن دووچاری بووە، گەلێك زۆرتر بوو لەو ئەشکەنجەدان و چەوسانەوەیەی کە توشی کۆیلەکان ببوو.

لێرەدا ئەم راستیە دەخینە روو، کە نابێ تەنیا بڵێین ژن رەگەزێکە ئەشکەنجە دەکرێت و دەچەوسەنرێتەوە، بەڵکو دەبێ هەوڵ بدەین کێشەکەی لە چوارچێوەی جیاوازی لەنێوچوونەکەی چارەسەر بکەین. چونکە دەستکەوتی ژن و رۆڵەکانی هەندێك ماف و باری ژیانی باشتری لە سایەی هەندێ لەو سەرکردانەی سەر شانۆی مێژووی سەرهەڵدانی چینەکانی کۆمەڵ وەرگرتووە، ئەمەش راستیەکی سەلێنراوە.

ئەو کاتە ژنی وا هەبوون کە لەهەموو مافێك بێ بەش بوون، هەندێ ژنی وەهاش هەبوون لەکاتی جێبەجێکردنی داخوازەکیانیاندا رووبەڕووی هیچ ناخۆشیەك نەبوونەتەوە. بەتایبەتی ئەوانەی کە لەدەستەی سەرەوەی کۆمەڵ بوون. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا لەئەنجامی زاڵبوونی دەسەلاتی پیاو بەسەر ژندا، رەگەزی ژن زۆر بەهای خۆی لەدەستداوە. جا ئەو ژنە کۆشك نشین بێ یان لە تەویلەی ولاخان کاری کردبێ، ئەمە هۆی سەرەکی مەسەلەکەیە و پالامان پێوە دەنێ کێشەی ژن لەگۆشەی چینەکەیەوە چارەسەر نەکەین.

پێویستە ئەم دواکەتوویییەی ژن لەپاڵ ئەو چەوساندنەوەیەی کە تووشی چینەکەی بووە چارەسەر بکرێ، لەگەڵ دەربڕینی خاڵەکانی لێکچوون و جیاوازیان و نیشانەکانی. ئەم جیاوازیەش لەگەڵ لەدایکبوونی کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی ئاشکرابووە.

هەرچەندە هەندێ دیاردەی درۆزن لە بارەی ژیانی ژنەوە هەیە، بەلام ئەنجامی دەست بەسەرداگرتنی چارەنووسی ژن لەلایەن پیاوە بە تەواوی ئاشکرا و دیارە. ئەگەر سەیری مێژووی ئیسلام بکەین، ئەو دیاردەیەمان بەتەواوی بۆ دەردەکەوێ، بەتایبەتی ئەوکاتەی ئیسلام رێی لەتیرە کۆچەریەکان گرت، کە کچەکانیان زیندە بەچاڵ نەکەن. ئەمەش وەك هەنگاوێکی مرۆڤایەتی پێشکەوتوانەی ناو شۆڕشی موحەمەد پێشکەوت، کە زیندەبەچاڵ کردنی کچی قەدەغەکردو و سنووری بۆ ژمارەی ژنی پیاوێك دانا. کەچی ئەمرۆکە ئەمە بە کارێکی ئاسایی دادەنرێ، بەلام لەو کاتەدا، پێشکەوتنێکی چۆنیەتی بوو. ئەمە لە شۆڕشی دیکەشدا روویداوە، بەلام سەرەتا ئەمە لەئیسلامدا روویداوە، وەلێ لەڕاستیدا ئەشکەنجەدان و چەوساندنەوەی ژنی هەژار هەر بەردەوام بوو، تا گەیشتە رادەیەك کە پیاو بۆی هەبێت دەسەلاتێکی بەربلاوی بۆ زیندەبەچاڵ کردنی ژن هەبێ.

بەلام لێرەدا دەپرسین، چۆن کاروبار گەیشتە ئەم رادەیە؟ هەروەك بۆمان

دەردەکەوێ ئەم بارە لەوەوە سەریهەڵداوە کە چەوساندنەوە و ستەمکاری گەیشتوونەتە بارێکی ناهەمواری لە رادەبەدەر. کەواتە دواکەوتوویی ژن تەنیا وشەیەکی پەتی نییە، بەڵکو مەسەلەکە لەمە زۆر گەورەترە. هەروەکو دەزانرێ لە کۆشکی دەسەڵاتدارەکاندا بەشی حەرەم دروست کراوە و، هەزاران ژن خراونەتە بەشی حەرەمی کۆشکی سوڵتانە عوسمانیەکان، تاوەکو کۆتایی هاتنی حوکمڕانی ئەو سوڵتانانە هەر بەردەوام بوو.

بوونی ژن لەچەرخەکانی ناوەڕاستدا شتێکی وەها نەبووە، تەنیا پێکهێنەر بوو و دەخرایە حەرەمی کۆشکەکان. لەوانەیە هەندێك کەس بپرسن، ئەگەر فرۆفێڵ و پلانەکانی ژن لەچەرخەکانی ناوەڕاستدا کە لەحەرەمی کۆشکەکان ئەنجامیان دەدەن رەچاو بکەین، ئەوا دەتوانین بڵێین خاوەنی بوون و کەسایەتیەکی وەهانەبووە. باشترین نموونەش ئەو پلانانە بوون کە ژنە ئیمپراتۆرەکان لە کۆشکی قەیسەرە بێزەنتیەکان دایان ناوە. جگە لەمەش ئەو ژنە ئیمپراتۆرانە هێزێکی تەواویان گرتبووە دەست. ژن لەبەشی حەرەمی کۆشکی ئیسلامیشدا نموونەیەکی هاوچەشنن لەو بوارەدا. چونکە ژنە سوڵتانەکانی عوسمانیش ئەم هونەرەی پیلانگێرانیان بەچاکی دەزانی. بەلأم هەموو ئەمانە تەنیا دیاردەیەکی درۆزنی کێشەکە بوو. چونکە ئەگەر ئەم پیلانانە لەژێر کاریگەری پیاو نەبوونایە، ئەوا جێبەجێ نەدەکران، لەبەرئەوەی لەپێناوی کەسایەتی خۆی و دەرخستنی هێزەکەی نەبوو. ژنیش ئەم توانستەی خۆی لە پێناو دابینکردنی دواڕۆژی کوڕەکانیدا بەکاردەهێنا.

رووداوەکانی کۆشکی سەلجوقی و عوسمانیەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە ژن گەلێك جار بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی شووی کردووە، بۆئەوەی کوڕەکانی لەدوارۆژدا بچنە سەر تەختی حوکمڕانی. زۆربەی شووکردنی ئەو ژنانە لەکاتی گەورەبوونی کوڕەکانیاندا کۆتایی دەهات و رۆڵی دایکیان دەبینی. واتە رۆڵی دایکایەتی لەمەیدانی سیاسیدا رەنگی دەدایەوە. لێرەدا ئەوەی شیاوی باسە بەرچاوترین تایبەتمەندیەکانی سەدەکانی ناوین، ئەنجامدانی ئەو شوو کردنە قەبانە بوون، کە هەموویان لەئەنجامی پیلانی وەها جێبەجێ دەکران ئەقڵ پەسندیان ناکات.

شووکردنی ژن لەچەرخەکانی ناوەڕاستدا بۆ خزمەتی دەسەلأت و بەرژەوەندی پیاو ئەنجام دەدرا. پیاویش ئەمەی بەهۆیەکی سەرەکی بەهێزکردنی دەسەلأتی خۆی و چەوساندنەوەی چینایەتی دادەنا. ئەمەش لەپێکهاتنی ئەوکاتەی خێزانەوە سەریهەڵدا

که لەناو زۆرلێکردن و چەوساندنەوەی چینایەتیدا دەژیا.

گواستنەوەی کۆمەڵ، لە خێزانی دایکسالاری بۆ خێزانی باوکسالاری کە پیاو تێیدا دەسەڵاتێکی تەواوی لە دەستدایە، ئارەزوو لەوەدا بووە کە ئەم سیستەمە پتر دەسەڵاتی لە دەستدابێ. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە خێزان لەسەر بنچینەیەکی پیرۆز یان ئایینی یاخود خۆشەویستی نەما، بەڵکو تەنیا لەناو چوارچێوەی سنووردار دامەزرایەوە.

ئەم گۆڕانکاریانەش لەبەرئەوە روویندا، کە راسپاردەی خودایە یان لەسەر بنچینەی ئەشقێکی بالا هاتۆتە دی. بەڵکو لەبەر ئەو گۆڕانکاریە روویدا کە بەسەر خێزاندا هات، بەشێوەیەکی وەها کە لەگەڵ گەورەیی و دەسەڵاتی پیاودا بگونجێ.

لەسەرەتادا ژن لە توانایدا هەبوو لەگەڵ چەند پیاوێکدا بژی، بەڵام ئێستاکە تەنیا پیاو دەتوانێ لەگەڵ چەند ژنێکدا بژێ. بێگومان ئەم دیاردەیەش بەشێوەیەکی توندو تۆڵ بە قۆناخەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیەوە پەیوەندداره. ئەوەی تێبینی کراوە، خێزان لەسەرەتادا بریتی نەبووە لە پەیوەندیەك پشت بە بنچینەی بالا و بەهێز ببەستێ، بەڵکو بریتیە لەدەزگایەك و دەتوانرێ بەپێی گۆڕانکاریەکی سروشتی هەڵبسەنگێنرێ. بەڵام ئەوەی لەم بابەتە بەرادەی یەکەم کاریگەر بوو، رەگەزی ژن بووە. ئینجا پیاو لەمەش سەیرتر لەچەرخەکانی ناوەڕاستدا بەوپەڕی سوود لەو دەزگایانە بۆ ململانێی ئیمپراتۆری بەکاردەهات. بەتایبەتی لەنێوان خانەدانەکاندا و، لەوکاتەی کە یەکیان دەگرت و سنووری موڵکیان فراوان دەکرد، گەلێك رێککەوتنامە لە سەر بنچینەی گۆڕینەوە ئەنجام دەدرا. لەو کاتەدا کچ بەشوودان لەسەر بنچینەی ژن بە ژن جێبەجێ دەکرا، دەبینین لەو رێککەوتننامانەدا پتر هێزو چەوساندنەوە بەسەر ژندا دەسەپێنرا و، ئەم دیاردەیەش بەردەوام پەرەی پێدەدرا و هەتا ئێستاش لەکوردستاندا هەر پەیرەو دەکرێ.

ژن لە کۆمەڵگای کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتیدا نەك هەر نرخ و رۆڵی نەبوو، بەڵکو تووشی وونبوون و دواکەوتنێکی زۆر بوو. جگە لە دۆڕاندن و لەدەستدانی هەموو ئەو دەستکەوتانەی کە بەدەستی هێنابوو. ئەو ژنانەی کە لەبەشی حەرەمی کۆشکەکانی چینە حوکمڕانەکان بەند دەکران، وەك دیلێکی پەیوەندییەکانی هەردوو کۆمەڵگای کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتی مایەوە و کەسایەتی خۆی لەدەستدا و لەکۆمەڵدا کاری

بچووك و سادەی پێ دەسپێردراو لەموڵکایەتی و دەسەڵاتی سیاسی و کارامەیی داشۆرا و وەکو هەر ستەملێکراوێکی کۆمەڵگای چینایەتی لێهات. ئەم داشۆرینەی دەسەڵاتی ژن، لەهەمموو دەزگا کۆمەڵایەتیەکانیشی دوورخستەوە. بەمەش پتر لەناو کۆشك و باڵاخانەکاندا بەولاوەنراوە و کاری وەهای پێ سپێردرا کە هیچ نرخێکی ئەوتۆی نەبێ و وەکو ئەو منداڵانە سەیر دەکرا کە دەیبوون و بەخێوی دەکردن. بوونی ژن لەناو ماڵەکەیدا، بە جوانی و کابانی و دەست رەنگینیەکەی دەپێورا. چونکە جیهانی فراوانی سیاسەت و موڵکایەتی بەتەواوی لەژێر دەسەڵاتی بەربڵاوی پیاودا بوو، کەچی ژن لەو جیهانە دوورخرایەوە و خۆی لەژێرەوەی توێژە کۆمەڵایەتییەکاندا دۆزیەوە و، لە زانست وەرگرتن و کاری سیاسی و بەشداریکردن لەبەرهەمهێنان بێبەش کرا. بەمجۆرە قۆناخی ونبوون و بێبەشبوونی ژن لە مافەکانی خۆی و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی دەستیپێکرد و، هیچ یاسایەکیش نەبوو پارێزگاری بکات. بەم شێوەیەش هیچ سنوورێك بۆ یاساکانی چەوساندنەوەی ژن لەکۆمەڵگاکانی دواتردا نەبوو. ئەو ژنەی دەچەوسێنرایەوە و دەسەڵاتی بەربڵاوی پیاوی بەسەردا دەسەپێنرا و زۆر جاریش بەبێ هۆ دەبووە قوربانی ئەو بارە ناهەموارەی کە تێیدا دەژیا.

نەك هەر ژن بە تەنیا بەڵکو مرۆڤ بەگشتی بەبێ گوێدانە خزمایەتی و پەیوەندی هاوسەرێتی، دەکەوتە بەر ئەو بارە ناهەموارە. بۆیە پێویستە بەتێروتەسەلی لێکۆڵینەوە لە مێژووی ئەم راستیە بکرێت. ئەگەر ئاورێك لە کۆمەڵگای کوردەواری بدەینەوە، ئەوا دەبینین لە کوردستانی ئەمرۆشماندا، ژن هیچ دەرفەتێکی پێنەدراوە کە بتوانێ مافی خۆی لە جێبەجێکردنی بریارِ و دیاریکردنی دەسەڵاتی سیاسیدا بەکاربێنێ. ئەمەش هەمان رەوشە کە لەو جێگانەدا لەسایەی چەوساندنەوەیدا بەسەر ژندا هاتووە.

لەو کاتەی ژن بەشداری لەژیانی سیاسیدا دەکات و، لەگەڵێك شوێن ئەرکی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی پێ دەسپێردرێ، ئەم پێسپاردنە لەو بەرگە سیاسیە تێناپەرێت کە بۆی دروستکراوە. بۆ نموونە: یەکێك وەك مارگرێت تاتشەری سەرۆك وەزیرانی پێشووی بەریتانیا، کە پێی دەگوترا:"خاتوونی ئاسنین" چی کردووە؟ تەنیا ئەوە نەبێ کە سیاسەتی وەکو پیاوان بەرێوەبردووە. هەروەها وەك نزمترین پیاو ئەو ئەرکەی جێبەجێی کردووە و دەزگای دەوڵەتی سەدان ساڵەی بەکار هێناوە، کە ئیمپریالیزم هەوڵ دەدات بە ناشرینترین شێوە بەکاری بێنێ. بۆئەمەش ئەم کارە

جۆرێك بەكاردێنێ كە بەتەواوی لەگەڵ سروشتی ژندا ناگونجی. لەو كاتەی كە رژێمی شاهانەی ئینگلیز داوای پاراستنی مافی ژن دەكات، دەبینین لە هەمان كاتدا نەرموونۆڵی و مێیەتی ژنی ئینگلیز بەجۆرێكی وەها بەكاردەهێنێ كە ژنەكە خۆی هیچ سوودێكی لێ نەبێنێ. خاتوو تاتشەر لوتكەی هەڵوێستی ئینگلیزی لەپێكهێنانی كەسایەتی ژندا دەنوێنێ و، ئەمەش ئەوپەڕی پیلانگێڕانی كۆشك و نموونەی ژنی بۆرژوازی دەستكردە. هەروەها شاژنێكی بەرەچەڵەك ئینگلیز لە كۆشكی عەممانی پایتەختی ئوردوندا هەیە، وەك ئاشكرایە "شاحوسێن"ی مێردی فێری رێكوپێكی كەشخەیی ئینگلیزی كردووە و، رەنگدانەوەی رۆشنبیری شا و شاژن لەجیهانی عەرەبیدا ماوەی ئەو پێشكەوتنە دەردەبڕێ كە ژنی ئینگلیز بەدەستی هێناوە. لێرەدا بۆمان دەردەكەوێ ژن رۆڵی ئەو جل و بەرگە دەنوێنێ كە خەوش و ناتەواوی مرۆڤی پێ دادەپۆشرێ. لەسەرەتای شۆڕشی بۆرژوازیدا ژنی نێو چینە نزمەكان وەكو كاڵا دەكراو دەفرۆشرا، كەچی لە لوتكەی كۆمەڵدا وەكو شاژن دەژیا. مەبەستیشمان لەو نموونە ژنانە، ژنی كۆشكەكانە كە بۆ هیچ دەست نادەن، تەنیا بۆ بابەتی كۆمیدیا نەبن. بۆیە لێرەدا پێویست ناكات دوور بڕۆین و بچینە ئەوروپا، چونكە ئەو پیلانانەی لەكۆشكی عوسمانیەكان دەگێڕدران، لەم بوارەدا نزیكترین نموونەی زیندوون. راستیەكن كە زۆر پێویستە چارەسەر بكرێن و لە پێشكەوتنی مێژوویان بكۆڵینەوە، چونكە ئەم كارە یارمەتیمان دەدات بۆ قووڵكردنەوەی بیروڕاو هەڵوێست لەم بارەیەوە.

## كۆمەڵگای سۆسیالیستی تا چ رادەیەك چارەسەری بۆ كێشەی ژن داناوە؟

هەروەكو زانراوە شۆڕشی سۆسیالیستی و كۆمەڵگاكەی بە مانایەك لە ماناكانیان وەك بەردەوامبوونی شۆڕشە بۆرژوازیەكان بەدیاركەوتن و شۆڕشی پرۆلیتاریاش بەو ناوەی كە شۆڕشی چینە چەوساوەكان بووە و، بەشداریەكی كاریگەریان تێداكرد، ئەمە وای پێویست دەكرد كە بەرادەیەكی زۆر ژنیش بگرێتە خۆی. چونكە ئەو رەگەزە دەستەیەك بوو لەهەموو دەستەكانی كۆمەڵ زیاتر دووچاری زێدەڕۆیی و ستەم ببوون.

بۆیە لێرەدا ژن لەهەموو دەستە و توێژێکی دیکەی گەلەکەی لەو شۆڕشە سوودمەندتر بوو. ئەمەش راستیەکە، جا لەخۆیەوە خوڵقابێ یا لەئەنجامی هۆشیاری هاتبێتە دی.

لەبەرئەوەی ئەو دەستکەوتەی ژن کە لەشۆڕشی بۆرژوازیدا دەیویست بۆی نەهاتە دی، بۆیە بە کارامەیی بەشداری لە رووداو و چالاکیەکانی شۆڕشی سۆسیالیستیدا کرد، بەو نیازەی لەو زوڵم و زۆریەی کە دووچاری بووە، رزگاری بێت. هەر بەهەمان هۆ بەشداریکردنی ژن لە شۆڕشی بەلشەفیکی سۆڤێتی، گرنگیەکی زۆری هەبوو. هەر لەبەر ئەم هۆیەش بەشداریکردنی ژن لە زۆربەی شۆڕشەکانی پێشوو و تا دەگاتە ئەمڕۆ ئاستێکی بەرزی لە زانایی و هۆشیاریدا هەبووە.

لێرەدا ئەم بەشداریکردنەی ژن شیاوی ئاماژە بۆکردنە کە تاوەکو ئێستاکەش لەناو چوارچێوەی بەشە ستراتیژیە گشتیەکەیدایە. واتە ئەم بەشداریکردنەی لەسەر بنچینەی لێکۆڵینەوەی پارتی تایبەت بە ژنان و دانانی بەرنامەیەکی تایبەتی بەکێشە و کاروبارەکانی ئەنجام نەدرا. ئەوەی گومانیشی تێدا نییە ئەم بەشداریکردنەی خزمەتی بەرژەوەندی گشتی دەکات. بەڵام ئەوەش بەس نییە، چونکە مارکسی مامۆستای پرۆلیتاریا، رادەی ئازادی کۆمەڵگاکان بەڕادەی ئازادی ژنەوە دەبەستێتەوە. لینینیش دەڵێ: ئەو جموجۆڵە شۆڕشگێڕیەی کە ژن بەشداری تێدا نەکات، لەئەنجامدا سەرناکەوێ. بەڵام ئەنگلس چارەسەری ئەم وونبوونەی کردووە کە ژن تێیدا دەژی، کەچی لەگەڵ دانانی بنچینەی تایبەتی بە کێشەکەی، لەو بوارەدا مانای ئەوە نییە کە بەرنامەیەکی تایبەتی بە مەسەلەی دابینکردنی ئازادی ژن و یەکسانی لەگەڵ پیاو داناوە. ئەم بەرنامەیەش بە رێکخستن و تێکۆشانی پێویست دێتە دی و، تاوەکو ئێستا مۆرکی دیاری جوڵانەوەی ژنان بەشێوەیەکی رەمەکی یە.

لێرەدا گەلێك بزووتنەوەی ژنان لێرەو لەوێ لە ئارادان و هەندێ سەرکردەی ژن پەیدا دەبن، بەڵام بەشێکی ستراتیژی خاوەن ئامانجی ئاراستەکراو نین بۆ چارەسەرکردنی بنەڕەتیانەی کێشەی ژن، بەڵکو وەکو هێزێکی یەدەگی ستراتیژی گشتین. لە دوایشدا ژن لە کۆمەڵگای سۆسیالیستی ئەمڕۆماندا هەرچەندە هەنگاوێکی باشی بەرەو پێشەوە ناوە، بەڵام ڤیرانەکە رەگ و ریشەی کێشەکەی دەرنەهێناوە. بێگومان ژن لە دەوڵەتە سۆسیالیستەکاندا بەتایبەتی لەیەکێتی سۆڤێتی پێشوودا لەو بارە فسیۆلۆژیە دەرچووە، کە سەدان ساڵە تێیدا دەژی. ئێستاکە لە بوونیادێکی فسیۆلۆژی

پێشکەوتووتردا دەژی و بەشداری لە بەرهەمهێنان و سیاسەت و چالاکی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتیدا دەکات و، بۆ هەڵبژاردنی جۆری ئەو کارەی کە دەیەوێ کۆمەڵگای سۆسیالیستی چوارچێوەیەکی کراوەی بەئارەزووی خۆی بۆ داناوە. بەڵام تاکو ئێستاکەش ژن وەك تۆو دواکەوتووە و کۆمەڵگا بە مۆرکی پیاو مۆردەکرێ، بەرادەیەکی وەها زۆر بە زەحمەت بتوانێ سوود لەو مافانەی کە پێی دراوە، وەربگرێ. بۆیە بەشداریکردنی لەکۆمەڵدا دوور دەبێ لەهێنانە دی ئەنجامێکی شۆڕشگێڕانە.

هەندێك کەس دەڵێن: لەمیانەی شۆڕشدا گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی دێتە ئاراوە و شانبەشانی ئەمەش گۆڕانکاریی بەسەر رەوشی ژندا دێت. بەمجۆرە گەلێك هەڵسەنگاندن بۆ ئەم مەسەلەیە ئەنجامدراوە و رووداوەکانی تۆمار کراون. بۆ نموونە: ئایا ژمارەی وەزیران و سەرۆك وەزیری ژن لە یەکێتی سۆڤییەت و دەوڵەتە سۆسیالیستەکاندا چەند بوون؟ بەپێی ئەو زانیاریانەی کە پێمان گەیشتووە، رێژەی رەگەزی ژن لە ناوەندە سیاسیە گرنگەکانی ناوخۆ و دەرەوە لە 5٪ تێپەرناکات. ئەمەش ئەنجامی ئەو جیاوازیە ترسناکەمان لەو بوارەدا بۆ دەردەبڕێ. لێرەدا دەبێ بڵێین فەرمان وەرگرتن لە رژێمی سۆسیالیزمیدا، لەبەردەم ژن و پیاودا وەکو یەکە، هەریەکەیان دەتوانێ بەپێی توانستی خۆی ئەم فەرمانانە بگرێتە ئەستۆ. هەروەها دەتوانین بڵێین: ئەگەر پیاو لە وەرگرتنی ئەم فەرمانانە زۆرینەبن، ئەمە مانای ئەوە دەگەیەنێ کە بەتواناترن. بەڵام پێویستە ئەوەشمان لەبیر نەچێت، کە پیاو دەستیان بەسەر شوێنی زۆر گرنگدا گرتووە، چونکە توانایان زیاترە. ئەم توانایەشیان لەو دەسەڵاتەیانەوە سەرچاوە دەگرێ کە سەدان ساڵە لەو کاروبارانەکادا لەژێر رکێفیاندایە. کەسیش ناتوانێ خۆی لەو راستیە دووربخاتە و بڵێ: "ئەو کەسەی کە لە سۆسیالیزمدا زیاتر کار بکات، پتر سوود وەردەگرێ و، ئەوەی زیاتریش بیربکاتەوە پتر کار دەکات". چونکە ئەمجۆرە لۆژیکە پاشماوەی یەکسانیبوونێکی ئاشکرایە.

ئەو رۆڵەی کە بەژن دراوە، تەنیا لەچەند بوارێکی سنووردارەوە و پێشکەوتنێکی هەستپێکراوی لە بوارەکانی هونەر و وێژە بەدەست هێناوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رۆڵی ژن لەبواری سیاسەت و نەخشەکێشاندا تاوەکو ئێستاکە یەکجار سنووردار و تەسك بووە و ئەم دیاردەیەش لەماڵی مێردەکەیدا دەردەکەوێ. لەم رەوشەشدا ئەگەر بڵێین کێشەی ژن

لـەرەگ و ریشـەوە لـە کۆمـەڵگای سۆسیالیسـتی ئێسـتادا چارەسـەرکراوە، یـان بڵـێین چارەسـەرکردنی ئـەم کێشـەیە بـەکاروانی پێشکەوتنی کۆمـەڵگای سۆسیالستیەوە بەنـدە، ئەمە چاوپۆشیە لە گەورەترین خەوشی کۆمەڵگاکان. ئەمەش لە چارەسەری گشتی کێشە کۆمەڵایەتیەکاندا جۆرە داخستنێك دەردەبڕێ.

ئەوەی گومانی تێدا نییە گفتوگۆ و لێکۆڵینـەوە لـەم بارەیـەوە، مـافی ژنـی زۆربـەی دەوڵەتەکانی جیهان دەگرێتـەوە، لـە سـەرووی هەمووشـیانەوە دەوڵەتـە سۆسیالیسـتەکان. بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێین، کە ئەو گفتوگۆیانـە تـا چ رادەیـەك ئـەو هەڵوێسـتە کلاسـیکیە ئاسـاییانە دەبـەزێنن و بـەرەو گەوهـەری کێشـەکەی دەبـەن؟ لەڕاسـتیدا مـافی ژن تـاوەکو ئـەمرۆمان هـەر خـۆی لـەدیاردەی درۆزنـدا نوانـدووە و، هاوتـەریب لەگـەڵ ئەمـەش چاوپۆشـی لـەهیچ ناکـات، بۆیـە دەبیـنین تـاوەکو ئێسـتاکەش هەڵوێسـتی کلاسـیکی و ئەنجامەکانی لە چارەسەرکردنی کێشەکەدا هەر بەکاریگەرن. هەڵبژاردنی رۆژی 8ی ئادار لەناو هەموو رۆژەکانی ساڵدا، ئـەنجامی پاشماوەی ئـەم دیـاردە درۆزنانـەن. کەچـی ئێمـە لەجیاتی ئەوە باوەڕیمان بەهێزە کە بەتێکۆشانێکی بـەردەوام لـەپێناو مـافی راسـتەقینەی ژن و پێشیخسـتنیدا دێتـە دی. لێـرەدا بۆنـەی دیکـەش هـەن کـە رێکخـراوی نەتـەوە یەکگرتووەکان بۆ ژنیان بڕیار داوە و هەریەکەشیان نـاو و سـاڵیان بـۆ دانـاون، بـەڵام ئـەو ساڵانەی کە بەساڵی ئاشتی ناویـان بـردوون، دەبیـنین لەهـەموو سـاڵان زیـاتر شـەڕ تێیـدا تەشەنەی کردووە. ئەو ساڵانەی کە بۆ لاوانیشـیان دانـاوە لەهـەموو سـاڵان زیـاتر کێشـەی لاوانیـان تێـدا شـاردۆتەوە. بـەلانی کەمـەوە ئـەو سـاڵانە زێـدە جیاوازیـان لەگـەڵ سـاڵانی پێشوودا نەبووە، مادام ئەو ساڵانە دەستنیشانکراون و هەریەکەیان بەبۆنەیـەکی تایبـەتی دانراوە، دەبێ پارێزگاری لە چەمك و ماناکانیان بکەن.

ئـەو شۆڕشـانەی کـە لـەدژی ئیمپرالیـزم ئـەنجام دەدرێـن، لـەڕۆژگاری ئەمڕۆمانـدا بەشێوەی زیاتر لە شۆڕشێك و شەڕێك لەیەك کاتدا بەرپا دەبن. جەنگ بەو بۆنەیەی کە جـۆرە سیاسـەتێکی ئاشـکرا دەنـوێنێ، دەگرێتـە دوو جـۆرە سیاسـەت؛ سیاسـەتی ئاشـتیپەروەرانە و سیاسـەتی جـەنگی رۆشـنبیری، کـە بەشـێکی جیانـەکراوە لەجـەنگ و کێشەی نێو دەزگای خێزان دەنوێنێ. ئەگەر وەها تێبگەین کە جـەنگ تـەنیا تێکچـڕژان و پێکدادانی خۆێنـاوی سـوپاکانە، دەبـێ چاوپۆشـی لـەدەنگی مێشـك بکـەین کـە لەهـەموو جەنگێکی نێو کۆمەڵگای مرۆڤ و بونیادی خێزان گرنگترە. لەبەرئـەوەی کـە پیـاو لایەنـە

بەهێزەکەیە لەم جەنگەدا، خۆی یاسا و پێوەر و بنچینەی چوونە ناو ئەو جەنگەی داناوە. کەواتە؛ پیاو ئەو لایەنە زاڵەیە و هەموو دەسەڵاتێکی بەسەر ژندا دەشکێ و ژنیش ئەو لایەنەیە کە هەڵدەسووڕێنرێ. ژن وەك یەکێك لەلایەنەکانی ئەو جەنگە، رەگەزێکی نایەکسانی بێ دەسەڵاتە حوکمی بەسەردا دەکرێ. بەڵام پیاو جەمسەرێکی ترە، دەبینین پشت بەهێز و دەسەڵاتێك دەبەستێ کە سەدان ساڵە داب و نەریتی یاساکان بۆیان دابین کردووە. بۆیە دەبێت شۆڕشێك بەرپابکرێت و نابێ هیچی تر چارەسەری ئەم بابەتە بەشێوەیەکی رووکەشانە ئەنجام بدرێت. ئەوەی ئاشکرایە، پیاو لەگەڵ لەدایکبوونیدا هیچ تایبەتمەندیەکی دەست نەکەوتووە، هەروەها ژنیش هیچ تایبەتمەندیەکی پێنەدراوە. بەڵام دەبێ ئەو راستیە بزانین کە داب و نەریتی چینایەتی جۆرە تایبەتمەندیەك بە میراس بۆ نەوەکان بەجێ دەهێڵێ و چەشنە سروشتێك بۆ پیاو و ژن دروست دەکات و بەم شێوەیەش دەسەڵاتی ئایین، زانیاری و رۆشنبیری بەسەر کۆمەڵدا دەسەپێنێ. لەم رووەشەوە پێویستە پەیوەندیەکانی نێوان ژن و پیاو لەسەر بنچینەی هەڵوێستی راستینەی مێژوویی چارەسەربکرێن. ئەو پەیوەندیانەی کە رژێمی سەرمایەداری بوونیادی ناون، دەزگای خێزانیشی دووچاری هەڵوەشانەوە کردووە.

لەمەوبەر پرسیارکرا و پرسیارەکەش لەبارەی روونکردنەوەی هۆی زیادبوونی پیاوێتی پیاو و قووڵکردنەوەی باری ژن و شوێنی ئەمە لەدیاردەکانی شەڕ و ئاشتی و گۆڕانکاری پەیوەندیەکانی رۆژانەدا بوو. ئەگەر ئەم کێشەیەمان بەڕاستی مرۆڤایەتی خۆمان هەڵبسەنگێنین، ئەوا بەئاشکرا بۆمان دەردەکەوێت کە پەیوەندی کەسەکان بەیەکترەوە راست و دروست نییە. گەلێك کەس لەو بوارەدا لە قەیرانێکی تەواودا دەژین و بەشێوەیەکی زۆر و قووڵ کاریگەری لەسەر شێواندنی کەسایەتیش کردووە. گەلێك پەیوەندی شێواو لە ئەنجامی بەرزبوونەوەی بێ سنووری دەسەڵاتی پیاو و نزمبوونەوەی لەڕادە بەدەری ژن لە کۆمەڵگاکەیدا دروست دەبن و جۆرە قەیرانێك دەخوڵقێنێ.

زۆر پەیوەندی هەن مرۆڤ حەزیان لێدەکات، بەڵام نایەنە دی، چونکە کەسایەتیەکان سەدان ساڵە بەکۆت و زنجیر بەند کراون. پێش هەموو شتێك لەبەرامبەر چەمکی رەوشت و داب و نەریتی هەزاران ساڵەی پیاو و کەسایەتی ژن دەوەستێ، کە چاخەکانی پێشوو دروستیان کردوون. ئەم بارەش لە کوردستاندا بەشێوەیەکی تایبەت

دەردەکەوێ.

مێژووی پیاو وەها نیشاندەدات کە گوایە پارێزەری دڵسۆز و بەخشندەی هەمیشەییە لە کۆمەڵدا. کەچی ژن وەك سواڵکەرێك بەبەگەوە بەستراوە و هەمیشە بەستەمکار دادەنرێ و پەیوەندی و ستەم بەکار دێنێ، کەچی ئەوەی پێی دەڵێ شەرەف پیاو قوربانی بۆ دەدات و خۆی لەپێنایدا بەخت دەکات راستیەکی بەرچاوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ژن و پیاو لە پەیوەندی نێوانیاندا دڵنیا نین. کەواتە هەموویان رووەو بارێکی نادروست دەبنەوە و ئەو نارەزایی و نیگەرانییەی کە خاوەن ژن و ماڵ دەریان دەبڕن، لەئەنجامی ئەو قەیرانەوە سەرچاوەی گرتووە کە لەکۆمەڵگا و خێزاندا لەو بوارەدا تێیدا دەژین.

ئەوەی زانراوە ئەو قەیرانەی کە بەدرێژایی مێژوو دروست بووە و پشتەکانی لەمەوبەر بەشێوەیەکی قووڵتر تێیدا ژیاون و بۆ ئێمەش ماوەتەوە و لەبەرئەوەی ئێمە شۆڕشگێڕین و باوەڕی شۆڕشگێڕی دروست دەکەین، بۆیە لەچاو خەڵکی پێشوو بارمان سووکترە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شوێنەواری ئەو رۆشنبیریەیە کە پڕە لە فڕوفێڵ و پیلان و ناپاکی لێك دابڕان. بەردەوام تاکو ئێستا بەپێی پێویست روون ناکرێتەوە و سەرچاوەکانیان دەستنیشان ناکرێن. ئەگەر ئەم پرسیارەمان ئاراستەی باوکان و دایکانمان کرد، بێگومان وەڵامەکەیان تەنیا بێ دەنگ دەبێ، چونکە لەبارێکی وەها توند و تیژدا دەژین. زۆر گرانە بەچاکی لە ماناکەی تێبگەن، چونکە لەگەڵ زۆر فڕوفێڵی ئاڵۆگۆڕکراویاندا ژیاون. ئەنگلس گرنگیەکی زۆری بە لێکۆڵینەوە و چارەسەری پەیوەندی بەستنەوەی نێوان هەردوو رەگەزی ژن و پیاو و ژیانیان داوە، کە بریتیە لە هەڵخەڵەتاندن. بۆیە لێی دەتوێژنەوە. دەبێ سەیری ئەوەش بکەین کە جەنگێکی کاریگەر بە تایبەت لەبواری خێزان و کۆمەڵ و سیاسەتدا هەیە. ئەم جەنگەش لەهەموو بارێکی پەیوەندی و خۆشەویستی ژن و مێردایەتی و تەڵاقدان بەدیار دەکەوێ. لێرەدا دەبێ ئەوە دەربببڕین کە هەریەك لەو دوو رەگەزەی ژن و پیاو چیان لەیەکتری زەوت کردووە و لەبەر رۆشنایی ئەو جەنگەدا بەچاکی هەڵیدەسەنگێنین. نەك ئەو واقیعە بسەلمێنین و بڵێین پەیوەندیەکی ئەوەندە بەهێزن نابێ دەستیان لێبدەین. ئەوەی شیاوی باسیشە، ئایین و سیاسەتی تاقمی حوکمڕان بەتەواوی شێوەی جیاواز دەریان بڕیوە و، بەپێی بۆچوونی ئەوان ژنیان پاراستووە. بۆرژوازیەتیش لەو باوەڕەدایە کە ئەو مافێکی

زۆری بەژن بەخشیوە، بەڵام هەڵوێستی ژن لەو بوارەدا ئاشکرا و روونە. بۆ نموونە: لە تورکیادا ژنی بۆرژوای بچووك خانوویەکی پڕ لە کەلوپەل و مێردیشی هەیە و وا دەزانێ ناز و نیعمەتێکی زۆری پێدراوە و، لەو باوەڕەدایە هەموو پێویستیەکانی بۆ دابین کراوە و تەواوی ئاواتەکانی هاتۆتە دی. بەڵام لەدوای چەند ساڵێك دووچاری قەیرانێك دەبێت و هەمووشتێکی لێ سەر و بن دەبێ و رەوشی ژیانی شکست دێنێ.

لەمانەوە بۆمان دەردەکەوێ، کە گۆڕانکاری مێژوویی و مەسەلەی شەرەف وانیە، کە بە وشە دەربڕاون و باسیان لێوەکراوە. بەڵکو لەڕاستیدا جۆرە داهێزان و نزمیەك دەردەبڕن و هەرساتێك ململانێ و بەیەکدادانی توندووتیژ لەو بوارەدا روودەدەن، لەو باوەڕەداین ئەوانەی دەزانن هەموو شتێك زۆر تەواوە، گەلێك کەمن. بۆیە لێرەدا پێویستە سەیری ئەم راستیەی خوارەوە بکرێت.

ئەو بارەی کە ژن تێی خزێنراوە، دەبێتە هۆی هەڵگیرسانی جەنگێکی سەیر، ئەو جەنگەش بەجۆرێکی زۆرەملێیانە بەرپا دەبێ. بەکورتی نموونەی ژنێك پێکدێنێ کە لەگەڵ پیاودا رێك بکەوێ. هەروەك ئەو پەندەی کە دەڵێ: "هەردوو وەك یەکن سەر یان شەبقە!". واتە رەوتی ئەفەندایەتی پیاو شتێکی وەها نییە بەئاسانی و شانازیەوە باسی لێوە بکرێت. چونکە چەند نرخ و رێزی ژن کەم بکرێتەوە، ئەوەندە نرخ و رێزی پیاویش نزم دەبێتەوە. لەم رووەشەوە کێشەی ژن کێشەی پیاویشە. لەبەر ئەوەی شکان و نزمبوونەوەی ژن یەکێکە لەسەرچاوە سەرەکیەکانی خراپیەکانی پیاو. بۆیە مەسەلەی پیاوێتی بۆتە کارەسات و بەڵایەك لەگەردنی ئالاوە. ئەو قەیرانەی کە پیاو تێیدا دەژی گاڵتەی پێناکرێت و، بەهەند هەڵدەگیرێ و زۆرن. ئەو بارانەی کە ژن دەست لە شەیتان هەڵدەگرێت و بەتەنیا دەژی، هەر ئەوەشە بۆتە هۆی دەروێشی لەئاییندا. ئەمەش چارەسەرکردنێکی نێگەتیفانەیە بۆ کێشەکە. چونکە لەفەلسەفەدا هاتووە کە دەڵێ: "ژن گوناهکارە" ئەمەش وتەیەکە بەمەبەستی دوورکەوتنەوە لەگوناهباری راستەقینە دەگوترێ.

مەسەلەی دەست نەگوشینی ژن و خۆداپۆشینی بەسەرپۆشێکی ئەستوور لەهەردوو باری ماددی و واتایی ئەنجامی ئەو هەڵوێستە هەڵانەن و دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەم هەڵوێستانە، کێشەکە بە هەموو گرانیەکیەوە دەهێڵنەوە و خراپتریشی دەکەن.

ئەوروپا و دەوڵەتە سۆسیالستەکان ئەو کێشانەیان بەجۆرێکی جیاواز وەرگرتووە و وردە وردە هـــەنگاوی چارەســـەرکردنیان بـــۆ هاوێشـــتووە و شـــێوەیەکی چاکســـازی ناشۆڕشگێڕیان بۆ چارەسەرکردنی بەکارهێناوە. ئەوەی لێرەدا سەرنج رادەکێشێ ئەوەیـە، جۆرە شێوەیەکی خەبات دەگرنە ئەستۆ کە نایان گەیەنێتە ئەنجام، لەوانەیە بەچاکسازی رۆڵێکی باش لەچارەسەرکردنی کێشەکە ببینن، بەڵام گۆڕانکاریـەکی سـەر تاسـەری بـەدی نـاهێنێ. بۆیـە پێویسـتمان بـە بـەرپابوونی شـۆڕش هەیـە، لـە هەمانکاتیشـدا شـێوەی چاکسـازی هەرچـەندە بـەس نییـە، وەلـێ بەسـوودە تـاوەکو ئـەو شۆڕشـە بـۆ هێنانـەدی قۆناخی نوێی ئەو شۆڕشە دێتە دی.

لێرەدا هەندێ کەس دەپرسن و دەڵێن: تا چ رادەیەك پێویستە لەم بـوارەدا شـۆڕش بەرپا بکرێ؟ لەبەر ئەوەی کۆمەڵگاکان هەمان کێشەیان هەیە، بۆیە پێویستمان بەشۆڕش هەیـە. ئـەوەی ئاشکراشـە شـۆڕش وەکـو ئـەوە نییـە کـە تـەنیا لـەنێوان دوو چـین هەڵدەگیرسـێ، بـەڵکو دەبـێ شۆڕشـێك بـێ لـە ئـەقڵ و بیرکردنـەوەی نێـو دەزگـا و داب و نەریتی کۆمەڵایەتی، بەتایبەتی لەناو خێزاندا بەرپا بکرێت، شۆڕشـی  هـەروەها خامـە و رۆشـنبیری و بێـت و لـەدژی تـەوژمی کلاسـیکی بـێ. واتـە ژنـان هـەرگیز لـەدەوری بەرنامەیەکی یەکگرتوو یەك ناگرن و سوپایەك پێکەوە نانێن تاوەکو بەرامبەر بەسوپای پیاوان بجەنگن و هیچ جەنگێك لـەپێناو یەکسانیبوون بـەم شـێوەیە هەڵناگیرسـێ. بـەڵام پێویستیشە مەسەلەی بـەردەوامبوونی دەسـەڵاتی پیـاو بەسـەر دەزگاکانـدا نەسـەلمێنین و پێویستی هەبوونی بەرنامەیەکی تایبەتی بۆ خەباتکردن لەو بوارەدا وەرنەگرین.

ئـەو بـێ هێزییـەی دەسـتی بەسـەر پەیوەندیەکانـدا گرتـووە و بەرادەیـەك قـووڵ بۆتەوە ناتوانین کێشەکان لە سایەیدا چارەسەر بکـەین. بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەمجۆرە چارەسەرکردنە بۆ پیاو و بۆ ژنیش وەکو یەك باشترین رێگایە. چـونکە تـەنیا دەربـڕینی چـەند ووشـەیەك لـە بـارەی پەیوەنـدی و کـەمێك لـە دەسـتەبەری ئـابووری و هەنـدێ چەمکی ئاسایی و باو کە لەناوەرۆکدا کێشەکە قووڵتر دەکەن، ئەمانـە ئـەو هەڵوێسـتانەن کە هەردوو رەگەزی ژن و پیاو پەنای بۆ دەبەن. ئەوەی زانراویشە، لێرەدا پێویستمان بـە ململانێیەکە کە لە رەگ و ریشەوە چەمکە باوەکانی ئەم بوارە بگۆڕێ و بەبێ تێکۆشان و شەڕکردنی پیاو لە دژی دەسەڵات و پیـاوێتی خـۆی و ژن لـە دژی مێیـەتی خـۆی و بـەبێ دابینکردنـی هاوسـەنگی لـە نێوانیانـدا ئـەم کێشـەیە چارەسـەر ناکرێـت. ئەمەیـە ئـەو

دیاردەیــەی پێــی کــە دەگــوترێ شــۆڕش. واتــە دوورکەوتنــەوە لەکۆمەڵگایــەی لــە ژێــر کاریگــەری قــووڵی پیــاو و ژیــانی مێیــەتی زێــدە لــە لای ژنــدا و، بنیادنــانی پەیوەنــدی بەرهەمهێنانێکی هاوسەنگتر دایە. واتە گەیشتن بە چالاکی هاوسەنگی بە کۆمەڵ لەژیانی رۆشــنبیری، سیاســی و کۆمەلایــەتی و، بــەبێ گەیشــتن بــەو هەڵوێســتانە نــاتوانرێ کێشــە کۆمەلایەتیەکان بە گشتی و کێشەی ژن بە تایبەتی چارەسەر بکرێن.

بەڵام خۆبەستنەوە بە چارەسەریەکی چاکسازییانە لـەوە دەچـێ کـە ئێمـە تیـۆری توندوتیژی ولاتە ژێردەستەکان پەیرەو بکەین. هـەروەکو چاکسـازیەکان لـەو بـاوەڕەدان کە ئەوانەی پەیرەوی تیۆری توندوتیژی دەکەن لەولاتە ژێردەستەکاندا گـەلێك کارەسـات بۆ میللەت دێنن. ئەوانیش بەهەمان شێوە چارەسەری ئەم کێشەیە لە رێگای زۆربلێیـی و گفتووگۆیــەکی لەڕادەبــەدەر دەکــەن و ئامۆژگــاری خــەڵکی دەکــەن تــا کێشــەکە بــەهۆی پڕوپاگەندە چارەسەر بکەن. ئەمەش لەڕاستیدا واتای مردنێکی تاهەتایی دەگەیەنێ.

لەو کاتەی کە ئێمـە چارەسـەری هەڵوێستی گشـتی کۆتـایی پـێ دەهێـنین، دەڵێین: دەبێ رێگەی بەرپاکردنی شۆڕشێکی بنەڕەتی بگـرین، نـەك شـێوەیەکی چاکسازی بکـەین بە بنچینەی چارەسەری کێشەکە.

ژن لەشۆڕشی بۆرژوازیدا تەنها ئەکتەرێکی راگەیاندن بووە لە هۆنینەوەی پیلان و گێچەڵدا. لە ئاستی بنکـە و ژێرخـانی کۆمـەڵ تـەنها وەك کالایـەك کـڕدراوە و فرۆشـراوە، بـەلام لـە لوتکـە و سـەرخانی بونیـادی کۆمەلایەتیـدا وەك ژنـە ئیمپراتـۆر بـووە. گـەلێك نموونەشمان هەیە بۆ ئـەو جـۆرە ژنانـەی کـە خـاوەن هێـز و دەسـەلات بـوون، کەچـی لـە راستیدا تەنیا بابەتێك بوون رۆڵی کۆمیدیان لە شانۆگەری ژیاندا بینیوە.

ژنـــی نێـــو کۆشـــکی دەســـەلاتداران بـــەوجۆرە بـــوون و پێویســـتیش ناکـــات دوور بکەوینــەوە و بــەدوای نموونــەی ژنــی ئــەوروپادا بگــەڕێین، تــەنیا ئەوەنــدەمان بەســە کــە نموونــەی ژنــەکانی کۆشــکی حکومڕانــە عوسمانیــەکان بهێنینــەوە، کــە چــەند گێچــەڵ و پیلانیان ناوەتەوە. جا لەبەر رۆشنایی ئـەم واقیعـە بەتایبـەتی کـە ئێسـتا لەبـەر دەرگـای سـەدەیەکی نـوێی ژیـانین، پێویسـتە ئـەم کێشـەیەی مـافی ژن بەشـێوەیەکی هاوچـەرخانە چارەسەر بکەین، کە لەگەڵ گۆڕانکاریەکانی مێژوودا بگونجێ. لێرەشدا بیروڕاو بۆچوونی جیاواز دەردەکەونە روو.

ئێمە دەپرسین، ئایا شۆڕشە بۆرژوازییەکان لەم بوارەدا چ دەستکەوتێکیان بۆ ژن بەدەست هێناوە؟ لێرەدا دەبێ ئەو راستیە بڵێین کە هەر شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی مرۆڤایەتی لەگەڵ بەرپا بووە، هەنگاوی بەرەو پێشەوەی ناوە. بۆیە هەست دەکەین سەرمایەداری خێزانی بۆرژوازی لەچاو خێزانی فیۆداڵی سەرکەوتووترن و، هەر بەو پێیەش ژنی بۆرژوازی پێشکەوتووترە لە ژنەکانی قۆناخی دەرەبەگایەتی. بۆیە کێشەی ژن لەگەڵ سەرهەڵدانی سەرمایەداری لەو کێشانە بووە و چارەسەر کراوە، بەوەی بۆرژوازیەت بەپێی تیۆری پیادەکردنی، هەوڵی دورستکردنی نموونەیەکی لەو جۆرە ژنانەی داوە و، لەئەنجامدا کردوونی بە بابەتێکی سەرەکی بۆ نیگارکێشان و بابەتی دیکەی هونەر و کاروباری رۆژانەی ژیان. لە راستیدا پیاوی بۆرژوا، کە لەشێوەی پەیوەندیەکانی کۆمەڵگای بۆگەنی دەرەبەگایەتی وەڕەس ببوو، لە دروستکردنی نموونەیەکی نوێی ژندا سەرکەوت، کە شێوازی جل و بەرگ و رێکخستنی قژی جیاواز بێ لە ژنی پێشوو، واتە جۆرە شێوازێکی نوێ بگرێتە بەر. لەم گۆڕانکاریەدا هەر حکومڕان و کاربەدەست ئەم رۆڵەیان نەگێڕا، بەڵکو پەیوەندیەکانی خێزانە خانەدانەکانی دەرەبەگایەتی کە ببوونە کۆسپێك لەبەردەم بەرەو پێشەوەچوونی بۆرژوازی، هۆکاری روودانی ئەو گۆڕانکارییە بوون. بۆیە بۆرژوازیەت بە پێویستی زانی دژی پەیوەندیەکانی دەرەبەگایەتی، کە ببوونە کۆسپێك لەبەردەم دورستبوونی کۆمەڵێکی نوێ شەڕی و ململانێیەکی راستەوخۆ بەرپا بکات. ئەم ململانێیەش بەزۆری لە بوارەکانی هونەر و وێژەدا بەدیار کەوتن و، گەلێك تیۆری کۆمەڵایەتی لەبارەی مافی مرۆڤەوە بەگشتی و بڵاوکردنەوەی یەکسانی لەنێوان مرۆڤ و مرۆڤێکی تردا هاتنە کایەوە و زۆری پێنەچوو بۆ مافی ژن و یەکسانیکردنی بەپیاو هەنگاویان هەڵێنا.

ئەو یەکسانیەی کە بۆرژوازیەت بۆ ژن دەیخوازێت، یەکسانیەکی گشتی نییە، بەڵکو تەنیا ئازادی خستنە نێو خێزانی بۆرژوازییە، کە لەمەوبەر دەرفەتی ژیانی کەم بووە. نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ کە گەلێك شێواندن لەم بوارەدا بەسەر مافی ژندا هاتووە. ژن بۆتە بابەتێکی دەرەوەی رۆمان نووسین، بەتایبەتی لە سەرەتای سەرهەڵدانی کۆمەڵگای بۆرژوازی کە ئازادی و ڤەبوونێکی بەربڵاو کەوتە پێش ئەدەب و هونەر. ئەو نموونەیەی کە لە رۆمانەکاندا وێنەیان بۆ دەکێشا، وەهایان نیشاندەدا کە ژن بە رواڵەت و وێنە مرۆڤێکی خاوەن ویست و بەبڕیارە، لەتوانایدا هەیە خێزانەکەی خۆی بونیادبنێ. جاران

ژن تەنیا دیاردەیەکی سادە و ساکار بوو، ئێستاش ئەو کۆڵەکانەن کە کۆمەڵگای رۆژئاوا لە سەریان بونیادنراوە. بەڵام پێویستە ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە بەشداریکردنی ژن لەکاروباری ئەو قۆناخەدا، تەنیا بەشداریکردنێکی رۆمانسیانە نەبووە، بەڵکو بەشداریکردنێکی ژێر دەسەڵاتی تەواوی پیاو بووە و مۆرکی ئەوی وەرگرتووە. جگە لەمەش شۆڕشە بۆرژوازیەکان بەشداری کردنێکی رێکوپێك و بەرفراوانی ژنانیان بە خۆوە نەدیوە، تەنیا لە چوارچێوەی سەمبوڵ و نموونەدا بووە و بەس. چونکە بەشداریکردنی ژن لە شۆڕشە بۆرژوازیەکاندا، تەنیا لە ناو ئەو سنوورانەدا بووە کە پیاو لە کۆمەڵگای نوێدا نەخشەی بۆ کێشاوە.

مافی ژن تا ئێستاکەش یەکێکە لەو بابەتانەی کە لەهەموو جیهاندا مشتومڕێکی زۆری لەسەرە، لە تورکیاشدا مشتومڕێکی زیاتر و فراوانتری لەسەر دەکرێ. دەبێ ئەوەش بزانین کە گەلێك جار پیاو لە کۆمەڵگای بۆرژوازیدا ئاڵای تێکۆشانیان بەناوی ژنان هەڵگرتووە، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو تەگەرە و کۆسپانەی کە پەیوەندی و دابونەریتی سیستەمی دەرەبەگایەتی پێکەوەی ناون و لەبەردەم خۆ گەیاندنی بۆرژوازیەت بۆ ناو خانەی خێزانی کۆمەڵگا کە بەردەوام هەوڵی بۆ دەدا ئاستەنگ بووە. هەروەها کەمالیستەکانیش لە تورکیادا ئەوەیان کردوە و، بەناوی ژنەوە ئاڵای مافەکانیان بۆ هەڵگرتوون و مافی سەرەکیان پێ نە بەخشیون.

ئەوەی راستی بێ ژن شتێکی لە پێشکەوتن و رێز گرتن لەسایەی سەرمایەداریەوە وەدەست کەوت. بەڵام لەبواری سیاسی و کۆمەڵایەتیدا بە رادەیەکی زۆر کەم رۆڵی هەبوو، کە شیاوی باسکردن نەبوو. واتە هەبوونی ژن بەند بوو بە هەبوونی مێردەکەیەوە. ئەم بارەی ژیانیشی وایکرد ماوەی ویست و ئارەزووی، جێگەی مشتومڕێکی زۆربێ. چونکە ژن لەو قۆناخەدا تەنانەت لە کۆمەڵگای زۆر پێشکەوتووشدا ناتوانێ بەڕێوە بچێت. واتە لەژێر دەسەڵات و چاودێری پیاودا نەبێ ناتوانێ بەڕێوە بچێ. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو راستییەی کە دەڵێ: ژن توانایەکی ئەوتۆی نییە لەبواری ژیاندا و، کۆمەڵگای ئێمەش بە قووڵترین شێوە لە کەش و هەوای ئەم راستیەدا دەژی. بەڕادەیەك کە ژن لە توانایدا نییە بەبێ پرسی کەس و مێردەکەی تەنانەت لەماڵیش دەربچێت. بەشداریکردنی لەهەر چالاکیەك یان دانانی هەر نەخشە و پڕۆژەیەك

بەبێ چاودێری و پاراستنی پیاو کارێکی نەگونجاوە.

ئەمڕۆکە لە کۆمەڵگای بۆرژوازیدا ژن وەك هۆیەکی سەرەکی بۆ پڕوپاگەندەی دوور لەپەیوەندی سیاسی و بەرهەمهێنان بەکاردەهێنرێ. لەبواری مۆدە و سەماکردن و دیاردە فەنتازیەکانیشدا خاوەن دەسەلاتێکی بەربلاوە. لێرەدا تەنیا ئەم پرسیارانەمان بۆ دەردەکەوێ کە ژن لەم جیهانەدا خاوەنی چییە؟ چۆن بە ناشیرینترین شێوە دەچەوسێنرێتەوە. وەك بڵێی ئەرك رۆڵێکی نوێ بە ژن سپێردراوە! ئەو ئەرکەش لە ناوەندی کولتووری و رۆشنبیری هۆلیۆدی ئەمەریکا گەیشتۆتە ئەوپەڕی. ئەم رەوشەش بەباشترین شێوە لەسەر ژنی ئەمەریکایی بە تایبەتی و ژنی رۆژئاوایی بەگشتی سەپێنراوە و بەجۆرێکی ترسناك ژن دەچەوسێنرێتەوە.

ئەوەی گومانی تێدا نییە، پێشکەوتنی ئۆرگانی لە ژیانی ژندا لەئەنجامی گواستنەوە لە کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی بۆ کۆمەڵگای بۆرژوازی روویدا. بەلام لە کۆمەڵگای بۆرژوازیدا ئەم گۆڕانکارییە کەوتە ناو چوارچێوەی دەسەلاتی پیاو و لەگەڵ ئەو سەرکەوتنەش ژن لە پەڕینەوە و بڕینی سنووری واقیعی خۆی لەنێو هەلومەرجی خێزانی بۆرژوازی سەرنەکەوت. لەگەڵ نزیکبوونەوەی سەدەی بیستەم، پرۆلیتاریا بووە چینێکی سەربەخۆ، دوای ئەوەی کە چینێکی تازەی پێنەگەیشتووە بوو، بەلام ژن ئەو گۆڕانکارییەی بە خۆیەوە نەبینی کەچی گەلێك پێشکەوتنی بەهاتنی قۆناخی سەرمایەداری ـ ئیمپریالی بەخۆیەوە بینی.

ژن دووچاری زەوتکردنی کەسایەتیەکەی بوو، لەوانەیە هەست بە ئەنجامەکەی نەکەین، چونکە لەنێو گۆڕانکاریەکی شێواوی سەرمایەداری ترسناکدا دەژین و واقیعێکی کۆمەلایەتی وەهامان هەیە کە تاوەکو ئێستاکە پاشماوەی دەرەبەگایەتی کاری خۆی تێدا دەکات و تووشی ناشیرینترین شێوەکانی ئیمپریالیزم و چەوساندنەوە بوون. بەلام دەبێ ئەو راستیەش بزانین کە ئەو رۆڵەی ئەمڕۆکە ژن لە کۆمەڵگای پێشکەوتووی سەرمایەداریدا دەیبینێ، زۆر گرنگترە. چونکە لایەنە ئیمپریالیەکان دیاردەیەکی نوێ لەبواری رۆشنبیری و سیاسیدا پێشدەخەن.

ژن بوونەوەرێکە دووچاری تاریکی و ژیانێکی داخراو کراوە و لەناو کۆشك و تەلارەکاندا بەندکراوە، هەروەها لە زۆر جموجۆڵی کۆمەلایەتی دوورخراوەتەوە و لە ناو تاریکیەکی رۆحیدا نوقم کراوە و بەمجۆرە بوون و رۆحی خۆی بەتەواوی لەدەستداوە.

ئەوەی شیاوی باسە پیاوی نێو لایەنە پیشەسازییەکان و پیاوانی سیاسەتی سەرمایەداری ئەم راستیە باش دەزانن و هەوڵدەدەن ژنی لە کۆمەڵ دابڕاوی ژێر دەسەلاتی پیاو بشێوێنن و نموونەیەکی دروستکراوی وەهای لێ بهێننەدی تاوەکو خەباتی چینایەتی پێ دابپۆشن و بە شێوەیەکی تایبەتی بیچەوسێننەوە و، لە پێناو خزمەتکردنی ڕەوڕەوەی چەوساندنەوەی ئیمپریالی ژن بخەنە ناو چوارچێوەی گەمەیەکی ناشیرین و، رووبەرووی سۆسیالیزمی بکەنەوە و مافێکی زۆر کەمی سەردەمی ئازادییەکانی بۆرژوازیەتی پێبدەن.

چونکە ئەمڕۆکە ژن لە ئەوروپا لەبواری مۆسیقا و وێنەکێشان و رۆشنبیری و فرۆفێڵی سیاسەتدا بە توندترین و ووردترین شێوە دەچەوسێنرێتەوە. دوای ئەوەی کە سەدان ساڵ لە ژینگەیەکی داخراودا دەژیا، دەبینین ئەمڕۆکە لە دەوروبەرێکی کراوەی ئاشکرادا دەژی و، کەوتۆتە مەیدان و بازاڕەوە. ئایا بزووتنەوەیەکی "فێمینیستی" چۆن ئەم راستیە هەڵدەسەنگێنێ؟ ئێمە زۆری لێ نازانین، بەڵام لەو باوەڕەداین کە ناوەندەکانی ئەوروپای رۆژئاوا ئەم کاروبارە بەباشی دەزانن.

بەمجۆرە دەبینین ئەم هەڵوێستانە بوونەتە هۆی تێکشکانی بونیادی دەزگای خێزان و، ئەوەشیان دەرخستووە کە خێزان یەکەیەکی کۆمەڵایەتی چەندە بێ مانایە دوای ئەوەی کە خێزان لە ناو گومان و دوو دڵی و نیگەرانیدا دەژیا و تێیاندا نوقم بوو، رووبەرووی هەڵوەشاندنەوە و لەناوچوون بۆوە.

لەو کاتەی کە ئێمە ئەم بارەی ژیانی خێزان و ژن هەڵدەسەنگێنین، باشترە ئاماژە بۆ چارەسەرکردنەکەشی بکەین. وەك بڵێین دیاردەیەکی ئاساییە لە ناو قەیرانێکی گشتی ئیمپریالیدا. دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەو کاریگەرییەی رژێمی سەرمایەداری ئیمپریالی تەنیا لەسەر کۆمەڵگای نییە، بەڵکو خراپتر کار دەکاتە سەر کۆمەڵگای دواکەوتووی وەکو کۆمەڵگای ئێمە. لەوەش خراپتر رازی بوون بەو نموونەیەی ژیانی ژن و کۆمەڵ، یان رەتکردنەوەی، نابێتە چارەسەرییەك. هەندێ جاریش خۆی گەمە بە رەوشەکە دەکات و دەیەوێ تۆڵەی سەدان ساڵی ژیانی ناهەمواری خۆی بکاتەوە. وەك بڵێی ژن لە راستیدا دەیەوێ تۆڵە لە چەوسێنەرانی بستێنێ.

## ژن لە سایەی کۆماری تورکیادا

گەوهـەری سیسـتەمی دەسـەڵاتداری تـورك و گەشەسـەندنی، لەسـەر بنچـینەی دژایەتیکردنی گەل و کۆمەڵە. کاتێك لەمەڕ کێشەی ژن و خێزان ئـەم راستیە لەبەرچـاو دەگـرین، نـاتوانین رەچـاوی هـیچ هەڵوێسـتێکی راسـتی ئـەم رژێمـە بکـەین. رزگـاربوونی کۆمەڵی ژنان پابەندە بە رزگاری راستەقینەی کۆمەڵەوە، بـەڵام کاتێـك لـە سروشـتی ئـەم رژێمە و بەتـەواوی خۆخسـتنە نێـو فۆزاخـەی ئیمپریـالیزم وورد دەبینـەوە، ئـەوا بۆمـان دەردەکـەوێ کـە لـەپێناو هێشـتنەوەی رژێمـی فـەرمانڕەوایی بـۆرژوازی تـورك چاوپۆشـی لەبەکارهێنانی هیچ ئامرازێکی نامرۆڤانە ناکـەن. بـەگوێرەی ئـەم بویـەرە نـاتوانین هـیچ مامەڵەیـەکی راسـت لـە کێشـەی ژنـان بـەدی بکـەین، چـونکە نزیکبـوونێکی بـەمجۆرە سروشتی رژێمی تورکیا نیشاندەدات. وەکو ئاشـکرایە گرنگـی ئـەم کێشـەیە لـە تێـڕوانینی فەرمانڕەوایی تورك و بەرژەوەندیەکانیانەوە بایەخدارە، هەروەکو ئاشکرایە لەسـەردەمی عوسمـانی پـێش دامەزرانـدنی کۆمـاری تورکیـادا، فـەرمانڕەوایانی تـورك ژنیـان بـۆ بەرژەوەندی چینایەتیان بـەکارهێناوە و کردوویانەتـە ئامرازێـك بـۆ تێرکردنـی غـەریزە ئاژەڵیـەکانیان. ئـەم رەوشـە لـەدوای دامـەزرانـدنی کۆمـاریش هـەر بەردەوامـە. بـەکورتی دەتوانرێـت لەیەکچـونێك لـەنێوان سـەماگەی شـەوان و کۆشـکە کۆنەکانـدا ببیـنین. ئـەم رەوشــە نــەگۆڕاوە، تــەنها هەنــدێك نوێکــاری لــە رووکــاردا لەلایــەنی "کــەمالیزم"ەوە ئەنجامدراوە. بۆچوونی "مستەفا کەمال" لەسەر ژن و خێزان بـە هەنـدێك پێـوەر دیـاری دەکرێـت، کـە نـاو دەبـرێ بـە ژن وخێزانـی کۆمـاری و، ئەمـەش بریتییـە لـە لاسـایی کردنەوەیـەکی ئەوروپیـەکان لـە جـل و بـەرگ و رواڵەتـدا، کـە سـەرەنجام بـووە هـۆی تێکچڕژاوی و شێواویەکی زۆر. بێگومان ناتوانرێت بەراوردێکی بەمجۆرە نە لە زەمینـەی کۆمەڵایـەتی و نـە لـە پلـەی پەرەسـەندنی تورکیـا و ئـەوروپا بـە یـەك پێوانـە بکرێـت. ئەمەش بەڕوونی ناکۆکیەکانی لەگەڵ بویەری تورکیادا دەردەخات، کـە دەخـوازن بـە زۆر بیسەپێنن.

بـۆرژوازی لـە پێنـاو پاراسـتن و بـەردەوامکردنی سیستەمی فەرمانڕەواییـدا ژن و خێزان بەکاردەهێنێ و لەتورکیاشدا باشترین نموونەی دەبینرێ. هەر دەرفەتێکی هونەری و کولتووری تەنیا بۆ ئەو مەرامە دەرەخسێنرێ. ئەوانەی کە دەسەڵات دەگرنە دەست لـە لایـەك ژن دەخەنـە پاراسـتنی دەسـەڵاتدارییان و لەلایـەکیتر بۆمـەرامی غـەریزەکانیان بەکاریدەهێنن. ئەمەش شێوازی مامەڵەکردنیانە.

ڕەفتارەکانی ڕژێمی 12 ئەیلولی فاشیست لەم بارەوە لە کەس شاراوە نییە و، ئەوانەی لەسەر ئەم ڕێبازەن وەك ڕۆژی ڕووناك دیارن و شتێکی نوێیان لێ بەدیناکرێ. نوێنەرانی ڕژێم لە ڕێکخراو و یەکێتیەکانی ژن و....هتددا، بچوکترین دەرفەت و توانا ناخەنە خزمەتی ژیانێکی سەرفراز بۆ ژن و خێزان. لەبەرچاوانە کە لە ژێر دروشمی هاریکاری، چۆن و بە چ مەرامێك لە ژنان نزیك دەبنەوە. هەرچەندە یاسای شارستانی بۆ ژنی تورکی دارێژن و پڕوپاگەندەی بۆ بکەن، وەلێ تەنیا بەکردەوە ئەو یاسایانە جێبەجێ دەکەن کە دەکەونە خزمەتی ڕژێم و بەردەوامکردنی باڵادەستیان بۆ دەمێکی درێژتر.

کارێك کە ڕژێمی 12ی ئەیلول و نوێنەرانی بەجێیان گەیاندووە، پایەداری و شوێنی ژن بووە کە لەهەموو بوارێکدا دایان بەزاندوە و لەپێناو مانەوەی خۆیان هەر شێوازێکی نامرۆڤانەیان گرتۆتە بەر. بۆرژوازی ناتوانێ نزیکبوونێکی ڕاست و دروست لە ژن و دەزگای خێزان بکات کە یەکێکە لە گرنگترین زنجیرەی سیاسەتەکانی. لەهەر بوارێکدا مامەڵەی لەگەڵ ئەو کێشەیە تەنیا بۆ پاراستنی ڕژێمەکەیەتی، بۆ ئەوەی لە سەری نەبێتە مەترسیەك. لەم بوارەدا لە دژی هەر جۆرە مەترسیەك ژن. لەگەڵ سەرهەڵدان و پەرەسەندنی خەباتی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی کوردستان، دەوڵەتی فاشیستی داگیرکەر تەنها خاڵێکی لاوازیش نەما لە کۆمەڵگای کوردستاندا کە نەیخاتە خزمەتی سیاسەتی داگیرکاری بەتایبەتی لە ساڵانی سەرەتای لەدایکبوونی بزووتنەوەکەمان. ئەمە یەکێك بوو لە گرنگترین بازنەی ئامانجەکانی لەکوردستاندا و ئەویش بۆ تەگەرە خستنە پێش ڕێگەی لاوان بوو کە تەڤلی ریزەکانی تێکۆشانی ئێمە نەبن و مەبەستیان لەوەشدا هەبوو کە خواستی شۆڕشگێڕان بۆ هاتنە ریزی خەباتی ئێمە نەهێڵن و لە شوێنی ئەوە هانیان بدەن بۆ چوونە نێو ریزی شۆڕشی چەواشە. لەناو هەر بزووتنەوەیەکدا، ئەمە بازنەیەکی گرنگی پێوەلکانی جموجوڵە گێرەشێوێنیەکانیان بوو. سەرەڕای ئەوەی کە دەیانویست بیکەنە کۆسپێك لەبەردەم خەباتی چەکداری. لەلایەکی ترەوە بۆ لەناوبردنی بەرخودانی زیندان بەکاریان دەهێنا. ئەمە بازنەیەکی سەرەکی بوو لەزنجیرەی سیاسەتەکانی دوژمن. واتە هەڵوێستی ڕژێمی تورکیا لە بەرامبەر ژن و خێزان تەنیا لە پێناوی پاراستنی ڕژێم و بەردەوامبوونیدایە. ئەو سیاسەتە

بناخەی هەموو کردەوەکانیەتی کە مامەڵەی ئەم کێشەیە دەکات. لەبەر ئەم هۆیەیە کە هەلی ژیان وەکو مرۆڤێك دژوارە و ئازادی ژن لەئارادا نییە و ئەم کێشەیە بە بنچینە وەرناگیردرێت. بەڵکو ئەوەی بە بنچینە دادەنرێت بەرژەوەندی رژێم و پێداویستیەکانیەتی.

بۆ ناسینی کەمالیزم و ئەو خێزانەی دروستی کردوە ناچارین لە ژیانی "مستەفا کەمال"بکۆڵینەوە کە وەك رەنگێکی ژێرخانی کۆمەڵگای ئەمرۆمان بەخراپترین شێوە بەردەوامە. کاتێك بمانەوێ ئاورێك لە رابردووی ژنان بدەینەوە لەسایەی کۆماری تورکیا و بە تایبەتی ژن لە ژێر سایەی عوسمانیەکاندا، ئەوا بەزەقی جیاوازی نێوان کەسایەتی ژن و ئەو کەسایەتیەی کە لە کۆشکەکانی عوسمانیدا بەسەر ژندا سەپێنراوە دەبینین. هەروەها کەسایەتی ژن لە هەلومەرجی کۆیلایەتی وەکو مەڕ ومالات لەنێوان گەلان و نەتەوەی جیاوازدا ئاڵوگۆڕیان پێ دەکرا و، دەیان هێنان بۆ کۆشکی عوسمانیەکان کە لەجیهاندا ناوبانگی دەرکردووە وەك خزمەتکار و کەنیزەك و حەرەم، کاریان پێدەکرا. هەربۆیە لەئاستی جیهانیدا عوسمانیەکان لە هەر شوێنکیتر لەپێشترن. گومانی تێدا نییە کاتێك کۆماری تورکیا دامەزرا بە بەراورد لەگەڵ پەیوەندی دەرەبەگایەتی هەندێك پێشکەوتنی لە چەمکی ژنان بە شێوەیەکی گشتی خوڵقاند.

بۆ ناسینی چۆنیەتی ئەم پێشکەوتنە پێویستە لێکۆڵینەوە لەسەر ژیانی مستەفا کەمال بکەین، کە نموونەیەکی زۆرباشی بۆرژوای بچوکە. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا کۆمەڵگای تورکیا لە بارودۆخێکی ئەوتۆدا بوو کە هەموو شتێك سەروبن بوو کە بریتیە لە قۆناخی گۆڕانی کۆمەڵگا لە دەرەبەگایەتیەوە بۆ سەرمایەداری، کە قەیرانی لە سەرخانی کۆمەڵدا دروست کرد. ئەم رەوشە لە بواری ئەدەبیدا رەنگی دایەوە و لەگەڵ ئەوەشدا گۆڕانی بۆرژوازی لە هەموو ئاستێکدا کاریگەر بوو. هەرلایەنێکی بە تایبەتمەندیەکانی خۆی مۆر کرد و هەروەها لەسەر ژن و دەزگای خێزانیش رەنگی دایەوە. گۆڕانی دەرەبەگایەتی بۆ سەرمایەداری لەسەر بناخەیەکی شۆڕشگێڕی نەبوو، بەڵکو بە رەزامەندی لەگەڵ سوڵتان ئەم کارە ئەنجامدرا. ئاخۆ دەبێ ئەم گۆڕانە چ مانایەك بگەیەنێ، کاتێك لەسەر بناخەی شۆڕشگێڕی نەبووبێت و، لە پاڵ ئەمانەشدا کاریگەری دامودەزگا دەرەبەگیەکان زاڵ بوو؟ واتە لەهەر بابەتێکدا سازشکاری بووە لەگەڵ دەرەبەگایەتی کلاسیکی. بنچینەی گۆڕانی سەرمایەداریش بەم شێوەیەیە.

لەم حاڵەدا بۆ زیاتر روونکرنەوە پێویست دەکات کە لە پەیوەندی "عەبدولحەمید" و "اتحاد و ترقی" بکۆڵینەوە لەگەڵ ئامادەکاریان بۆ راوێژ لەگەڵ یەکتردا، لەلایەکیترەوە کە سەردەمی فەمانڕەوایی عەبدولحەمید نزیك دەبێتەوە و بەرەو سەرمایەداری هەنگاو دەنێ، کەچی هێشتا بنەمای سەرخانی دەرەبەگایەتی بە رەنگێکی بەرفراوان زاڵ بوو، کاتێ سوڵتان عەبدولحەمید بە "اتحاد و ترقی" دەگوت: ئەمانە نەوەی لادێی منن، لەلایەکی ترەوە کوتەکێکی لێ دەدان و دەیگوت: "ناتوانن دە ئاخافتن بکەن و لەسەر رای خۆتان بمێننەوە"، کاتێك رەوش بەمجۆرە بووە، ئەوا پەرەسەندنی سەرمایەداری لە بۆتەی کۆمەڵدا پتەو نەبوو و نەیانتوانی دەرەبەگایەتی بەتەواوەتی بنبڕ بکەن. بێگومان کاتێك پەرەسەندنی لەسەر بناخەی هەڵوەشاندنی رابردوو نەبێ ئەوا بێ دوودڵی لەگەڵ دەرەبەگایەتیدا پێکەوە دەژین.

## ژن و خێزان و کەمالیزم

ئەو دیاردەیەی کە بەشێوەیەکی گشتی بەسەر پێکهاتەی کۆمەڵاتیدا سەپێنراوە، رەنگدانەوە لەسەر دەزگای خێزانیش دەکات. هەرچەندە خێزانی بۆرژوازی پەرەبستێنێ ئەوا نایەتە ئەو واتایەی کە خێزانی فیوداڵیزم دەستبەداری تایبەتمەندییەکانی پێکهاتەی خۆی دەبێت. ئەگەر بێتو ئەم تایبەتمەندیانەی سەدەکانی ناوەڕاستی خێزانی دەرەبەگایەتی لێکنەدرێتەوە و بە پرۆسەیەکدا تێپەڕنەبێ کە تیایدا ئەو بنەمایانە ریشەکێش نەکرێن و سەرلەنوێ لەسەر رایەلەی نوێ دانەڕێژرێنەوە، ئەوا پەرەسەندن لەسەر بناخەیەکی سازشکاری نێوان پێکهاتەی کۆن و نوێ دروست ئەبێ. دروستبوونێکی بەمڕەنگە هەر لەسەرەتاوە ناکۆکە و ناتوانێ بنەمایەکی راست دابنێ.

مستەفا کەمال لە قۆناخێکی وەهادا بە بۆچوونی رادیکاڵیەوە دێتە کایەوە کە پەیوەندی لەگەڵ کۆشکی عوسمانیدا تێك چووبوو. لەڕووی خزمایەتی دەگاتەوە سەر بنەماڵەی کۆشك، لە بەرامبەریدا ئەنوەر پاشا هەبوو، کە خەریکی ژنهێنان بوو لە بنەماڵەی کۆشك، هەر لەو ماوەیەدا مستەفا کەمالیش لە بنەماڵەی کۆشکی عوسمانیەکاندا نیازی ژنهێنانی هەبوو، لەبەر ئەوەی ئەنوەر پاشا لەو لەپێشتر بوو، ئەم

داخوازییەی مستەفا کەمال مەیسەر نەدەبوو، هەروەها ئەنوەر پاشا خاوەنی کوشك و ناوبانگ بوو، جگە لە پلەی پاشایەتی کە ئەمەیان گرنگترە. ئەم دڵشکانەی مستەفا کەمال کاردانەوەیەکی توندی لا دروست کرد کە نەدەگەیشتە ئاواتی خۆی.

دوای ماوەیەك گلۆڵەی ئەنوەر پاشا دەکەوێتە لێژی و بەمەش هیوای مستەفا کەمال لەم بوارەدا بەهێز دەبێ، لەم سەردەمەدا مەسەلەی کۆماریبوون و سەرمایەداری لە حسابی عوسمانیەکاندا نەبوو، دەستەیەکی (اتحاد و ترقی) لەگەڵ کۆشکدا رێککەوتبوون و لە نیازی ئەواندا تەرحی مەسەلەی کۆمار لە ئارادا نەبوو، کە دەبووە هۆی زامدارکردنی هەستی سوڵتان. لێرەدا باس لە کۆماریکردن مانای دژایەتی کردنی بەرژەوەندی کۆشك دەگەیەنێت. بەکورتی خستنە بەر باس و لێکۆڵینەوەی ئەم بابەتانە ئەگەر لە بواری بیرکردنەوەشدا بێ شایانی پیادەکردن نەبوو. ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کە ئەنوەر پاشا دەیویست سەرلەنوێ پەیوەندی خۆی لەگەڵ کۆشك خۆش بکات و جێی خۆی بکاتەوە. چونکە سەرکەوتنی مەسەلەی زەماوەندی ئەنوەر پاشا بە دەست لێنەدانی هەر کارێك کە بە کۆشك زیانبەخشە پابەندبوون. ئەم مەسەلانە هەر لەسەرەتاوە لەلای مستەفا کەمال ئاشکرا بوو. کاتێك دەزانێ فەرمانڕەوایی عوسمانی لە ئارادا نامێنێ، سەری خۆی هەڵدەگرێ و تامردن خۆی لە سوڵتان دوور دەخاتەوە. وەك دەزانرێت لەو ساتە وەختەدا هێشتا نەوەی سوڵتانەکان شوێنێکی تایبەت و شکۆداریان هەبوو، بۆیە لە بەرامبەردا ئەتاتورك تێدەکۆشا بۆ گەشەپێدانی رەنگێکی نوێی ژن، کە لەوەی سوڵتانەکان شکۆدارتر بێ. لەبەر ئەمە سەرەتا هەوڵیدا خاتوونەکانی پێشووی کۆشك لەوێ دووربخاتەوە. ئەمەش دەبێتە هۆی دڵشکانی گەلێك لە دامەزرێنەرانی کۆمار کە بە سووکایەتی دەبینن دەرهەق بە ئاغاکانیان. تەنانەت هەندێك کەسی وەك "رەئوف ئیقبال" ئەم هەڵوێستە بە توندڕەوی دادەنێن و دەڵێن پێویستە بەوشێوەیە نەبێ. مستەفا کەمال سەرەڕای ئەو هەموو رکەبەرایەتیە، سەبارەت بە سازدانی خێزانی کۆماری لەسەر بۆچوونی رادیکاڵانەی خۆی بەردەوام بوو. چونکە لەلای سوور بوو کە هێدی هێدی کۆشك بەرەو نەمان دەچێ و لە شوێنی ئەو کۆماری تورکیا دروست دەبێ.

لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕشی رزگاری تورکیا، ئەتاتورك دەچێتە شاری ئیزمیر و چاوی بە کچێکی بۆرژوا کۆمپرادۆر کە ناوی "لەتیفە خانم" بوو دەکەوێت و ئارەزووی هاوسەرێتی لەنێوانیاندا دروست دەبێت. ئەو زەماوەندەش ناسراوە کە چۆن تراژیدیا و

کۆمیدیایەك بوو. ئەتاتورك لە قۆناخی رزگاری نەتەوەیی و پاش ئەم قۆناخەش چەندین کچی هەڵخەڵەتاندووە. ئەمەش بە بنچینەی نزیکبوون و هەڵسوکەوتی لەگەڵ ژن دادەنرێت. بەهیچ بەها و نرخێکی ژیانەوە پەیوەست نەبوو، هیچ پەیوەندیەکی کە شایانی رێز بێت لەگەڵ ژن و خێزاندا نەدەبەست، بەڵکو سەرتاپای ژیانی بە بەرەڵایی بەسەر دەبرد. لەم هەڵسوکەوتانەی ژیانی خۆیدا کولتوورێکی بەهێزی بۆرژوای کردبووە ئامانج. کەسایەتیەکی کەوتوو بوو کە ژنی تەنها بۆ سەماکردن لەسەر مێزی مەیخواردنەوەی بادەنۆشی بەکاردەهێنا. ژنی بەم رەفتارانە لەژێر ناوی ژیانی ئازاد رازی دەکرد، لەبەر ئەوەیە کە ئەو خێزانەی ئەتاتورك بناخەکەی دارشتووە بریتیە لە خێزانێکی پڕ لە ئاژاوە و بەرەڵایی و ئەنارشیستی بێ سنوور. تەنانەت ژنەکەی دەیویست بەردەوام لەسەری زاڵ بێ، چونکە وەك پرەنسیپ رۆژانە بێ نامووسی دەخستە مەیدان. ئەو پەیوەندیانەی کە ژنی کۆماری بەبناخەی دادەنێ، بەپێشکەوتنێکی تا دوارادە ساختەکارانە دەردەکەوێ. کاتێك پەیوەندی ئەتاتورك لەگەڵ "ئافەت ئینان" دەخەینە بەر لێکۆڵینەوە ئەو پەڕی بێ پرەنسیپی و رووکەشی بێ سنوورمان بەرچاو دەکەوێ. بۆ نموونە "کاتێك دەیەوێ ئاهەنگێك لە ئەنقەرە بۆ ئافەت ئینان سازبکات بۆئەوەی وتارێکی تیابخوێنێتەوە، کە هەموو دەزگا دپلۆماسیەکان و زانایان و رۆشنبیران تیایدا بەشداربوون، تەنها بۆ رازاندنەوەی کورسیەکەی خانم، بەشەوان و رۆژان ئامادەکاری بۆ سازدرا و لەپێناوی پیشاندانی بەرەنگێکی سەرسوورهێنەر، ئەتاتورك بۆخۆی لەسەر ئەو پرۆژەیە راوەستاوە و بۆ دارشتنی ئەمە ماوەیەکی درێژیش بیری کردۆتەوە. لە خەیاڵی خۆیدا وێنەکێشی بۆ کردووە و نوێترین مۆدیلی ئەو ساتەی بۆ سازکردووە و لەبەژن و دیمەنی ئافاتدا نەخشاندوویەتی کە کچێکی 22 ساڵان بوو. نیوەی لەبەرگی مامۆستا و نیوەی دیکەی لە بەرگی راهیبەدا رووپۆش کراوە و رازێنراوەتەوە بۆئەوەی کە زانایان لێی سەرسامبن". ئەمەش ئاماژە بە هەموو ووردەکاری و هەست و ئارەزووی ئەتاتورك دەکات، کە لە بنچینەدا نەیویستووە ژن ئازاد بێ یان ئاستی بەرزبێتەوە لەناو کۆمەڵدا.

ناوەرۆکی ئەم جۆرە کەسایەتیە لەم هەڵوێستانە ئاشکرا دەبێت، کە ژن و پیاو لەسەر مێزی شەو بادە و رابواردن وەك نیشانەیەکی پەیوەندی ژن و پیاوە لەسەردەمی کۆماریدا. مستەفا کەمال لە کاتێکدا سەردانی هەر شارێك دەکات لایەنێکی تری ئەم

کەتوویی و بێ ئابڕوویە دەردەخات کە لە کەسایەتی گەندەڵیدا بەرجەستەیە و، هیچ درێخی لە دابینکردنی غەریزەکانی خۆی نەکردووە و بە هەموو شێوەیەك لە سەر تاسەری وڵاتدا هەوڵی بڵاوکردنەوەی دەدا. سەرەنجامیش کەسایەتی بەمجۆرە هەرگیز ناتوانێ بەگیانێکی لێپرسراوی نزیکی کێشە کۆمەڵایەتیەکان ببێتەوە.

نزیکبوونی کەمالیزم لە کێشەی ژن و خێزان بە گوێرەی ژیانی مستەفا کەمال دارێژراوە، کە خۆی نموونەیەکی ئەم کەسایەتیە و، هەر لەگەڵ پێشکەوتنی رژێمی کۆماری ئەم لایەنە باشتر روون دەبێتەوە، کە شان بەشانی ئەم پێشکەوتنە کەسایەتی خێزانی بۆرژوا پێکدێت، بەتایبەتی خێزانی پیاوانی سووپا. نموونەی ئەم کەسایەتیە بەپڕاوپڕی کەسایەتی بۆرژوازیە. بە پێی پلەی دووەم خیزانی ئەفەسەرانی سوپا دێن. دوای ئەمانەش خێزانی بۆرژوای بچوك و بیرۆکراتەکان دێن. ئەم خێزانانە لەناو خۆیاندا بۆ گەیشتن بەم کەسایەتیە کەمالیستە پێشبڕکێ دەکەن.

بەڵام لەناوچە لادێیەکانی تورکیا بەگشتی و لەناوچەکانی کوردستان بەتایبەتی پەیوەندی دەرەبەگایەتی لەهەر ئاستێکدا زاڵە. ئەمجۆرە خێزانە زۆر توندوو چالاکانە خۆیان دەپارێزن و، هەموو کاتێك لەخزمەتی کەسایەتی دەرەبەگ دان. دەرەبەگ دەتوانێ زۆر بەئاسانی خۆی بگێنەیەنێتە کچ و ژنی جووتیاران لە دێهاتەکان و، هەروەها گرێدانی پیاو بە خێزانەکەیەوە لەم ناوچەنانە زۆر لاوازن.

لەڕاستیدا کۆمار بریتیە لە رووپۆشێکی مەدەنی لەچوارچێوەی یاسادا. لە کۆندا کەمتەرخەمی بارێکی گرانی لەسەر خێزان دروست دەکرد، کەچی لەڕاستیدا لێپرسراوی و رۆڵێکی گرنگی هەیە. لەم قۆناخەدا لەبەرامبەر خێزان و منداڵ و ژن گیانی بەرپرسیاری دروست دەبێ و، بەگوێرەی چەمکێکی بۆرژوازی، پەرەسەندنێکی بچووك لە بنکەدا دروست دەبێ کە تائێستاش لەیەك ئاراستەدایە و لەسەری دەڕوات. هەروەك چۆن لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمار و سەردەمی سەقامگیربوونی کۆماردا دەبینین بەهۆی پێشکەوتنی دامودەزگای سەرمایەداری دامودەزگای خێزانیش پێشکەوت، ئەگەرچی پێنەگەیشتووشە، وەلێ لە پەرەسەندن دایە، دامەزراوی خێزان هەرچەندە یەکسانی بەدەست نەهێناوە، بەڵام پەرەسەندنی بەردەوامە.

گۆڕانی پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان لە دەرەبەگایەتیەوە بۆ تاکە کەس، پێشکەوتنی خێزانی دووقۆڵی لەگەڵ خۆی هێناوە. واتە خێزانی شارستانی لەبواری

پەیوەندیەکانی کشتوکالیّ خۆی سەپاندوە و بنکەی سەرەکی نفوزی سەرمایەداری پێکهێناوە. ئەمەش زیاتر لەدێهاتەکانی تورکیا پەرەیسەندوە. بە دوورکەوتنەوەی خێزان لە پەیوەندیەکانی دەرەبەگایەتی کۆن، رێگا خۆش دەبێ بۆ دروستبوونی خێزان بەرەزامەندی ژن و پیاو. ئەوەی زیاتر لەسەر دروستبوونی ئەم جۆرە خێزانە بەکاریگەرە سەروەت و سامانە. سەرەڕای ئەمەش کەمێك لە رابردوو باشترە، چونکە بەدامەزراندنی خێزانی دوو قۆڵی تا رادەیەك لەپەیوەندی هەردوو لادا راستی بەدی دەکرێت و ئەمەش بواری ئەمە دەرەخسێنێ کە هەریەك خۆی بەرپرسار ببینێ ئەگەر لاوازیش بێ. لێرەدا پێویستە باس لە خێزانی ئەفسەران بگەین، کە زیاتر رەنگدانەوەی مستەفا کەمالیان تیا بەدیدەکرێ بەرادەی ئەوانی تر. ژن لەم خێزانانەدا نموونەی رەنگدانەوەی شێواز و کەسایەتی کەمالیزمە و، پێشکەوتنی ژن دەبێتە ئامرازێك بۆ دەرخستنی پێشکەوتنی ئەفسەران، بەلاَم لە راستیدا ئاستی رووکاری و سەرەڕۆیی ئەفسەران و خێزنەکانیان دەردەخات کە لەرادەبەدەر لە ژیانێکی کەوتوویدا دەژین. هەر کەسێك بەباشی سەیر بکات، ئەوا بۆی دەدەکەوێ کە پێکهاتنی خێزانی ئەفسەران و پەیوەندی ناو خێزانیان نوێنەرایەتی کەسایەتی کەمالیزم دەکات، هەروەها بەبێ ئەوەی پێشیبخەن یا زەمینەی بۆ ساز بکەن نوێنەرایەتی کولتووری سەربازی و ناکۆکیەکان دەکەن. ئاشکرایە کە ئەفسەران شوێن پێی بەد رەوشتی کەوتوون، کە ئەمەش رادەی کەوتوویی ئەوان نیشاندەدا. لەلایەکی تر دابڕانی سوپا و دوورکەوتنەوەیان لە گەل، سەرەڕای رەوشی لەخۆبایی بوونیان، رەنگدانەوەیان لە رووخسار و لە ناوەڕۆکدا بەهەمان شێوە لەسەر خێزانەکانیان دیار دەبێت. لە راستیدا ئەو ژیانەی کە بەسەری دەبەن بریتیە لە دوارادەی کەوتوویی و دوورکەوتنەوە لە کۆمەلّ، هەر ئەمەشە وادەکات کە ژن بچێتە شوێنی وەك گازینۆ و مەشروب خواردنەوە. ئەم جۆرە خێزانانە هەرگیز ناتوانن پەیوەندیان لەناو خێزان و کۆمەڵدا پتەو بکەن و ببنە یەك گیان و رێز لەبەها کۆمەڵاتیەکان بگرن و لەسەری هەڵسوکەوت بکەن. خۆیان وەها دادەنێن کە رۆشنبیر و پێشکەوتوون و کۆمەلگاش زۆر دواکەوتووە، ئەمەش راستی بارودۆخی ئەوانە. ئەم دیاردەیەش داب و نەریتی مستەفا کەمال و بەردەوامی رەفتار و شێوەی نزیکبوونەوەی لەخێزان دەردەبڕێ. ئەم داب و نەریتەش لەلایەك نوێنەراتی گەشەسەندنی سەربەستی

ژنی بۆرژوای بچووك دەكات، لەلایەكی دیكەش دوور كەوتنەوەی ژنە لە كەسایەتی و بویەری خۆی. ئەمەش سەرچاوەی خۆی لە پابەندبوونی بەو خێزانە و ئەو فەرمیەتەی كە مستەفا كەمال دایڕشتووە، دەگرێ. لەلایەكی تریشەوە بە ڕێگای ئەفسەران ئەمە لەسەر كۆمەڵگا دەسەپێنێ، كە هەر یەكێ ببێتە خاوەن خێزانێكی كامڵ و فەرمی، واتە بەپێی پێوەرەكانی كەمالیزم. بەم شێوەیە و لەسەر ئەم بناخەیە فوتابیانی پەیمانگای سەربازی لەسەر كێشەی خێزان و گەشەسەندنی پەروەردە دەكرێن. ڕێسایەك هەیە دەڵێ: هەر كەسێ لە خێزانێكی شایستە نەبێ ڕێگای دەرچوونی نادرێ لە پەیمانگە، هەروەها پلەی دەرچوونیشی بەپێی شایستە و فەرمیەتی ئەو دیاری دەكرێ. ئەم تایبەتمەندیانەش بۆ كولتووری ئەم خێزانانە گرنگن كە بوونەتە شوێنی سۆزانی شەوان، كە شایستەی فەرمانڕەوایانی كەمالیزمن.

ڕژێمی كۆماری كە لەسەر بناخەی كەسایەتی و ڕەوشتی عوسمانی سەقامگیر بووە، بەڕادەی تێپەڕكردنی پەیوەندیەكانی دەرەبەگایەتی لەم ڕێچكەیەدا بەهەمان رادە خێزانیش گۆڕانكاری بەخۆیەوە بینیوە. بەڵام لە نەخۆشییە هەرە زاڵەكانی خێزانی سەردەمی كۆماری، پاشماوەی كاریگەری كولتووری دەرەبەگایەتیە كە بەئاسانی بەرچاو دەكەوێ و ئەم بنەما نەخۆشیەی خێزان و ئەم شێوە نزیكبوونە كۆمەڵگا دەخاتە بوارێك كە ڕۆڵی ژن بەشێوەیەكی زۆر سامناك بەلاوەدەنێ. ئەم چەمكە وەها لەژن دەكات كە بەناچاری بكەوێتە ژێر كاریگەری ژیانێكی بێ ئابڕوویی و لەسەر مێزی خواردنەوەش بۆ كەیف و سەفا بەكاربهێنرێ. بەواتا دابڕینی ژن لە شێوەی دەرەبەگایەتی و رووپۆش كردنی بە فۆڕمێكی بۆرژوازی. ئەمە بوو كە لەدوای ڕاگەیاندنی كۆمار لەژێر پەردەی شۆڕش لە رووخساردا بەسەر ژندا سەپێنرا. ئەم دەستكاریە ساختەكارانەیە لەوە بەدواوە گەشەی پێدەدرێ و تەقەلایەكی باش كرا بۆ سەپاندنی هەموو ئەم تایبەتمەندیانە، هەر لەشێوەی ڕێگا ڕۆیشتنی بگرە تا دەگاتە شێواندنی دەم و چاو بەڕەنگێكی دەستكرد. ئەمە بویەری نزیكبوونی كەمالیزمە لە كێشەی ژن و كاركراوە بۆ سەپاندنی لەسەر هەموو ژنان، ئەو كەسایەتیەی مستەفا كەمال دروستی كردووە هەتا بڵێی دوورە لە ئازادی ژن و تەنها بریتیە لە كەسایەتی خانمی بۆرژوای بچووك، تا ڕادەیەك چاوی كراوەیە، بەڵام لە بنەڕەتدا كەسایەتیەكی پڕ لە ناكۆكیە.

بەڵام لە كورستاندا ئەمجۆرە مەسەلانە هێشتا جێگای قسە و باس نییە. ئەم

گۆڕانکاریانەی باسمان کردن لە قۆناخێکی سەرەتاییدان، دەخوازن کولتووری بۆرژوازی بە شێوەیەکی گشتی بەسەر کۆمەڵی ئێمەدا بسەپێنن و لە شوێنی ژن و خێزانی دەرەبەگایەتی کۆن، دەیانەوێ ئەم ڕێڕەوە زاڵ بکەن لە گۆڕانکاریەکاندا. بەڵام لە بویەری کۆمەڵگای ئێمەدا داب و نەریتی دەرەبەگایەتی و شێوەی ژنهێنانی کۆن هێشتا بەردەوامە، ئەو ژنەی کە هەڵی دەبژێرێ دەبێ خاتوون بێ، لە بنەماڵەیەکی خانەدان بێ. ئەم شێوەیەی ژنهێنان پێویستیەکی سەرەکیە لە کۆمەڵدا، کە بەسازکردنی ڕێکەوتنێکی دیاریکراو (ڕێککەوتنی دوو خێڵ یان دووعەشیرەت لەگەڵ یەکتر) یان بەرژەوەندیەکی سیاسی پێکدێت. ئا لێرەدا پێویستی ئەم ڕووداوە دەردەکەوێ، هەرچەندە ژمارەی ژنەکان زیاد بێ گرنگ نییە، چونکە ڕۆڵی سەرەکی و کاریگەر تەنها بۆ کێشەی سیاسی و پەیوەندیەکان دەمێنێتەوە. ئەگەر ڕەوشی سیاسی پێویست بکات ژنێکی دیکە بهێنێ ئەوا دواناخرێت. هەروەها شەریعەتی ئیسلامیش ڕێگا بەزیادکردنی ژمارەی ژنهێنان دەدات. دوای دروستبوونی کۆماری کەمالیزم و کولتوور و خوو و ڕەوشتی خۆی لەسەر کوردستان داپەساند. ئاغا و دەرەبەگەکان پێش هەر کەسێك خۆیان لەگەڵ ئەم کولتوورەدا گونجاند. دەرەبەگە کۆمپرادۆرەکان لەم بوارەدا پێشبڕکێیان دەکرد لە سەرلەنوێ کردنەوەی خۆیان لەژنهێنانی بۆرژوازیدا. بەڕێگای ئەمجۆرە ژنهێنانە، کولتووری بۆرژوازی لە کوردستان داهێنرا. بەمجۆرە پرۆسەی نوێی ژنهێنان و ئەمشێوازە ژیانە لەسەر واقیعی خێزانی کوردستان ڕەنگی دایەوە. سەرەتا ئەم پەرەسەندنە لە سەرخانەوە دەستیپێکردووە، بەڵام لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا پرۆسەی ژنهێنان وەك کاڵای کڕین و فرۆشتنە، کە بەمارەیی ناودەبرێت. گەورەی ماڵ هیچ پێویستی نابێنێ کە ڕای کوڕەکە یان کچەکە لە دەستنیشانکردنی هاوسەردا وەربگرێ. هەتا بڵێی هاوسەری دروستکردن هەر لە منداڵیەوە پێکدێت. بەمجۆرە پەیوەندیە دەگوترێ پەیوەندی شیری کە هیچ کاتێك لەبیر ناکرێ، هەروەها ژنهێنان لەتەمەنێکی گەورەتریشدا هەر بەهەمان شێوەیە، باوك ئەو کچە بۆ کوڕێکی هەڵدەبژێرێ کە خۆی گونجاوی دەبێنێت، هەروەها دایکی کچەکە لەسەر ئەو بڕە پارەیە ڕازی دەبێ کە خۆی گونجاوی دەبینێ بۆ فرۆشتن.

لەگەڵ هاتنی سەرمایەداری کۆلۆنیالی بۆ کوردستان ڕەنگی خێزان بەرەزامەندی هەر دوولا دەبێ، واتا کوڕ و کچ. پەیڕەوکردنی ئەمشێوەیە زۆر دەگمەنە کە تەنها لە

شارەکاندا باوە، بەڵام لە گوندەکاندا جیاوازە لەگەڵ شار، ئەویش لەبەر ئەم هۆیانە: موڵك و سامان، خزمایەتی، پایەی کۆمەڵایەتی و...هتد. لۆژیکی باوك کە لە شار و گوندەکان گشتیە و زاڵە، بریتیە لە هێزی ماددی و مەعنەوی توانست، کە لە کوێ هەبێت لەوێ دەتوانرێت لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت. ئەم پێوەرە فیۆداڵیانە تا ئێستاکەش لەسەر واقیعی کۆمەڵایەتیدا زاڵن.

## سەبارەت بە ژن و خێزان

مرۆڤ لە ناوەندێکی پڕ لەخیانەت و گێلی و نەفامی و بێ رەوشتی و فێلبازی و لادان، گەشەناکات و گەورە دەبێت لە منداڵییەوە بگرە تا بەساڵاچوون.

بەبێ مێشك و بەبێ هیچ سیستەمێك پەروەردە دەبێت، ئاژاوە هەموو شتێك و هەموو شوێنێك دادەپۆشێت، مرۆڤی ئێمە لەم ناوەندە مەزن دەبێت و چاو بە جیهان دەکاتەوە. بۆیە ئێمە زەحمەتی زۆر دەکێشین بۆ ئەوەی لەم واقیعە رزگاریان بکەین و بیانهێنینە سەر رێگای راست، لە پێناو پاراستنی شەرەف و ئابرو و سەربەستی و مروڤایەتی. بە ئاسانیش ناتوانین رایان کێشین و هاوکاریان بکەین تاوەکو ببنە خاوەن رەنجێکی دروست، بۆ ئەوەی ببنە واقیعێکی شۆڕشگێری بە باوەڕ و مافدار و داوەر، زەحمەتیەکی زۆرتر و قورستری دەوێت، ئەمەش بەئاسانی نابێت بەڵکو پێویستە لەسەرمان بە شێوەیەکی فراوانتر و باشتر بەدەستەوەی بگرین.

سەبارەت بە ئێوەش بەهەمان شێوە لەم ناوەندە گەشەتان کردووە و گەورە بوون، نازانن چۆن بە شێوەیەکی راست گرنگی بە ئارەزوو و غەریزە و بەرژەوەندیەکانتان بدەن، کاتێك دێنە لای ئێمەش دوو قسە نازانن و کۆسپ لە دوای کۆسپ دادەنێن و هەڵوێستی تەماوی نیشان دەدەن. چونکە لاواز و بێچارەن. ئەمە راستی ئەو واقیعەیە کە

تیایدا بەمشێوەیە گەورە بوون. هەربۆیە تا رادەیەك لەسەر ئێمە قورس دەبێت تاوەكو بتوانن لەم بارە دەرتان بهێنین لەپێناو نزیكبوونەوە لە ژیان بە شێوەیەكی دروست واتان لێ بكەین كە بەشداریكردنی شەڕتان هەبێ ئەمەش تەنگ و چەڵەمەیەكی ئاڵۆز دەكات، چونكە ئێوە زۆر دەگرین و زۆرسكاڵا دەكەن، دەردەكرێن. جاری واش هەیە تێكدەشكێن و دەڕوخێن و بەئاسانی خۆتان دەدەنە دەست پارتی یان دوژمن.

لەبەرامبەر واقیعدا دەبەزن چونكە شێوازی ململانێی نێوخۆتان لاوازە، ئەمە شتێكی هەڵەیە، ئێمە لەو باوەڕەداین ئێوە لە دواییدا دێنە سەر ڕێبازی راست و سەربەست و ئابڕومەندانەوە، بە هەموو شتێكی راست رازی دەبن و وەری دەگرن. بە مانایەكیتر دەڵێین: **یان بە ئاسانی لەناودەچن و دەسڕێنەوە یان دێنە سەر رێگای راست و لە سەری دەڕۆن لەوەش زیاتر رێگاچارە نییە. ئەمە واقیعە و هەلاتن لەدەستی نییە.**

بۆ كوێ دەڕۆن و بەهانەتان چییە؟ رێگای هەموو بەهانەیەك گیراوە. بۆیە دەبێ هەر شەڕ بكەن؛ بەبێ ئەملاو ئەولا و چەپ و راست لەپێناو كەرامەت. ئەگەر پێویستی كرد بەهێزترین شەڕ بكەن بۆ كردنەوەی ئەو رێیە، ئەگەر نا كەس بەزەیی پێتاندا نایەتەوە و پارچە نانێكیشتان نادەنێ، كەسیش رێزتان بۆ دانانێ و بەم شێوەیە دەمێننەوە. ئەگەر سەد ساڵیش بڕوات، پێی ناوێت خۆتان هەڵبخەڵەتێنن و بكەونە فێڵبازیەوە. خۆ هەڵخەڵەتاندن و گریان و ئازار بێ بەهایە و هیچ نرخێك ناهێنێ. پێویستە زوو هەستی پێبكەن و هەڵسن بە هەندێ كاری مرۆڤایەتی وەكو خەڵكانی تر. ئەو كاتە چاكترین كار لە پێناو خۆتان ئەنجام دەدەن. بەڵام پێویستە ئەمە لەبیر نەكەین كە ئەمە تەنها بەشەڕ بە دەست دەهێنرێت، ئەمە بۆ هەمووتان راستە، پێویست بەناز و شەرم یان توڕەبوون و هەراسانی ناكات. بەمشێوەیە نەبێت هەڵسوكەوتتان لەگەڵ ناكەن و پەسەند ناكرێن، بەهەڵەی تێمەگەن ئەگەر بەو شێوەیە بڕۆن كە باسمان كرد، دەتانخەینە ئەستۆ و هاوكاری رۆیشتنتان دەكەین و دەتانگرینە خۆ و چارەتان بۆ دادەنێن، بەڵام ئەوە نابێتە ئەوەی هەموو شتێ بەهەمان شێوە بڕوات لە هەموو قۆناخ و هەر تەنگەژەیەك.

سەیری رەوشی رابردووتان بكەن كە چۆن بە ئامادەیی لەبەردەم جەندرمەی دوژمن دەوەستان ئەوانیش جنێویان بە دایك و خوشكتان دەدا بەڵام ئێوە دەتانگوت؛

ئێوە قسەی باش دەکەن. هیچ شتێکتان دەرهەق بەوان پێنەدەکرا. ئەمە چ رەوشێکە؟ لەهەمووی سەیرتر ئەوەیە چەند بە خۆشی و چەند لە بارێکی سروشتی دا دەژین بێ ئەوەی خۆتان بشێوێنن و شەڕ و ئاشتی لێك جیا بکەنەوە لای ئێوە وەکو یەکن، لەگەڵ ئەوەش سەری خۆتان بەرز دەکەنەوە وەك بڵێی "خودان" ناتوانین تاڵە قژێکتان لێ بکەینەوە. راستیش لەم کارەساتە دەردەکەوێت کە کەسایەتی جارانتان نەیدەتوانی دوو بزن بەخێو بکات، ئەمڕۆ دەبینین دێنە گۆڕەپان و سەرۆکایەتی دەکەن. وەکو گورگ کاتێ هێرشی سەر بزن دەکات دەستتان بە خوێنە، چونکە گورگ هێرش بۆ سەر شوان ناکات، بەڵکو تەنها بە بزن دەوێرێت. ئێوە سەرۆکایەتی بە چ رەنگێك دەناسن، گومان ناکەم بەشێوەیەکیتر بیزانن. بۆیە پێویستە بە دار و ئاسن لەخۆتان بدەن، تاوەکو بتوانن بزنەکان رزگار بکەن. من شوان و شوانکاریم خۆش دەوێت، بەکۆنترین پیشە دادەنرێت، ئەوەش پلەیەکی مرۆڤایەتیە و زەحمەتیەکی زۆر دەبینین بۆ ئەوەی بیگەینێ بۆ ئەوەش پێویستە لە سەرمان هەوڵبدەین و بەردەوام بین لە هەوڵدان و گفتوگۆ و یەکتری پێش بخەین. لە رێی گفتوگۆوە بۆئەوەی بگەینە کەسایەتیەکی وەڵامدار بۆ پێویستیەکانی ئەم قۆناخە. ئەمەش باشترین کارە کە بکرێت، بۆ ئەوەی بتوانین بتانکەینە کەسایەتیەکی وەڵامدەر بە باشترین شێوە لەگەڵ قۆناخ. ئێمەش لە گەڵتان خەریك دەبین بەبێ ماندووبوون و بێزار بوون. ئێمە ئازایەتیمان نیشاندا، شەڕمان پەرەپێدا لەچەند ساڵێکدا. واتە ئێمە دەتوانین بگەینە ئەنجام. ئێمە هەتا ئێستا زیندووین و بە دڵنیاییش ئەنجام بە دەست دێنین. شەڕیشتان گۆڕەپانی مەردایەتیە و باشتریشی لێ دەکەین وەك ئەوەی پێشتر. هیوادارم ئێوەش هەروا بکەن و هەوڵ بدەن و شەڕ بکەن و بژین. من کە ئاماژە بەم بابەتانە دەکەم روونیان دەکەمەوە، چونکە ئەوانە بابەتێکن پێویستیان بە بیرکردنەوە هەیە. ئێوە خۆتان رزگار دەکەن. بە قاڵبێکی داڕێژراوی رژێمی دەسەڵاتدار لەبەر ئەوە زۆر شێوێنراون و دڵتان داخوازی مەزنبوون و سەروەری تێدا نییە. تاکو ئێستا کەسێك لە ئێوە دەرنەکەوتووە شایەنی ئەوە بێت گوێ لە قسەکانی رابگرین یان لەقسەکانیدا هەڵگری کاریگەری گۆڕان بێ، بەرەنگێك خۆی بسەپێنێ کەسانی تر ئامادەی بن گوێی لێ بگرن، دەنگتان وەك دەنگی مێشوولە وایە نەوەکو دەنگی (ئۆکێسترا) ئەوەم لە ئێوە تێبینی کردووە. ئەمەش تێڕوانینی منە لەسەرتان. نابێت وەك جووڵەی دەنگی مێشوولە لە ناو پارتی ببزوێن، بەڵکو دەبێ وەك جووڵەی دەنگی (ئۆکێسترا) ببزوێن.

چونکه پارتی به مانای یەکگرتن لەنێوان چەمك و ئاوازه. بۆ نموونه ئەوەشمان هێنایه زمان به هۆی ئەو هێرشانەی کە مێشووله لەم رۆژانه دەیکەنە سەرمان، هەمووتان وا دەزانن بەگوێرەی قسەکانتان دەگەنە ئەنجام (ئەوه لە مێژوودا وایکرد... ئەوەی تر وایکرد... من بیری بۆرژوازی بچووکم هەیه...و یان من تەڵەکەبازی گوندیم هەیە...) هەرچەندە هەندێك مشورین بەڵام هەر بەردەوامین هەتا هەبن ئەوانەی بڵێین دەمانەوێ شتێك بکەین باشترینیشیان جەنگ و شەڕه. دەبێ رۆژانە لەسەری ڕابوەستین و بژێنینەوه لەناو پارتیدا بەگیانێکی هەڤاڵ بەندی گەوره. لە بەرامبەر ئێمەدا لە کشانەوەدا نیین، بەڵکو بەردەوام لە هەوڵدانداین کە هەموو شێوازێکی نوێ تاقی دەکەینەوه. لە رێگای ئەندامی نوێوە هەر دەگەینە هەندێك بەرەو پێشچوونی مێژوویی. ئەوەی خۆی دەسەپێنێ ژیانێك بەردەوام بکەین زیاتر بە بەرهەم و بە سوود بێت ئەمەش چ بەقسە بێت یان بەکارکردن دواناکەوین، بەڵکو هەر شتێك بێتە پێشمان وەڵامی دەدەینەوه. کێ بە شێوەیەکی باش کار بکات و باوەڕیەکی زیاترمان بداتێ ئەوە لەلامان لا پەسندتره.

ئێستا شیربایی ژن لە 20 تا 30 ملیۆن لیرەی تورکی کەمتر نییە، من لەیادمە کاتێ لاوان لە رابردوودا دە ساڵ بەشێوەیەکی بەردەوام کاریان دەکرد بۆ گەیشتن بە خێزانێك و، لە کۆتایشدا یان پێی دەگەیشتن یان نا! بەڵام لەڕۆژی ئەمڕۆماندا رەوش گەلێك قورستر بووه بۆ ئەوەی تاکە کەسێك بتوانێ خێزانێك پێك بهێنێ ناچار دەبێ کە رەنجی بازووی بە هەرزانترین نرخ بفرۆشێ کە هێشتا هەرزە کاره و تەمەنی لەنێوان 15 ـ 25 ساڵیدایه، ئەمە هەمووی لە پێناو بنیادنانی خێزان و بەردەوام بوونێتی. کاتێ دەبێتە باوك و خاوەن منداڵ باری ژیانی ئاڵۆز دەبێ، چونکه پێویستی زیاتر بە پاره دەبێ.. ئا بەمرەنگە مرۆڤی کورد لە کەشێکی سەرسورهێنەر گەشەدەکات دیاردەی خێزاندا. من پراکتیزەکردنی خۆمم دێتە بیر کاتێ خەریکی هەڵسەنگاندنی ئەم مەسەلەیە دەبووم بەحوکمی ئەوەی یەکێکە لە مەسەلە بنچینەیی و چارەنووسیەکان، بەمشێوەیە مەسەلە پێشینیەکان لەلای من گەشەیان سەند. بەپێی ئەم کێشەیه، ئەوسا دەپرسم: کاتێك دایك و باوك دەبنە خاوەن منداڵ ئایا باش بیر لەمەسەلەکان دەکەنەوه؟ کاردانەوەی ئەم مەسەلەیەش بەشێوەیەکی لەیەکچوو پێشکەوت ئەمڕۆ ئێمەش دادگای

خۆمـان پـێش دەخـەین لـە بەرامبـەر مەترسـی خێـزان و ئـەو کاریگەریانـەی کـە ڕەنگدانـەوەیان لەسـەر ئێمـە دیـارە بـەپێی ئـەم بنەمایـە. هـەروەها لـەدژی ئـەم بەرەیـە شەڕێکی وام بەرپاکردووە هیچی کەمتر نییە لەو شەڕەی کە لە دژی دوژمن دەیکەین، بـە مەبەستی گەیشتن بە هەڵوێستێکی ڕاست. ئەم شەڕە لـەڕۆژی ئەمڕۆمانـدا لـەژێر سـایەی PKK پێشکەوتووە و گەیشتۆتە ئاستێك کە بەهەمان شێوە بەردەوامـە، چـونکە PKK هێشتا هەر ماوە. لەلایەکی ئەگەرچی شەڕێکی دژوار و توندووتیژە بـەڵام باوەڕناکـەم بـە بەردەوام نەکردنی بەمشێوەیە بتوانین یەك ملیم پێشبکەوین.

پێویسـتە لەسـەرمان چـەند خـاڵێکی تـریش ڕوون بکەینـەوە.. هـەر یـەکێ لادانـی زایەنـدی هـەبێ بـە دوو شـێوە لەسـەری دەردەکـەوێ و خـۆی دەردەخـات، یەکـەمیان: بەشێوازێکی خراپ بـۆ تێرکردنـی غـەریزەکانی. دووەمیـان: بەشـێوازێکی لادەرانـە (واتـە نائاسایی) بۆ پێکهێنانی خواست و ویستەکانی زایەنـدی. بـۆ نمونـە ئەمـە بەتایبـەتی لـە کۆمـەڵی ئێمـەدا دەردەکـەوێ و بـەدیاردەی بەشـوودانی کچـی تەمـەن بچـوك بـە پیـاوی بەساڵاچـوو. یـا لەبەرامبـەردا ئـەو هەڵوێسـتەی کـە دەردەکـەوێ وەك جووڵانـەوەی لـەناو بەرگی ڕێکوپێکی ئایینی، لێرەدا پیاو ئەم مەسەلەیە بە یـەکێك لـە (محرمـات) دادەنـێ و لێـی نزیـك دەبێتـەوە، بێگومـان ئەمـەش ڕەنگێکـە لـە هەڵوێسـتی لادەرانـە. خێزانـی پێشکەوتوو لـەم شـێوازەدا دەکەوێتـە ئـاڵۆزی وەها کـە دەرچوونی مەحاڵە و، پیـاو بـەو ڕادەیەی کە ناتوانێ غـەریزەکانی خـۆی پێـك بـێنێ گوشـار دەخاتـە سـەر خێـزان و ڕێسا دۆگماتیـەکانی ئـایینی لەسـەر دەسەپێنێ، کـە ئەمـەش وا لـەخێزان دەکـات بکەوێتـە نـاو ئـاڵۆزی و دژواری بـە کاریگـەری ئـەم هەڵوێسـتانە دەبێتـە ناوەنـدێك بـۆ دروسـتبوونی قەیران. ئا بەمشێوەیە دەتوانین لەسەر پەیوەندی ژن و پیاو و دەرەنجامەکەی ڕاوەستین، کاتێك پیاو دەڵێ: (خێزانێکی پاك و دروستم بنیاد نـاوە و لەسـەری حـاکمم...) و لێـرەدا ژن دەکەوێتە بارێکی ناهەموارتر لەپێشان، کە ئەو کـات لـەزەت و خۆشـی لێوەردەگرت و خۆی بەخاوەنی سەرتاپای دنیا دەزانی. کاتێ پەیوەنـدی ژن و پیـاو لەسـەر ئـەم بنەمایـە دروست، دەبێ ئەوا زەمینەیەکی لەبار و گونجاو دەرەخسێ بۆ دواکەوتوویی و پاشڤەڕۆیی و فاشیەت و داگیرکەری.

ژن بەشێوەیەکی گشتی لەجیهاندا دەبێتە پۆلیس و لەبواری سەربازیدا ڕۆڵی خـۆی دەبینێ بۆ هەڵگرتنی چەك (بەتایبەتی وەك لەناو ڕیزەکانی ئێمەدا کە بـەرەنگێکی بـاش

و بەرێژەیەکی گونجاو چەك بەکاردێنن) سەرباری ئەمانەش لەجیهاندا لەگەڵێك بواری تردا کار دەکات وەك سینەما و تەلەفیزیۆن بەمەبەستی بەد رەوشتی و بێ ئابڕوویی. بۆ نمونە لە وڵاتەکەماندا رووداوی فرۆشتنی ژن زۆر بڵاوە وەك لە ناوچەکانی " باتمان ــ ماردین...." تەنها بەمەش ناوەستن، بەڵکو دەیانەوێ بزووتنەوەی ئێمەش بخزێننە ناو ئەم رەوشە، لەلایەکی تر ئایین وەك چەکێك لەڕووی ئەو کەسانە بەکاردێنن کە تێڕوانینیان بۆ زایەند شتێکی حەرامە. ئێستا ئەمە لە رێگای (حزب الله) وە پەیڕەو دەکەن و بانگەشەی ئەوە دەکەن و دەڵێن PKK ئازادی تەواو بە خێزان دەبەخشێ کە ئەمەش گەورەترین هێرشە بۆ سەر بەها و شەریعەتە پیرۆزەکەمان. بەم چەمکەش هەڵدەکوتنە سەر ئێمە و هێرش دەکەن... لە لایەکی تریش ئەو دوو شێوەی کە لە سەرەوە باسمان کرد لە لادانی زایەندنی (الانحراف الجنسی) واتە (بەکارهێنانی بە شێوەیەکی نائاسایی) رۆڵێکی دوژمنکارانە دەبینن لە دژی شۆڕشگێڕی و رزگاری و نەتەوایەتی و دەبنە هۆکاری دەرخستنی خراپەکارییەکی زۆر کە وامان لێدەکەن بنگەی ئەمە شیبکەینەوە لە وێنەی ئەو لادانە و ئەوانەی راستەوخۆ پابەندن بە دوژمن، بە شێوەیەك کە دەرگا دەخەنە سەر پشت بۆ کاریگەریەکانی دوژمنەوە، هاوتەریب لەگەڵ ئەمە هەر یەکێ لە ژن و مێرد ئامادەیە سەد جار خۆی لە بازاڕ بفرۆشێ لەپێناو بەدەستخستنی خواردن و خواردنەوە بۆ منداڵەکانی. ئەگەر مەسەلەکە زیاتر روون بکەینەوە دەبینین کە کۆمەڵ بە جارێ نوقم بووە لە زەلکاوی نەزانی و نەبوونی خوێندن و فێرکردن، سەرباری زەحمەتی ناردنی منداڵان بۆ فێرگە. ئەوا دەبینین دایك و باوك ئامادەنین سەدجار خۆیان بتوێننەوە لەپێناو فێرکردنی منداڵەکانیان و رەوانە کردنیان بۆ قوتابخانە. باشە ئەو کەسانە چ دەکەن کە (دە تا بیست) منداڵیان هەیە؟ چۆن خۆیان رزگار دەکەن لە ژێر ئەم بارە گرانە؟!... ئەم رەوشە گرفتێکی بێ پایان دەخولقێنێ و دەبێتە مایەی دروستبوونی بارێکی کۆیلایەتی، بەوەی کە باوك ئامادەیە هەر شتێك بکات تەنها بۆ رزگار بوون و وەدەستهێنانی موچەیەك یا کارێك. ئەگەر نەیتوانی ئەم مەسەلەیە چارەسەر بکات، دەست دەکات بە شەڕ کردن و بەگژداچوونی کەسانی تر، تەنانەت ژن و منداڵەکانیشی دەفرۆشێ، دوای ئەمە کاتێ منداڵ دەبینێ ئارامی و ئاساییش لەماڵدا نەماوە دەکەوێتە جادە و کۆڵان و دەبێتە لومپەن. کچیش

لەم ڕەوشە ڕادەکات و بەڕەڵا دەبێت. بە مانایەکی تر: **دەتوانین دەرەنجامێکی گرنگ لەم مەسەلەیە دەربخەین ئەویش ئەوەیە کە خێزان یەکێکە لە فاکتەرە هەرە گرنگەکان بۆ دروستبوونی لومپەن.** لەگەڵ ئەوەی ژن و مێرد دژی خێزانی لومپەنن، کەچی دەبینین خێزان ناوەندی لومپەنیە.... بۆ نمونە کچ هیچ کاتێك ناخوازێ ڕا بکات، بەڵام چەمکی مەسەلەی خێزان ناچاری دەکا بەم کارە هەڵسێت. سەرباری ئەمەش دیسان دایك و باوك خێزانی خۆیان هەڵدەسەنگێنن و دەڵێن: خێزانی ئێمە لە ڕەوشتدا وێنەی نییە.

## شەڕی تایبەت

### ئەو بارە دەروونییە کۆمەڵایەتیەی کە خولقاندوویەتی و ڕەنگدانەوەی ئەم بارە لەسەر ڕۆڵەکانی گەل

باهەندێك سەرنج سەبارەت بەشەڕی تایبەتی تورك بخەمە ڕوو، چونکە ئەمجۆرە شەڕە زۆر تایبەتمەند و هەمەچەشنە ، لەم باسەدا ناوە ناوە هەندێك ڕوونکردنەوە پێشکەش دەکەم. جاری پێشوو لە ڕوونکردنەوەکانماندا لەڕووی دەروونییەوە باسی چڵ و پۆپی ئەم جەنگەمان کرد. شەڕی تایبەت ئەو بارە دەروونیەی لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە دەیخولقێنی شایەنی گوێ پێدانە، نەخوازە ئەو لایەنانەی تایەبەت بە کەسانن، چونکە ڕۆڵێکی گەورەی لە دورستکردنی کەساتی لاواز و خۆ بەدەستەوەدەردا گێڕاوە، ئەو شەڕە تەنیا بە تۆقاندن و تیرۆری ناو بەندیخانەکان نەوەستاوە، بەڵکو هەڵساوە بە بەکارهێنانی هەموو شێوازێك بۆ کەویکردنی کۆمەڵ و لەمپەرکردنی بە مەبەستی سەرچەماندن و چۆك پێدانانی گەلەکەمان بەهەمان جۆری چەوساندنەوە.

بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستە گلاوە یاری بە ڕەوشتی کۆمەڵ دەکرێت و پەرە بە تیرۆر دەدەن و، ئایین بۆ ئەم مەبەستە بە شێوێکی بەرفراوان و زۆر بێ شەرمانە دەکرێتە داردەست، هەمدیسان وەرزش بە چاکترین داردەست دادەنرێت بۆ خافڵاندنی کۆمەڵ، هەروەها ژن و خێزان زۆر بە بەفراوانی لەم پێناوەدا بەکارهێنراون. لە هەمووی گرنگتر ئابووری و گەمەکردن بە جەماوەر سەرکەوتووترین ئامرازە بۆ گەیشتن بە نیازە

گلاوەکانیان. بەڵێ ئەمانە هەمووی پێکەوە لەماوەی رابردوودا لەپێناو شەڕی تایبەتیدا بەکارهێنراون و، لەرۆژی ئەمرۆشماندا بەشێوەیەکی زۆر چڕوپڕ بەکاردێن کە بەهۆیەوە کۆمەڵگایەکی شپرزە و شێواویان پێکهێناوە. ئا بەم شێوەیە دەرگا داخرا، بۆ ئەوەی کەس نەتوانێ داوای سەربەستی و ماف بکات. دوایین جار ویستیان بە کودەتای 12 ئەیلول زیاتر شەڕی تایبەت چوست و چالاك بکەن بۆ بەرەنگار بوونەوەی PKK ، هەمووشی لە ژێر پەردەی ــ هەرێمی رەوشی نائاسایی ــ لە کوردستاندا ئەو رێباز و پەیڕەوەی دەوڵەت کە سوپای تورکی گرتوویانەتە بەر، زۆر لەوە دەچێت کە تیرە بەربەرەکانی پێشووی تورك گرتبوویان، کاتێ هووروژمیان بۆ ئەنادۆل هێنا، چاك دەزانرێت ئەو دڕندانە چ تاوانێکی فیزەونیان دەکرد لەتالانی و رەشبگێریدا لە رێگای ئەو تیپانەی پێکیان هێنابوو بەناوی "قوولەکان"ەوە. روویان لەهەر دەوڵەتێك بکردایە بیانخستایە ژێر کۆنترۆڵیان خۆیان، هەمان سیاسەتیان پیادە دەکرد. کردار و رەفتاری ئەمرۆشیان سەرچاوەی خۆی هەر لەو رەنگدانەوەیەیان دەگرێ کە لە مێژووی رەشیاندا پیادەیان کردووە.

فەرمانڕەوایی هەر دەوڵەتێکیان کردبێت بۆ بەرژەوەندی چینێکی تایبەت بووە، بە گەلێك فێڵ و تەڵەکەبازی توانیان دەسەڵاتی عەباسی و مەمالیك ـ کوڵەمەند ـ پاکتاو بکەن و هەموو تواناو هێزێکیان هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە تا ئەم رۆژگارە لەپێناوی ئۆپەراسیۆنی سەربازیدا بووە. ئەمەش هەر بەئامانجی زاڵبوونی بەردەوامیان بووە بەسەر ئیرادەی گەلاندا. هێزەکانیان لەدژی نەتەوەکانیتر لە گەلێك شەڕ و جەنگدا بەکارهێنا. هەر بۆ زیاتر مسۆگەر کردنی ئەم رێبازە هاتن رۆڵەی هەژار و رەش و رووتی گەلەکەیان و گەلانی تریشیان مەشق پێکرد بۆ بەدەست هێنانی هێزێکی سەربازی گەورە. دوای ئەوە هاتن تاجی پاشایانەیان کردە سەری پاشا و حوکمڕانەکان کە گوایە ئەمانە خاوەن سوپان. هەمیشە هۆشیان بەوە دادەمرکایەوە کە ئەو کەسەی کۆچەر بەرێوە دەبات ئەم رێگە، رێچکە و رێبازی بێت.

پێویستە ئێمە تایبەتمەندیەکانی جەنگ و ئەزموونی ئەوان باش تێبگەین، چونکە تاکو ئێستاش زۆرلامان زەحمەتە بتوانین گروپێکی بچووکی گەریلا بخەینە گەڕ و کاریان ئاسان بکەین هەرچەندە هەوڵەکانمان بەردەوامە. کەچی هێشتا شەڕی گەریلایمان لاوازە،

تایبەتمەندی جەنگ لای تورك و چینی فەرمانرەوای تورك لەوپەڕی گۆڕانی سروشتی دایە، کەچی لای گەلی تورکی رەش و رووت هێشتا دواکەوتوو و لاوازە، لای گەلی کوردستانیش یەکجار بێ گیان و لاوازە.

دەبێ ئەم مەسەلەیە وەکو بابەتێك سەیر بکەین لەبابەتەکانی شەڕی تایبەت. هێزی جەنگی ئێوە زۆر لاوازە، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ بنەمایەکی مێژووی و زەمینەیەك کە لەدێر زەمانەوە ئامادەکراوە. کاتێ دەستمان دایە کێشەکانی جەنگ، لە بنچینەی مێژوویی ئەم جەنگەمان کۆڵیەوە و گرنگیەکی زۆرمان پێدا بۆ ناسینی سروشتی لەشکری دوژمن و ئەو شێوازانەی کە دەیگرێتە بەر. هەروەها توێژینەوەیەکی قووڵمان سەبارەت بە خودی خۆمان کرد بۆ ئەوەی کەسایەتی خۆمان بەووردی بناسین. هۆی سەرەکی ژێردەستەبوونی ئێمە دەگەرێتەوە بۆ داگیرکاری تورکان، هەروەها مێژووی شەڕیان بریتیە لەمێژووی ژێردەستە کردن و ملکەچ کردنمان. ئەمەیان تەنیا لە بەرەکانی شەڕدا بەدەست نەهێناوە، چونکە تایبەتمەندی بنەڕەتی داگیرکەری تورك تەنها بە شێوازی شەڕی سوپای رێکوپێك سنوور نادرێ. هەربۆیە کاتێك بە خوێندنەوەی دروستبوونی چینایەتیاندا شۆردەبینەوە کە درێژکراوەی خێڵەکانی ئاسیای ناوەڕاستن و، لەدوا قۆناخی بەربەریدابوون. لە راستیدا دەبینین کە ئەمانە زۆر نامۆبوون بەم ناوچەی ئێمە. کاتێك دەکەونە قۆناخی دورستبوون (چینایەتی) دەبینین سەرۆك خێڵەکان دەست دەکەن بەکۆیلەکردنی دوولایەن، لەلایەك هەڵسان بە دەستەمۆکردنی ئەو جوتیارانەی کە لەگەڵیان هاورەگەز بوون، هاوخوێن بوون، لەلایەکی ترەوە هەڵسان بە ژێردەستەکردنی ئەو جوتیارانەی خەڵکی ناوچە بوون و لەوان نەبوون.

ئەم رێچکە و رێبازە پێویستی بەهێزێکی سەربازی گەورە هەبوو بۆ زەوتکردنی نیشتمانی گەلانی تر. بەمجۆرە هەموو شێوەیەکی تیرۆریان بەکارهێنا لەهەموو بوارێکی رامیاری، ئابووری، کۆمەلاتی و سەربازی بۆ گەیشتن بە ئاوات و نیازی گلاویان. ئەمە ئەو یاسایەیە کە تورك دایهێناوە و ئێستاش بەرامبەربە گەلی کورد درێژەی هەیە.

وەك بزانم تێروانێنێك هەیە بەناوی - یاساکانی کوردان - ئەم یاسایە لەگەڵ سەرەتای شالاوی داگیرکەران پەیڕەو بوو، لە ئاسیای ناوینەوە بۆ هەرێمەکە لە ئێران، ئێراق و ئەنادۆڵەوە بێ بەزەییانە هەموو کارێکی تیرۆری و بەدڵڕەقی و هۆڤانە ئەنجام دەدا.

چینی فەرمانڕەوای تورك گەلێك لایەنی ئیمپراتۆری دەرەبەگایەتی خستە خزمەت خۆی و دواییش خزانە ناو دەوڵەتی عەباسی و لە ریزەکانی دەوڵەت و سوپادا بەرپرسیارێتی بەرزیان گرتە دەست. کاتێك زانیان دەوڵەتی عەباسی ڕەوە و هەرەس دەچێت، بەپەلە پۆستی بەرزیان خستە دەستی خۆیان و جاڕی فەرمانڕەواییاندا. ئەوەی جێگای سەرەنجە ملیتاریزمی تورکی هەرگیز بەلای ژیاریەوە نارِوات و بەهیچ ڕەنگێك پەیوەندی بە شارستانیەوە نەبووە، بەڵکو تا بڵێی کۆنەپەرستە. لە کاتێکدا لەگەڵ توێژێکدا یان لەگەڵ زانایاندا هێزێکی بەرێوەبەرایەتیان پێکەوە بنیاد دەنا، لەبنەڕەتدا هەمیشە سروشتی سەربازی بەسەر هێزو سیاسەتەکاندا زاڵ بووە و هەتا ئێستاش هەمان شێواز پەیرەو دەکەن. بەکورتی ئەوەی کە سیمای بنەڕەتی تورکانە، ملکەچ کردن، چەوساندنەوە و پابەندنەبوونە بەهیچ یاساو رێسایەك. بۆچی؟ چونکە نموونەی پێکهاتەیان هەمیشە رووەو هەرەس هێنانە.

ئەم سیستەمە دواکەوتووەی تورك لەگەڵ هاوچەرخیدا ناگونجێت، هەمیشە بەزەبر و زۆر دەیەوێت پارێزگاری لەخۆی بکات و خۆی لەو وڵاتانەدا بهێڵێتەوە کە داگیریکردوون، ئەمەش تاکە شێوازی خۆپاراستنیانە. چینی فەرمانڕەوای تورك، بۆ کۆنترۆڵکردن و راگرتنی سیاسەتی خۆی هەمیشە پشتی بەسوپا بەستووە، بەبێ گوێدانە بنەمای ئابووری کۆمەڵایەتی، کە رێگە خۆشکرابێت بۆ گۆڕانی کولتوور و رووناکبیری وگەشەپێدانیان، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەمیشە بنەمای رووناکبیریان خاپورکردووە، هەمووشی خراوەتە ژێر بەرژەوەندی جەنگەوە. ئەم تایبەتمەندیانەش پێناسنامەی کەسایەتی ئەم چینانەن.

بۆ ئەوەی ئێستا لەخۆمان تێبگەین پێویستە ئەم راستیانە بزانین، کە بۆتە هۆی دامرکانەوەی گیانی بەرگری بەم رادەیە تائەمرۆمان، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ دورکەوتنەوەتان لەراستی، بە تایبەتی ململانێی سیاسی ــ سەربازی و بێ تواناییتان لەتێپەرکردنی ئەم رەوشە نیگەرانە و کاریگەرییانە، ئەوەش بزانن کە هەر ئێوە وا نین بەڵکو گەلی تورکیش بەهەمان شێوەیە. گەلی تورك زیاتر لەهەموو گەلێکیتر بەرێرەوێکی کەوتووییدا دەروات، بەبێ ئەوەی دژی چینی دەسەڵاتدار هیچ بەرگرییەك بکات. باوەڕ ناکەم هیچ گەلێك هەبێ لەم جیهانەدا وەك گەلی تورك ئەوەندەی کاسەلیسێ

چینی دەسەلاتدار بووبێ. بێگومان بەمەبەستی سوکایەتی پێکردنیان ئەم قسەیە ناکەم، چونکە ئەو تیرۆرەی ئەم چینە پیادەی دەکەن، لەجیهاندا بێ وینە و بەدرێژایی میژوو تاوەکو رۆژگاری ئەمرۆمان بەردەوامە. بۆ نموونە دەمیرێل وەك سیاسەتمەدارێکی لێهاتوو دەڵێت "زۆر سەیرە ئەم گەلە ـ واتە گولی تورك ـ بەم رادەیە دژی دیموکراسییە و راناپەرێت دژ بەچەوساندنەوەی ئابووری" بەرێز دەمیرێل ئا بەم تێروانینە ساکارە دەمانخاتە بەردەم پێوەرێك کە دژ بەهەموو پێوەرێکی هاوچەرخە. ئەمەش بەو مانایەدێت کە تەنانەت دەمراستی ئەم چینەش لە لای سەیرە کە ئەم بارودۆخە بۆ وەهایە.

با پرسیارێك بکەین و بڵێین بۆچی لە تورکیادا دیموکراسی نیە؟ گوزەراندنی نادیموکراسی گەیشتۆتە پلەیەك کە مێشکی مرۆڤ ژێر پەزیری ناکات، ئەمەش تەنها بۆ ئەنجامی رژێمی 12 ئەیلول ناگەرێتەوە و بەس، چونکە ئەم رژێمە هی دەمێکی مێژوویی دیاریکراوە، سەرکوتکردنی جەماوەر و ملکەچ پێکردنی کۆیلە بەدەستی ئەم رژێمە نییە، بەڵکو ئەمە بناخەیەکی قووڵی مێژوویی هەیە. چینی سەردەست یەکجار هۆڤ و کۆنەپەرستە و هیچی نەداوە بە گەل، هەموو شتێك هەر بەهێز و ملهوری وەردەگرێت و هەمیشە ئیشی زەبروزەنگە و بەس.

وەك پێش ئێستا لە مێژووی ئاییندا باسمان کرد، کە ئایین لەلایەن گەلێك رژێمەوە بەمەبەستی کۆنەپەرستانە بەکار دەهێنرێت، هەروەکو چۆن عوسمانیەکان ئایینی ئیسلامیان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بەکارهێنا. هەروەها لەرۆژی ئەمرۆشماندا رۆژئاوا و ئیمپریالیزمیش هەڵدەستن بەپیادەکردنی ئایینی مەسیحی بە مەبەستی کۆنەپەرستانەی خۆیان. سەرەرای ئەوەی پەیمانی ناتۆ کۆتایی پێهاتووە وەك سەربازگەیەکی کۆنەپەرست، کەچی دەبینین نوێنەرانی تورك بۆ سەلماندنی کۆنەپەرستییان بە هەموو توانای خۆیان تێدەکۆشن بۆ بەردەوامبوونی پەیمانی ناتۆ و دەڵێن:"پێویستە ـ ناتۆ ـ هەر بەردەوام بێت" بەمجۆرە ململانێیەکی بێ هودە دەکەن و نایانەوێ دەستبەداری ئەم پەیمانەببن.

بەمجۆرەش چینی فەرمانرەوای تورك دەیانەوێ هەر تەنیا بەهێز ئەو رژێمەی کە کۆن بووە بیهێڵنەوە و هەوڵی تایبەتی بۆ بدەن. سوپا و گەل پێکەوە هەمیشە خۆیان داوەتە دەست رەوشی نائاسایی وەکو بڵێی زۆر ئاساییە. تواندنەوەی گەوهەر و کەسایەتی

نـەك هـەر لای خەڵكـە سـادەكەییە، بـەڵكو لـەناو ئـەو چینەشـدا، كـە جڵـەوی سـوپای بەدەستەوەیە و خاوەن دەسەڵاتە زەق و لەبەر چاوە.

ئەمانە هەرچەندە خۆیان بەگەورە بزانن، هەر بێ گەوهـەر و بـێ نـرخن تـا كـاری بەرهەمهێنان و ئابووری پێشبخەن. هیـچ توانایەكیشـیان نیـە تـا ببینـە هـۆی گۆڕانكـاری لـەبواری كۆمەڵایـەتی و روناكبیریـدا. لـەبواری رامیاریشـدا ئەمـە حاڵیانـە، تاكـە پـەناو داردەسـتیان هـەر سـوپایە، تـاوای لێهـاتوە بۆتـە وێـردی سـەرزمانی هـەموو خـەڵكیش. ئەوەنـدەیان فـوو كردۆتـە سـوپا، پیشـەی سـەربازی و رۆڵـی فەرمانـدە و ئەفسـەرەكانیان بەرادەیەك گەورە كردووە، وەكو بڵێی لەو پیرۆزتر نەبێت. تا وای لێهاتووە بۆتـە بـارێكی گران، لەسەر شانی بنەمای كۆمەڵایەتی ئابووری.

ئـەو كودەتـا و كردەوانـەی كـە لـەم دواییـەدا لێیـان وەشـاوەتەوە، بناخەكـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ ـ اتحـاد و ترقـی ـ ئەمـەش هۆیـەكی سـەرەكیە كـە نـاهێڵێ لەدەوڵـەتی توركیادا دیموكراسـی پەرەبسـێنێ و بـاری ئابوریشـی لـە پـەلوپۆ خسـتووە. بـەكورتی ئـەم رەفتارانەی كە رێگەیان لە دیموكراسـی گرتـووە، كۆمـەڵگا بەهۆیـەوە بـووە بـە بیابـانێكی كاكی بە كاكی.

ئەگەر ئابووری و پێداویستیەكانی بەرەو پێش نەبرێت ئەوا رێگە خـۆش نـابێ بـۆ گەشەكردنی كەسایەتی رۆشنبیری و كۆمەڵایەتی و، هەر بەلاوازی دەیهێڵێتەوە. لە بـواری رامیاریشدا بەربەست دەبێ، نەك هەر لەپەیدابوونی هێزێك بۆ چینەكانی گەل، بەڵكو بۆ چینی فـەرمانڕەواش. كـارێكی وا ئـەنجام دەدات كـە نابێتـە هـۆی هێنانەكایـەی پـارتێكی سیاسی بەهێز، چونكە بەرژەوەندییـە خـود و تەسـكەكان پـارێزراو دەبـێ و كـار هـەر بـۆ ئەمـە دەكـرێ. ئـا بـەم شـێوازە لاواز و بـێ بنەمایـە، گەیشـتوونەتە چـەمك و روخسـاری دەوڵەت و حوكمڕانی .

بێگومـان دەتـوانین زیـاتر لەمێـژووی رژێمـی تـورك بكۆڵینـەوە و، گـەلێك لایـەنی هەڵسەنگێنین، پێشتریش لەم بارەیەوە گـەلێك روونكردنـەوەمان ئەنجامـداوە. بـەكورتی باسـی ئـەو تـیرە شـەڕنگێزە هۆڤانـەم كـرد، كـە هـاتن كوردسـتان و ئـەنادۆڵیان داگیركـرد، ئەمانـە بنـەمای گـەلیان تێـدا نـەبوو. جـا بـۆ ئـەوەی بتـوانن بەدڵنیاییـەوە بـژین، بـە پەرۆشەوە رێگـەی داگیركـردن و ڤـەبوونی هۆڤانـەیان گرتەبـەر، ئـا بـەم رێگەیـە توانیـان

بەخێراییەکی سەر سورهێنەر بگەنە دەروازەی ـ ڤییەننا ـ.

ئەگەر ئێوە لەڕووی هزریەوە خۆتان گورج و گۆڵ بکەنەوە و، لە مێژوو قووڵ ببنەوە، تێدەگەن کە ئەم تیرانە تەنیا ماڵ و موڵکیان داگیر نەکردووە، بەڵکو مرۆڤیشیان داگیر کردووە. لاپەڕەکانی مێژووی مرۆڤایەتی ئەمانەمان بەئاشکرایی بۆ دەگێڕێتەوە. کاتێك دەسەڵاتیان بەسەر کۆمەڵگایەکدا پەیدا دەکرد خەڵکەکەیان دەگرت، هەر کەسێك کەمترین بەرگری بکردایە بەوپەڕی دڵ رەقیەوە لەناویان دەبرد. منداڵەکانیشان دەست بەسەردەکرد و دەیان بردن بۆ جێگەی تایبەتی ئامادەکراوی لای خۆیان بۆ ئەوەی بیانکەن بە کۆیلە. بەمەشەوە نەدەوەستان بەڵکو رێگەی وایان دەگرتەبەر کە پەتی هەموو داب و نەریتێکی دەپچڕاند. تەنانەت بەشێوەکی هۆڤانە ژنیان بەکاردەهێنا کە نموونەی نەبێت. با نموونەیەکتان بۆ بێنەمەوە؛ کاتێ: سولتان (مەحەمەد)ی فاتح لە ژێر پەردەی ئیسلامدا ئەستەمبۆڵی داگیرکرد، بە سوپاکەی گوت "ئەبێ ئێوە لە ماوەی سێ رۆژدا ئەستنبۆڵ تالان بکەن". دوای ئەوە سوپا هوروژمی هێنا و ئەستەمبۆڵی گرت و تالانی کرد، بەجۆرێك کە لە هەموو مێژوودا وێنەی نەبێت.

خۆ ئەگەر کردار و رەفتاری ناشرینیان لێکبدەیتەوە، ئەوا هەر شتێك نرخی هەبووایە تالانیان دەکرد، تەنانەت کەلوپەلی پەرستگاکانیش، کچی ماڵە گەورەکان و خێزانە ناسراوەکانیان لای خۆیان دەهێشتەوە بە مەبەستی تێرکردنی ئارەزووی ئاژەڵییان. دەیانبردنە کۆشك و تەلارەکان بە مەبەستی مارەکردنیان. کارێکی وەهایان بەو کیژۆڵە ناسکانە دەکرد کە زۆر دوورە لە ئەقڵی مرۆڤ!!.

ئایا ئیسلام یان هەر ئایینێکی دیکە ئەمە پەسند دەکات؟! ناوەرۆکی ئیسلام لای عەرەب هەندێك لایەنی هەڵکشاو ـ ئیجابی ـ ی تێدا هەیە، هەندێك لایەنی دادوەرە و لەسەر بناخەی دادوەرەیە. بەڵام ئیسلامێتی لای تورك بناخەکەی کفر و گومڕاییە. هەر ماڵە و پربوو لە کچۆڵە و خێزان و ژنانی پاشا و سولتانەکان، بە شێوەیەك کە پیاو ڤیزی لێدەکردەوە. گوایە بەو پێیەی ئەمانە شازادەن و بەبنەچە ئارستۆکراتین. زۆر سەیرە! ئەی داخۆ دەبێ چیان بەخەڵکی تر کردبێ؟ ئێوە خۆتان بیری لێبکەنەوە!! ئەوکاتە دەگەنە راستی.

بەهۆی چەند پابەستێکەوە لەکوردستاندا ئەم سیاسەتەیان پیادە نەکرد. ئەوەی جێگای باسە بەهۆی چەند رێکەوتننامەیەکەوە بوو، هەر چەندە ئێستا وەك لایەنێکی

شەڕی تایبەتی لە کوردستاندا ئەم سیاسەتە پیادە دەکەن، بەلام لەو کاتەدا کوردەکان کە سەوداو مامەڵەیان لەگەڵ تورکدا بوو، بۆ مەبەستی بەرژەوەندی خۆ بەخۆ هەندێك بویان هاتنە خوارەوە، بۆ نموونە نەهاتن دەست درێژ بکەنە سەر خێزان. هەتا ئەمڕۆش ئەم سەوداو مامەڵەیە لەگەڵ کوردان وەك خۆی ماوە.

کاتێك خۆیان بە ئەستەنبۆڵدا کرد. تالان و بڕۆیان گەیشتە ئەو پەڕی، هەروەها ولاتەکانی بالکانیش بەهەمان شێوە. بەلام لە کوردستان و ئێران و ولاتە عەرەبیەکان ئەم بەزمەیان کەمێك هێورتر بوو، چونکە ئەم ناوچەیە ناچەیەکی ستراتیژی بوو بۆیان. هاتن و چەند میرنشینێکیان ڕێگە پێدا. ئەگەر ڕێبازی ئەم میرنشینانە لێکبدەینەوە، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە مێژووی سەودا و دەست تێکەڵکردنی چینە سەردەستەکانی کورد لەگەڵ تورکەکان وێنەیەکی ئاشکرای کوردی وابەستەمان بۆ دەردەخات. وای لێهاتبوو کە ئەم میرنشینانە ئەوەندە پابەند و پەیوەستبن بە دەوڵەتەوە کە دەوڵەت ئەوەندە تەباو پێکەوە بەستراو نەبوو.

باری ئێستای کورد هێشتا ئەم کلکە لەقییەی پێوە دیارە، ئەوەی مەبەستمانە بیڵێین ئەوەیە کە نابێ تەنها ناوی ڕژێمی ـ شەڕی تایبەتی ـ تورك ببەین بەبێ ئەوەی بە وردی و تێرامانێکی زۆر، هۆڤێتی و بەربەرێتی ئەم ڕژێمە ڕوون نەکەینەوە.

دەوڵەتی تورك ئەگەر ئەمڕۆ هەڤاڵێکی ئێمە لەگۆرەپانی جەنگدا شەهید بکەن و تەرمەکەی بکەوێتە دەستیان، ئەوا یاری بەتەرمەکەی دەکەن و دەیشێوێنن. بەپێی ئەو هەواڵانەی پێمان گەیشتوون بزمار دادەکوتن بەسەریان و لە بەردەم گەل سوکایەتیان پێدەکەن، یا لە فڕۆکە تەرمەکانیان فڕێدەدەنە خوارەوە، یان بە پشتی گالیسکەوە دەیانبەستنەوە و ڕایاندەکێشن، یان ئۆتۆمۆبیل بەسەر تەرمەکانیاندا دەبەن تا دەبنە هەویرێك لەگۆشت و خوێن. ئامانجیشی لەم کردارە دڕندە و بێ ڕەوشتانەی تۆقاندنی گەلە، بەمەبەستی دوور خستنەوەیانە لەخەبات. ئەم کردارە ناشیرنانەی نە تەنها هی ئێستایانە، بەڵکو هەموو حکومەتە یەك لەدوای یەکەکان، ئەمە هەر ڕەفتاریان بووە، هەموویان دەستێکی بالایان هەبووە لەم بێ ڕەوشتییەدا. بە تایبەتی لەسەردەمی عوسمانیەکاندا، کاری وەها بێ ڕەوشتانەیان کردووە کە بە خەیاڵی کەسدا نایەت، چەندین جار هەر چوارپەلی تێکۆشەرانیان بڕیوە ئینجا هەڵیانواسیوە بە داردا بۆ ماوەی

چەند رۆژێك.. یان دێن بە شیشی ئاسن چاویان هەڵدەکۆڵن. ئەوانەی ئەمانە دەکەن تەنها بۆ مەبەستی بەرزبوونەوەیە لە پلە و پایەی حکومەتدا، خۆ ئەوە خنکاندن کارێکی ئاساییی رۆژانەیە و سزایەکی هەمیشەییە. هەروەکو چۆن هاتن تێکۆشەر ـ شەهزاد ـ یان خنکاند کە تەنیا $18$ساڵ تەمەنی بوو، زۆریش بە دڵنیاییەوە کە گوایە ئەمە پێویستە بۆ ئاشتی. رەفتاری رۆژانەیان زۆر لەمەش پیستر و درندانەترە، ئەمەش وەك ئەوان دەڵێن بۆ سەلامەتی کۆمەڵە.

لێرەدا دەمانەوێ هەندێك لەو تایبەتمەندیانەی شەڕ بخەینە بەرچاو، کە دوژمن پەنای بۆ دەبات. ئێوە هێشتا بچوکن و ناتوانن تونای خۆتان بەگوێرەی پێویستییەکان لە شەڕدا پێشبخەن ، بەمەش خۆتان دەکەنە کۆسپێکی گەورە لەرێگەی تێکۆشاندا. جا چونکە دەسەپاچەن لە پەرەپێدانی شەڕی گەلدا، هەروا بە دەسەپاچەیی دەمێننەوە لەکارەکانتاندا. ئەمەش گەلێك هۆکاری هەیە و، بەستراوەتەوە بەو شەڕە تایبەتییەی کە دوژمن سەپاندویەتی. بۆچی ناتوانین هەڵتان بسێنێنەوە؟ ناتوانین بەرەو شەڕێکی خودی تایبەت راتانبکێشین کە بۆ بەرژەوەندی ئێوەش بێت؟ چوونکە ئێوە خەفە بوون و، دامرکاونەتەوە و تا تەوقی سەرتان هەر ترسە. دڵ و مێشکتان بەستویەتی. ئێستاش بە کارەکانتان دیارە و لەپەناو ئەملا و ئەو لادا خۆتان شاردۆتەوە و گومراوییتان پەسند کردووە.

کاتێك دەمانەوێ شەڕی شۆڕشگێڕانەتان بۆ روون بکەینەوە، پێویستە مێژووی ئەو شەڕە باش بزانن. بۆچی و بە چییەوە خەریکین؟ کەی دەستمان کردووە بە ئامادەکاری بۆ جەنگی شۆڕشگێڕانە؟ کە لەم رووەوە هەنگاوی مەزن بەدیهاتوون. ئێوە خۆتان لە شەڕ دەکۆڵنەوە و دەتوێژنەوە و بەڵام بەناتەواوی لێی تێیدەگەن. چەك هەڵدەگرن و بەخۆشیەوە بەچیادا هەڵدەزنن. بەڵام ناتوانن جەنگەکە بە چاکی بگێڕین و سەرکەوتن بەدەست بێنن. ئەم پێلێنانە زۆر ترسناکە، چونکە چەندەها دەستەی گەریلا بە کۆمەڵ پشتگوێ دەخرێن، چ لە رووی مەشق و چ لە رووی رێکخستن و چاودێریەوە. ئەمە دەتانخاتە تەنگەتاوی و ناهێڵێ هەناسە بدەن و هیچ سەرکەوتنێکیش بەمجۆرە ئەنجام نادرێ.

ئەوەی شیاوی باسە، پێویستە سروشتی رژێمی تورکیا بە قووڵی و لە هەر رووییەکەوە تێبگەین. وەك گوتمان لەقۆناخی سەرەتای داگیرکردن و زەوت کردنیاندا

هەناسەیان لەهەموو ئەو کۆمەڵگا و گەلانە بڕیبوو کە کۆنترۆڵیان کردبوو. تەنانەت ئەو ڕەفتارەیان هەموو هەژار و ڕەش و ڕووت و چینی ڕەنجدەر و هی تری تورکیشی گرتەوە، ناوبانگی پیسی زۆرداری عوسمانی ـ سەلجوقی لەمێژوودا بە درندەترین شێوەی ناو دەبرێت، گەلێك کۆنەپەرستتر لە دەرەبەگایەتی و سەرمایەداریش.

چینی سێیەم کە ڕژێمی کۆماری دامەزراند، لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا لە قاڵبی چینی بۆرژوادا خۆی نواند. لەو کاتەدا کۆمەڵ گۆڕانکاریەکی بەخۆیەوە دەدی. ئەمجارە ئێمەی لەگەڵ کۆماری تورکیادا بەڕەنگاری خوی بۆرژوازیانە کردووە، ئەمە لەجیاتی عوسمانی و ڕژێمی و پادشا و بەگ. ئا بەمشێوەیە ڕژێمی کەمالیزم لە تورکیادا هاتە کایەوە. ئەمەش وەك ڕژێمێکی کۆماری هۆکار و دارەدەستەکانی زیاتر تازە کردەوە. بۆ زۆرداری و چەوساندنەوە و، شەڕی تایبەت کە سەدان ساڵە پیادەی دەکات. ئەمەش بەو مانایە دێت کە ڕەفتاری دەرەبەگایەتی درندە لەگەڵ ڕەفتاری بۆرژوای نەرم و ناسك یەکانگیر دەبن بۆ دەمکوتکردنی هەژاران و زەحمەتکێشان.

بۆ نموونە کاتێك هەندێك نوێنەری گەل دەرکەوتن، کۆمۆنیستەکان، سوپای سەوز و هەندێك تیپ و پارتی دیکە توانیان خۆیان بئاخننە ریزی ئەم ڕێکخراوانە و لەناویان ببەن، لەلایەکی تریشەوە هاتن هەموو ئەندامە پاکەکانیان کوشت و تیرۆریان کردن. دەتوانین بڵێین هیچ ڕێگەیەکی چەوساندنەوە نەما نەیگرنە بەر. بەکورتی ئەم ڕژێمە لەژێر پەردەی دیموکراسیدا خۆی نیشان دەدات، ڕژێمێك کە دژ بەدیموکراسی بێ تەنیا بەهیتلەر دەتوانین وەسفی ئەم مۆدیلە بکەین. هیتلەر دەڵێ: کەمال تەتاتورك مامۆستای گەورە و پێشڕەوەی منە... ئەوەیە راستی کەمالیزم. بەڵێ ڕژێمێك داهات سەری هەمووومانی سورماند، ئا لەم سەدەیەدا هیتلەر تەنیا بۆ 10 ساڵ لەو ڕەفتارەی بەردەوام بوو، بەڵام ڕەفتاری ڕژێمی تورك دەیان ساڵی خایاند. واتە کۆماری تورك بۆتە دامەزراوێکی کارا بۆ پیادەکردنی شەڕی تایبەت.

دامەزراوی کۆماری تورکیا تەنیا ئاراستەی کوردستان نەکراوە و بەس، بەڵکو ئاراستەی هەموو گەلانی ئەنادۆڵ کراوە و، شەڕی تایبەتی بەسەردا سەپێنراوە. کەمال ئەتاتورك ئەو پێشەوا بستەباڵایە بوو بۆ ئەم شەڕە و، یەکەم بەرێوەبەری بوو. چینی زەحمەتکێشان زۆریان ناڵاند بەدەست ئەم تاقمە بێ شەرمە و هیچیان بۆ نەهێشتنەوە.

دورشمی فاشیزم لەم قۆناخەدا ئەمە بوو: "با خاوەن دەسەڵات بین ئەگەرچی لەسەر حیسابی نزکترین هاوکارمان بێ". ئەمانە چەندین لیستۆکیان گێڕا بۆ چەسپاندنی رژێمی دیکتاتۆری ئەتاتورك کە دیکتاتۆریەتێکی رەها بوو. ئەوەی دەستگیر بوو دەستگیر بوو. ئەوەی هەڵات وا هەڵات. کاتێکیش نۆرەی کوردستانیش هات، بە لێشاو کرداری داگیرکردن دەستیپێکرد، لەو هەوڵ و کردارەدا فێڵ و فەلاچۆکردن و دەسیسەی ناهەموارانە پەیدا بوون. ئەتاتورك لە نێوان ساڵانی 1920 ــ 1940 هەڵوێستێکی دووفاقی هەبوو لەبەرامبەر سەرۆك تیرە کوردەکان، هەندێکیانی کرد بە سیخور و کرێگرتە و هەندێکیشی هەڵخەڵەتاندن و پاشان لەناوی بردن. جاری واش هەبوو سەرکوتکردنێکی ئەوتۆی دەنایەوە کە زۆر خوێنین و دژوار، زۆر ناهەموار و ناشرین، بۆ نموونە ئێستاش ئێسك و پروسك و پەیکەری ئێسقان لە ئەشکەوت و دۆڵەکانی دێرسمدا دەدۆزرێتەوە.

ئەگەر راستی دێرسم بزانین ئەوا راستی شەڕی تایبەت چاکتر تێدەگەین. خەڵکی دێرسم لەلایەن تورکیاوە، بەتەواوی کۆیلە و ژێر دەستە کرا، دەتوانین بڵێین زۆربەی ئەو پیاوانەی کە شەڕی تایبەت پیادە دەکەن بەسەرکردایەتی (مەیجەر هۆلسۆسایم) و لەناو دێرسم خۆیدا هەر خەڵکێکی دێرسم خۆیانن. ئەمە مانای ئەوەیە هەر بە دەمکوتکردن راناوەستن و بەس. بەڵکو وا لەخەڵك دەکەن هەمیشە لەنێو ترس و لەرزدا بژین. ئەم رەفتارە رەفتاری عوسمانیەکان بوو بە هەموو مانای وشەیەك، بۆ نموونە کاتێك خەڵکی دێرسمیان کۆمەڵکوژ کرد، منالانی ئەو کوژراوانەیان دەهێنا و لەقوتابخانەی تایبەتیدا پەروەردە دەکردن، کردنیان بە موسڵمانێکی درۆزن، دوایی بەو پەروەردەیە وایان لێکرن کە تا ئەو پەڕی هۆڤ و دڕندە بن. موراد پاشای کۆیوجی خۆی بەتەنیا چل هەزاری لێ کۆشتن و تەرمەکانیانی فڕێدایە بیرەوە، هەر موراد پاشا نەبوو ئەمەی کرد؟، بەڵکوە موراد پاشا تەنها نمونەیەکە لە چەندەهای دیکە لەو دڕندانە. ئەم منالانە کە گەورەبوون دەیانگوت: "ئێمە موسڵمانین و تورکی راستەقینەین". تورك ئا بەمشێوەیە نین وەك دەڵێن. پێویستە باسی تورکی رەسەن و تورکمان بکەین، کە لەگەلێك رووەوە لەیەك دوورن. تورکمانەمان کە ئێستاش لە چیای تۆرۆسدا گەلێك جیاوازن و پەیوەندیان بە تورکبوون و تەتریك و موسڵمانی ساختەکارەوە نییە. ئەم پاشایانە، بە رواڵەت و درۆ موسڵمانن، کەچی لە راستیدا لە کفردا نوقم بوون. لەلایەك خۆیان بە موسڵمان دەزانن،

لەلایەکی دیکەشەوە چەوسێنەرن. ئەمانە خوێنمژ و پیلانگێڕن. لەم بوارەشدا عوسمانیەکان ناوبانگێکی مەزنیان هەیە.

مستەفا کەمال هیچی لەو پاشایە کەمتر نەبووە و، مێژووش سەلماندوویەتی کە ئەمە جوولەیەکی مورتەدە و فڕی بەسەر تورکبوونەوە نییە. بەڕاستی گەلێك ڕەفتار و کرداری ئەتاتورك ئەوە دەگەیەنێت کە تورك نییە. لەو کاتانەی دەسەڵاتی عوسمانی بەرەو ئاوابوون دەچوو، خۆی بەشێوەیەك نیشان دەدا کە پیاوێکی خێڵەکیە. ئەو کاتە لەدیاربەکر بوو، هەموو هەڵس و کەوتێکی لە کوردان دەچوو، کاتێکیش ڕاپەڕینی کوردان دەستیپێکرد، ویستی خۆی بکاتە پێشەوای ئەو ڕاپەڕینە و ببێتە پاشای کوردان. کاتێك لەپیلانی دووەمیدا سەرکەوتوو نەبوو، ئەمجارە وەها هاتە پێشەوە کە گوایە باپیری تورکانە. زۆر ڕاستی و بەڵگەنامە سەلماندوویانە کە ئەم پیاوە جوولەکەیە. تەنانەت گەلێك دانراو و پەڕاو هەیە ئاماژە بۆ ئەم ڕاستیە دەکەن.

## ئةتاتورك لة ماسؤنيَتيدا طةيشتؤتة ثلةي سي و سيَهةمين

زایۆنیزم و جوولەکایەتی ئا بەم قەبارەیە کە بەرگری لەکەمالیزم دەکەن شتێکی بێ هۆ نییە. ئێوە باش دەزانن کە ئەتاتورك لە ماسۆنێتیدا، گەیشتبووە پلەی 33 هەم، کە ئەمەش بەرزترین پلە و پایەیە تیایدا. ماسۆنێتی گەورەترین داردەستی زایۆلیزمە. کەس نییە  بە پلەی سەرۆکی دەوڵەت لە تورکیادا بگات، ئەگەر ماسۆنی نەبێت.

ئەوەی ئەمڕۆ  دژایەتیمان دەکات دەوڵەتی زایۆنیزمە، لە ژێر دەمامکی تورکێتیدا. ویستمان ئەم ڕاستیە بۆ عەرەبەکانیش ڕوون بکەینەوە. ئەمڕۆ ئەم ڕاستیە بە زەقی دیارە، کە کۆماری تورکیا بەرگری لە ئیسرائیل دەکات کە خۆیشی ئەو بەرگریە لە خۆی ناکات. واتە ئەمەش هەر دەوڵەتێکی زایۆنیزمە.

لەبواری ڕامیاریشدا سەیر دەکەی خۆیان بە تورکێکی پوختە دەزانن کەچی لەڕاستیدا چەند منداڵێکی زۆڵی سەرمایەداری جیهانین و چڵکاوخۆری زایۆنیزمی جیهانین. بەداخەوە خەڵك درەنگ لەم ڕاستیانە تێگەیشتن. لە گەلێك بارەوە زۆر قسە و باس هەیە لەسەر تورکیا، **کەمالیستەکان دوژمنی ڕاستەقینەی ئیسلامن و هەرکەسێك موسڵمانی ڕاستی بێت ئەوا لەناوی دەبەن، بەڵێ ئەمانە گۆڕیان ئامادە کردووە بۆ موسڵمان و عەلەویەکان، ئەوەش هەر لەژێر پەردە و دەمامکی ئیسلام و عەلەویدا یان**

**لەژێر دەمامکی ( عەمانیەت) دا ئەنجام دەدەن.** ئەمە رەفتاری گەندەڵی و پەیڕەو و داردەستی ماسۆنێتیە. هەرچەندە بڵێین ئەمە تورکە وادەکات بەڵام نا، ئەمە ئەقڵی خۆیان نییە و ئەمە ئیشی جوولەکە و پاشڤەرۆیانە.

پەیڕەوی ماسۆنێتی تێکدان و شلەژاندنی باری رەوشتە لەهەموو جیهاندا. سەیری جوولەکە بکەن کە چۆن یەکێتی سۆڤییەتیان لە خشتە بردوو لەرێگای راستی سۆسیالیزم لایان پێدان. **ئێوە ترۆتسکی باش دەناسن کە بەرەگەز جوولەکەیە. ستالین لەکەسێتی ترۆتسکیدا گۆری هەڵکەند بۆ هەموو رۆشنبیرانی جوولەکە.** ئەمرۆش رەوشێکی وەهایان خوڵقاندووە کە هەموو ڤینی خۆیان هەڵرێژن بەرامبەر ستالین. ئەمە هەموو پروپاگەندەی داروخاوی جوولەکە و زایۆلیزمە، ستالین هەتا ئێستاش لەو قسە دواخستنە رزگاری نەبووە کە تیرۆری دژ بە جوولەکە و ترۆتسکی کردووە.

ئەمرۆ تاقمێك دەرچووە بەناوی جوولەکەی سۆڤییەت، سەرکردەکانی سۆڤیەت ملیان بۆ دائەنوێنن، هەروەها لە ئەمەریکاشدا بەتەواوی کەوتوونەتە ژێر رکێف و فەرمانڕەوی جوولەکە و زایۆنیزم. هەتا ئێستاش، عەرەبەکانیش دژ بە زایۆنیزم دەسڵەنەوە، کۆنگرەی لوتکە دەبەستن بۆ ئەم مەبەستە. کەچی جار دوای جار، کۆنگرە دوای کۆنگرە وەك پێوەی دیارە جوولەکە مۆری زایۆنیزمیشی بەوانیشەوە ناوە.

ئاخۆ ئەم هەموو راستیانە سەبارەت بە تورکیا چی دەگەێنێت؟. پێویستە لەم چوارچێوەیەدا کەمالیزم بناسین، ئەتاتورك خاوەن داستانی چاویلکەی شین نەبوو، تەنیا نەمامێك نەبێت کە جوولەکە و زایۆنیزم ناشتوویان. جوولەکایەتی لەخۆێنی دایە. ئێوە چاك دەزانن کە چۆن (مەلا عەبدولرەحمان) ویستی ئەوە روون بکاتەوە کە ئەتاتورك جوولەکەیە. رەنگە ئەمە راست بێت، ئەم بۆچوونە لە تورکیادا بڵاوە. ئەم پیاوە گەورە "ئەتاتورك" لە ژێر دەستی مامۆستای ماسۆنێتیدا لەسالانێك پەروەدە کرا، مەشقی پێکرا هەتا گەیشتە بەرزترین پلەوپایە. تورکیا ئەمرۆ گەورەترین دۆستی زایۆنیزمە، ویستوویەتی ریز و یەکێتی موسڵمانان تێکوپێك بدات. هەروەك چۆن ئیمپراتۆریەتی عوسمانییان لەت و پەتکرد، مستەفا کەمال بۆیە دژ بە عوسمانیەکان بوو چونکە زایۆنیزم دژ بە عوسمانی بوو. ئەم دژایەتیەی کەمال ئەتاتورك بۆ عوسمانی، لەڕووی ئەوەوە نەبوو کە گوایە پێشکەوتووخوازە. لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدیشدا دەیانویست جوولەکە لە فەلەستین نیشتەجێ بکەن. سوڵتان عەبدولحەمیدیش

دەیخواست بیرۆکەی ئیسلامێتی بپارێزێت و ڕێگا لەم پرۆژەیە بگرێت. ئا لێرە و لەم بارودۆخەدا مستەفا کەمالیان هێنایە کایەوە بۆ شێواندنی وێنەی ئیسلام. ئێستاکە ئێران دژی تورکیایە بناخەکەی دەگەرێتەوە بۆ ئەمە، ئەڵێین ئەوەی کەلێنێکی دورست کرد لەنێوان بەرگری موسڵمانان دژ بە ئیمپرالیزم، کەمالیزم بوو. بەمشێوەیە توانرا یەکێتی گەلانی ئیسلام تێك بدرێت و کۆماری تورکیا لەژێر پەردەی دژ بە موسڵمانێتی دابمەزرێت، کە لە عوسمانێتی کۆنەپەرستترە. ئینگلیزیش لەمەدا رۆڵی هەبوو، چونکە بزووتنەوەی کەمالیزم لەگەڵ خواستی ئینگلیز لەدژایەتی عەرەب و ئیسلام یەکانگیر بوو. کەمالیزم پشتی ئەوەی گرت کە بەلێشاو جوولەکە و هێزی زایۆنیزم بەرەو فەلەستین بکێشن، وەك دەزانین لەساڵانی 1930 ــ 1940 فەلەستینیەکان بەزۆرەملی لەوڵاتی خۆیان دەرکران و زۆری پێ نەچوو دەوڵەتی ئیسرائیل دامەزرا. هەر لە گەڵ دامەزراندنی ئەم دەوڵەتە، ئیتر رۆڵی کەمالیزم لە تێك و پێکدانی گەلانی موسڵمان بەزەقی دەرکەوت.

هەتا ئەمرۆش ئەم هەڵوێستەی ئینگلیز و کەمالیزم هەر بەردەوامە. کاتێك ساڵی 1412 جوولەکە لە ئیسپانیا دەرکران، هاتن لە ئەستەنبۆڵ و ئەنادۆڵ نیشتەجێکران بە فەرمانی سوڵتانی عوسمانی، ئێستاش کە ساڵی 1992 وە، دەڵێن بەبۆنەی تێپەربوونی 500 ساڵ بەسەر ئەم کارەساتەدا ئاهەنگ دەگێرین، واتە ئاهەنگی دۆستایەتی جوولەکە و تورکیا. ئیسرائیل و تورکیا بەیەکەوە نەخشە بۆ پاشەرۆژی ناوچەکە دەکێشن، هەر لە ئێستاوە دەست کراوە بەدانانی لێژنەی خۆئامادەکردن بۆ ئەم ئاهەنگە کە سەرمایەدارە گەورەکانی جوولەکە دەیرازێننەوە، ئەوەش بزانن کە سەرمایەداری ئەمەریکی و جوولەکە هەردووکیان لە ژێر کۆنترۆڵی زایۆنیزمدان. تەنانەت ئەورووپاش بەرێژەیەکی گەورە بەدەست سەرمایەداری جوولەکەوە دەناڵێنێت. تەنانەت کاریگەری جوولەکە بەمەودایەکی گەورە چەپۆکی خۆی داوە بە جیهانی سۆسیالیزمەوە، هەڵمەتی دژایەتی بۆ سەر ستالینیزم بەڵگەیە بۆ راستی ئەم گوتەیە. کەواتە زایۆنیزم لە پشتەوە راوەستاوە و هانی تورکیا دەدات بۆ شەڕی تایبەت.

کاتێك رۆشنبیرێکی جوولەکە لەیەکێتی سۆڤیەت دەستگیر بکرێت، ئەوا واز ناهێنرێت هەتا ئازاد نەکرێت؟ کەچی لە کوردستاندا گەلێك دووچاری قەڵاچۆ دەبێت،

کەچی تەنیا رۆشنبیرێکیش نییە باسی بکات. ئەمە بەهیچ جۆرێك وریایی سیاسەتی تورك ناگرێتەوە، بەڵك دەگەرێتەوە بۆ ئەو رێکەوتننامانەی کە تورك و زایۆنیزم بەیەکەوە بەستوویانە، چونکە زایۆنیزم نایەوێت تورکیا بەلاوە بنێت و لەئاستی جیهاندا پەردە لەرووی هەڵماڵێت، بۆچی؟ چونکە تورکیا گرنگترین و بەهێزترین هاوپەیمانێتی ئیسرائیلە لەناوچەکەدا بۆ پارێزگاریکردنی. بەمرەنگە وەك هێزێکی سەرەکی لەدژی ئێمە بەکاریدەهێنن و لەپشت پەردەوە هانی شەرِی تایبەت دەدەن. لەچوارچێوەی کۆماری تورکیادا کەمالیزمیش لەنێو ئەم هێزەدا خۆی دەبینێتەوە.

لەبەر ئەم هۆیانە، ئەمە گرنگترین هێزە کە پێویستە بەلاوەبنرێت و لەجیهاندا ریسوا بکرێت. هەتا ئەمرۆش زۆربەی گەلانی یەکێتی سۆڤیەت خاوەن کۆمارن و، کۆمەڵگای خۆیان دەپارێزن، زمان و کولتوور و مافی خۆیان پەرە پێدەدەن، کەچی دەبینین کە چۆن هەڵمەت دەکەنە سەر ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەت. بەقسەی خۆیان لەپێناو دیموکراسی و ئازادیدا تێدەکۆشن. ئەمەریکا لەسەرووی ئەم هەڵمەتەوەیە و ئەورووپاش بەتوندی پشتگیری لێدەکات. ئەمانە هەڵمەتیان تەنیا بۆ ئەوە نییە کە بەرگری لە مافی مرۆڤ دەکەن و شالاو دژ بە هاوپەیمانێکی وەك دەوڵەتی تورکیا ئەنجام دەدەن، بەڵکو دژی مافی چارەنووسی گەلان دەوەستن. ئەمانە نەك دیموکراسی پێشێل ناکەن، بەڵکو هەر کەسێك هەڵگری هزری ئازادیش بێت، ئەوا لەناوی دەبەن و یاسای خۆیان هەر پیادە دەکەن. کەسیش نییە لێی بپرسێتەوە.

لێکدانەوەی ئەمانە چۆن دەبێت؟ رژێمی شەرِی تایبەت (تورکیا) لە سەردەمی نوێدا بەشێوەی کەمالیزم و رژێمی 12 ئەیلولدا دەرکەوت. هەتا ئێستاش لەئاستی جیهانیدا لەژێر چاودێری و پارێزگاری ئیمپریالیزم و زایۆنیزمدایە و، هەر جۆرە پروپاگەندەیەکی بۆ دەکەن و چاوپۆشی لەهەموو رەفتارێکی نالەباری ئەم رژێمە دەکەن.

لەم قۆناخەدا دەیانەوێت گۆرِانکاریەك لەرێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستین و هەندێك دەوڵەتی عەرەبی وەك "لیبیا" بخولقێنن. ئایا تۆ بڵێی ئەمانە لەتورکیا نزیك بخەنەوە؟ رەنگە قاڵبێك بۆ نزیککردنەوەی دابنێن لەژێر سێبەری ئیسلامێکی ساختەدا، یاخود خۆیان بەنزیکخستنەوەی مێژوویی و کولتووری هەڵ بخەڵەتێنن. بەڵام دوایی دەرکەوت کە حکومەتێکی تیرۆریست لە ئیسرائیل پێکهێنرا. حکومەتی ئاقبولوتیش هاوبەش لەگەڵ ئۆزالدا دەیەوێت لەگەڵ دەوڵەتی ئیسرائیلدا پەیوەندی بەهێز بکات.

ئێستا کێشەیەك هەیە کە زۆر دەهۆلی بۆ لێدەدەن، ئەویش کێشەی ئاوە. نوێنەری رێکخراوی فەلەستین پەردەی لەسەر ئەوە هەڵماڵی، کە سیاسەتی تورکیا شارازەیانی ئیسرائیل بەرێوەی دەبەن. ئەم کێشەیە بەسەر ئێمەدا رەنگی داوەتەوە. دە ساڵ دەبێت وەهای لەقەڵەم دەدەن کە هۆی ئەم کێشە PKKیە. مەسەلەی ئاو مەسەلەیەکی هەڵبەستراو و دورست کراوە. سەرەتا تورکیا هەندێ پارەی بژاردەوە و، بە پێی لاف و گەزافیان ویستیان تورکیا لە دەستی ئێمە رزگار بکەن. بەم شێوەیە بۆ مان دەرکەوت کە تورکیا هاوپەیمانێتی ئیسرائیل نەبێت هیچیتر نییە، ئەوان نامەردانە سیاسەتی ئێمە هەڵدەسەنگێنن، بەڵام ئەبێ لەئەنجامی ئەم هەڵسەنگاندنە باشتر بکۆڵینەوە.

پێویستە پەیوەندی نێوان تورکیا و بزووتنەوەی زایۆنیزم و ئیمپریالیزمی جیهانی باش تێبگەین، گونجاوە  کە چۆنیەتی دەستپێکردنی ئەم پەیوەندیانە لەمێژووی نزیکدا بزانین. مرۆڤایەتی بۆچی نەفرەت لە تیرۆری رێکوپێکی و بێ سنوور ناکات کە شەڕی تایبەت خوڵقاندویەتی؟ جا بۆ ئەوەی هۆکارەکانی بزانین، ئەوا لەم باسەدا قووڵتر بەرەو شەڕی تایبەت کە چەند پەلوپۆی کوتاوە رۆدەچم. بەتایبەتی لایەنی نهێنی شەڕی تایبەت کە وەك پێویست لەگەڵ لایەنەکانی تردا ئاڵنگاری یەکتر بوون. کێن ئەوانەی پێویستیان بە نهێنی هەیە؟.

یەکەم؛ ئەوانەی کە لاوازن، پێویسیتیان بە نهێنی هەیە، بۆ ئەوەی دوژمن پێیان نەزانێ و لەناویان بەرێ.

دووەم؛ ئەو کەسانەن یان ئەو رژێم و رێکخراوانەن کە مرۆڤایەتی بەهیچ جۆرێك حەز لەچارەیان ناکات و دادو دڵۆڤانی لە دڵیاندا نییە. ئەمە شتێکی ئاشنایە بە هەمووان. خۆ ئەگەر جەماوەر بەرەفتار و کرداریان بزانێت کە چەندە نا مرۆڤ و بیفەرن، ئەوا پشتی ملیان دەگرن و فرێیان دەدەنە سەرە نوێلك، لەبەرئەوە شەڕی تایبەت بە نهێنی بەرپا دەکەن.

ئەوەی زۆر بەناوبانگە زایۆنیزم و ماسۆنێتی بەرفراوانە کە زۆر بە نهێنی خەبات دەکەن و کۆدەبنەوە تاوەکو بتوانن فۆرخی جیهان بکەن و گەمە بە چارەنووسی گەلان بکەن و، رەوشتی جیهان تێکبدەن.

کەمایەتیەکی کەم لەجوولەکە بۆ ئەوەی دەست بە سەر جیهاندا بگرن پێویستی

بە نهێنی هەیە. بۆیە ناچارە ئەم ڕێگەیە بگرێت. خۆیشی بە گەلی هەڵکەوتووی خوا (شعب الله المختار) ناو دەبات. جا بۆ دەستگرتن بەسەر جیهاندا بەهیچ جۆرێك پەیڕەوی دادوەری و ئاشتی ناکەن، بەڵکو گەورەترین سەرمایەدارن کە هەمیشە بەردەوامن لەسەر سیاسەتی نانەوەی ئاشووب و ناکۆکی لەناو موساتدا.

هەڵوێستی ڕەوشت بەرزی هەمیشە لە ڕاژەی مرۆڤایەتیدایە کە دادوەری و پیاوەتی بەدواوەیە، بەڵام ئەمانە ڕەوشتی خەڵکی تێکدەدەن بۆ ئەوەی بەئاسانی لێیان بخوڕن، هەموو هەوڵێك دەدەدن بۆ بڵاوبونەوەی دواێن پیسی و هەموو توانای خۆیانی بۆ دەخەنە کار. لە ئەمریکا و ئەوروپا هەر چەشنە ڕەوشتێکی نزم بڵاودەکەنەوە و مرۆڤ هەڵدەخەڵەتێنن و گیروگرفت لەنێوان هەموو توێژەکانی گەل دەخولقێنن.

لەجیهاندا زۆر دەوڵەت هەن کە دەستەیەکی فاشیی دێننە سەر کورسی، تەنانەت لە وڵاتە سۆسیالیستەکانیشدا ئەم هەوڵە دەدەن و نزمی و داوێن پیسی لەناو گەلدا بڵاودەکەنەوە. ئەم هەموو بەردەوامبوونانەیان لەسەر ئەم ڕێچکە بەمەبەستی سەقپامگیرکردنی ڕەوتی ئیمپریالیزم و سەرمایەداریە بۆ دەست بەسەرداگرتنی هەموو جیهان.

تورکیا ئەمڕۆ لەناوچەکەدا ڕۆڵی پۆلیسێکی ماسۆنی دەگێڕێت، ئەمە دەبێتە مەترسیەکی گەورە. هەروەها ئیسرائیلیش لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناویندا ڕۆڵ دەگێڕێت، تورکیایان لەلا زۆر گرنگە لەناوچەکەدا بۆ پیادەکردنی شەڕی تایبەت و بە پەلەش چەندە بتوانن، گۆڕانکاری بەسەردا بهێنن. هۆی پەنا بردنە بەر نهێنیشیان، ئەوەیە کە گەلی تورك موسڵمانن. هەر لەبەرئەوە نهێنی پێویستە. وەك دەزانن سلێمان دەمیرێل سەرۆکی پارتی (DYP) خۆی بەتەواوی ماسۆنیە و، هەوڵێکی زۆر دەدات ماسۆنیەتەکەی بشارێتەوە. ئەوەی تا ئێستاش ئاشکرایە، هیچ کەس ناگاتە پلە و پایەیەکی بەرز ئەگەر ماسۆنی نەبێت. هەروەها جەلال بایار (سەرۆك کۆماری پێشوتر) و عەدنان مەندەرەس (سەرۆك وەزیرانی پێشوو، کە لە ساڵی 1960 خنکێنرا.) و هەموو سەرۆك کۆمارەکانی تورکیا و وەزیرەکان و پیاوە ئیداریە گەورەکانیش ماسۆنین. خۆ ئەگەر ڕێنمایی بزووتنەوەی زایۆنیزم نەبێت، ئەوا کەسیان بە پلەو پایە ناگەن چ وەزیر، سەرۆك وەزیر و سەرۆك کۆمار. ماسۆنی هەمان شێەی پێوەری بۆ سوپای تورکیاش داناوە چا ئەمە چ لەداڕشتنی قاڵبی گشتی و چ لەدانانی ڕەنگ و پلەدا بێ.

وەك دەزانــن ماسـۆنێتی بزووتنەوەیـەكی نهێنییـە، كـەس نـاتوانێ تیایـدا خـۆی لەخەڵك ئاشكرا بكات، چونكە ئەگەر خۆین ئاشكرا بكەن، ئـەوا خـەڵكی موسڵمان لێیـان دوور دەكەونــەوە. ماسـۆنیەكان خۆیـان تـەریك دەبـن لـەناو كۆمەڵـدا، ماسـۆنی ناچـارە بـەنهێنی كاربكـات، چـونكە تـاقمێكی كـەمن. ئەمانــە دەڵـێن "ئێمـەین كـە ئـەو پـەری گۆرانكاریمان داوە بە فۆرخ (مۆنۆپۆل)ی و گەیاندومانەتە لوتكە".

لــەتوركیادا رێكخســتنی ماســۆنی زۆر بــەهێزە، هــەتا كــۆنترۆلی سیاســەت و ئابووریشیان كردووە، ئەگـەر چـی دەسـتەیەكی كـەمن، كەچـی بوونەتـە هێزێـك دەوڵەت بەرێوە دەبەن. مۆلگەیـەكی مۆنۆپۆلییـان خوڵقانـدووە و هـەموو دامـەزراوەكانی دەوڵەت دەستبەسەر دەكەن، وەك بانقی ئـیش و بـانقی كشتوكاڵی. ئـەم دوو بانقـە بـە دەوڵەت و رێكخـراوە مۆنۆپۆلیەكانـەوە گرێـدراون كـە هـی "وەهـبی قـوج"، و خـاوەنی "ئەجزاچـی باشـی"ن. هەریـەك لەمانـە بەشـێوەیەكی نهێنی پابەنـدی دەوڵەت و سـوپایە، بـۆ یـەك مەبەست هاوكارن، چونكە دەستەی "تورگوت ئۆزال"یـش بـنج و بنـاوانێكی نـزم و شـڕی هەیـە. كەسـایەتیەكی لاوازو چـەپەڵە و رووی رەشـی سـەرمایەداری تـورك دەنوێنێـت. تەنانەت "وەهبی خۆجە"ش بەرامبەری هیچ و كەم بوێرترە. ئەم پیـاوە گۆڕانكارییـەكی بەسـەر رەفتارەكـانی مافیـا و پەیوەندیـەكانی نێوانیـان هێنـا بـۆ ئـەوەی توركیـا بگاتـە گۆرەپانێك. لەلایـەكی تـرەوە بەرامبـەر ملیتاریستەكان نـاتوانێ دەنـگ بڵنـد بكات. هـەر فەرمانێك دەدەن، پەسندی دەكات. بۆ زۆرداری و فۆرخ دەڵێ بەڵێ. بۆ ئەوەی داردەستێك بێت بە دەست فاشیزم و كۆنەپەرستیەوە، كردوویانە بە سەرۆك كۆمار. راسـتی دەوڵەتی توركیا و كەڵە پیاوەكانی بەمشێوەیەیە. بە نهێنیەكی زۆر سـەر شـۆڕ دەكـەن بـۆ سـتەم و زۆرداری. بۆ ئـەوەی لە ژێر ئەم نهێنیـەدا شـەڕی تایبـەت بـەردەوام بكـەن و لـەبارودۆخی ئێمە ئاگاداربن، وەك زایۆنیزم و ئمپریالیزم چاویان بریوەتە جوغزی ئـەم شـەڕە. هـەر بـەو بیانوویـەش دژ بـە هـەموو كۆمـەڵ دەوەسـتن. راپـۆرتێكی دەزگـای زانیـاری توركیـا (MIT) هەیە، كە ئەگەر لە ناوەرۆكەكەی بتوێژینـەوە، ئـەوا شـتی سەرنجراكێشمان بـۆ دەردەكەوێت. راپۆرتەكە باسی چەند كەسێك دەكات كە هەڵاتوون. لەبەرئەوەی هەنـدێك لە هاوەڵانی تریان باشتر بوون. بەڵام رووی ناشیرینتر ئەوەیـە كـە راپۆرتەكـە نـاوی ئـەم كەسانە نابات.

ئەو ڕەوشە ناهەموارەی کە کۆمەڵ دووچاری دەبێت زۆر سەخت و دژوارە. هەر لەلێدان و ڕەفتاری داوێن پیسی و ڕەوشت نزمی بگرە تا دەگا بە قۆرخی بێ سنوور. هەرچی ڕاگەیاندنیش هەیە چ ڕۆژنامە و چ ڕادیۆ و تەلەفزیۆن خۆیان کەڕ کردووە و باسی هیچ ناکەن. کەچی لەلایەکی دیکەوە باوەشیان بۆ گەڵێك شتی ناهەموار کردۆتەوە. ئەمەش هەمووی میت لەپشتی پەردە وەك داهۆڵ (قەرە قۆز) سەمایان پێدەکات. لە گۆڕەپانی هونەریشدا هەر میت ڕێنیشاندەرێتی. بۆئەم مەبەستەش لە ئامەد ڕەوشت نزمێکی (وەك ئەمرا)یان دەرخستووە، ناویان مەزن کردوە و فویان تێکردووە. بەڵام بۆچی لەئامەد ئەمەیان ئەنجامدا و لەشوێنێکی تر نا؟. گەر وردەکارییەك بکەین و باش لەمەسەلەکە بکۆڵینەوە، ئەوا بەئاسانی تیدەگەین. ئامەد، مەڵبەندێکی کوردستانە. هەروەها مەڵبەندێکە بۆ کەسانێکی زۆری بێکاران لە لاوان و هاووڵاتیان. لەهەمان کاتدا لەم شارەدا قۆرخ دەنوێنن. ئەمجا هەنگاو دوای هەنگاو دەبنە خاوەنی ملیار. هەرچی سەرخان و ژێرخانی کۆمەڵ هەیە هەمووی موڵکی ئەمانەن. لەبەرئەوە زۆر پێویستیان بە نهێنی هەیە بۆ ئەوەی هیچ کۆسپ و تەگەرەیەك نەیەتە ڕێگەیان.

نهێنیبوونی شەڕی تایبەت ڕەهەندێکی تری هەیە، لەبەر ئەوەش بەڕێوەبەرایەتیەکی نهێنی هەیە بۆ پراکتیزەکردنی پیلانەکانی. با سەیرێکی ڕەفتارەکانی ئەم تاقمە چەقاوەسووە سەردەستە و دەزگای زانیاری تورکیا بکەین، کە چۆن نزیکترین کەس لەخۆیان و تەنانەت بەکرێگیراوی خۆشیان بیکەن دەیکوژن. ئەی ئاخۆ چی بەوانە دەکەن کە لەنێو گەلدا بەرەنگاریان دەبنەوە، لەمە زیاتر هیچ درندەیەکی دیکە نییە بەکاری بێنن لەواقیعی ئێستای کوردستاندا. ئەم هەمووە ڕەفتارانە بەهێزی کرداری نهێنی پیادەی دەکەن.

چونکە ئەگەر خۆیان ئاشکرا بکەن، ئەوا خەڵك لێیان ڕادەپەڕن و دەست دەنێنە بینیان تا هەناسەیان لێ دەبڕن. لەبەر ئەوە بەشێوەیەکی زۆر سەرسووڕهێنەر و نهێنییەکی تەواو خەبات دەکەن. هەمووە چالاکیەکی سیاسیەکان و کۆبونەوەکانی ئەنجوومەن دەسەڵاتی سوپا بەڕێوەی دەبات. هەرچەندە لەژێر پەردەشدا بن، ئەوا ڕاستنەی لەبەرچاوە و ناشاردرێتەوە. ئەمانە هەمووی وەك گاگەل لە هەر شوێنێکدا بن دەستێك بە پشتیانەوەیە. بەڵام ئەمانە هەمووی هاوکارن، هاودژی یەکتر نین، پیان دەڵێن: کێ ببێ بە جەنەراڵ و مۆنۆپۆلیست (قۆرخکەر)، وەزیرە. ئەم تاقمە تاوانبارە بەم

شێوەیە خۆیان ڕێکخستووە. بۆ ئەوەی بە ئاسانی ئیشیان بڕوات، بەوپەڕی بنهێنییەوە کاروباری خۆیان پیادە دەکەن. ئەو نهێنییەش لە دەوڵەتی تورکیادا باوە کە لەجیهاندا وێنەی نییە. فێڵبازانە و لە پشت پەردەوە هەڵی دەسووڕێنن.

دەوڵەتی تورکیا هەر ڕێکخراو و بەڕێوەبەرایەتییەکی کە بۆ شەڕی تایبەت ئامادەی کردووە بە نهێنیەکی مەزن بەڕێوەی دەبات. ئیتر هەر لە سەرۆك کۆمارەوە بگرە هەتا دەگاتە بچووکترین دامەزراوە، ئەمانە هەموو دەمامك و نموونەن بۆ شەڕی تایبەت. راستی و مەردایەتی PKK باش دەناسن. جا بۆ شێواندن ئەمرایان فریو داوە کە بڵێت: "ئەمانە تیرۆستن، ئەرمەنین و هیچیان لە بارەوە نازانم". ئەمە و قسەی تریشی هەیە. ئەم ئەمراە (هونەرمەندە) چۆن ناوی دەرکرد و ناوبانگی پەیدا کرد، ئەوە هەروا لەخۆیەوە نەبوو. بۆیە وەها فویان تێکرد بۆ ئەوەی کەسایەتی لەهەموو ڕوویەکەوە بشێوێنێ. بێگومان ئەوانەی ئارایشیشی بۆ دەکەن لە بەرزترین پلە و پایەدان.

لەئەمریکا بتێکیان داتاشیوە و ناویان ناوە "مایکل جاکسۆن". ئەمراش مایکل جاکسۆنی تورکیایە. لاوان هەر ئەوەنییە نەیپەرستن. هەروەك چۆن مایکل جاکسۆن هەموو بەردڕەوشتیەکی لە سۆڤیەت و وڵاتە سۆسیالیستەکاندا بڵاوکردەوە، ئەوا لەتورکیاشدا بۆ هەمان مەبەست ئەمرایان فریودا و ناردیانە سێواس و مەڵاتیا. ئەمەش نموونەیەکی بێفەڕە لە ڕەفتاری بۆرژوازی.

ئەگەر لەم بابەتە بکۆڵینەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەمرا دەستکردی میتە. لەڕاستیدا ئەو هونەرمەند نییە و فڕی بە هونەرەوە نییە. لە ئامەددا پیاوی وەها هەن کە کەس بە پێنج فلس نایانکڕێت، ئەگەر ئەمانە ناویان پێبدەن و ئارایشیان بۆ بکەن، ئەوا گەلێك لە ئەمرا بەتواناتر دەردەچن. دەزگای ڕاگەیاندنی تورکیا بە "خەونی لاوان" ناوی دەبات. ئێستاش لە خەونی لاوانەوە پەرەی پێداوە بۆ خەونی هەموو کۆمەڵ. راستیەکەی ئەوەیە کە میت دەیەوێت بیکاتە داردەستی خۆی و بۆ چەند مەبەستێکی تایبەتی بەشێوەیەکی وەها نهێنی بێت کە کەس هەستی پێ نەکات. ڕەنگە ملیۆنەها کەس شەیدای بن. ناشزانن بۆچی؟ ئەم بەڵێنە، بەڵێنی ساختەکار و درۆزنە کە کارگەی میت هەڵیهێناوە.

دەتوانم نموونەی تر بهێنمەوە: کاتێك کە من لە ئامەد بووم و هاوکات بانگهێشی

دامەزراندنی PKK کرا، "ئیبراهیم تاتلی سەس"یان کردە پاشای گۆرانی بێژان. بۆچی؟ بۆ ئەوەی لەکوردستاندا ڕەوشت و کولتوورێکی تازە بچێنن و پەرەی پێبدەن. ئیبراهیم تاتلی سەس کە بە ئیبۆ ناوی دەرکرد. لە ئورفا ئارایشیان بۆ کرد و ناویان پێدا، خستیانە سەر شانۆ و کردیان بە پاشای گۆرانی بێژان. لەئەنجامدا مەشقێکی باشی پێکرا. بۆ سەرکەوتن لە شەڕی تایبەتی و بەردەوامکردنی و پەرەپێدانی دەبێ بە نهێنیکاری بێت. هەروەك زایۆنیزمەکان چۆن نزمی و بەدکرداری بڵاو دەکەنەوە و دەیانەوێت ڕەوشتی بەرز و ناسك لە دڵی گەلاندا هەڵتەکێنن، هەر بۆئەوەی ڕۆژێك بێت بتوانن کۆنترۆڵی هەموو گەلان بکەن.

ئەم نارەواییانە ئاوەها لە تورکیادا هەن. (ئۆبرۆ موفتس) رابەر و راوێژکار و پیلانگێڕە لە کاروباری ڕۆژانەی دەوڵەتی تورکیادا، ئەم پیاوە باڵیۆزی ئەمریکایە لە تورکیادا. شتی سەیر سەیر دادەهێنێ بۆ بەرەنگاری PKK. بە ئارەزووی خۆی و بێبەزەییانە بە دەستێکی پۆلاییەوە خەبات دەکات، هەر ئەم پیاوە بەرژەوەندی قۆرخایەتی (مۆنۆپۆلی) هەیە کە هاوکارە جوولەکە و تورکەکان بۆی دەپارێزن، بەجۆرێ باری ئابووریان کۆنترۆڵ کردووە کە بە نووکی پەنجەی ئەو دەگەڕێت، بێگومان ئەمەش لە سەدا سەد بەرژەمەندی ئەمریکایە.

بۆ گرێدانی تورکیا بە ئەمریکا و ئەورووپاوە هەندێك دەسەڵات هەیە لەناو حکومەتدا کە لەژێر مەشقی ماسۆنێنێدایە. بەم گەمانە هەموو کاروباری دەوڵەت بەڕێوە دەبەن.

بۆ نموونە؛ ئاقبولوت چۆن هاتە ناو حکومەتەوە؟ کە مرۆڤێکە هەموو جیهان کەسایەتی دەناسێت. ئەم پیاوە ناتوانێت پارێزگاری ناوچەیەکی بچووك بکات، کەچی لەپڕ بوو بە سەرۆك وەزیران. چونکە پیاوێکی بێ ڕەوشت و چەپەڵە، بە تەواوی خۆی فرێداوەتە باوەشی شەڕی تایبەتەوە. ئەم سەرنجە شتێکی بچوك نییە چاوپۆشی لێبکەین، پێویستی بە تێرامان و لێکۆڵینەوە هەیە.

ئەوەی کە لەو یاریگایەی 150 هەزار کەس دەگرێت، روو بکاتە جەماوەر بەبێهۆشی، وەك خەرمانە دەوری بدەن و سەڵەوات لە دیداری بدەن. ئەمە هەر بۆ ئەوەیە کە شۆڕشگێڕی ڕاستەقینە لە تورکیا و کوردستاندا لەبەرچاوی جەماوەر بخەن و بە تیرۆرست و چەك لەشان لەقەڵەمیان بدەن و، بەمەش ئەمرا و تاتلی سەس و وێنەی

ئـەوان لای خـەڵك خۆشەویست و ناویـان گـەورە بکـەن و، جـەماوەر پـەیکی راسـتی بـیر بچێتەوە و لە چارەنووسی خۆیان دوور بکەونەوە. کاتێ تـاتلی سـەس چووە ئازەربایجان ئیتر لە دەوری کۆبوونەوە و بوو بە مهرەجانێکی گرنگ و بـەرفراوان. لـە ئـەورووپاش کـە ئاهەنگەکانی نەورۆزمان ئەبوژانەوە هـەر لـەمانگی ئـادارەوە هـەتا نیسان تـاتلی سـەس و ئەمرایان دەنارد. ناردنی ئەمانە لەلایـەن ئیستخباراتی تورکیـەوە بـوو، ئەمـەش هاوکات بوو لەگەڵ ئاهەنگەکانی ئێمەدا، بۆئەوەی ئاهەنگەکانمان کز و بێ بەها بکەن.

بەمشێوە نهێنیە میتی تورکی هونەر دەکاتە داردەست و، پاڵ بەوانـەوە دەنـێن کـە جەماوەر دڵیان بۆیان لێدەدات. ئێمە باش لـە نهـێنی میـت تێدەگـەین و لەبـەر چاومانە. بەمەشەوە رانەوەستاون بەڵکو وەرزشیش هەر تیرئەندازەیانە. هەر کارێکی وەرزشی کـە دەکرێت میت دەیەوێت بەلای خۆیدا رایکێشێ و ناوەرۆکی راستەقینەی پوچەڵ بکاتـەوە، بەڵام دیسان فێڵ و تەڵەکەی ئەمانـە ناشـاردرێتەوە. بـۆ نموونـە کاتێـك لەسـاڵی 1988دا دیدارێکی رۆژنامـەییم لەگـەڵ رۆژنامـەی "مللیـەت" سـازدا، رۆژی دوایـی تورگوت ئـۆزال رووبەڕووی پەلاماردانێك بۆوە و لە ئەنجامـدا پەنجـەی برینـدار بـوو و، خۆیـدا کوتـا بـە زەویـدا. بـەڵام چـۆن خـۆی رزگـار کـرد؟ هـەموو دەزانـین کـە لەترسـاندا بێهـۆش کـەوت، چونکە پیاوێکی سەیر و سەمەرەیە، خواستی بوێری خۆی نیشان بدات، بـەڵام لەڕاسـتیدا ئـەوە هـەوڵی کوشـتنی ئـۆزال و، خـەریککردنی جـەماوەر بـوو، بۆئـەوەی ئـەو دیـدارە رۆژنامەییـە لـە (حورییـەت)دا بڵاونەکرێتـەوە و ناوەرۆکەکـەی نەخرێتـە بەردەسـتی رۆشنبیران، کە تەگبیرێکی میت بوو. هەر سێ مانگ جارێکیش خشتەی کاریـان دەگـۆڕی ئەمەشیان بۆ ئەوە دەکرد، کە لەناو دەروونی جـەماوەردا راتـەکانێك بکـەن جـەماوەر بـە کردار و ئۆپەراسیۆنی دوژمن دژ بەئێمـە نیگـەران نـەبێت و بەشـتی پـروچـووچ نیگـەران بێت. میت تا رادەیەکی زۆر ئەمەی پەیڕەو کردووە، چونکە توانایـەکی تێـر و تەسـەلیان هەیە و فشاریان خستۆتە سەر دەزگاکانی راگەیاندن. بەجۆرێك پـیلان دەگێـڕن تەنانـەت پێشکەوتووخوازەکانیش هەست ناکەن کە ئەمە فڕوفێڵە.

با پرسیارێك بکەین کێ لە ئۆزالی دا؟ نازانم بەڵام لەوانەیـە میـت پیـاوێکی نیـوە شێتی راسپادبێت ئەم کارە بە ئەنجام بگەیەنێت. ئێستاش ئەڵێن نازانرێت کێ لـە ئـۆزالی داوە. ئەمە درۆیە، چونکە تەنها بە دوو خولەك دەتوانرێـت پیاوەکـە بدۆزرێتـەوە و ئـەو

لایەنەش بدۆزرێتەوە کە رایسپاردووە، کە بەئاشکرا دیارە میت بۆخۆیەتی و بە ئاسانی پەردەیان لە روودا هەڵدەماڵرێت.

پێش ماوەیەك پیاوێك بەناوی مەحەممەد عەلی ئاغجا کە خەڵکی مەلاتیایە، هەڵی کوتایە سەر نووسەری بەناوبانگی تورکی پێشکەوتووخواز (عبدی ئیپەکچی) و هەوڵیدا تیرۆری بکات، دوایی نارديان بۆ ئەوروپا. دیسان هەوڵیدا کە پاپا یوحەنا بکوژێت، ئەمەشیان بۆ ئەوە کرد رای گشتی ئەوروپا کە دیموکراتیە، دژ بەوانەی کە کۆچیان کردووە بەرەو ئەوروپا بوروژێنێ. بەتایبەتی رقی مەسیحیەکان هەڵسێنێ کە ژمارەیان پتر لە ملیارێکە بەوپێیەی پاپا یوحەنا پیاوێکی هەروا سادە و ئاسان نییە. ئەمە بوو نیاز گڵاوی تاقمە فاشیستەکەی دوازدەی ئەیلول، وەك گوتمان رقی جیهانی مەسیحی هەڵسێنن دژ بەوانەی کە بەرەو ئەوروپا مل دەنێن.

جارێکی دیکە تورکێش کە سەرۆکی MHP بوو وتی: "ئاغجا دەستی لە کارێکی بەمشێوەیەدا نییە و سەر بە نورەدین ئارسین"ە. گوایا دەیەوێت بڵێ ئەمە پیاوێکی سەردەستی تورکیا و ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوایەتیە. دواترش بە ناوی ئێمەوە گەمەی کوشتنی ئۆلف پاڵمەیان سازکرد، کە سەرۆکی بزووتنەوەی دیموکراتی و سۆسیالیستەکان بوو. یەکێك بوو لەو کەسانەی کە داوای ئاشتی و هاوژینیان دەکرد لە ئەوروپادا. خۆ ئەگەر گوللەیەك ئاراستەی پاڵمە بکرێ، ئەوا تاوانبار بە تەواوی لەجیهاندا دەبینرێ، بەتایبەتی لای رای گشتی ئەوروپا.

بەڵێ ئەمانە دەتوانن کوردێکی ساختە بهێنن و بەڕێوەبەری ئۆفیسی ئاسایش خۆی رووی لێبنێ و ئامۆژگاری بکات. بەمەشەوە ناوەستن، بەڵکو فێڵ و تەڵەکەشیان گەیشتە ئەم رادەیە. ویستیان هەڕشەمان لێبکەن، ئەتوانن زۆریتری وەك ئاغجا ئامادەکەن بۆئەوەی بڵێن: PKK ئەمەی پێکردین. لە ئەوروپادا بۆ سووك کردنی ناوی PKK و نیشاندانی وەکو تیرۆرست، ئەمانەیان لێدەوەشێتەوە. بەمەش لەئەنجامدا تاوانباران دەسگیربکەن و PKK گۆشەگیر بکەن و دۆستایەتی تورکیا و سوید خۆش بکەن.

دەزگای شەڕی تایبەت بەپێی پێویست زۆرجار لەبەرنامەی خۆی لادەدات. نموونەی زۆرمان لا هەیە کە چەندان پەند و داو بۆ PKK دەنێنەوە. مەبەستیشیان خەریککردنی PKKیە بە شتی دیکەی لاوەکی. بۆ نموونە حەسەن جەلال گوزەل

نوێنـەری عـەنتاب و دەم راسـتی پـارتی نیشـتمانی دایـك لەگـەڵ ژنێکـدا دەسـتی تێکـەڵ کردبوو، ئەم هەواڵەیان لەرۆژنامەکاندا بڵاودەکردەوە، هاوکات کە لەگەڵ ئاقبولوتدا هـیچ جیاوازیەکیان نییە. ئەمە بۆچی؟ چونکە لەو سەردەمەدا راپەڕینەکانی گـەلی کوردسـتان لەسـاڵی 1990دا بەتایبـەتی لـە جـەزرە و نوسـەیبین لەوەرچـەخانێکی مێژوویـدا بـوو، تەنانـەت گـەلی تـورکیش رەدووی هـەواڵێ کـەوتبوو و بـەرگری لـێ دەکـرد، لەبـەر ئەمـە سەرۆکی دەزگای ئاسایش دەڵێت: "پێویستە بەرگریکردن لـە PKK بووەسـتێت. چـونکە مەترسیدارە". هەروەها بڕیاری ژمـارە 413 دەرچـوو کـە هەڕەشـەیان لـە رۆژنامەگـەران کـرد لەسـەر PKK هـیچ نەنووسـن. ئـا لێـرەدا بەزمەکـەی حەسـەن جـەلال گوزەل بـوو بەقسەی دیوەخان، چیرۆکێك بوو هەموانی سەرسام دەکرد.

کۆبوونـەوەی کەڵـە پیـاوان ئینۆنـۆ، ئـۆزال و، دەمیرێـل کـە دەبەسـترا تـەنیا بـۆ بەرەنگاربوونەوەی ئێمە بوو. ئەم کۆبوونەوەیە بە نهێنی لەلایـەن بەڕێوەبـەراتی شـەڕی تایبەتەوە کرا، کە گوایـا بـاس باسـی بەزمەکـەی حەسـەن جـەلال گوزەلـە، بۆئـەوەی بـەو مەسەلەیە خەڵك لەراستی شۆڕشەکەمان روو وەرگێڕن. تەماشاکەن ئەو بڕیارەی سـەبری یـەرمی دەریکـرد کـە سـەرۆکی ئۆفیسـی شـەڕی تایبەتـە کـە بـە رۆژنامەنووسـەکانی ووت:"ئێمە چیتان پێ ئەڵێین ئەبێ هەر ئەوە بکەن و پابەندی بن، هەروەك چۆن تیپـە وەرزشـیە نەتەوەییەکـەمان پابەنـدی ئامۆژگارییمـانن". رۆژنامـە نووسـەکانیش هـەموو فەرمویان بەسەر چاو.

لێـرەدا قسـەیەکی ئیسـماعیل بێشکچـیم بـیر دێتـەوە ــ کـە نووسـەرێکی تـورکی پێشکەوتووخوازە ـ دەڵێت: هەموو رۆژنامەکان ئامرازی دەستی ئۆفیسـی شـەڕی تایبـەتن، هـیچ کارێکیـان نییـە، خافڵانـدنی میللـەت نـەبێت، تـا دووریـان بخاتـەوە لـە مەسـەلەی چارەنووسیان.

نموونەکی تر کە لەڕاژەی شەڕی تایبەتدایە، دەیانەوێت بەوپەڕی نهێنیەوە پیادەی بکەن، بۆئەوەی یاری بەڕەوشت و ئەقڵی جەماوەر بکەن. کاتێك سیناریۆی ئـەمرا و ئیبـۆ تەواو بوو، ئەمجا دوو بووکەشوشەی تریان خستە سەر شانۆ، تـانجو و هۆلیـا وەك هـەموو پێوەرەکانی تری میت، فویان کردە ئەم دووانەش. لە تورکیـا و ئـەوروپاش لـە دەزگاکـانی راگەیاندندا تانجویان ناونا شای تۆپ، هۆلیاشیان نـاودەبرد بـە شـاژن یـان بـانوی هونـەر.

تاوای لێهات له چوار بەش سێ بەشی خەڵك شەیدای بوون، واتا نیوەی کۆمەڵگای تورکیا شەیدای وەرزش و نیوەکەیتر شەیدای هونەرن. ئەم هونەرمەندانەش هەموو بە میتەوە گرێدراون. ئەمەیە کە لە راپۆرتێکی میتدا ناویان هاتووە. رێکخستنی کاری ئەمانە هەموو لەلایەن دەزگای تەشکیلاتی تورکیاوەیە.

پاڵەوانانی وەرزش و هونەر گەمە بە رەوشت و نەریتی کۆمەڵ دەکەن. ئەمانە لە کۆمەڵ گرنگترن لەلایان. ئەمە وایکردووە توانا لەخۆیاندا ببینن بۆئەوەی بچنە پەرلەمانەوە، ئیبراهیم تاتلی سەس دەڵێت: "ئایا دەتوانم لە پەرلەماندا ببمە نوێنەری شاری ئورفا؟" میتیش وەڵامیان دەداتەوە و دەڵێ بەڵێ. چونکە هەر کەسێك بیەوێت کاری سیاسی بکات پێویستە بە پێوەری میت بپێورێت. جا کە ئەمانە مۆدیلێك بن لە کۆسپ و تەگەرە دژ بە شۆڕشەکەمان، ئەوا بۆچی میت بە شێوەیەکی سەرنج راکێش نایانکاتە داردەست.

ئەو کادیرانەی لە ریزەکانماندا بوون و خۆیان فرێدایە باوەشی دوژمنەوە و لە کاری شۆڕشگێڕی پەشیمان بوونەتەوە؛ میت پەنای بردە بەریان و بە فێڵ و تەڵەکەبازی، بەڵێنی ژیانێکی ئاسوودەی پێدان و، پێیان ئەوتن دەریا چۆن ئەبینین؟ چاك سەیری بکەن، لەوانەی چوونەوە پاڵ حکومەت شەمسی ئۆزکان کە لەوەڵامدا گوتی: ئای چەند ژیانێکی تەواوە! ئەو والە دنیا دەگات. ئەم پیاوە یەکێکە لە مەینۆشەکان، سەرەتا لە ریزی PKKدا بوو، بەڵام پاش ئەوەی دەرکەوت، ئەمانە ناپاك و هیچ و پووچن، رێگایان پێدان کە لە بواری وەرزش و هونەردا ئیش بکەن، بۆ ئەوەی هەمیشە کۆمەڵگا دڵیان هەر لای هونەر و وەرزش بێت.

پوختەی لێکۆڵینەوەی ئێمەش ئەمەیە کە دەڵێین: جەنگی شۆڕشگێڕیمان زۆر بەچڕوپڕی رەچاو کراوە. خشتەی کاری کوردستان و تورکیا ئەمە روون دەکاتەوە، دژ بە رژێمی دەوڵەتی تورك کە هەمیشە پەنا دەباتە بەر شەڕی تایبەت و دەیەوێت بە هەموو هێزێکیەوە بەرنامەکانمان پێ لابدەن.

ئەو بێ کەسایەتیانەی خۆیان بە دەستەوەداوە بەردەوام لووتیان، دەمیان و روخساریان بە نەشتەرگەری جوان دەکەن بۆئەوەی بەردەوامبن لە کارەکانیاندا، دەبینین کە نهێنی شەڕی تایبەت گەیاندونیەتە کوێ و لەچ سەر نزمییەکدا دەژین.

با ئاورێك لە لایەنی ئابووریش بدەینەوە، هەر چەندە لەمەوپێش ئاماژەم پێکرد،

چۆن ئابووریان کردە چەکێك دژ بە ئێمە. با کەمێك باسی کۆمەڵە هەرەوەزەکان بکەین کە چۆن ناشیرینترین و نارەواترین کاری قۆرخایەتی دەکەن، ئەمانە دێن پارەو دراوێکی زۆر لەیەك شوێندا کۆدەکەنەوە، ئەمجا جارێکیتر بە ئارەزوی خۆیان بەشی دەکەن. بە زۆرەملێ دەست بەسەر موڵکی کۆمەڵدا دەگرن، دەوڵەت و دراوی خەڵك بە تالان دەبەن، ئەمەش دەبێتە هۆی هەڵاوسانی بونەوەی دراو بەجۆرێك کە وێنەی نییە. ئەوەش بزانین کە دەست بەسەرداگرتنی موڵکی میللەت هەمیشە لە ژێر کۆنترۆڵیان دایە، دەزگای سیخوڕی لە بانق ئەو پارانەی راکێشاوە بێ بەرامبەر، هەروەها دراوی کاغەزیش کە دەوڵەت بە رێژەی پێنج ئەوەندە، دەئەوەندی، دەری دەکرد، بۆتە مایەی هەڵاوسانی دراو و میللەتی زیاتر نوقمی هەژاری کردووە.

ئەوەی دەمەوێ ئاماژەی پێبکەم، ئەوەیە کە ئەم پارە زۆرانەی دەوڵەت کە بە زۆری کۆنترۆڵ کردووە، دەوڵەتیشی خستۆتە هەژارییەکی بێ ئامانەنەوە. گەلیش دەست کورتە چکە چکە پار و دەگەیەنرێتە دەمی. گەل کە هەردەم هەڵپەی بێت و بیر لەدەرامەتی ناتەواوی خۆی بکاتەوە و بە دەوڵەتەوە بەسترا و بێت، هەروەکو ئەو مەسەلەیەی کە دەڵێت:"سەگەکەت برسی بکە دوات دەکەوێ"، ئا بەم رەفتارانەیانەوە خۆیان بە سەردەست دەبیننەوە.

لەهەمان کاتدا سیاسەتی ئابووری رێکوپێك، کە بەرێوە دەبرێت بەپێی پێداویستیەکانی"شەڕی تایبەتە"ن سیاسەتی کۆمەڵەی هەرەوەز و سیاسەتی فشالکردن، باج، قۆرخ و پارە تەرخانکردن بۆ رۆژنامەکانیان تەنیا پلەیەکی بەرزن لە شەڕی تایبەتدا. لە بواری گەڕیدەییدا، سیاسەتیان لەگەڵ بێگانەکاندا و بەخشینی هەرچی جوان و نایابە پێیان، هەروەها سیاسەتی کەلوپەل ناردنە دەرەوە هەموو ئەمانە بەرێگای شەڕی تایبەتدا دەیبەن. (ئێستا ئەمە لە تورکیا باوە)، پارووی دەمی گەل دەکەنە دەمی بێگانەوە، سیاسەتی پارەش بنەمای هەموو ئەم کاروبارانەن. ئەنجامەکەشی ئەمەیە کە ئابووری تەنیا چەکێکی نهێنیە، بۆ ئەوەی سەرتاپای کۆمەڵ رکیف بکەن، هەندێك چڵکاوخۆر بەکرێدەگرن هەتا تاکە کەس وورتەی لێوە نەیەت و گەل بە روویانا هەڵنەسێت. تورکیا سیاسەتێکی نەتەوەیی یەکگرتووی هەیە و دەیەوێت بەم ئایدیۆلۆژیایە مێشکی خەڵك بسرێتەوە، سەیر بکەن دەڵێت "تورك لە مەترسیدایە،

یەکپارچەی نیشتمان لە مەترسیدایە". مێژووی کۆنەپەرستی شۆڤێنیستی تورک دیارە، ئیتر ئیسلامەتی چی؟ ئەمڕۆش هاواری ئیسلامیەت و تورکێتی پێکەوە جاڕ دەدەن.

ئەم سیاسەتە ئابووریەی کە کردوویانەتە داردەست، تەنیا بۆ ئەو مەبەستەیە کە بەسەر ویستی گەلدا زاڵ بن و بیکەن بە رانە مەڕ و بە ئارەزووی خۆیان لێی بخوڕن. بەمە کاریان بۆ ئاسان دەبێت. هەر لەم چوارچێوەیەدا کە وەرزش و هونەریان بەوپەری تواناوە خستۆتە گەڕ، دوای ئەمە شەڕی تایبەت تەنها رووە ناشرینەکەی دەمێنێتەوە کە هەر زەبروزەنگە و خوێنرێشتنە.

## بەستنی دەمی ملیۆنەها شتێکە ناکرێ و نەبووە.

پێشتر باسی هەندێك لایەن و تایبەتمەندی شەڕی تایبەتمان کرد. کاتێك شۆڕشەکەمان گەیشتە شاری ئادیامان و هەندێك لە هەڤاڵەکانمان شەهید بوون، دەوڵەتی تورکیا هات و تەرمەکانیانی هەپڕوون هەپڕوون کرد. بێگومان ئەم کارە کاری یەکە تایبەتیەکانی تورك نەبوو، بەڵکو کاری ئەوانە بوو کە فەرمانیان بۆ دەرکردن کە وەها بکەن. ئەم کردارە دڕندانەشیان هەر بۆ ئەوەبوو ترس بخەنە دڵی گەلەوە، تا کەس نزیکمان نەکەوێت. لەبناخەدا ئەمانە ئەوەن و ئەوەیان دەوێت، رووی تیرۆری خۆیان دەرخەن و دەڵێن: "ئەگەر نزیکی PKK ببنەوە ئێوەش وەهاتان بەسەردێ" لە شوێنێکیتری وەك شاری میدیات لەبەرچاوی جەماوەر تەرمی شەهیدانمانیان دەکردە یەك پارچە هەویر و دەیاننوساند بە ئوتۆمبێلەوە. ئا ئەمەیە زەبروزەنگ کە بەرپای دەکەن، چ لە بەرچاوی گەل یاخود لەبەر چاوی جیهان خەڵك ناچاری هەڵاتن دەکەن. بێ ئەوەی گەلی تورك بەمە بزانێت، تەنانەت لە رووی نەفامیەوە گەلی تورك هاواری لێ هەڵدەستێت و دەڵێت: "تیرۆریستەکان ژن و منداڵ دەکوژن، ئەوانە خەریکن سەرچاوەی دەوڵەتەکەمان ووشك دەکەن".

ئەمە خۆی لەخۆیدا ئامادەکردنێکی بەرێوەبەرایەتی شەڕی تایبەتە، بۆ ئەوەی بیانوویەك بێت بە دەستیانەوە بۆ تەفروتونا کردنی تیرۆریستان و ریشەکێش کردنیان. بەراستی سەیرە، هەر ئۆپەراسیۆنێك ئێمە ئەنجامی دەدەین، بە وێنە و بەڕووە پێچەوانەکەی نیشانی هەموو ئەورووپای دەدەن و دەڵێن: "PKK" منداڵ دەکوژن. راستیەکەشی ئەوەیە کە خۆیان تیرۆریستن و تا ئەمڕۆش هەر کاری تیرۆری ئەنجام دەدەن و یارمەتی زایۆنیستەکان دەدەن. ئەوانەی دەیڵێن هەمووی درۆ و دەلەسەیە و

بناخەیەکی راستی نییە. خۆیان هەموو نامەردییەك دەکەن و دەیگەیەننە ئەوروپا، کە گوایە ئەمە کردەوەی ئێمەیە.

بەڵێ تورکیا رەوشی ئابووری، وەرزش و هونەر دەکاتە داردەست بۆ لە ناوبردنمان، سەیرێکی ئەم سێ دەهۆڵە (دەمیرێل ــ ئینۆنۆ ــ ئۆزال) چۆن کۆدەبنەوە بەبیانووی قەلاچۆی تاوان. بریار دەدەن بۆ بەرەنگاریکردنی PKK. ئەمانە نوێنەری شەری تایبەتن. بزانە ئۆزال دەڵێت چی؟ "ئەبێ هەرچی بکەین، ئێوە دەم نەکەنەوە". هەروەها دەڵێ "وەرن سەیرم کەن، من دەهۆڵێك نەبم بەدەست جەنەراڵەکانەوە هیچتر نیم". لەژێرەوە ئەوەی ئەم کارە ئەنجام دەدات سکرتێری گشتی ئۆزالە. "کەمال یاماق و سەبری ئیرمی بیە شغل"، ئەمانە نوێنەری جەنارالەکانن، رۆژنامەکان بەرێوە دەبەن، پەرلەمان و حکومەتیش داردەست و نوێنەری ئەمانەن.

پەرلەمان و حکومەت روونوسێکی کلاسیکی و دەهۆڵێکن بەدەست پێنج تا دە، لەجەنارالەکانی شەری تایبەت. هەموو شتێك لەسەرەتاوە تا کۆتایی بەرێوە دەبەن، ئەوەی ئەمرۆ پێی دەڵێن حکومەت یان ئەنجومەن هەر بەوانەوە بەستراون. کاتێکیش هەندێك ووتیان با بەرەیەکی ئۆپۆزیسیۆنی پێك بهێنن، پێیان وتن: "PKK" لەم هاودژی پارادۆکسە کەڵك وەردەگرێت، کە قسەیەکی دەمیرێلیان بیر دێنێتەوە کە چەند ئۆزال و دەمیرێل داکۆکن و لەبیردا چوونیەکن، دەمیرێل دەڵێت: منداڵێکیان هێنا بۆ حەزرەتی عەلی، دوو ژن هەبوون کە هەریەکە دەیانگوت من دایکی ئەو منداڵەم، حەزرەتی عەلیش گوتی: من ئەو منالە لەت دەکەم، هەریەکە لەتێکیان دەدەمێ. لێرەدا ئەو ژنەی دایکی راستیەقینە بوو هاواری کرد لەتی نەکەی، لەتەکەی منیش بۆ ئەو.

دەمیرێل بۆ هەر شوێنێك بروات ئەم دەماودەمە دەگێرێتەوە و دەڵێت: "رەوشی منیش هەر وایە". ئەوەتا منیش تورکیا دابەش ناکەم و منالێ دوو لەت ناکەم، نیشتمان دەدەمە دەست ئۆزال. واتە بۆ ئەوەی نیشتمان لەگەڵ PKK دابەش نەکەم وازم لەئۆپۆزسیۆن هێنا.

ئەوەی دەمیرێل دەیڵێت زۆر دیارە و ئاشکرایە، بەلام ئەم نامەردە قسەکانی هەر بەنهێنی دەکات و یەك بابەتن، بەگوێرەی ئەو بەرنامانەی شەری تایبەت بۆی دارشتووە جوولە دەکات. ئەوەتا ئینۆنۆش وازی لە ئۆپۆزسیۆن هێنا، کەچی تا دوێنێ وەکو

کەڵەشێر بەگژیەکدا دەهاتن، هەموو مەبەستەکەشیان سەر پانکردنەوەی PKKیە.

هەر لەم بابەتەوە دەمیرێل قسەیەکی هەیە. وابزانم دەیەوێت بڵێت: شەڕی تایبەت لـە تەنگانەدایـە، جـا لەبـەر ئەمـە نـاتوانین PKK لەناوببـەین. پێویسـتە سیاسـەتمان بگۆڕین، هەندێك ماف بە کورد بدەین وەك ڕێگەدان بە کـورد کـە قسـە بـەزمانی خۆیـان بکەن (سەربەستی زمان مافێ نییە و سەربەستی نییە).

کـە دەم دەکەینـەوە ئـەبێت قسـە بکـەین و، ئەمـەش پێـدانی سەربەسـتی نییـە. ئاژەڵیش زمانی خۆی هەیـە، بـۆ ئـەوەی نـەهێڵین ئـاژەڵ و مـرۆڤ قسـەبکەن ئـەوا دەبێـت دەمیان ببەستین، یا دەمیان پینە بکەین و بزمار ڕێژی بکـەین. بێگومـان بەسـتنی دەمـی ملیۆنان کەس شتێکە ناکرێ و نەبووە. ئەمەی ئـەم پیـاوە (گەورانـە) بـیری لێدەکەنـەوە، شێواندنی ڕاستیە. خۆ ئەگەر ڕێگاش بدەن بە نووسینی زمان، ئەمەش ماف پێدان نییـە، لە هەموو جیهاندا مافێك لەم بابەتە و بـەم شـێوەیە نییـە، بـەڵام لای حکومـەتی تورکیـا ڕێگا دان بە قسەکردن ئەوە هەر لـەزووەوە مافـە. وەکـو بڵێـی کـورد ئـاژەڵ بـن و ورتـە و دەنگی تایبەتیی خۆیان هەبێت.

سـەیر ئەوەیـە ئـەم پیـاوە گەورانـە ئـەم مافـە دەخەنـە بەرنامەیانـەوە، کـە کـەس بەپیریەوە ناچێت و کەسیش پێی پێناکەنێت. جا دەمیرێل لەم بارەیەوە دەڵێت: "چونکە تیرۆری PKK لە بەرنامەماندایە ئەوا باسی ئەم شتانەش ناتوانین بکەین".

لـە دیدارێکـدا بـۆ ڕادیـۆی دەنگـی ئـەمریکا سـەبارەت بـە تـەرخانکردنی کـات بـۆ ئێستەگەیەك بە زمانی کوردی، وتی "چێشتی لێنراو ئاوی ساردی بەسـەردا کـراوە، ئێمـە دەمانەوێت قەڵاچۆی تیرۆر بکەین و سەرمان سووك بێت، کەچـی نـازانم ئـەم قسـانە لـە کوێوە سەری هەڵدا؟".

ئـەمریکاش لەبناخـەدا شـەڕی تایبـەت دەپارێزێـت و، دەشـزانێت سـەرناکەوێت. ئەمریکا دەڵێت: "با کوردەکان لایەنێك بن لەشەڕی تایبەتدا". ئـەمریکا سیاسـەتی خـۆی هەیە، مەسەلەی ڕادیۆش بە زمانی کوردی بەشێکە لەچەکی ئەو سیاسـەتە. دەمیرێـل بـە بەرژەوەندی ئیمپرالیزم چاوی بەرایی نادات، بەڵام ئینۆنۆ کوڕی باوکیەتی بۆیـە دەڵێـت: "ئـۆزال ناتوانێـت شـەڕی تایبـەت بـەڕێوە ببـات، مـن ئامـەد دەکـەم بـە مەڵبەنـدی خـۆم، ناچمە دەرەوە هەتا هەموو PKK تەفروتونا نەکەم". ئەم پیاوە ئینۆنۆ بەخۆی و قاچە باریکەکیانـەوە هیچـی لەدەسـت نایـەت، تـەنیا ئـەوە نـەبێت کـە بیسـەلمێنێ کـە کـوڕی

باوکیـەتی (واتـە کـوری عیسـمەت ئینۆنـۆ، وەرگێـر). لێـرەدا گـرنگ ئـەوە نییـە بتـوانن لەناومان ببات یان نەتوانێت، گرنگ ئەوەیە کە زۆر شەیدای مەسەلەکەیە.

ئاواتێکیـان هەیـە ئـەویش ئەویـە، گوایـا لـەرێی ئۆپۆزسـیۆنەوە شـەڕی تایبـەت بەڕێوەدەبـەن، ئۆپۆزسـیۆنیش دەهۆڵێـك نـەبێت هیچیتر نیـە بەدەسـتی ئۆزالـەوە، وەکـو ئەوەی کردوومانە بەس نیە و هێشتا ماویەتی، ئەوە بۆ نەمان کرد زوو لەناویان بـەرین؟ بۆ ئەم کێشەیەمان تا ئێستا هێشتۆتەوە؟ بۆچی لە سەرچاوەکەیەوە ووشکمان نـەکردن؟ ئا بەم شێوەیە لە ئۆزال دەپرسنەوە، سەرەڕای ئەو هێز و توانایـەی بـۆ شـەڕی تایبـەتیان تەرخان کردووە. وابزانم جەنەراڵە بێکارەکان بەم قسـەیە پێدەکـەنن و بـزە دەیانگرێـت، چونکە دەزانن ئەم جۆرە کێشانە لەجیهاندا بە شەڕی تایبەت بنەبڕ نابن. ئەوانەی لەناو ئەمانەشدا لایەنەکانی چەپی تورکی دەڵێن، ئەوەی ئۆزال کردوویەتی بەس نییە.

ئەمە راسیتیەکی رەق و تاڵە، ئەڵێن:"ئێمە هەتا بەسەر PKKدا زاڵ نـەبین، ئـەوا ناتوانین بەرنامەی ریفۆرم جێبەجێ بکەین". واتا ئەمانەش هـەر درۆزن و ساختەکارن. حەزدەکـەن زوو PKK پێشـێل بکـەن، تـابتوانن ئـەنجامێکی ریفۆرمیسـتی بەرنامـەیی پەرە پێبـدەن، هەنـدێك پـارتی دابمـەزرێنن بـۆ ئـەم مەبەسـتە. ئـەم کاریگەریـەی شـەڕی تایبـەت لەسـەر بەرهەڵسـتکاری و تەنانـەت لەسـەر چـەپ هەنـدێ هەڵوێسـیتی پڕداخـی خسـتۆتەوە، هەنـدێکیان لـەوە دەترسـن PKK پاکتاویـان بکـات، ژمارەیـەکی زۆریـش لەچـەپی تـورکی هـەروای بـۆی دەچـن. ئـەوەتا (TPKP) دەڵـێن: ئێمـە دژی تـیرۆرن، هـەروەها رێگـەی شۆڕشـگێڕی(DEV-YOL) دەڵـێن زەبروزەنگـی PKK تاوانێکـە گەورەترە لە زەبروزەنگی کۆمـاری تورکیـا. بـەم قسانە چـەپی تـورکی نزمـی و نامـەردی خۆیان نوواند، تەنانەت ئەوانەش لەچەپدان و دەیانەوێت بە رێگەیەکی راستدا بڕۆن.

کاتێ لە نرکە و ناڵەی ئۆپەراسیۆنەکانماندا جیهان راچەنی و جـەماوەر راپـەڕین، ئەمانــە هاتنــەوە ســەر گۆڕەپــان تــابڵێن:"PKK بزووتنەوەیــەکی نیشــتمانیە و چالاکیەکانیشـیان شۆڕشـگێڕانەیە و پێویسـتە هاوکـاری بکرێـت". بـەڵام ئایـا کـەی ئەوشـتەیان گـوت؟ ئەوکاتـەی حاکمـە کەرەکـە بیسـتی و دوای ئـەوەی راپەڕینـە جەماوەرییەکان تەنانەت شوانە شێتەکانیش گرتەوە، کەچی ئەو بزووتنەوە چەپانە کە دەبوایـە رۆڵـی پێشـەنگیان بگێرایـە کـە دوای ئـەو هـەمووە گوتیـان:" PKK خزمـەتی

دیموکراسی دەکات و دژی فاشیزمە، لەبەرئەوە پێویستە هاوکاری بکرێت و کەسیش دژایەتی نەکات" ئەو هاوکاریانەشیان تەنها وەك ڕۆمانێك وەها بوو، بە بیانووی ئەوەی هەلومەرجیان بواری هاریکاریەکی بەو جۆرە نادات، هەرچەندە بەشێك لەم ڕاستینەمان بۆ دەرکەوت، بەڵام سەرەڕای ئەوەش لەپشتەوە درۆ و دەلەسەیان بەدەم PKK وە هەڵدەبەست.

بە هەر حاڵ با واز لەو چەپانە بهێنین کە لە ئێمەوە دوورن، با بێینە سەر ئەو کۆنترایانەی کە لەناو ڕیزەکانی ئێمەدان هەر بەو شێوەیە هەمان ڕێبازیان هەبوو، کە خۆیان کردبووە پاسەوانی شەڕی تایبەت لەناو PKKو بەنهێنی و ناپاکانە گوتیان:"لە ماتەمینی PKKدا فاتیحا لەسەر ڕۆحی گەلی کوردستان دەخوێنینەوە و تاکتیکەکانی PKKش لەناو دەبەین". ئێمەش بۆ ئەوەی تا لایەنگرێك پەیدا بکەین ساڵانێکی دوور و درێژ کارمان بۆ دەکرد، کەچی ئەوان تەنیا بە چالاکیەك هەزاران دوژمنیان بۆ دورست کردین، ئیتر بەناوی ئەنجامدانی ئەو چالاکیانەوە دەستیان بەکاری کۆنترایەتی کرد. ئێمەش هەموو توانایەکمان بەگەڕ خست بۆ ڕاکێشانی شەڕڤانێك بۆ ناو ڕیزەکانمان، ئەوانەش بەم ڕەفتارانەیان بوونە هۆی هەڵاتن و ڕاکردنی سەدان لە شەڕڤانان. لەڕاستیدا ئەو کەسانە لەڕەوشێکی نادیاردا دەژیان و کاتێك ئەنجامدانی پەروەردەیان پێ دەسپێردێت دەیکەنە یاری و گاڵتەجاری خۆیان، چونکە ئەوانە بێ دسپلینن و بەگوێرەی تاکتیکە پێشکەوتووەکانی PKK بەرێوە ناچن، بەڵکو بەپێی تاکتیکەکانی خۆیان هەڵسوکەوت دەکەن.

بەر لەئێستاش ڕەهەندەکانی شەڕی دەروونیمان ڕوونکردەوە، لەگەڵ ڕەوشی ئەو کەسانەی کە لە وڵات و کەسایەتی خۆیان رادەکەن و هەرگیز ناگەنە پێناسەی شۆڕشگێڕی و شەڕی شۆڕشگێڕانە، هەروەها ئەو کەسانەش کە سازشیان کرد و خۆیان دابەدەستەوە و یاری بە دلۆڤانیان کراو بە جارێك لە ژیان بێزار بوون و تا ئێستاش خۆیان لە نێو ئەو کەسێتیەدا گەوزاندووە و هەوڵ دەدەن بوێری خۆیانی پێوە دەرخەن. ئەمەش وەك دەرئەنجامێکی بابەتی دەتوانێت شەڕی تایبەت لە نێو ڕیزەکانماندا دورست بکات. کاتێك کەمێك لە تاکتیکەکانی PKK مان دەرخست و پیادە کرد، هەندێك لە کادیرە بەرپرسیارەکانمان هەستیان بە تەنگاوی کرد و خۆیان فرێدایە باوەشی دوژمنەوە و هەزاران شۆڕشگێڕیان لەدوای خۆیان لەبەر دەستی دوژمن بەجێ هێشت کە چاوەڕوانی

مردنیان دەکرد.

لەڕاستیدا ئەوانە هیچ جۆرە پەروەردەیەکیان نەدەکرد و بەڵکو ئەوەی کردیان ئەوە بوو کە ژمارەیەکی زۆر لە دۆستانیان لێ کردینە دوژمن و ئەوەشیان بەناوی ئەنجامدانی چالاکی PKKوە کرد.

ئەوەش بە کارێکی کۆنترا دادەنرێت و پیلانێکە لەو پیلانانەی کەبوونەتە مایەی بەدیارخستنی ڕێسای شەڕی تایبەت لەنێو PKK. ئەو کەسانەش بە شێوەیەکی سیخوڕی پەیوەندیان لەگەڵ جێبەجێکردنی شەڕی تایبەتدا نەبەستیووە، "واتا ئەڵقە لە گوێی ڕژێم نیین"، چونکە لە هەزاری یەك لەو کەسانە بەشێوەیەکی تایبەت تەرخان نەکران کە شەڕی تایبەت بەڕێوە ببەن. ئەوانەش ئەگەر بێت و بەپێی تاکتیك و بریار و پیلانەکانی PKK هەڵسوکەوت بکەن، ئەوا خۆیان لەو کارانە دەپارێزن کە خزمەت بە شەڕی تایبەت دەکەن، هەروەها بەپێی ئەو ڕێبازەی PKK پەیوەندی هاوڕێیەتی خۆیانیان دانەڕشتووە، بگرە لە هەموو ئەو کارانەی کە کردوویانە بەرژەوەندی تایبەت و کەسایەتی خۆیانیان لە دژی ئێمە بەکارهێناوە و ئەو کارەشیان کردۆتە بناخەیەك بۆ گاڵتە کردن بە بەها کۆمەڵاتیەکان و لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵاتی خۆیان بەکارنەهێناوە و خۆیان کردۆتە دەزگای شەڕی تایبەت و تایبەتمەندییە زۆرەکانی، ئێوەش ناتوانن بڵێن ئەو کارە وابەستە نییە بەشەڕی تایبەتەوە، ئەگەر هات و ئەو مافەشتان دا بەخۆتان کە ئەو شتە بڵێن، ئەوا من دەڵێم ئەو کارە وابەستەیە و بەشێوەیەکی تیرۆتەسەلیش ڕوونی دەکەمەوە وەك ڕەوشی نائاسایی ئەو چالاکیانە کە لەو دۆخەدا خزمەت بە شەڕی تایبەت دەکات و ئەو جۆرە کارانەش بەهەموو لایەکی جیهاندا بڵاوبۆتەوە. مادام شەڕی تایبەت پشت بەو جۆرە کەسانە دەبەستێت، هەربۆیە گرنگی بە بارودۆخ و هەڵسو کەوتەکانیان دەدات، لە بەژرەوەندی خۆیدا دەیخەنە گەڕ، ئەوەیە کە وابەستەیان لەگەڵ شەڕی تایبەتدا جێگیر دەکات، مرۆڤی شۆڕشگێڕ بوار بە شەڕی تایبەت نادات، هەرچەندە دەزگاکانی ئەو شەڕە لەدژی ئەو دەست بەکاربن. چونکە ئەو کەسە پەیوەندیەکی پتەوی لەگەڵ گەلدا بەستووە و هەتاکو دوا تنۆکی ژیانی لەگەڵ گەل و نیشتمانپەروەریدا یەکانگیرە و لەهەمانکاتدا بە هەڵسوکەوتی باش خۆی دەکاتە ناوەندێکی سەرنج ڕاکێش و بەو خوو و ڕەوشتەوە لەنێو PKKدا دەژی و بەردەوام دەبێت لەتێکۆشان، ئەوەش

شتێکی روون و ئاشکراو چاکە. بەڵام ئەگەر هاتوو هەر کادیرێکمان فەرامۆش کردوو وازمان لێهێنا، ئەوا بە هەڵسوکەوتی تێهەڵکێش و شێلگیرانە خزمەت بە شەڕی تایبەت دەکات و بە هەموو لایەکدا پەرش و بڵاوی دەکاتەوە. بۆ ئەوەی خۆتان لەیاری شەڕی تایبەت بپارێزن، پێویستە پەیوەندیەکی قووڵ لەگەڵ رێسا و هێڵی PKKدا ببەستن، هەوڵی پاراستنی ئەو هێڵەش بدەن لە شتی پووچ و نزم و بە شێوازێکی پتەو رێکیبخەن.

بەئەنجامدانی ئەم کارەش کەسایەتی راستەقینەی کادیر بە دیار دەخەین، ئەگەر هاتوو راستی سەرۆکایەتی لە هەموو لایەکیەوە هەڵسەنگێنرا، ئەوا ئەو بۆچونە لەلامان پەیدا دەکات و ئەو راستیەشمان لەلا بەرجەستە دەکات، کە راستی ژیانی گەلێکی سەربەخۆیە. هەر کەسێکیش بەپێی ئەو راستیە بجوڵێتەوە، لەئەنجامدا بەو کەسایەتیە سەربەخۆییەی خۆیەوە دەتوانێت لە ژیانێکی سۆسیالیزمدا بژی. بەڵام ئەوەی وەك هەڵسوکەوتەکانی رژێمی کۆن، یاری بە سەرۆکایەتی دەکات، پێویستە لێبخرێت و لابرێت. ئەو بارودۆخەش کە ئێوە تێیکەوتوون بەشێکە لەو رژێمە کۆنە، ئەو کارانەش ئەو شتانەمان بۆ ئاشکرا دەکات، کە ئێوە کاریگەری شەڕی تایبەتیتان پێوە دیارە، هەرچەندە سەرۆکایەتیەکی روون و ئاشکرای راستەقینەتان هەیە، کە لەم کاتەدا شەڕی شۆڕشگێڕانە بەرێوە دەبات، هەروەها بۆ ئەوەی لاف ئەوە لێبدەین کە ئێمە سەرکردەین، پێویستە هەموو شتێك لە بارەی ئەو شەڕە تایبەتیەوە بزانین کە بەهەموو رەهەندەکانیەوە بەسەرماندا سەپێنراوە. پێویستە بناخە مێژووییەکەشی بزانین و بێ بیر و هۆش هیچ هەنگاوێك لەشوێن پێی شەڕی تایبەتیدا نەهاوێژین. ئەوەی کە جێگای سەر سوورمانە لایەنە نهێنی و ئاشکراکانی شەڕی تایبەتە، کاتێك بە شێوەیەکی ساختەکاری هەڵمان دەخەڵەتێنن و سیاسەتی "داپلۆسین و دەم شیرن کردن" بەکار دەهێنن، هەربۆیە پێویستە سەیرێکی لایەنەکانی شەڕی تایبەت بکەین، کە بە شێوەیەکی گشتی هەموو لایەنەکانی سیاسی، ئابووری و سەربازی، کە دواتریش هەموو رەهەندەکانی رۆشنبیری دەگرێتەوە، کە پێویستە هەڵسورانی رەوش و پەیوەندیەکانی لەبەرچاو بگرین. جا ئەو پەیوەندیانەی لەنێو وڵات یان لەگەڵ چینە هاوپەیمانەکاندا بێت، یاخود لەنێو گەل و بگرە هەتاکو لەنێو پارتیشدا دورست دەبێت. پێویستە ئەمانە هەموو لەبەرچاو بگرین و بزانین چۆن رێچکە دەگرن و، پەیوەندیەکانیان چۆنە و ئیتر ئەم پەیوەندیانە لەناو خۆی وڵات بێ یان لەگەڵ چینە هاوپەیمانەکان یاخود لەناو گەل و

تەنانەت لەناو پارتیشدا بێت.

هەموو ئەمانەی باس کران، بەلایەنی بابەتی و خۆییەوە پێویستە بدرێتە بەرنیگار. لێرەشدا سەرەنج بدەینە چۆنیەتی رێکخستن و رەتاندنی هەر بوارێك و شێوەی پەرەپێدانی لە هەنگاوێکدا (مەبەست لە بابەتی ئەو کەسە و دەستانە دەگرێتەوە، کە راستەخۆ پەیوەندیان بە دوژمنەوە نییە و سەرتاپای کارەکانیان لە خزمەتی دوژمن دایە، بەڵام لایەنی خۆیی مەبەست کەسانی خۆفرۆشە کە راستەوخۆ بەکرێگیراون و دوژمن بۆ گێرەشێوێنی دەیانێرێتە ناو ریزەکانی شۆڕش ـ وەگێر). ئەوەی تا ئێستا دەرکەوتووە زۆر بە سادەیی دەڕوانینە شەڕی تایبەت. ئەگەر بێت و زۆر بە وردی و قووڵی پیایدا شۆڕبینەوە، ئەوا دەتوانین بەسەر ئەم شەڕەدا زاڵ بین و سەرکەوتن بە دەست بێنین، چونکە بۆ سەرکەوتن تێگەیشتن رۆڵێکی فراوانی هەیە.

پێویستە بە پلەی یەکەم بەراوردی رێبازی PKK و پیلانی ئەم شەڕە شۆڕشگێڕییەی خۆتان لەگەڵ ئەو شەڕە گەلەرییەی کە لەسەر بناخەی مێژوویی و دادپەروەری و پێشکەوتوانەی سەربەخۆ بەرپا کراوە، بکەن. پێویستە ئەو کارانەش لە بەرچاو بگیرێت، کە لەپێناو خزمەتکردنی گەلەکەماندا کردوومانە و هەروەها چۆن لەم رۆژەدا دەستمان کردە شەڕی شۆڕشگێڕانە و چۆن توانیمان گەلەکەمان هەڵبسێنینەوە سەر پێ، بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی گشتی چالاکیەکانی بەئەنجام بگەیەنێت. دیسان پێویستە دەکات ئەو هەنگاوانەش بزانن و بە شێوەیەکی باش زیندووی بکەنەوە، کە بە پرەنسیپ و باوەڕییەوە پێی هەڵسابووین.

ئێمەش هێڵی سووری PKK، وەك بناخەی تاکتیکی هەڵسوکەوتەکانمان بەکار دێنین. تەنیا بە لەبەرچاو گرتنی ئەم کارەش واز ناهێنین، بەڵکو بە شێوەیەکی گەرم و گوڕ لەگەڵیدا دەژین. چونکە بەگوێرەی ئەو هێڵ و (رێسایەوە) خۆمان دەکەینە ئەو گەریلایەی کە کەس ناتوانێت لەڕووی رابوەستێت، لەو رووشەوە گەمەیەکی زۆر بە هەڵسوکەوت کراوە. جگە لەمەش دەرکەوتنی نەفامی و بێ فەرهەنگی لەزیادبووندا بووە، ئەمەش کارێکە دوورە لە تاکتیکەوە. ئێمەش ئەم کارە لەپێناو بە ئەنجام گەیاندنی تاکتیك باس ناکەین، بەڵکو پێویستە تاکتیکی وابەستە بە ستراتیژەوە لەبەرچاو بگیرێت و بەشێوەیەکی گشتی پێویستە سیاسەتی PKK لەهەر رووداوێکدا بناسرێتەوە. بۆ

جیهـانیش ئاشـكرا بكرێـت كـه PKK چـۆن دوارۆژ دەبـینێ و لـەپێناو دابینكردنـی پێداویسـتیه سـاكار و ئاڵۆزیەكانیـدا پشـت بـه كـێ دەبەسـتێت و چـۆن پەیوەندیـەكانی دادەرێژێ و چۆن ئەو پەیوەندیانەش بـەرەو پـێش دەچـێت و چـۆن هەڵسوكەوت لەگـەڵ ئەم سەردەمەدا دەكات و لەسەر چ جۆرە بناخەیەك لەكاتی ئێستاماندا جێبـەجێ دەكـات، چۆنیش لە دوارۆژێكی نزیكدا پێش كەوتن بەخۆیەوە دەبـینێ، چـۆن ئـەم پـێش كەوتنـە دەخاتە روو؟. پێویستە هەموو لایەنەكانی ئەم رێڕەوانـە بـزانین بـۆ ئـەوەی پێـی ئاشـنا بین و سەرلەنوێ زیندووی بكەینەوە و لەگەڵیدا بژین و خەباتی بۆ بكەین. زۆر جاریش ئەو شتە دووبارە دەكرێتەوە كە دەڵێت؛ كاتێـك پەیوەنـدی لەگـەڵ راسـتی سـەرۆكایەتیدا دورست دەبێـت، پێویسـتە ئـەوەش بزانرێـت كـە چـۆن بنیـاد دەنرێـت و جێگیر دەبێـت. پێویستە بزانین كە ئەم شەڕە چۆن بەلای خۆماندا بشكێنینەوە و هـەنگاوەكانمان بـەرەو سـەركەوتن رۆژ دوای رۆژ كاتـژمێر دوای كاتـژمێر دەنـێین و لەبەرچـاو گـرتنی ئـەم مەسـەلانەش شـتێكی زۆر گرنگـە. لـە سـەرەتادا تێكۆشـەر بـە شـێوەیەكی چـاك ئاشـنایی لەگەڵ باردۆخ و مێژووی دوژمندا پەیداكرد و بەو شێوەیە خەباتی بەڕێوە دەبرد. بـەڵام ئـەمڕۆ بۆئـەوەی شـەڕی شۆڕشـگێڕانەمان بەسـەر شـەڕی تایبەتـدا سـەربكەوێ، پێویسـتە تێكۆشەر بە شێوەیەكی باش نوێنەرایەتی گەلەكەی بكات و رێبازی PKK بگرێتە بەر و رارا نەبێت و خاوەنی ئیرادەیەكی بەهێزی لـە رادە بـەدەربێت. جگـە لەمـەش ئـەو شـەڕە تایبەتیەی كە ئێمە لە دژی وەسـتاوین، دوژمـن فرتـوفێڵێكی زۆری تیـادا بـەكار دێنێـت و كارەكانیش بە شێوەیەكی ئاشكرا و نهێنیانە جێبەجێ دەكات. ماوەیەك پەنا دەباتـە بـەر شـێوازێكی نـەرم، ماوەیـەكیش شـێوازی توندوتیـژی و تـیرۆر و یارمەتیـەكی زۆریـش لـە دەرەوە و ناوەوە بەدەست دەهێنێت و بە توانایەكی ماددی گەورەوە بەرەو پێش دەبرێت. بـەكورتی هـەموو ئـامرازێكی مـاددی و مەعنـەوەی لـەدژی ئێمـە و لـە پێنـاو بنبڕكردنـی شەڕی شۆڕشگێڕانەمان بەبەڕێوەبردنی شەڕی تایبەت بەكار دێنێت.

بەهەر حاڵ دوژمن، هـەموو شـێوازێكی دژە بـەها مرۆڤایەتیـەكان لەسـەر بناخـەی شەڕی تایبەت سازی دەكات و لە دژی ئێمە بەكاری دێنێت و هـەر بـەو شـێوەیەش شـەڕە تایبەتیەكـەی بـەڕێوە دەبـات. كەواتـە پێویسـتە هـەموو بەهایـەكی بـەرخودانی مرۆڤایەتیانە، لە رووی رێكخستن و شێوازی كار بگرینـە خۆمـان و ئـەو بەرخودانـەشمان لە كانگای دڵ و راستگۆیی و هەنگاوی پتەوەوە هەڵقولا و بێ و هـەر بـەو پێیـە پێویسـتە

پشت بەتوانای مێشکتان ببەستن. ئەگەر هاتوو بەشێوەیەکی باش ئایدیۆلۆژیای PKK و سیاسەت و ڕێبازە سەربازییەکەیمان لە وەڵامدانەوەی ئەم هەموو شتانەدا بەکار هێنا و لایەنی کرداری ژیانیمان لەبەرچاو گرت و لە هەموو لایەنێکەوە لێکمان دایەوە و شەڕی شۆڕشگێڕانەمان لەهەموو بەرەکانی شەڕدا تاوتوێ کرد، ئەوا دەتوانین دەرەنجامی پێویست بەدەست بهێنین. کاتێکیش هەر کارێك دوور (لەو شتانەی کە ئێمە باسمان کرد و لێکمان دایەوە، بکرێ، ئەوا شەڕی شۆڕشگێڕانەمان دژ بەشەڕی تایبەت مایە پوچ دەبێت. هەر بەو شێوەیەش شەڕی تایبەت هیچ تواناکاریەکی لە بەردەمدا نامێنێتەوە کە لەرووی ئەم شەڕە شۆڕشگێڕیە پێشکەوتووەدا خۆی رابگرێ. هەرچەندە رێکخستنی پێشەنگایەتی ئێمە لاوازبێت و ئەو کەسانەش کە یارمەتی دەدەن لە دەرەوە و ناوەوەدا کەم بن، ئێمەش تەنیا لەم بوارەدا دەتوانین شوێن پێی خۆمان لە شەڕی شۆڕشگێڕانەدا بگرین و بە هەموو لایەنێکیەوە لەگەڵیدا بژین و خەبات بکەین، ئەوکاتە بۆمان دەردەکەوێت ئایا شەڕەکەمان بەرەو سەرکەوتن دەبەین؟ ئایا چۆن لە هەموو بەرەکاندا بەرپای دەکەین؟.

ئەگەر رێبازی هەڵسوکەوتی چالاکی رۆژانەمان زانی و بەو شێوەیە پێکەوە لە تێکۆشانێکی سەربازیدا یەکانگیرمان کرد، ئەوا شەڕی تایبەت ناتوانێت لە دژی ئێمە رابوەستێت و هەر بەو شێوەیەش ئەو کەسانەی کە هەوڵی جێبەجێکردنی دەدەن، وەك شێرە بەفرینەیان لێدێت و دەتوێنەوە. هەروەها ئەو کەسانەش کە بە شێوەیەکی گشتی لاوازن ـ واتە ئەو تێکۆشەرانەی مافی ژیانیان نییە ــ چونکە هەموو شێوەیەکی نەفرەت لێکراوی پەسند دەکەن. جا هەرچەندە بە فرتوفێڵ و تەڵەکەبازی رووی خۆیان بگۆڕن، لەئەنجامدا بەو شێوەیە دەتوێنێنەوە و ترسیان لێ دەنیشێت و لێرە و لەوێ پەش و بڵاو دەبنەوە. ئەو هەڵسوکەوتە شۆڕشگێڕانەیەی PKK، کە بە کەموکورییەکی زۆرەوە جێبەجێکراون، توانیویەتی شەڕی تایبەت بگەیەنێتە خاڵێکی وەها، کە هیچ جۆرە دەرەنجامێکی لێ چاوەڕان نەکەن. کەواتە بیر لەوە بکەنەوە؛ جێبەجێکردنی بڕێکی کەمی ئەرکەکانی ئەم رێبازە، ئەو ئەنجامەی ئێستاکەی بەدەستهێنا. واتە ئەگەر هاتوو بە شێوەیەکی پڕاوپڕ رێبازەکانی PKK جێبەجێ بکرێت، ئەوا شەڕی تایبەت مایە پوچ دەبێت.

دەتـوانین پێشـبینی ئـەوە بکـەین و پیشتیشـی پـێ ببەسـتین، بـەڵام بەمـەرجێ بەشێوەیەکی پڕاوپڕ پەرە بەشەڕی شۆڕشگێڕیمان بدەین. لەڕاستیدا ئەگەر هاتوو بەبێ سـێ و دوو بـە بڕیـارێکی گـەورە و بەشـێوەیەکی دڵخۆشـکەرانە نوێنەرایـەتی ڕێبـازی تـاکتیکی سـەرۆکایەتی پارتیمـان کـرد، واتـا ئەگـەر هـاتوو لـەم بـوارەدا بـە شـێوەیەکی داهێنەرانـە تاکتیکەکـەمان پـەیڕەو کـرد، ئـەوا مسـۆگەر سـەرکەوتنی ئـەو شـەڕە شۆڕشـگێڕانەیە شـتێکی ڕەهـا دەبێـت. لـەپێناوی شـەڕی شۆڕشـگێڕیدا، دەبێتـە مایـەی داتـەپینی بنـەمای ژێرخـان و سـەرخانی شـەڕی تایبـەت و لەسـەر ئـەو بناخەیـەش دیموکراسی و ئازادی و مافی مرۆڤ بەدی دێت. ئەوە شتێکی دورستە لەئاستی راستی گەلی تورك و کوردستاندا هەتا بگرە لە گۆڕەپانەکانی جیهانیشدا. هەربۆیە ئەو کۆنەپەریستیە وەك نەخۆشی شێرپەنجەیە لەجەستەی مرۆڤدا و پێویستە ببڕدرێتـەوە و فـرێ بـدرێت. ئەوکاتەش سەربەستبوون تەنیا گەلی کوردسـتان ناگرێتـەوە، بـەڵکو بەشـێوەیەکی گشـتی هەموو مرۆڤایـەتی دەگرێتـەوە. بـەو پێیـەش پێویستە هەرچـی توانامـان هەیـە لـەپێناو شـەڕی شۆڕشـگێڕانەدا بیخەینـە گـەڕ. چـونکە ئەنجامـدانی ئـەو کـارە تـەنیا ئـەرکێکی نیشتمانی نییە، بەڵکو مرۆڤایەتی و سەرەیەکیە. هـەر لەسـەر ئـەو بناخەیـەش دەگەینـە کۆمەڵگایەکی مرۆڤاتیەتی هاوچەرخ. ئەمـەش ئـەو ڕێبازەیـە کـە پێویسـتە بەشـێوەیەکی بنبڕانە بیگرنە بەر.

ئـەو کەسـانەی کـە لەسـەر ئـەو بناخەیـە بـەڕێوە دەچـن، بێگومـان گەلەکـەیان و بەرخودانی PKK لەسەر پێ رایـان دەگرێـت و بەخۆیانـدا دەچـنەوە و کەسـێتی خۆیـان سەرلەنوێ بەشێوەیەکی گشتی بونیاد دەنێتـەوە. پێویسـتە هـەر لەسـەر ئـەو بناخەیـەش بجەنگین، چونکە ئەوە تاکە ڕێگای بەدەستهێنانی ژیانێکی سەربەخۆ و ئازادە. لەڕاسـتیدا ئەوەی کە دەخوازێت هەموو شتێك پەسند بکات، ئەوا ئەو کەسە نەك تـەنیا سەرچـاوەی کەسـایەتی بـۆ سـەردەمی کـۆیلاتی کلاسـیك دەگەرێتـەوە، بـەڵکو سـتەم و ئەشـکەنجەو داماڵینێکی بێ هاوتا بەئەنجام دەگەیەنێت و بەو کـارەش بـە شـێوەیەکی گشـتی خـۆی لـە دەرەوەی رەفتارە بە نرخەکانی مرۆڤایەتیدا دەبینێتەوە. هەربۆیە ئەو شەڕە تایبەتیـەی ئێسـتاش شکسـت دێنێـت و دەتـەپێت. ئـەو ئامانجانـەی کـە پێویسـتە بەدەسـتی بخـەین، ئێستاش ئێمە لەپێناویدا شەڕێکی شۆڕشگێڕانە بەڕێوە دەبەین. ئەگەر هاتوو بە تـەواوی مـافی خـۆی بـدەینێ، ئـەوا بێگومـان ئـەو شـەڕە بـەلای ئێمـەدا دەشـکێتەوە. ئایـا ئـەو

پرسیارەتان لە خۆتان کردووە، کە شەڕی تایبەت چ دەخوازێت و بەشێوەیەکی گشتی چ مانایەك دەبەخشێت. هەریەك لە ئێوەش چاوەڕێی چین؟ جا ئایا پێشەنگایەتی PKK دەتوانێت خۆی سەقامگیر بکات و لە ژیان و خەباتدا بەردەوام بێت؟ ئەی ئەو کەسانە کێن؟ ژمارەی ئەو کەسانەش چەندە کە خۆیان لەو شمشێرە تیژەی شەڕی تایبەت رزگار کردووە؟.

ئێستا ئێوە دەڵێن: "بارودۆخمان لەبەرچاو گرتووە و لێی دەکۆڵینەوە"، ئەوەی کە پێویستە لێرەدا بزانرێت ناوەرۆکی پەیوەندیەکانە. کاتێ کە PKK ئەرکە بنچینەیەکانی بەرێوەدەبات دوژمن لەدژی دەوەستێت و دەخوازێت پاکتاوی بکات. بەڵام هۆکاری ئەوەش دەبێ چی بێت؟ بەڵێ؛ هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دەیانەوێ دەستبەرداری نیشتمان و مرۆڤایەتی بین. تەنانەت سنووری مرۆڤایەتیشی تێپەڕ کردووە، بۆ ئەوەی بگەینە دواڕۆژێکی تاریکی ئەوتۆ کە هیچ هەبوونی ئێمەی پێوەدیار نەبێ. ئەم گیرگرفتانەش کە دێنە بەردەممان، گیروگرفتی جدین و تەنیا بە گیروگرفتی خۆمی نازانم. بەڵکو هەمەلایەنەن.

ئەو شەڕە تایبەتیەی کە حکومەتی تورکیا لەبەهاردا پەنای بردە بەر و ئەو ئامادەباشیەی کە لەخۆوەی گرتبوو، بە تایبەت لەبواری قەدەخەکردنی راگەیاندندا، ئامانجی ئەوەبوو کە هەموو شتێك لەدژی ئێمە بەکاربێنێ. لەو کاتەشدا جۆرە فرتوفێڵێکیان بەکار دەهێنا کە لەڕووی رەوشتەوە لە مرۆڤایەتیەوە زۆر دوور بوو. دەتوانین نموونەی ئەم کارەیان بە وتەیەکی "میکافیلی" دیاری بکەین کە دەڵێ: "ئەگەر پێویست بوو دەتوانیت گەمە بە رەفتاریش بکەیت، بۆ ئەوەی بگەیتە ئامانجی خۆت"، ئەمانەش تەنیا گەمەیان بە رەفتار نەکرد، بەڵکو گەمەیان بەهەموو لایەنێکی مرۆڤایەتی کرد. هەربۆیە ئەو چەند رۆژانەی پێکدادان، توندووتیژە و بۆ چەند مانگێگ درێژ دەبێتەوە، چونکە ئەوە رۆژانی مان و نەمانە. ئەگەر هاتوو راستی ئەمە تێگەیشتن، ئەوا هەموو تواناکاریەکان لە پێناو پێشخستنی ئەرکەکانمان بەبێ دواکەوتن لەهەموو گۆڕەپانەکاندا دەخستە گەڕ. ئەوەی مەبەستمە لێرەدا بیخەمە روو ئەوەیە کە ئێمە خەباتێکی زۆرمان لەبەردەمدایە کە ئەنجامی بدەین، بۆئەوەش بڕیارمان پتەوە؛ تاوەکو نەهێڵین شەڕی تایبەت بگاتە ئامانجی خۆی. بەڵام ئەوە راستیەکە و لاتان ئاشکرایە کە

شەڕی تایبەت لەخۆیەوە کۆتایی نایەت.

ئەوانەی لەناو ئێمەدا بەم کارە (دژی شەڕی تایبەت) خۆیان خەریك کردووە زۆرن، بەڵام کاتێك بارودۆخی ئەوانە لەبەرچاو دەگرین کە لێپرسراون لەپێشخستنی ئەم کارە، لەبارودۆخێکی ئەوتۆدا دەیان بینینەوە کە ئەگەری ئەوەیان لێدەکرێ لەو لایەنە شکستمان پێ بێنن. چونکە ئەو کەسانە بەشێوەیەکی جددی و ڕێکوپێك لەئەرکەکانیان نزیك نابنەوە، هەروەها هەنێك سەرکردە لەم بوارەدا چەند لێکدانەوەیەکی خۆیان دەکەن و دەڵێن:" هەتاوەکو کەی PKK دەتوانێت دژی شەڕی تایبەت بوەستێت؟" ئەوکەسانەی کە ئەمەیان دەگوت بەرێژەیەکی زۆر لەنێو ریزەکانی ئێمەدا بوون و بەمشێوەیەش مامەڵەیان لەگەڵ سیاسەت دەکرد و تێی گەیشتبوون. هەتاوەکو هەندێکیان بگرە لەدژی ئێمەش راوەستاون و بەبانگەشەی کوێرانە هەوڵی ئەوەیاندا کە شەڕی شۆڕشگێڕانەمان لەبەرامبەر شەڕی تایبەتدا شکست پێ بهێنن. دەیانگوت: "سەرکەوتن مەحاڵە و هەتا ماون سەرکەوتوو نابن" و، ئەو کەسانەش کە ئەمەیان دووپات دەکردەوە کەم ژمار نەبوون، هەروەها لەپێناو تێرکردنی غەریزە خود پەرستیەکانی خۆیاندا خوازیاری سەرنەکەوتنی ئێمە بوون و، لە خۆدەرخستن بەولاوە هیچ خەمێکی تریان نەبووە. بەڵام ئەمە ئەو راستیە نەبوو کە ئەوان تێیگەیشتبوون، چونکە ئێمە لەو چەند مانگەی دوایدا توانیمان ناوەڕۆکی شەڕی تایبەت پووچەڵ بکەینەوە. کەواتە زۆر خۆتان بەو خەونە مایەپوچانەوە خەریك مەکەن.

ئەگەر هاتوو تێکۆشەر بەشێوەیەکی تەواو بارودۆخی دوژمنەکەی زانی و مێژووی خۆی ناسی و خستیە ژیانەوە و بەشێوەیەکی چاك نوێنەرایەتی بەرژەوەندی گەلەکەی کرد، هەروەها ئەگەر هاتوو خاوەنی تێگەیشتنێکی باشی ڕێبازی پارتی بوو و ڕاپایی نەکرد و خاوەنی هێز و ئیرادەیەکی لەرادەبەدەر بوو، ئەوا ئەو تێکۆشەرە دەتوانێت بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە شەڕی شۆڕشگێڕی دژ بەو شەڕە تایبەتیەی کە بەفرتوفێڵێکی زۆرەوە (ساتێك بە نهێنی و ساتێك بە ئاشکرا و بەشێوازی نەرم و دەمێکیش بە شێوازی توندوتیژی و تیرۆر) ڕووبەڕوومان دەبێتەوە، پێشبخات. هەروەها تا دێت ورەی ئەم تێکۆشەرە بەرز دەبێت و بەشداربوونیشی لەدەرەوە و ناوەوەدا چالاکتر دەبێت و بەتواناکاریەکی ماددی مەزنەوە تێکۆشانی خۆی بەردەوام دەکات.

بۆ ئەوەی شەڕی شۆڕشگێڕیمان لەدەست نەدەین، چەند ئەرکێکمان خستە نێو

نەخشەی کارەکانمانەوە، کە پێویستە لەدژی شەڕی تایبەت پێیان هەڵسین. راپەڕاندنی ئەو ئەرکانەش زۆر گرنگ و چارەنووسسازن. ئەگەر هاتوو هۆشیارییەکی مێژوویی ئەوتۆمان هەبوایە و، لەسەر ئەو بناخەیەش خەباتمان بکردایە، ئەوا دنیامان بەسەر دوژمندا هەڵدەگێڕایەوە. لە کاتێکدا، کە دوژمن دەڵێ: "هەموو تواناکاریەکمان بۆ ساڵی 1990 دەخەینە گەڕ"، دوژمنیش ئەو ناکۆکیەی ناو ئێمە دەبینێت، بەڵام ئەگەر نەیدیبایە چی دەکرد؟ ئەگەر تەگبیر وەرگرتنی ئێمە نەبوایە بەرامبەر ئەو رەوشە، ئەوکاتە جگە لەخۆ بەدەستەوەدان یان لەناوچوون چیترمان بەدەستەوە نەدەما. بەڵام ئێمە بەوە رازی نابین. کاتێك ئاماژەمان بە شەڕی تایبەت کرد، وتمان رۆژانە ئەو شەڕە بە شەهیدکردنی تێکۆشەرانی PKK، ئێمە ماندوو و شەکەت دەکات. لەم بوارەدا دوژمن گیانی گەلەکەشمان لاواز دەکات و فرتوفێڵ بەکاردێنێ، ئەمەش لەڕێگەی شتی نهێنی و ساکار ئەنجام دەدات. مانای ئەوە نییە کە دوژمن ترسی لێنشتبێت، بەڵکو بەم کارەی گاڵتە بە جیهان دەکات و، زۆر لەسەرخۆ و بە هێمنی بەڕێوەی دەبات. چونکە هێزی کۆنەپەرستی جیهانی بەم گاڵتەجاڕیە راهاتووە. دوێنێ ئۆزال چی گوت؛ "ئەمە کارێکی جدییە و پێویستیشە بیری لێ بکەینەوە، ناشزانم بە تەواوەتی چی دەکەم" ئەم وتەیەی ئۆزال ئەوە دەگەیێنێت کە هەتا دوایی پێ لەسەر شەڕی تایبەت دادەگرێ و پێشیدەخات و دەڵێ: بەڵێ بۆ شەڕی تایبەت.

ئەمریکاش سەبارەت بە PKK لە راپۆرتێکیدا دەڵێ: "پێویستە زۆر بیر لەو کارە بکەینەوە کە دانپیانان بە کوردەکان چ ئەنجامێکی دەبێت؟" لێرەدا تێڕوانینی ئەمریکا و تورکیا هیچ جیاوازیەکیان نییە. هەروەك دەسەڵاتدارانی تورك دەڵێن: "ئەوە بۆ شەست ساڵە ئێمە بەو کوردانە دەڵێین ئەوانە تورکن، ئەگەر هاتوو ئێستاکە بڵێین ئەوانە کوردن، ئایا چارەنووسی ئەو والی و پارێزگار و ئەفسەر و پۆلیسانەی کە لەکوردستان کار بەدەستن و ئەرکەکانیان جێبەجێ دەکەن چی بەسەر دێت؟" بێگومان زەرەرمەند دەبن. باش تەماشا بکەن ئەو کەسانە (دەسەڵاتدارانی تورك) راستی خۆیان باش دەزانن، وشەی کورد هەموو شتێك لای ئەوان سەروبن دەکات و هەڵدەگرێرێتەوە، ئەوانەش ئەو راستیە باش دەبینن و شەو رۆژ خۆیانی پێوە خەریك دەکەن. لەڕاستیدا هیچ مافێکیان لەلا نییە کە بیبەخشن بە کورد، چونکە لە بناخەدا هەبوونی کورد لەوڵاتی ئەواندا نییە.

ئەگەر میللەتێك بوونی نەبێت، چ مافێکی دەدرێتێ؟. هەروەها سەبارەت بەمەسەلەی مافی چارەنووس و بەخشینی ئازادی بە کوردان، جگە لە بانگەشەی راپۆرتی شەڕی تایبەت بەولاوە هیچیتر نییە. ئەوا ئەو سەرەنجامەی لەم مەسەلەیەدا پێی گەیشتوون مایەی سەرسوڕمانە، چونکە ئەوانی خستۆتە نێو رەوشێکی زۆر خراپەوە و، ئێستاش دەخوازن بە هەزار و یەك شێواز خۆیانی لێ رزگار بکەن. ناشزانن چۆن خۆیانی لێ دەرباز بکەن و دەستبەداری بن. بۆ ئەمەش گەلێك جار بیری لێدەکەنەوە کە بۆچی دەستبەداری ئەو کارە دەبن.

دوژمن هەڵوێستی خۆی لەرووی ئێمەدا بەمشێوەیە روون دەکاتەوە و دەڵێت: پێویستە زۆر وریا بین بۆ ئەوەی نەکەوینە داوی PKK وە. بەم قسانەشیان دروستی سیاسەتی ئێمە دەخەنە روو، بەڵام ئەوان چۆن توانیان ئەو سیاسەتە دروستەی ئێمە بە داوێکی راستەقینە لێکبدەنەوە، ئەوەش لەکاتێکدا بوو کە هەر هەنگاوێکی دەیانویست بینێن سەرکەوتوو نەدەبوون و دەکەوتنە نێو تەڵەی ئێمە و دەربازبوونیشیان مەحاڵ بوو. ئەمەش تایبەتمەندی سیاسەتی شۆڕشگێڕانەی هەمەلایەنی ئێمەی دەخستە روو. لێرەشدا لە قسەکانی سەرۆك کۆماری تورکیادا دەردەکەوێت کە لە تورکیا خاوەن دەسەڵاتێکی بێ سنوورە و دەڵێت: "کەوتوومە بارودۆخێکی گرانەوە". واتە کەوتۆتە تەڵەوە، بەو قسەیەش دروستیی ئەو سیاسەتەی ئێمە دووبارە ئاشکرا دەبێتەوە. ئەو رژێمە بێ رەوشتەش لەپێناو بەئەنجام گەیاندنی مەبەستە گڵاوەکانی خۆی بۆ رووتاندنەوەی خەڵکی خەبات دەکەن. بەڵام ئایا تایبەتمەندییەکانیان چییە؟ ئەو سیاسەتەی ئەوان جێبەجێی دەکەن و لەسەری دەڕۆن لەجیهاندا بێ وێنەیە. کاتێکیش دەخوازن دەستبەرداری ئەم سیاسەتەی خۆیان بن، روو دەکەنە یەکتر و لەخۆیان دەپرسن؛ پێش ئەوەی بڵێن ئایا دەستبەرداری ئەم سیاسەتە بین یان نا، پێویستە هەموو شتێك لەبەر چاو بگرین، بۆئەوەی نەبینە گەمەیەك بەدەست PKK وە. ئێستاش مادام تورگوت ئۆزال لە حکومەتی تورکیادا لەسەرووی هەموو دەسەڵاتێکەوەیە، بەشێوەیەکی قووڵ بیر لە شەڕی شۆڕشگێڕانەی ئێمە دەکاتەوە. کەواتە ئێمە دەبێت چۆن بیری لێبکەینەوە؟ لەگەڵ ئەم هەموو تواناکاریەی لەخزمەت شەڕی تایبەتدا خستوویەتیە کار، ئێمەش جگە لە سیاسەتی شەڕی شۆڕشگێڕانە بەولاوە هیچیترمان نییە کە لەبەرامبەریدا بیخەینە روو. چونکە بە سیاسەتێکی رەوای دەزانین، پێویستیش بەوە

دەکات کە گرنگیەکی زۆری پیّ بدەین. لەکاتێکیشدا ئەگەر بەگوێرەی پێویست وەڵامی ئەو شەڕە نەدەینەوە، ئەوا دەکەوینە تۆڕی سیاسەتی دوژمنەوە، کە مەبەستی لەناوبردنی ئێمەیە.

ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە ئێمە کاتێك دەمانەوێت بەو کارانەی خۆمان لەدژی شەڕی تایبەت رابوەستین، پێویستە هەموو تواناکاریەکمان لەپێناوی ئەو ئەرکانەماندا بخەینە گەڕ، کە پێویستە هەموو رۆژێك بیر لەو مەسەلە چارەنوسازە بکەینەوە. تەنانەت بۆ تەنیا ساتێکیش نابێت دەستبەرداری ئەم مەسەلەیە بین. بۆ نموونە: کاتێك مرۆڤ دەڕوانێتە ئەو ژیانەی کە ئێوە خۆتان پێوە خەریك کردووە، هەست بەو بێهۆشی و بێ وشیارییەی ئێوە دەکات کە لەبەرامبەر ئەم مەسەلە چارەنووسازەدا خستوتانەتە روو.

ئەگەر هاتوو یەکێك چەقۆیەکی لەسەر قوڕگی هەریەکێك لە ئێوە دانا و ویستی سەرتان ببڕێت، ئەوا بۆ ئەوەی ئێوە خۆتان لەو بارودۆخە رزگار بکەن، بەرگریەکی ئەوتۆ دەکەن کە لەوانەیە دنیا بەسەرخۆتاندا هەڵبگێڕنەوە. بۆ نموونەش ئەگەر بێت و ویستیان بەرخێك سەربڕن، ئەوا ئەو بەرخە هەتا دوا تنۆکی ژیانی بەرگری دەکات. ئەو رەوشەی کە ئێستا تیایدا دەژین لەو چەقۆیانە دەچێت کە لەوانەیە دوژمن لەسەر قوڕگی ئێوەی دابنێت. ئەوەی دوژمنیش بۆ ئێمەی دەخاتە روو، ئەم راستیە دەسەلمێنێ. ئەو رۆژگارەی ئێمەش رۆژانی چاکە و قارەمانێتی و سەر بڵندی و مان و نەمانە. لەڕۆژێکی وەهادا ئەگەر نەکەوینە نێو جموجۆڵ و تێکۆشانمان بەهێزتر نەکەین، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت، کە ئەو بزووتنەوە ساختەیە هیوای سەدان ساڵمان دەکوژێت. ئەوەی کە ئێوەش لەدەستی دەدەن، تەنیا رەنجی تاکە رۆژێك نییە، بەڵکو چارەنووسی سەرجەم گەلە. بەڵام ئەگەر هاتوو بەشێوەیەکی جددی خۆتان بەسیاسەتەوە خەریك کرد، ئەوا ئەو کاتە بە شێوەیەکی سەرسوهێنەرانە کارەکانتان لەبەرچاو دەگرن. نەوەك بێ بەرپرسیارانە و بێ بیر و گرنگی پێدان و خۆماندوو کردن بە سیاسەتەوە خۆتان خەریك بکەن، کە لەوانەیە کارێکی بەو جۆرە هەناسەشتان لێببڕێ. ئەگەر هاتوو یەکێك شەقازلەیەکی لێدان ئەوا خۆتانی لێ سوور دەکەنەوە و لەبری شەقازلەیەك دوانی لێ دەدەن؛ ئەم کارەش هەزار جار لەو مەسەلەی شەقازلە لێدانە گەورەترە، چونکە ئەوەی

که دوژمن لەدژی ئێوە دەیکات تەنیا شەقازلەیەك نییە، بەڵکو ئەوە لێدانێکە کە دوژمن دەخوازێت بەو کارە لەناومان ببات. ئێمەش لەلایەن خۆمانەوە بەووردبینی و تایەبتمەندیەوە ئەو خەباتە بەگوڕ دەکەین بۆ ئەوەی لەناو نەچین و، هەموو تواناریەکیشمان لەم بوارەدا دەخەینە گەڕ. ئەگەر نەتوانن ئەو مەسەلەیە لەبەر چاو بگرن و نەگەنە ئاستی ئەو تێگەیشتنە، ئەوا ناتوانین بڵێین ئێمە تەنیا گەلێکی کۆیلەین، بەڵکو گەلێکی سەربڕاویشین. دیاردەی سەربڕاویش زۆرن، لە ئەنجامیشدا ئێمە ئەو کارەمان لەبەرچاو گرتووە کە وڵات چی بەسەر هاتووە و، لە کاتێکدا ئەوان ئەو هەموو دەستکەوتانەیان لەدەستداوە، ئەی کەواتە گەل چی بەدەستەوە ماوە؟ بەڵام ئێمە ئێستا بە ئاگاداریەکی زۆرەوە کارەکانمان جێبەجێ دەکەین و بە شێوەیەکی ئازا و بەجەرگانە لەدژی دوژمن رادەوەستین. چونکە ئەگەر بەمجۆرە نەبێ، ئەوا لەڕابردوو زیاتر دەبینە قوربانی. ئێوەش ئەمڕۆ بە هیوایەوەکەوە پشت ئەستوورن، گەلەکەشمان بە هەمان شێوەیە خوازیارە کە PKK کاری لەوە زیاتری ماوە لەم بوارەدا ئەنجامی بدات و، تواناکاری سەرکەوتنیشی مەزنە. ئەمەش ئەوە دەگەیێنێت کە ئێوە باوەڕیتان بە ئێمە هەیە و دڵنیان لێمان، ئەوەش شتێکی دروستە. بەڵام مەسەلەکە بەو رادە نییە کە ئێوە تێیگەیشتوون و بیری لێدەکەنەوە و بۆچوونتان لەسەری هەیە. منیش لێرەدا تاڵاوی راستی ئەو کارەتان رووبەڕوو بۆ روون دەکەمەوە، بەڵام لەبەر چەند هۆیەك من ئەو شتە باس دەکەم، چونکە ئێوە بەشێوەیەکی نارێك و هەڵە لەشەڕی تایبەت نزیك دەبنەوە.

ئێوە بەقسەی خۆتان دەڵێن: بەشێوەیەکی ئاسایی و ساکار بەسەر ئەم شەڕی تایبەتیەدا زاڵ دەبین. لەکاتێکدا ئێوە کۆمەڵێك لە کادیرانمانن و هەر بەو شێوە ساکار و نێگەتیفانە لەمەسەلەکە نزیك دەبنەوە. ئەوەش خۆی لەخۆیدا کارێکی هەڵەیە و بەشێوەیەکی رەها مەترسیەکی گەورەشمان بۆدروست دەکات. هەتاوەکو هەندێك لەوانە خۆیان بە دۆستتی ئێمە دەزانن هەمان بۆچوون و داواکاریان هەیە، یەکێك لەو دۆستانە حزبی شیوعی تورکیە TKP کە بەڕەزامەندی دەوڵەتی تورکیا دامەزراوە و چاوەڕێی رۆڵی خۆیان دەکەن، بۆ ئەوەی خۆیان ببوژێننەوە. بانگەشەی ئەوەش دەکەن کە گوایە دۆستەکانیان واتە PKK بەشێوەیەکی بەهێز و کاریگەر هاوکاری یان ناکەن. ئایا ئەوە چ جۆرە زمانێکە کە ئەوانە قسەی پێدەکەن؟ لە کاتێکدا ئەو پارت و کەسانە دەنگی

خۆیـان لـەپاڵ حکومـەتی تورکیـادا بەرزدەکەنـەوە و داوای لەناوچـونی PKK دەکـەن و لەپێناو ئەم کارەشدا لەو لە پشت پەردەوە هاوپەیمانێتی خۆیان لەگەڵ دوژمندا دەبەستن و دەڵێن: "دوای ئەوەی PKK لەناو دەچێت ڕێگا بۆ ئێمەش خۆشدەبێت". ئەگەر هاتوو لێپرسراوە پایەبەرزەکانمان ئەم کارەیان لەبەر چاوی خۆیان بگرتایە، ئـەوا بەدڵپاکیـەوە، وەك ئاوێکی سازگار ڕەوشی خەبات و ڕێکخسـتن و چالاکیەکانیانی بـەبێ هـیچ هەڵەیـەك بەڕێوە دەبرد. لە کاتێکدا ئێمە تەنیا ئەوە دەزانین کە بەزبری ئەو نارنجۆکـە بچووکە و ئـەو چـەکەی لەدەسـتماندایە ژمارەیـەك کەسـی پێبکـوژین، ئەمـەش لەبـەر تواناکـاری ڕێکخستنەکانمانە کە بەپێی تایبەتمەندی شەڕی تایبەت بەکارمان نەهێناوە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێنێت کە ئێمە بەشێوەیەکی نێگەتیفانە بە گرنگیـەکی کـەم و دەسەڵاتێکی لاوازەوە لەشەڕی تایبەت نزیك دەبینەوە. بەمشێوەیەش ڕێگای سەرکەوتن بە ئەنجام ناگات. بەڵام ئێستا ئەو سەرکەوتنە لەڕێی منـەوە بەئـەنجام دەگـات، کـاتێکیش ئەم ئەرکە دەکەوێتە سەر شانم، ئەوا ئـەوەی لەتوانامـدا بێت لەپێناویـدا دەیخەمـە گـەڕ، جگە لەوەش هیچ تواناکارییەکی دی لە ئارادانیە کە بتوانن لەو ڕێیەوە خۆتان لـەو کـارە نزیك بکەنەوە. ئێمە لەرابردوودا تێڕوانینێکی کەمترمان هەبوو لەسـەر ئـەو مەسـەلەیە، بەڵام ئێوە ئەو چـەند مانگـەی ڕابردووتـان لەبەرچـاوە کـە لـەڕووی تێڕوانینـەوە لەگـەڵ هیچ کاتێکی تردا بـەراوورد ناکرێت،.هەرچـەندە ئێمـە ناچـار کـراین کـە ئـەم تێکۆشـانە بکـەین، لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەو شـەڕی تایبەتـەی کـە بەهـەر شـێوازێك لـە دژی ئێمـەدا ڕادەوەستێت و دوژمنـیش بـە هـیچ شێوەیەك بوارتـان نـادات بـە تێگەیشـتنێکی زیـاتر و مێشکێکی فراوانترەوە شەڕی تایبەت لەبەرچاو بگـرن، ئـەم کـارەش جیاوازیـەکی ئـەوتۆی نییە بەلای هەڤالانی ئێمەوە کە شەڕێکی چەکدارانەیان لەدژی بەرپا کردووە.

بێگومان ئێمە بەهیچ شێوەیەك بیر لە دۆڕاندنی ئەو شـەڕە ناکەینـەوە، بـەڵکو بـە پێچـەوانەوە هیوامـان بـە سـەرکەوتن زۆر گەورەیـە. بـەڵام بـۆ ئـەوەی باوەڕیشـمان بـەم سەرکەوتنە قووڵتربکەینەوە، پێویستە تواناکـاری خۆمـان بـەهێز و سـوودمەندن بکـەین. هەریەك لەم بابەتە تایبەتمەندی خۆی هەیە، بەتایبـەتی مەسـەلەی گـەریلا کـە هەنـدێ خەسڵەتی هەیە جێگای ڕەخنە لێگرتنە، ئەگەر بێتو پشتگوێش بخرێت.

بـەو پێیـەش گـەریلا ناکرێـت بەشـێوەیەکی قـووڵ بـەپێی پێداویسـتیەکان وەڵام

بداتـەوە، هـەروەها بـەپێی نـاوەڕۆکی بڕیارەکـان ناجوڵێتـەوە و پێشـی ناخـات، ئـەو هۆکارانەش لەوانە ڕێ لە پێشکەوتنی گەریلا و شەڕی شۆڕگێڕانە بگرێت. ئێمەش شـەڕی شۆڕشـگێڕانەمان لەسـەر شـەڕی گەلـەری بـەڕێوە دەبـەین. ئەگـەر هـاتوو بـۆ سـاتێکیش دەسـتەبەرداری بـن، ئـەوا ئـەو پێگەیانـەی لەدەسـتتانداپە نـاتوانن بـەپێی پێویسـت سەقامگیری بکەن. هەربۆیە پێشەنگ لە کاتێکی وەهادا پێویستە خـۆی بکاتـە لێپرسـراو، هـەروەها پێویستیشـە لەسـەری بـەپێی کـات و پێویسـت وەڵام بداتـەوە، ئەوانـەی کـە وەڵامـیش نادەنـەوە و بـەو کـار و ڕەفتـارە خراپانـەیان دەبنـە کـۆنترا، پێشەنگیەکانیشـان هەوڵی ڕاست کردنەوەی ئەو شـتە نـادەن، بـەڵکو بەپێچـەوانەوە دەجوڵێنـەوە و تەنانـەت ئەم کارەش لەبەرچاو ناگرن. بـەڵام ئایـا ئـەو کەسـانەی کـە بـەم شـێوەیە ڕەفتـار دەکـەن دەتـوانن خۆیـان بکەنـە شۆڕشـگێڕ یـان نـا؟ بـەڵێ بارودۆخەکـە بەمشـێوەیە دەگوزەرێـت. لەکاتێکـدا شـەڕی تایبـەت لـە زۆر لایەنیـەوە بـە لێپرسـراوێتی و لێهاتوویـیـەوە بـەڕێوە دەچێت، ئێمـەش خۆمـان دەبینینـەوە کـە بـە وردبینیـەوە وەڵامـی ئـەو کـارە نادەینـەوە. ئەگەر بێتو هەر بەمشێوەیە بمێنینەوە، ئـەوا ئـەو کـارە شکسـتمان پـێ دێنێـت. لەوانەیـە هیچ شکستیەکیش لەئارادا نەبێت، بەڵام سەرکەوتنمان کەم دەبێتەوە و لە دوایشدا پەیتا پەیتا بەرەو بن بەستبوون دەچێت، ئەو کارەش هەرگیز شایستەی ئێمە نییە.

سەرۆکایەتی هەرگیز بەو پڕوپاگەندەیە ڕازی نابێت کە دەڵێت:"دوژمن بە هێزە و ئێمە هیچ توانایەکمان نییە کە لەبەرامبەریدا بجەنگین" ئەو کارەش تەنیا بانگەشەیەکی بـێ سـوودە و بـەهیچ شـێوەیەکیش بـیری لێناکەینـەوە. ئێمـە لـە کاتێکـدا بڕیارمانـدا کـە شەڕی شۆڕشگێڕانە بەرپا بکەین، بەوشەیەك دەستمان پێ کردوو خوێندمانەوە و پاشان بوو بە دوو وشە و هەر بەو شێوەیەش خەباتمان هەتا ڕۆژی ئـەمڕۆمان بـەڕێوە بـردووە. ئـەم تێکۆشـانەش ئـەوە ناگەیـەنێت کـە ئێمـە پێشـکەوتنمان بەخۆمانـەوە نـەدیوە و باوەڕیشمان بـە خۆمـان نییـە، بـەڵکو مەبەسـتم پشتبەسـتن بـە گەلـە لـە هـەر هـەنگاو و قۆناخێکدا. ئەم قسەیەشمان لە ڕوانگەیەکی زێدەڕۆیی یەوە نایەت، بەڵکو بەپێچـەوانەوە بڕیتین لە ڕاستی مەسەلەکان. سەرکەوتن بۆ ئێمە شتێکی مسۆگەرە و تواناکاری خۆمانی بۆ دەخەینـە گـەڕ بـۆ ئـەوەی پێداویسـتیەکانی بـۆ دابـین بکـەین. ئـەوەی کـە PKK ی گەیانـدە ئـەم ڕۆژە هەڵوێسـتی ئێمـە بـوو، کـە توانایمـان سـیمایەك بەخشـینە پەرەسەندنەکان. کەسانێك هەن کە هەوڵی لادانی هەڵوێستی ئێمە دەدەن و بەم کارەشیان

دەیانەوێت رادەی لادانی رێچکەو ئاراستەمان لەسەر ئەو هەڵوێستە لاواز بکەن. هەربۆیە ئێمەش پیان دەڵێین پێویستیمان بەو جۆرە هاوکارییانە نییە.

لە کاتێکدا ئەمرۆ گەلەکەمان کە بانگی سەرهەڵدانی خۆی داوە، ئەگەر بێتو لەلایەن ئێمەوە بۆ تەنیا رۆژێك چاوپۆشی لێبکەین و هاوکاری نەکرێت، ئەوا هەر زوو بەزوو لەناو دەبرێت و دەکوژێتەوە. ئەگەر کۆششی سەرۆکایەتیش نەبوایە ئەوا بەردەوامبوونی ئەو سەرهەڵدانانە شتێکی مەحاڵ بوو. بەتایبەتی ئەگەر هاتوو بکەوتبایە بارودۆخێکی لاوازەوە. هەربۆیەش ئێمە رۆژ لە دوای رۆژ هەوڵی بەهێزبوونی دەدەین و لە پێناویشیدا تواناکاریەکی مەزن دەخەینە گەڕ و، هەوڵدەدەین لەم پێناوەشدا تەگبیر و نەخشەی بەهێزی بۆ دارێژین و کارەکانیشمان مۆرکێکی پێشکەوتووانەی پێ ببەخشین.

ئەو کارانەش پێویستە بەو شێوەیە تێی بگەین و بەو شێوازەش لەگەڵیدا بژین و خەبات بکەین. منیش تواناکاریەکی زۆرم لەم پێناوەدا بە گەڕ خست بۆ ئەوەی لەم هاوینەدا بە شێوەیەکی قووڵ و شێلگیرانە ئەو بارودۆخە لەبەرچاو بگرین و تێی بگەین. چونکە زۆر بەپێویستی دەزانم و هەر بەم شێوەش دەتوانین ئەرکەکانمان بەجێ بهێنین. ئەوەی گرنگ بێت لێرەدا روونکردنەوەی بونیادی ئەو کادیرانەیە کە دەتوانن بەئەرکەکانیان هەڵسن، لە کاتی هەڵسەنگاندنیشیدا، ئەوا ئەو کادیرەی بونیادەکانی شیدەکرێتەوە، پێویستە لە ئاستێکدا بێت کە شایستەی ئەو کارانە بێت و بەشێوەیەکی دروست خۆی بۆ تەرخان بکات. بەڵام ئایا دەتوانین لەم بوارەدا سەرکەوتوو بین؟ ئەوا پێویستە گرنگیەکی زۆر بە مەسەلەی رێکخستن بدەین، هەروەها بتوانین تۆوی پەرەسەندن و پێشکەوتن لە خۆماندا بچێنین. ئەگەر پێویستیشی بکات، ئەوا سەرلەنوێ PKK بنیاد دەنێینەوە و هەنگاوی کادیرەکانمان دەخەینە روو و سەرلەنوێ بە هەڵس و کەوتنەکانیشیاندا دەچینەوە و، بەرەو ئەرکی سەرهەڵدانەکان رێگە دەگرینە بەر و بۆشایەکانیش پڕ دەکەینەوە. هەوڵی مەزن کردنی ئەو پێگانەش دەدەین و، پێگە لەکار کەوتووەکانیش دەخەینەوە گەڕ. هەروەها پێویستە هۆکارە ماددیەکانیش هەڵبسەنگەنرێت و، شەڕی گەلێریش بە زانایی و هۆشیاریەوە بەرێوە ببردرێت بەبێ جیاوازی کردن لە نێوان گەورە و بچووك، کە ئەوەش نزیکبوونێکی دروستە. هەروەها

پێویستە لایەنگرە سیاسیەکانیشمان ئەو ئەرکەکانە بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە جێبەجێ بکەن.

کادیری پێشەنگیش بەتایبەتی ئەو کادیرەی کە ئەو کارە تێدەگات و لە ئاستێکی بەرزەوە بەپرسیارێتی خۆی دەخاتە روو، کەچی لەلایەکی ترەوە ناتوانێت هاوکاری کەسانێك بکات کە لە خەباتدا دەمێننەوە. بەپێی ئەو بەڵێنەی کە ئێمە بە گەلەکەمان داوە ئەوا گەلیش دەتوانێت هاوکاری خۆی پێشکەش بکات، بەڵام کەسانێك هەن هەست بە لێپرسیارێتی ناکەن بەرامبەر بە شەڕی تایبەت، هەتاوەکو بگرە هەندێ کەسی سوك و کەوتو هەن دەڵێن: "باشترین کار ئەوەیە کە ئێستا ئێمە رابکەین و لەم زەمان و ژیانە خۆمان رزگار بکەین".

ئایا مێژووی ئێمە چییە؟ ئەوانەی کە پەنا دەبەنە بەر راکردن باروودۆخێکی خراپ لە مێژووی ئێمە دەخەنە روو، بەڵام بۆچی خۆمان بگەیەنینە ئەو باروودۆخە و لەگەڵ ئەوەشدا کەس نییە لە جیهاندا گەلەکەمان بناسێت. هەندێك دەڵێت: "ئەو مەسەلەیە بەمنەوە پەیوەست نییە، ئەو مارەش کە بەمنەوە نەدات با هەزار ساڵی دی بژی". هەندێکی تریش هەن دەڵێن: "ئەو قسەیە مەکە هەتا زیانمان پێ نەگیشتووە". ئیدی مەسەلەی وڵات و مرۆڤایەتی و ناسنامەی نەتەوەیی چی پێوە ماوە، چۆن خۆی بخاتە روو. پاش ئەوەش هیچ رێگاچارەکیان لەبەر دەستادا نامینێتەوە و تەنیا ئەوە نەبێت کە بەهەر چوار لای جیهاندا (وەك پەنابەر لە هەندەران) بڵاوببنەوە. بەڵام لەئەنجامی ئەو کارەدا پێویستە مرۆڤ خۆی بناسێت، کە بەچ شێوەیەك و چۆن و بەچ هەڵوێستێك ئەم رەوشتەی خۆیان لە دەستدا.

لەو بارگرانیەی کە پێیدا تێپەڕین لەدژی یەکتر راوەستان و هەموو شتێکیان لە دوای خۆیان بەجێهێشت، لەگەڵ ئەوەی کە وڵاتەکەیان (کوردستان) خاوەن مێژوویەکی چوار هەزار ساڵەیە. ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە ئەوان هەست بە لێپرسراوێتی خۆیان ناکەن، ئەو رێگا چارەیەشیان نەدیوە کە لەم باروودۆخە دەربازیان دەکات. ئەگەر هاتوو ئێمەش هەمان رێگا چارەی ئەوانمان هەڵبژاردبایە، ئەوا کێش و رێزی گەلەکەمان لەو بوارەی کە تێیدایە دەردەخست.

ئەو کەسانەی کە بەشێوەیەکی چاك ئەرکەکانیان بەرێوە نابەن، بێگومان ژیانی خۆیان لەدەیت دەدەن. هەربۆیە ئێمە لێیان دەپرسین، لەم بوارەدا چەند بەختەوەر و

سەرکەوتوون؟ ئەو گروپانەی کە لەدەرەوەی ڕێبازی ئێمەدا دەژین و ئەرکەکانی خۆیان هەڵناسەنگێنن، بەڵکو بەپێی فەرمانی دوژمن هەڵسوکەوت دەکەن لەوپەڕی بێ ئاگاییدا دەژین. هەروەك کەمال ئەتاتورك دەڵێ: "ئەو کەسەی لە غەفڵەتدا بژی و تێیدا بمێنێتەوە، ئەوا زۆر ساکارانە دەچێتە نێو زەلکاوی خیانەتەوە". ئێوەش لەهەمان ڕەوشدا دەژین. بەڵام ئێمە ئەم ڕەوش و هەڵوێستانە دەربازدەکەین، چونکە ئەم هەڵوێستانە لەتوانایاندا نییە بەرپەرچی شەڕی تایبەت بدەنەوە و بەسەریدا زاڵ بن، بەڵکو زیاتر بەرەو بە شەڕی تایبەت دەدەن. ئەمەش پیلانێکە لە پیلانەکانی شەڕی تایبەت، ئەو کەسایەتیانەش کە ئەم هەڵوێستانە دەخەنە ڕوو، بۆ گەل خۆیان دەکەنە هەڵگری ئاڵای شەڕی تایبەت و لەتاوانەکانیدا هاوبەشن.

ئێمە هەرگیز ئەم هەڵوێستانە پەسند ناکەین، لەبەرئەوەی PKK لە بەرخودان و خۆڕاگری پێکهاتووە. ئێمەش بەرامبەر ئەم ڕەوشانە بەرخودانمان کردووە و لەم هەلومەرجانەشدا فێر بووین کە چۆن بەرخودان بکەین، ئەرکێکی زۆر گرنگە، هەتاوەکو ئەگەر لەهەندێ شوێن پێویست بەڵێن و پەیمانیش بکات ئەوا PKK درێخی نەکردووە.

لەساڵی 1970 دا بابەتی هەرە گرنگ و بایەخدار بۆ ئێمە ئەوەبوو کە "کوردستان کۆلۆنیە". بێگومان ئەمەش لەئاستی بەڵێن و پەیماندا بوو، لەم بوارەشدا گفتووگۆیەکی زۆرمان لەسەر ڕەوشی کوردستان کرد، کە لەهەمان کاتدا ئانارشیستیی باڵی بەسەر گۆڕەپاندا کێشابوو و زانیاریش دەربارەی گەل و وڵات زۆر کەم بوو. بەم گفتوگۆیانەش ئەم ڕووداوەمان ڕوون و یەکلایی کردەوە، هەروەها وتمان ئەم کارە پێویستی بە ڕێکخستنێکی سەربەخۆ هەیە، لەم چوارچێوەیەشدا تێکۆشاین و خەباتمان کرد تا گەیشتین بە قۆناخی بەپاکردنی شەڕ و، ڕووبەڕوو بوونەوەی کێشەکان.

ووتمان ئەم کارە پێویستی بە "شەڕی گەلەری" هەیە و دواتریش هەڵساین بە ئامادەکاریەکی مەزن، ساڵانێکی دورودرێژیش بەگریمان کرد. هەندێك کەس لەسەرەتادا ووتیان "بەهۆی لاوازیان ناتوانن لە دوژمن بدەن و ئەگەر زیاتر لاواز ببن ئەوا بۆ چەند مانگێکی تر کۆتاییان پێ دێت. ئەو کەسانەی بانگەشەیان بۆ ئەم پڕوپاگەندانە دەکرد لەڕادەبەدەر باوەڕیان بە دوژمن هێنابوو. بەڵام ئێمە ئەوانەمان لە ناوەڕۆکەوە پووچەڵ کردەوە. شەڕی تایبەتیش بەهەمان شێوە پووچەڵ دەکەینەوە.

هەروەها دەیانگووت "بێ سێ و دوو ئەمانە لە دەستاری شەڕی تایبەت رزگاریان نابێت". بەڵام ئێمە گەریلا و شەڕی پاتیزانمان خستە روو و بەگەڕمان خست بۆ رووبەڕوو بوونەوەیان، لەهەمان کاتدا جوڵانەوەی PKK ئەو چوارچێوە تەسکەی کە تێیدابوو شکاندی و لەهەموو لایەکی جیهاندا ناسرا و دەنگی دایەوە. ئەو بنچینانەی کە بزووتنەوەکەمان لە پێشکەوتن و پێگەیاندنی خۆیدا پشتی پێی بەستووە، دوژمنیش دانی پیاناوە. هەڵوێستی راست بۆ ئێمە دەرەنجامی باش بەدەست دێنێ. بەڵام ئەگەر هاتوو هەر لەگەڵ ئەو کەسانە بمابایایەوە کە ئەنجامێکی سادە و ساکاریان بەدەست هێنا لە ئەرکەکانیاندا، ئەوا بەرەو نەمان و لەناوچوون دەچووین.

ئەگەر بێت و ئێستا بەشێوەیەکی دروست و بابەتی مێژوو هەڵبسەنگێنین، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ کە PKK لەم رەوشەدا جێگەی خۆی کردۆتەوە و لە پێشکەوتنیشدایە، ئەمەش لەگۆڕەپانەکەدا بەدی دەکرێ. هەروەکو دوژمنانمان دەڵێن: ئیسماعیل بێشکچی بەجارێك بۆتە یارمەتیدەر و لایەنگری PKK. هەرچەندە کە پەیوەندیەکی بە PKK وە نییە، تەنیا دەخوازێ ببێتە خاوەن بنەمایەکی زانستی لەسەر کێشەی کورد و کوردستان. چونکە زانست مانای بینینی واقیع و لایەنەکانیەتی و، هەڵسەنگاندنیەتی بە گوێرەی رێبازی راستەقینە. جا ئیسماعیل بێشکچی هەڵدەستێ بەم لێکۆڵینەوانە و دەڵێ:"PKK پێشەنگی هەموو پێشکەوتنێکە و، هەر ئەویشە گەل دێنێتە مەیدانی ئازادی و رزگاری". هەروەها لەم بوارەشدا چەندین نووسین و پەرتوکی هەیە وەك نووسەرێکی تورکی خاوەن پرەنسیپ. دوژمنیش ئەم راستیە دەسەلمێنێ کاتێك دەڵێ "کوردەکان دوژمنمانن". تەنیا ئەو کەسانەی نەکەوتوونەتە ژێر کاریگەری PKK وەکو دوژمن دەڵێن "PKK پارتیەکی نهێنی و تیرۆستە" بۆ ئەوەی PKK لە تورکیا و جیهاندا پاکتاو بکەن. لێرەشدا ئەو راستیەی سەرەوەمان باشتر بۆ روون دەبێتەوە و دەردەکەوێتە روو. لەم چەند ساڵەی دواییدا هەموو لایەك چ دۆست چ دوژمن ئەم راستیەیان سەلماندووە، PKKش وەکو پێویست وەڵامی داوەتەوە.

لە قۆناخی ئێستاماندا، سیاسەتی پارتیمان هەڵدەستێ بە رێکخستنی چالاکیەکان بەشێوەیەکی رێکوپێك و دروست و، ئەنجامی پێویستیش ئەدات بەدەستەوە. ئەوەی لەم رووەوە ئاماژەمان پێکرد، ئەو کاتە کەسانێکی زۆر کەم بروایان پێکرد. بەم پێیە هەوڵە سەرەتاییەکان و یارمەتیەکانیان بە ئەندازەی ئەو بڕوا پێ نەکردبوو، کەچی ئەمڕۆکە

ئەم سیاسەتە دروستە لەپێش هەموو سیاسەتێکەوەیە.

ئەگەر بێت و ئەوانەی کە لەدەرەوەی ڕێبازی پارتین وازیان لێبهێنین، دەبینین کە چۆن خۆیان لەناو ڕۆژگاردا ون دەکەن و بەبێ ئەوەی بزانن دەگۆڕێن بۆ ئامرازێکی شەڕی تایبەتی. بۆیە دەپرسین چەند کەس توانای وەڵامدانەوەی هەیە بەپێی قۆناخ؟ بڕیار و ئامادەکاری پێویستە بە گوێرەی ئەمە بێت (واتا قۆناخ)، ئەمەش فەرمانێکی زۆر گرنگە.

لەمێژووی PKKدا، کاتێ بە شێوەیەکی دروست سەرمان هەڵدا و هاتینە مەیدان، هەر لەو کاتەوە هەڵسەنگاندنی چالاکی و خەبات بەپێی قۆناخ گونجاو بووە. جا ئەو کەسانە پلەیان چەند بوو و تا چ ڕادەیەك توانیان وەرگرتن و جێبەجێ کردنیان هەبوو؟ و ئەو ڕەخنەنانەی کە کردمان و پێی هەڵساین لەم بارەیەوە، ئاراستەی ئەو کەسانەمان کرد کە بێ باوەڕ بوون و لە ڕێگا لایاندابوو.

لەلایەکی دیکەوە هەوڵی "چەپە توونـدڕەوەکان و ڕاسـتڕەوە پاکتاوەکانی تورکیا" کە دەیانخواست بەرەو دواوە پەلکێشمان بکەن و، خەباتەکەمان لە ناوەڕۆکەوە پووچەڵ بکەنەوە. بێگومان ئەمەشیان بەنیازێکی خراپ نەبوو، بۆیە دەڵێین ئایا ئەم کۆششانەیان تا چ ڕادەیەك بە ناچاری بووە؟ جا ئەگەر لەهەر کاتێکدا ڕووبەڕووی ئەوانە نەبووینایەوە و بەسەریاندا زاڵ نەبووینایە، چی ڕووی دەدا؟

بۆ نموونە؛ ئەگەر مەسەلەی کورد و کوردستانیش بدەینە لاوە، لەتورکیادا نەك تەنها دیموکراسی بەڵکو پیتی (د) کەشی هەبوونی نییە و دەست ناکەوێت". بێگومان ئەمەش جێگای سەرنجە.

پێش هەموو شتێك ئەو هێزەی کە لە نێو ئێمەدایە ڕێبازی شۆڕشگێڕییە، کە بەپاراستنی بەرخودانمان پێی دەبەخشێت و دەوڵەمەندمان دەکات. لەو ئامادەکاری و کۆبوونەوانەی کە لەنێو خەبات و ڕێکخستندا ساز دەکرێت، دەتوانین بۆ زۆربەی شێوەکانی چالاکی و خەبات سوودی لێ وەبگرین.

وەك سەرەنجام دەتوانین بڵێین؛ شەڕ تایبەتیان بۆیە خستە مەیدان، تاوەکو ڕۆژانە ڕووبەڕوومان ببنەوە. لەهەمان کاتدا ئێمە باش دەزانین ئەگەر بێتو بە پێوەرێکی کرداری ڕێکخستنی ئەرك و ڕەوشەکان هەڵبسەنگێنین، ئەوا دەگەینە گەشەسەندنێکی

زۆر گرنگ.

ئێمە ئەمانەمان زۆرجار دووبارە کردۆتەوە، کە شەڕی تایبەت شێوەیەکە لەو جەنگانەی کە ماوەی کورتە و زۆریش ناخایێنێ. هەر لەبەر ئەوەش دوژمن ناخوازێت شەڕێکی درێژخایەن چ لەڕووی ماددی و چ لەڕووی مەعنەویەوە بەرێوە ببات، چونکە لە رووی ماددیەوە پێویستی بە خەرجی دەبێت و لەڕووی مەعنەویشەوە ئەم کارە وەك تاوانێکی دژ بە مرۆڤایەتی لەقەڵەمدەدرێ و لەوانەیە ئەو کەسانەی کە ئەم ئەرکە بەجێ دەگەیەنن مرۆڤایەتییان بکەنەوە. ئەم کارەش لەلایەن جیهانەوە نەفرەتی لێکراوە و ئەنجامدەرانیشی ریسوا دەکرێن و، دواتریش دەکەونە رەوشێك کە ناتوانن ژیانی تیا بەسەر بەرن. هەروەها ئەو دەڵەتانەی کە شەڕی تایبەت بەرێوە دەبەن، حکومەتەکانیان دەگەیەننە ئاستێك کە نرخیان پێنج فلس ناکات. بەکورتی خۆیان بە تەواوی ریسوا دەکەن و کۆشەگیر دەبن. ئەم راستیەش بە ئاشکرا لە شەڕی ڤێتنامدا دەردەکەوێت، ئەگەر هاتوو ئەمریکا لەداگیرکردنی ئەم وڵاتە بەردەوام بووایە، ئەوا خۆی لەگەلی ئەمریکا دادەبڕی، کە ئەمەش گەورەترین شکست و دۆڕاندنە.

ئاکامی شەڕی تایبەتی تورکیاش هەر هەمان چارەنووسی دەبێت. ئەو ترس و لەرزەی ئۆزال و ئێفرینیش خۆی لەخۆیدا بەڵگەی سەلماندنی ئەم راستیەیە. بێگومان ئەم ترسەش بێ سوود نییە، هەر بۆیە دەستیان کردووە بە نووسین و وتوێژ لەدەزگاکانی راگەیاندن، کە دەیان گوت:"ئێمە هەتاوەکو ئێستا شتێکی زۆرمان بەخشیوە"، مەبەستیشمان لێرەدا ئەوە دەگەیەنێ کە دابڕان و ریسوا بوون بەشێوەیەك تەشەنەی کردووە هەتا بگرە گەلی تورکیشی گرتۆتەوە. هەروەها کوردستانیش کە ماوەیەکە لەرەوشی هەڵچوون و تەڤینەوەدایە، هەر لەو کاتەشدا ئەم شەڕە بۆ ئەوان مایەی مەترسیە. ئەگەر لەکاتێکی کورتدا سەرکەوتنیان بەدەست نەهێناوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە لەهەر کاتێك زیاتر هەوڵەکانیان پووچەڵ دەبنەوە. بەمەش ئەو شەڕە تایبەتە لەناوەرۆکەوە پوچەڵ دەکرێتەوە. ئێمەش دەگەینە سەرکەوتن و لە ماوەیەکی کورتدا بەسەر ئەو شەڕەدا سەردەکەوین. بەڵام ئەگەر شەڕی تایبەت سەربکەوێ، ئەوا ئەو دەستکەوتانەی کە بەدیمان هێناوە لەناوی دەبەن و وڵاتەکەمان دەکەنە زەویەك کە رووەکی تیا نەڕوێت. ئەگەر هاتوو سەرکەوتنیشیان بەدەست نەهێنا، ئەوا زەمینەی شکستی و لەناوچوونی خۆیان خۆش دەکەن.

تورکەکان ئایینـدەی خۆیـان دەترسـن، سـەرەڕای ئـەوەی کـە نزیکـەی سـەدەیەکی تەواوە پشتیان بەشەڕی تایبەت بەستووە، لێرەدا کۆششێکی کوشـندە لـە پێنـاو پاراسـتنی کاریگەری بـەردەوامبوونی شـەڕی تایبـەت لـە دژی PKK دەخەنـە روو. بەواتایـەکی تـر هاوپەیمانەکانیان سـەرکەوتنیان بـۆ دەخـوازن لـە پشـتگیری کردنیـان لـە شـەڕی تایبـەت. بیگومان ئەمەش بۆ ئەوان مانای مـان و نـەمان دەگەیـەنێت. لەبـەر ئـەم هۆیـە دەڵێین: چۆن توانیان شەڕی تایبەت لەم چواچێوەیەدا بخەنـەروو، هـەموو هێـز و توانایـان تیایـدا بخەنـە گـەڕ، هـەروەها چۆن چاوپۆشـی لـەو کەمووکوڕیـە بچووکانە دەکـەن، چـۆن بـەو هەموو ورد بینیەوە شەڕی تایبەت پیادە دەکەن؟. ئەگەر بێت و بەوردبینیـەوە سـەرنجی حکومـەتی ئێسـتایان (واتـا 1990) بـدەین، ئـەوا بەتـەواوی حکومـەتی شـەڕی تایبەتـە. نـەوەك"ئـاقبولوت" چـونکە ئەرکـەکانی سـنووردار و سـادەیە و دەسەڵاتیشـی زۆر کەمـە، خۆشی ئەم راسـتیە بـەڕەنگێکی دیکـە دێنێتـە زمـان، وەکـو دەڵـێ: سـەرەڕای بـێ توانـایی لەبواری ئابووری و سیاسەتی دەرەوە، لە رابردوودا وەزیری دەرەوە بووم ئێستاکەش بووم بە سەرۆك وەزیران. ئەمەش لە راستیدا ئەوە دەگەیەنێ کە خزمەتکاری شەڕی تایبەتـە. واتـە کەسـایەتیەکە بـە شـێوەیەکی بـاش لـە خزمـەتی شـەڕی تایبەتدایـە و لەخۆیـدا بەرجەسـتەی کـردووە. هـەروەها ئـۆزالیش چـۆن بـوو بـە سـەرۆك کۆمـار؟ ئـەم پرسـیارە پێویستە بە شێوەیەکی بەرفراوان لێتوێژینەوەی لەسەر بکرێ، چونکە بوونی بە سەرۆك کۆمار هەروا بەخششێك نەبوو لەلایەن بۆرژوازیەکانـەوە، کەچـی ئەمرۆکـە کـەمال یـامق سـەری هـەموو پەتـەکانی بەدەسـتیەوەیە، ئـۆزالیش وەکـو بوکەشوشـەیەکە بەدەسـتیەوە. کاتێ یامق شـتێ بخـوازێ ئـۆزالیش بـە زیـادەوە جێبـەجێی دەکـات، کەواتـە ئـۆزال بـەپێی پێـوانی شـەڕی تایبـەت ئـەرکی سـەرۆکایەتی کۆمـار بـەڕێوە دەبـات. هـەروەها ئینۆنـۆ و دەمیرێلیش بە خۆیان و هەموو کۆمەڵگاشەوە لەگەڵ ئـۆزال رانـەهاتبوون، تـاوەکو لەسـەر کراسەکانیشیان نووسیبوو: "ئۆزالمان ناوێ". بەڵام ئێستاکە هـەموویان لـەخۆیان گرتـووە. تەنانەت خودی ئۆزال دەڵێت "واتان لێدەکەم کە بـەمن لـەخۆوە بگـرن". راسـتە توانیـان لەگـەڵی بگـونجێن، چـونکە ئـۆزال باڵندەیەکـە لەپشـتیەوە جەنارالـەکانی سـوپا خۆیـان شاردۆتەوە. رۆژنامەکانیش ئەم راستیەیان دەست نیشان کردبوو، تاوەکو هەندێك دەڵێن: "ئەو شتە بووە هۆکارێك کە هەریەك لـە ئـۆزال، ئینۆنـۆ و دەمیرێـل لـە کۆبوونەوەیـەکی

بالآدا کۆببنـەوە بگەنـە یـەك و لـەکاتی ئـەم کۆبوونـەوەیەشـدا هـەموو ئـەو کەسـانەی کـە پێشـتر ئۆزالیـان پەسـند نـەدەکرد پێـی رازی بـبن و، بـاوەڕی پـێ بێـنن. لێـرەدا ئـەوەی دەیانــەوێ بیڵــێن و، ئــەو شــتەی لــەو راســتیانەوە رەچـاو دەکـرێ ئەوەیــە کــە شــەڕی شۆڕشگێڕانەمان وەهای کرد کە هەموویان سوێند بە سەری ئۆزال بخۆن و پێی رازی بـن. لەبەر ئەوەی مامۆستای شەڕی تایبەت بوو و، دژ بە شۆڕشە بەتایبەتی کاتێـك پـەردەمان لــەڕووی شــەڕی تایبــەتی ئــەو هــەڵماڵی و، هەڵســاین بــە ســەلماندی دەســتدرێژیەکانی دەســەلآتداران. کەواتــە ئــەو رکەبەریــەی کــە ئینۆنــۆ و دەمیرێـل سـەرۆکایەتی دەکـەن، لەبۆشایەکدا دەژین کە لە بۆشایی حکومەت گەورەترە. لەبناخەدا جگە لەشـەڕی تایبـەت هیچ دەسەلآتێکی تر لەتورکیادا نییە. ئەمـەش وەکـو خزمـەتێکی مـەزن بـۆ ئـەم راسـتیە خراوەتە روو.

لەسـەر ئـەم بنچینیە پێویسـتە گفتۆگـۆ لەسـەر رێکخسـتن و کـار و خـەبات بـە شێوەیەکی راست بەرەو پێش بچێت. ئەگەر چاوێك بە رۆژنامەکانی ئەو چەند مانگەی رابردوودا بخشێنین ـ بەتایبەت پێش ئەوەی رۆژنامەوانان گوێبیستیی بڕیـاری سانسۆری راگەیانـدن بـبن و گوشـاریان بخرێتـە سـەر ــ دەبیـنین راسـتی رژێمـی تورکیایـان ئاشـکرا کـردووە. بـەمجۆرە لەماوەیـەکی کەمـدا ئـەم رژێمـە هـەرەس دێـنێ و تەمـەنی درێـژنابێ، چونکە درێژەپێدانی دەسەلآت لـە بەرژەوەنـدی ئەوانـدا نییـە، لەبـەر ئـەوەی بـەهاکانیان هــەموو کــاتێ لەدەســت دەدەن و، بەئەنــدازەی دەریــاش خــەرجی لێدەکــەن. لــەڕۆژی ئەمڕۆمانـدا زۆربـەی شـێوازەکانیان روون دەبێتـەوە، بەتایبـەتی ئـەو شـێوازەی کـە پشـت ئەستوورە بە رێبازی فێڵ و تەڵەکەبازی، چاوچنۆکی و پارێزگـاری کـردن و، لـە شـێوازی فرۆفێڵدا بازرگانە چاوچنۆکە بێ ویژدانەکانیان تێپەڕ کردووە.

لەپێناوی ئەمانەشدا هەڵسـەنگاندنە نوێیـەکانمان لـەم بـوارەدا زۆر گـرنگن و، هـەر لەسەرەتاوە ویستمان ئەو هـەموو کەموکوڕیـە زۆروە روونـی بکەینـەوە کـە تێیکـەوتوون. ئەمانــەش هــەموو کــەموکوڕی کادیرەکانمـان بــوو کــە خســتمانە روو تــاوەکو لەســەریان رابوەسـتین و پاکتاویـان بکـەین. هەربۆیـەش وێـڕای زۆری و زەحمـەتی شـەڕ و لەسـەر بنـەمای سیاسـەتی کـادیری راستەقینە دەبـێ بـیر لـەم مەسـەلەیە بکەنـەوە. خواسـتمان لەسەر پەروەردەی کادیران راوەستین، بۆئەوەی لەم رەوشە نابوودە رزگار ببین، لەهـەمان رێگاشەوە بە شێوەیەکی چاك شەڕ بکەین. جا چ لە پێناو نیشـتماندا بێـت یـا لـە دەرەوە،

بەمشێوەیە دەتوانین سەری کێشەکان بگرینە دەست. لە کاتێکدا کە مەسەلەکە کێشێکی مەزن لەخۆوە دەگرێت، ئەگەر هاتوو هەڵەیەکی بچووکیش روویدا لەوانەیە بە لێکدانەوەیەکی ساکار گەلێك شت لەدەست بدەین. بەڵام لە نێوان پیادەکردنی سیاسەتێکی راست و دروست رووی ناهەمواری شەڕی تایبەت بەرەو ناهەماتی و خنکاندن دەچێت، کەچی هەندێکیان بیر لە چاکسازی ساختەکارانە دەکەنەوە و، خۆیان بەخەندەی لێوان و زمانی لوس دەخەنە روو.

ئەمە هەروا شتێکی سادە نییە، بۆیە دەیانەوێ PKK پارچە بکەن و ئامانجیشیان بەچاکی دیارە. هەربۆیە دووچاری کەند و کۆسپ دەبن. ئەگەر سەرکەوتنیشیان لەم شەڕەدا بە شێوەیەکی تەواوەتی بێت، ئەوا خۆیان دەخەنە نێو رەوشێکی زۆر خراپ و نابوود. ئەم رۆژگارەش کە تیایدا دەژین ئەوا لە بەرژەوەندی ئێوە یان دوژمن دەشکێتەوە. بەڵام بە چ لایەکدا ئاراستە دەگرێت؟ بەراستی رەوشێکی گرانە و لەهیچ هەڵەیەکی بچووکیش خۆش نابین. ئەوەی جڵەوی شەڕ و دەستپێشخەری بخاتە دەست خۆی، ئەوا لەم شەڕەدا سەردەکەوێ و زاڵ دەبێ. لە پێشخستنی شەڕدا، شەڕی شۆڕشگێڕانەمان بەرامبەر بە شەڕی تایبەتە. پێویستە لەسەرمان هەر بەو پێیەش نزیکی ئەرکەکانمان ببینەوە و هیچ رێگاچارەیەکی دیکەمان نییە، ئەمەش شتێکی روون و لەبەر چاوە.

کاتێك ئەم مەسەلانە لە هەر گۆڕەپانێکدا دەبینین، ئەوا تەنها سەرکردەیەك هەیە کە ئەرکی لێپرسراوێتی رووداوەکانی دوا رۆژ دەگرێتە سەرشانی خۆی و، بەرپرسیاریشە لە هەموو تەگبیر وەرگرتێك، تواناکاریەکی کەم خەرج دەکات و سەرکەوتنیش دەستەبەر دەکات. بەمشێوەیە دەبێ سەرکردە رەفتار بکات، لەلایەکەوە پێویستە بەشێوەیەکی باش پێش بکەوێت، لەلایەکی دیکەش پێشکەوتنی چاوەڕوانکراوی شەڕی ئێمە پشت ئەستوورە بەم بناخەیە. لەم پێناوەشدا ئەو گۆڕەپانانەی کە بە قووڵی لەسەریان راوەستین لەم بوارەدا و لە رووی چەندایەتی و چۆنایەتی، ئامانج قووڵکردنەوە و گۆشکردنی کادیرەکان بوو لە پێناوی نوێکردنەوە و ئامادەکردنیان، لە سەرجەم ئەو گۆڕەپانانە بەم کارە هەڵسااین و دواتریش سەرکەوتنمان بەدەست هێنا. هەروەك پێش ئێستا روونمان کردەوە، کە ئەو کادیرانەی رووبەڕوومان دەبنەوە، ئەو کادیرە کۆنەپەرستانەن کە بە

ئـەركی خۆیـان هەڵنەسـتاون. هـەر لێپرسـراوێتیەك كـە لەبەرژەوەنـدی شـەڕی شۆڕشگێڕانەماندا بێت، مافی خـۆی دەیـدەنێ و بـە ئـەركی خۆمـان هەڵدەستین، تەنانـەت هەندێك جار زیان و شكستیمان تەنها لەو شوێنانە بوو كە ئەو جۆرە كادیرانەی تیابوو.

بڕواننـە شـۆڕش كـە تـا چ رادەیـەك ئـەو تواناكاریـەی لەدەسـتتاندا بـوو هـەڵتان سەنگاند؟ بێگومان بە رادەیەكی زۆر كەم بووە. ئێوە تاوەكو ئێستا لـەم پـەرش و بڵاویـە خۆتان كۆنەكردۆتەوە و نـەتان توانیـوە كـۆنترۆڵی كەسایەتی خۆتـان بكەن. توناكاریتـان چەندە بۆ پیـادەكردنی شـەڕی شۆڕشگێڕانە بەرامبـەر شـەڕی تایبـەت؟ ئـەو سـەركردەی شەڕێكی بەمجۆرە پەش و بڵاوە بەڕێوە ببـات، سـەركردەیەكی وەهـا هـەرگیز لـە توانایـدا نییـە شـەڕی شۆڕشـگێڕی پێشـبخات. كادیرەكـانی ئێمـەش بـە رەنگێكـی پتـەو لەگـەڵ كارەكانیـان بەرجەسـتە نـەبوون، بەمشـێوەیەش نـاتوانن شـەڕی شۆڕشـگێڕانە پـەرە پـێ بـدەن. هـەموو ئـەم كەسـانەمان لـەماوەی ئـەم قۆناخـەدا رەخنـە كـرد و، لـە ئاكامیشـدا سەرەنجامی گرنگ بەدی هاتن كە پێویست بوو بەدەست بێت. ئەگەر هەنـدێ پێشكەوتن لە بەرژەوەنـدی ئێمـەدا لـە ئـارادابن و، ئـەوەی پێویست بـوو پێـك بێـت، جێبـەجێ كـرا، هەمووی لە ئەنجامی رەخنە گرتن بووە. بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا ئـەو كادیرانـەی خۆیـان خستە رەوشێكی بێ ئومێدیەوە لە چالاكی رێكخستندا، تاوەكو وایـان لێهاتووە بـۆ مـاوەی چەند مانگێك دەستیان لـە خۆیـان بـەرداوە و هەنـدێكی تریشـان وەكـو زەڕافـە لەخـەودا دەمێـنن. ئەگـەر یارمـەتی ئـەو كەسـانەمان نەدایـە و دەستمان نـەگرتبانا چیان بەسـەر دەهات؟. چۆن دەیانتوانی بژین بەبێ كۆششی ئێمە كە كردمان لە پێناو ووردبوونەوە لـە پەیوەندیەكان و پاراستنیان لـە هـەموو بوارێكـەوە. ئایـا دەیـانتوانی چوارچـێوەی شـەڕی تایبـەت بشـكێنن و لـەناوی دەربچـن، هـەروەكو لـە سـاڵی 1988دا ئـەم مەسـەلەیەمان بەوپەڕی وردبینینەوە خستە روو.

لــە بەرامبــەردا بەڕێوبەرایــەتی رەوشــی نائاســایی لەناوەڕاســتی 1988دا كۆبوونەوەیـەكی باڵایـان بەسـت و نەخشـە و پلانـی پێویسـتیان داڕشـت و هەڵسـان بـە رێكخستنەوەی سوپا و ئامانجیشیان لەم پلان و نەخشانە بنبڕكردنی PKK بوو لەناوە و لە دەرەوە. هەر ئەو كاتەش دەستیان كرد بە شاڵاوێكی قڕكردنی داڕێژراو.

زۆر بـەووردی ئـەم كارانـەمان لەبەرچـاو گـرت و هەڵسـاین بـە چـڕكردنەوەی كۆششـەكانمان و، هەڤاڵانیشـمان ئاگـاردار كـردەوە، كـە گرنگـی بـەم مەسـەلەیە بـدەن و

لەبەرچاوی بگرن. بۆ ئەمەش ڕێنماییمان بۆ هەموو ناوچەکان ڕەوانە کرد، بەڵام کادیرەکانمان بە قووڵی تێی نەگەیشتن و بیریان لێنەکردەوە. لە ئەورووپا سەرەڕای ئاوەڵابوونی ئەو بوارە فراوانانەی کە لەبەردەستیاندا بوو و لەگەڵ ئەو هاوکاریانەی ئێمە پێشکەشمان کردن، کەچی لە ئاکامدا دەرکەوت کە بەشێوەیەکی ڕاست و دروست ئەو دەرفەتانەیان هەڵنەسەنگاندووە.

ئێمە تایبەتمەندێتی پەرەسەندنی شەڕی تایبەت و شێوازی بەرخودان و دەرفەتی سەرکەوتن لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو شەڕەمان خستە ڕوو. لێرەدا پێویستە هۆی سەرنەکەوتنی دوژمن لەم شەڕەدا باش بزانین لە هەمانکاتدا هۆی سەرنەکەوتنی ئێمە وەکو پێویست بزانین.

هەروەکو پێشتریش ووتمان ئێمە کەمتەرخەم بووین لە جێبەجێکردنی ڕێبازی پارتی لەبواری کرداریدا. باش بیر بکەنەوە، ئەگەر بێتوو ساڵی 1989 موداخەلەمان نەکردبا چی ڕووی دەدا؟ و کاریگەریە نێگەتڤەکانی ساڵی 1988 لە چ ئاستێکدا دەمانەوە؟ هەروەها لە ئەورووپا ئەگەر ئێمە لێرەوە بەڕێوەمان نەبردایە ساڵی 1988 چی ڕووی دەدا؟ تاوەکو زیندانەکانیش بەرەو سەرنگونی دەچوون ئەگەر چاودێری و هاریکاری و خەباتی ئێمە نەبوایە، بێگومان ئەگەر مانگرتن نەبوایە ئەوا بەرخودانی زیندانەکان کۆتایی پێدەهات.

لەم پێناوەشدا لە نزیکەوە هەڵساین بە هەڵسەنگاندنی ئەم مەسەلانە هەر لەسەرتای ساڵی 1989. هەوڵێکی زۆرماندا، بەڵام بەداخەوە نەیانتوانی تەنها سوود لە پەنجا کادیریش وەربگرن لەو کادیرانەی کە ڕەوانەی ئەورووپامان کردبوون، کە لەتوانایاندا هەبوو بەشێوەیەکی زۆر باش نیشتمان ڕزگار بکەن.

ئەم کەوکوڕیانە لەو کەسانەدا ڕوویدا کە پێویست بوو بەرامبەر ئەمجۆرە چەمك و هەڵوێستە هەڵانە هەست بە لێپرسراوێتی بکەن، بەڵام بەپێچەوانەوە بە گیانێکی بێ بەپرسیارنە و بەڕەنگێگی هەڵە لە ئەرك و دەسەڵاتدارێتی خۆیان نزیك بوونەوە، بەم نزیکایەتیەشیان زیانیان بە خۆیان گەیاند و گەیشتنە ئەو باوەڕیەی کە سەرناکەون و هیچ سوودێك نابینن.

بەڵێ ساڵی 1989 توانا و دەرفەتێکی زۆرمان بەدەستەوە بوو، کەچی

سەرکەوتنێکی کەممان بەدەست هێنا. ئەم سەرەنجامە لاوازەش لە ئاکامی بەگەڕخستنی تەواوی گۆڕەپانەکان بوو و، هیچ شوێنێکمان بە بەتاڵی نەهێشتەوە و بەپێی توانا سوودمان لێوەگرت. هەروەها ئەو هەنگاوانەی پێویست بوو هاوێشتمان. سەرباری هەموو ئەمانە هەندێك لەو کادیرانە خواستیان لەسەر ئەم راستی و ماندوبوونە خۆیان بژێنن. کەواتە چۆن ویستمان بە زیندوویی بمێنن و لە کاتی تەنگەتاویدا چۆن هەڵس و کەوتیان کرد؟

هەستاین بە روونکردنەوەی ئەرك و کارەنمان، کە بەشێوەیەکی فراوان نەخشە و پیلانەکانمان خستە بەردەم کادیران بۆئەوەی توێژینەوە لەسەر خۆیان بکەن و لەسەری راوەستن. لەساڵی 1989 زۆر بەوردی و هەستیاری لەسەر ئەم مەسەلەیە راوەستاین و، بەپرسیارێتی ئەم مەسەلەیەش بە گشتی کەوتە سەر شانی کادیر. هەر لە مانگی شوباتی ئەو ساڵەدا دەستمان کرد بەچالاکی دەستێوەردان بۆ نێو گۆڕەپانی وڵات. لەلایەك شیکردنەوە و توێژینەوەی زۆرمان بۆ ناردن و لەلایەکی دیکەش هاریکاری ماددی و پێداویستیەکی زۆرمان لە رووی چەك و جبەخانە و کادیر و جەنگاوەران پێبەخشین. لەسەر ئەم بنامایانە ئەو رەوشەی رووبەڕووی دەبنەوە دەکەوێتە ئەستۆی کادیر. لەبەر ئەوەی سەرجەم توانای خۆیان نەبەخشی و چالاکیەکانیان لە شێوازی شەڕی گەریلایی و سەربازیدا پیادە نەکرد و، خۆیان نزیکی چالاکی رێکخستن نەکردەوە. بەڵام ئێمە جارێکیتر لە بەرامبەر هەموو ئەم مەسەلانە لەهەر لایەکەوە هەوڵ و کۆششێکی بێسنوورماندا. لەم پێناوەشدا هەستاین بە ناردنی رێنمایی و چەندین کادیری لێهاتووی جەنگاوەر. بەم شێوەیە هەموو شتێك لە کاتی خۆی و زۆر بە وردی دابین دەکرا.

ئەو کۆمەك و هەوڵدانەی لەساڵی 1989 نەمان بەخشی، ساڵی 1990 جێبەجێمان کرد. ئەگەر وانەبوایە لە کۆتایی ساڵی 1989 هیچ شتێك نەدەما، پێویست بوو ئەم مەسەلانەش زۆر بەجددی بیریان لێبکەنەوە و لەسەریان راوەستن، هەروەها ئەگەر بەشداری و پێشگیری ئێمە نەبوایە و لە کارەکانتان وازمان بهێنا لەم رەوشە، چەند کەستان تیا دەمایەوە لەم هەلومەرجەدا کە پابەندبێ بە بەڵێن و پەیمانی خۆی؟

هەربۆیە دەستێوەردانمان کرد و هەستاین بە بەخشینی هاریکاری ماددی و هەوڵی بەردەوام. دوای ئەم هەموو هەوڵ و کۆششە بێوچانە لە هەندێك گۆڕەپان و چەند خاڵێکدا بەرادەیەکی کەم بەرەو پێشەوە چوون. ئێستاش دەمانەوێ بەپێی هێزی

ڕێکخستن پێشتان بخەین و وشیارتان بکەینەوە، لە کاتێکدا کە کۆڕ و کۆبوونەوە سازدەکەن و زۆر بەزەحمەت بڕیار دەردەکەن، کەچی لە هەندێك شوێن بە شێوەیەکی وەها بێ پیلان و پڕۆگرام هەڵسوکەوت دەکەن کە شەڕی تایبەت دەبێتە کۆسپ لەبەردەمتان.

وەکو ئاشکرایە خەباتی ساڵێك بە کۆششێکی سەرانسەر ئەنجامی تەواو بەدەستەوە نادات. لە کاتێکدا کە بۆچوون و تێڕوانینی دەوڵەتی تورکیا بۆ بۆ گشت دەردەکەوێت، کە ئەو شتانەی لە رووبەڕوو بوونەوەی ئێمەدا دەردەکەون لەماوەی ئەمساڵدا مسۆگەر ئیفلاس دێنێ و مایە پووچ دەبێت. ئەم تێڕوانینەی دەوڵەتی تورکیاش لە هەڵسەنگاندنی ساڵانەیدا بەم شێوەیە دێت: "PKK زۆری نەماوە کۆتایی پێ بێت و چەند کەسانێکیان ماوە"، ئەم گوتراوەش پەیوەستە بە هەڵسەنگاندن، بەڵام ناوەڕۆکی ئەم پڕوپاگەندانە لە بناخەدا وابەستەیە بە مەسەلەی لەناو بردنی "ئاپۆ"، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون لەم بوارەدا، ئەمەش بەهۆی ئەو هەوڵ و تێکۆشانە شۆڕشگێڕیەی ئێمەیە کە رووبەڕووی هەموو پلان و نەخشەکانی دەکەینەوە. پێویستە ئەمانە بەجارێك ریشەکێش بکرێن و رێگا خۆش نەکرێت بۆ بەرێوەچوونی ئەو پیلانگێڕی و چەواشەکردنانەی کە لەم دواییەدا روویاندا. سەرنەکەوتنی شەڕی تایبەت دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بەرەنگاربوونەوە بێ بەزەییانەی ئێمە کە لای دوژمنیش ئاشکرا بوو. ئەگەر چی شەڕی تایبەت سەرکەوتنی دەستەبەر نەکرد. ئەوا دوژمن باش دەزانێت کە زۆر بێ بەزەییانە بەرەنگاریان بووینەوە. لەساڵی 1989 ــ 1990 دوژمن بە هەموو تواناکارییەکەوە لەسەر ئەم مەسەلەیە راوەستا، ئێمەش لەبەرامبەریدا بە هەموو توانـاو دەرفەتێك بەرەنگاریان بووینەوە. بەمرەنگە بەسەر ئەو ئاستەنگیانەدا زاڵ بووین و توانیمان جارێکیتر لەسەر پێی خۆمان راوەستین، دوژمنیش دان بەم راستیەدا دەنێت.

راستە ئێمە ئێستا بە قۆناخی شەڕێکی گرنگ و هەستیاردا تێپەڕ دەبین و، دەمانخاتە بەردەم بڕیارێکی مێژوویی و چارەنوساز. ئەمەش تەنها ڕوانگە و بۆچوونی ئێمە نییە، بەڵکو لایەن و هێزی ناڵێپرسراویش ئاماژە بەوەدەکات. جگە لەمانە گەل زۆر بەوردی سەرنجی ئەم قۆناخە دەدات و هەڵی دەسەنگێنێ. بێگومان پارتی پێشڕەو ئەم شتانە بەوپەڕی بەرپرسیارێتی و بە گەلێك مانا لێکدەداتەوە، هەروەها هەڵدەستێ بە

هەڵسەنگاندنی شەڕی تایبەت لەهەر لایەنێکی مێژوویی و تاوەکو دەگاتە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەشی. بەڵام ئەوەی گرنگە لێرەدا بەرەی شۆڕشەکەمان و ڕۆڵ و هێزی شۆڕشگێڕی و پارتی پێشەنگە بەرامبەر شەڕی گەریلا و گەلەری. بۆ ئەم مەبەستە شیکردنەوەکانی کۆنفرانس لەسەر ئەم ڕەوشە و قۆناخی داهاتووشی ڕاوەستاوە. ئەرکەکان شوێنی خۆیان گرت و جێگیر بوون و بەشێوەیەکی زۆر بەرفراوان و دەوڵەمەند هەڵسەنگێنران. دیسان دەڵێین ئەوەندە بەس نییە.

مەسەلەی نزیکبوون لە پەروەردە و کادریران و پێگەکان شتێکی زۆر پێویستە. لەکاتێکدا کە دەبینین ئێمە بەرەنگاری شەڕی تایبەت دەبینەوە و، گۆڕانی شەڕی شۆڕشگێڕانە هێدی هێدی لە بەرژەوەندی ئێمە بەڕێوە دەچێ. بۆ ئەوەی ئەم ڕەوشە بە شێوەیەکی وورد و باش تێی بگەن پێویستە ئەوانە هەموو ببینین و، ئێمەش هەوڵدەدەین کار و ڕووداوەکان مانگ بە مانگ و بەرەنگێکی ڕێکوپێك هەڵسەنگێنین. ئێمە دەڵێین بەرەو ئەو ڕۆژەش ڕێ دەگرین. لەم کاتەشدا زۆر بە چڕی تێدەکۆشین بۆ هەرچی زیاتر سەقامگیر و پتەوکردنی ژیانی پارتی و خزمەتکردن و پێشخستن و سیاسی کردنی جەماوەر ڕێکخستن بە پارتی و پێشەنگ و پارتیزانەوە، چونکە بەمشێوەیە لەشەڕدا سەرکەوتوو دەبین. ئەوەش دەبینین ئەم وشانەی کە دەیاندرکێنین هەر لەخۆیانەوە لەدەممان دەرناچێ. گەیشتن بە سەرۆکایەتیەکی بەهێز و لێهاتوو، بەگەڕ خستنی سەرجەم هێز و گۆڕەپانەکان، تەنها بە کارێکی وورد و پتەو ئەنجام دەدرێت. کەواتە پێویستە لەسەرمان کەسایەتیەکی سەربازی و سیاسەتمەدارێکی بەهێز بونیاد بنێین. ئەرکی سەر شانی کادیری پارتیە کە ئەمانە هەمووی لەبەرچاو بگرێت و شەرڤانێکی ڕێکوپێك خۆی دەربخات. ئەوکاتە دەتوانین بڵێین من بەمشێوەیە دەچمە مەیدانی شەڕ. بەم شێوەیە کادیر دەتوانێ بە هەنگاوی پتەو بەرەو پێشەوە بچێ و پەرەسەندنی کردارانە دەخوڵقێنێ و مەسەلەی شەڕیش بەهەموو لایەنەکانیەوە تێدەگات، ئەوساکە دەڵێن: "ئەم شەڕە مەسەلەیەکی چارەنووسە"، هەر ئەو کاتەش لەسەر شەڕ ڕادەوەستن و لێی دەکۆڵنەوە.

هەروەکو باسمان کرد ئەگەر بێتو کادیر بەجددی هەڵسێ بە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی خۆی، ئەوا زیانێکی یەکجار گەورە بە دوژمن دەگەیەنێت و دەگەین بە قۆناخی زرگاری، لەم بارەیەوە ئەو قسەکەرانەی کە بەناوی ڕۆژنامە بۆرژوازیەکانەوە

دەدوێـن، وەك ئاگادارکردنەوەیـەك بـۆ پارتـە دەسـەڵاتدارەکان دەڵـێن: "PKK دەتـوانێ سـوود لـەم هەلومەرجـە وەربگـرێ" پارتـەکانیش ئێـستا ئـەم بوویـەرە پەسـند دەکـەن. بێگومان ئەم ڕووداوەش هەروا ڕەمەکی نییە، بەڵکو زۆر بـەووردی و بـە پـلان و نەخشە دارێژراوە لە پێناوی بەدەستهێنانی سەرەنجامێکی باش. کەوابێ پێویستە لەسـەرمان چـی بکـەین؟ دەبـێ بـە ئەرکـەکانمان هەسـتین و هـەوڵ بـدەین بـە ووردی ئـەنجامی پێویـست بەدەست بێنین، لەم پێناوەشدا هەموو ئەم ئامراز و تواناکاریمان هەڵسەنگاندووە.

لەپێناو بەڕێوەچوونی شەڕی گەریلایی، گفتوگۆیەکی بەرفراوانمان هێنایە مەیدان و هەستاین بە دابەشکردنی ئەرك و کار بە پێی شارەزایی و لێهاتوویی، بـەڵام لەبناخـەدا ئـەم شـەڕە لـە تەنگـژەی فەرمانـدەیی کردندایـە، بەتایبـەت لـە مەسـەلەی دامەزرانـدنی گـەریلا و ئاراسـتەکردنی بـۆ نێـو گۆڕەپـانی شـەڕ بــە شـێوەیەکی بـەهێز و بـەپێی پێداویستیەکانی قۆناخ، دەستنیشانکردنی ئەم ئەرکانە هـەمووی لەسـەر شـانی ئێمەیـە و لەسنووری تواناکاری ئێمەدان. لـەپێناو بەدەسـتهێنانی سـەرکەوتن قـەبارەی دەرفەتـەکان زیـاد بـووە. بـە واتایـەکیتر ئێـستا تواناکـاری تـەواومان لەبـەر دەسـتدایە بـۆ بونیادنـان و پەرەپێـدانی شـەڕ و هێـزی گـەریلا بـەپێی هەلومـەرجی گـەنجاو و، ئیمکانـاتیش زیـادکرا لەپێناو دروستکردنی گەریلا بەگوێرەی هەلومەرجی لـەبار و دەربـازبوون لـەو قـەیران و گرفتاریەی پێوەی دەنـاڵێنن. هەربۆیـە دەبـێ گـەریلا بـەپێی ئـەو تواناکارییـەی کـە بـۆی ڕەخساوە و لەئاردایە سازبکرێت و وەڵامی گونجاویش بدرێتەوە. هەروەها ئەگەر کۆششی زیـاتر بـدرێت و گـەریلاش لـەڕێڕەوی خۆیـدا چـڕ بکرێتـەوە، ئەوکاتـە ئێمـە دەتـوانین سـەرەنجامی بـاش لەشـەڕی گـەلێری و لـەناو جـەماوەر و لـە شـارەکاندا بەدەسـت بێـنن، هەروەها گەلیش ناچار دەبێت خۆی لە سیاسەت نزیك بکاتەوە.

نهـێنی بـەرەوپێش چـوونی PKK بـێ ڕاوەسـتان، بـە پشتبەسـتن بـە خـوو و هەڵسـوکەوتی وشـیارانەیە، بەهـەمان شـێوە ڕاپـەڕین و خۆپیشـاندانی گەلـەری و زەبروزەنگی جەماوەریش پشت بەم بناخەیە دەبەستێ و بەردەوام دەبێت. ئەگـەر هـاتوو ڕێکخستنی گەل پێکهات، ئەوا زەبر و زەنگی گەل بەرەو سەرهەڵدانەکان ڕێچکە دەگرێـت، ئێستاش دوژمن دەخوازێ ئەو ئەرکانەی پەیوەستن بە تاکتیکی ڕاپەڕین، ئاشکریان بکات. لەڕاستیدا ئەگەر لـە جێبـەجێکردنی ئـەرکی ڕێکخسـتنی سـەرهەڵدانەکان سـەرکەوین کـە

ئەرکێکی ئاسانە، بەتایبەتی ئەگەر بە پیشتگیری چالاکی و هێزی گەریلاش بێت، ئەوا بەهەرم و ئەنجامیان زیاد دەبێت چ لەڕووی کەم زیانی و شەهیدبوون، یاخود لەڕووی بەدەستهێنانی سەرکەوتنی مەزنەوە بێت، ئەو کارەش وەك بنکەیەکی سەقامگیری لێدێت بۆ پەرەپێدانی گەریلا، بەشێوەیەکی قووڵ لەسەر ئەم پرسە راوەستاین بۆئەوەی سەرکەوتن لەم ئەرکەی کەوتۆتە سەرشانمان بەدەست بێنین. هەبۆیەش هەستاین بە توێژینەوەیەکی قووڵ و بەرفراوان لەسەر ئەم مەسەلەیە.

لەبواری کرداریدا پێشکەوتنێکمان بەدی کرد، هەر لەسەر ئەم بناخەیەش دەتوانین کاریگەریەکانی شەڕی تایبەت پووچەڵ بکەینەوە، بەلاَم لەپێناوی سەرکەوتن لەم شەڕەدا پێویستیمان بە سەرکردەی راستەقینە و هۆشمەند هەیە، ئێوەش دەبینن ئەم بابەتەی کە ئێمە بە ووردی چارەسەری دەکەین، ئەمڕۆ مەسەلەی بونیادنانی کادیرە. ئەمڕۆکەش هەوڵدەدەین بە چڕوپڕی گفتوگۆ لەسەر ئەم مەسەلەیە بکەین. ئەم قۆناخە لەهەر قۆناخێك زیاتر لەمێژووی PKK و بەپێی هەر قۆناخێك هەڵدەستین بە رەخنەی کادیران سەبارەت بە نزیکبوونیان لە ئەرکەکانیان و دەرفەتی ئەوەشیان بۆخۆش دەکەین تاوەکو کەموکوڕیەکانیان دەرباز بکەن.

لەڕاستیدا ئەو کادیرانەی قۆناخی سەرکەوتن دەستەبەر بکەن لەئارادا هەن و ئامادەن ئەو ئەرکانەی کە دەکەوێتە سەرشانیان لەهەر گۆڕەپانێکدا جێبەجێی بکەن، هەروەها دەتوانن ئەرك و کارەکانی ناوخۆ و دەرەوەش ئەنجامبدەن ئێستاکە لە جێبەجێکردنداان. ئەم هەنگاوانەی لەناوخۆدا دەیهاوێژن دەبنە بناخەیەك بۆ هەموو ئەو هەنگاوە دیپلۆماسیانەی لەخزمەتی شۆڕشدا نەخشەکێش دەکرێن. بەواتایەکی دیکە بەرخودان و خۆڕاگری ئێمە لەدژی شەڕی تایبەت و پەرەپێدانی شەڕی شۆڕشگێڕی تواناکارییەکی مەزنی بە دیپلۆماسیەت بەخشیوە تاوەکو لەخزمەتی شۆڕشدا بکەوێتە گەڕ.

نزیکبوونی هێزەکانی رۆژهەلاَتی ناوین لە PKK لەسەر ئەم بنچینەیە گەیشتۆتە ئاستێکی وەها کە سنووری پێگەیشتن و ئاگاداربوون و دەرك پێکردنی تێپەڕ کردووە و ناچاری کردوون کە دەستی هاوکاری و پەیوەندی بەستن درێژ بکەن، هەروەها پارچەکانی دیکەی کوردستانیش دەستیان کردووە بە هاوکاری و پشتگیری بە بەرپرسیارێتیەکی زیاترەوە لەهەر کاتێکی دیکەی رابردوو هەندێك لەوانەی کە دەبوونە

کۆسپ و تەگەرە لەبەر دەممان لە گۆڕپاندا نەمان. هەموو رووداو و هێماکانیش لەم دواییەدا ئەم راستیە دەسەلمێنن، بەتایبەتیش دوای قۆناخی 1988 و هەرەسەکەی باشووری کوردستان، بەمشێوەیە پەرەسەندنەکان وایان لە PKK کرد کە بکەوێتە پێشەوە چ لەئاستی گۆڕەپانی کوردستاندا بێت یاخود لە مەیدانی دیپلۆماسیەوە.

لەم خاڵەدا، ئەگەر هاتوو بەشێوەیەکی چاك لەسەر چۆنایەتی رێکخستنی پێشەنگ رابوەستین، ئەوا کەمترین هۆکاریش نابێتە ئەگەری دروست نەبوونی سەرکەوتنی مەزن لەهەموو بوارەکانی خەباتدا. هەروەها ئەوەی تاوەکو ئێستا دەرکەوتووە دەیسەلمێنێ کە زۆربەی پێشکەوتنەکان لە بەرژوەندی ئێمەدا دەشکێنەوە، بەشێوەیەك کە لەقۆناخی داهاتوویەکی نزیکدا نابێ بچوك سەرنجی بدەین، لەهەمان کاتدا نابێ ئەو راستییەشمان لەبیر بچێ کە هەرگیز کەمتەرخەمی بەرامبەر بە شەڕی تایبەت پەسند ناکرێ و، ئێمەش بەدرێژایی بەردەوامبوونی بەرپرسیارێتیمان ئەو بنەمایانەی سەرکەوتنی لەسەر بونیاد دەنرێ روونیان دەکەینەوە کە چین؟ بەڵام مادام ئێمە لەگەڵیدا دەژین و لەسەر رێچکەی ئەو دەڕۆین، کەوابێ بە شتێك دادەنرێ و، مەحاڵە هەر دەبێ بە رەنگێکی باش جێبەجێ بکرێت. هیچ سکاڵایەکمان لە هەڵوێستی گەلەکەمان نییە بە پێی ئەو کادیرانەی کە بەرپرسیارن لە رێکخستنی پێشەنگدا.

ئێمە بەردەوام لەو باوەڕەدا بووین و پێمان وایە کە ئێمە هەموو کاتێ پشتگیری لەرادەبەدەری گەلەکەمان بەدەست دێنین، کاتێك بە شێوازێکی گەنجاو لێی نزیك دەبینەوە، هەروەها پشتمان بەدەرەوە نەبەستووە، بەڵکو لە هەموو ئەو کاتانەدا پشتمان بە هێزی خۆمان بەستووە و لە داهاتووشدا هەر پشتی پێدەبەستین. هەربۆیە ئاستی رێکخستن و هۆشیاری پراوپڕ پەیوەستە بە ئێمەوە و، لێپرسراوێتی کادیریش لەخودی خۆیاندایە، بەڵام لەهەمان کاتدا مەسەلەی کادیران جیاوازە و بریتییە لە مەسەلەی ئیرادە، بە واتا رۆڵ و کاریگەری کادیران هەیە لە بەدەستهێنانی سەرکەوتن و شکست هێنان. لەم بوارەشدا بەپێی چوارچێوەی لێپرسراوێتیمان و لە هەموو ئاستێکدا، روونمان کردەوە، کە دەبێ چۆن هەنگاو بنێن سەبارەت بە رێکخستن و ئەرکەکانیان. زۆربەی کادیرانیشمان بەم رادەیە ئەرك و وەزیفەیان هەیە و، ئەگەر بەمشێوەیەش لە ئەرکەکانیان گەیشتن ئەوا هیچ گومان لە دەرکەوتنی ئێمەدا نییە لەبەرامبەر شەڕی

تایبــەت و شــتێکی ڕەهایــە. بــەڵام بــە پێچــەوانەی ئــەوەش دەتــوانین گــەرەنتی هــیچ سەرکەوتنێك بدەین.

بـۆ پووچـەڵ کردنـەوەی شـەڕی تایبـەت و کاریگەرییـەکانی لـە داهـاتوودا، تـەنیا تێگەیشتنی پرس و کێشەکانی قۆناخ بەس نییـە، بـەڵکو پێویسـتە تـەواوی وەزیفـەکانمان کۆنترۆڵ بکەین لە هەموو لایەنێکەوە. خۆمان لـە نزیکبـوونی کوێرانـە و کەموکوڕیـەکان دوور بخەینــەوە و، بەشــێوەیەکی هۆشــیارانە لەهــەر مەســەلەیەك نزیــك بینــەوە و لــە ئاستێکی بەرزەوە بایەخیان پێ بدەین. هەروەها هەر لەم بابەتەوە پێویستە جەسارەت و چاونەترسیەکی بێ سنوور بخەینە روو و، بەپێی پێویستیش قوربانی بدەین. تـەنیا بـەم هــەموو تەقەلایــە دەتــوانین ســەرکەوتن دەســتەبەر بکــەین، ئەمانــەش هــەموو روون و ئاشکرایە و، ئێمەش بە تەواوی هێـز و تواناکاریمـان لەسـەری رادەوەستنین و هـەوڵی بـۆ دەدەین. بۆ ئەمەش هیچ بەهانە و هۆکارێك نییە کە ئەو شتانە تێنەگەن.

ئێمە نـاڵێین ئەمـە تـەنیا ئـەرکی سەرشـانی کـادیرە و بەرپرسـیارێتی بـەس تـەنیا لەئەستۆی ئەودایە، بەڵکو ئەمە دڵسۆزیەکی بێ پایـان و لێپرسـراوێتیەکی نیشـتمانیە بـۆ هەڵسوڕاندن و جێیـەجێکردنی کـار و خـەباتێکی زۆر، لەبەرئـەوە ئـەو کەسـانەی خۆیـان لکانــدووە بــە کــەموکوڕی و هەڵەشــەیی و بــەردەوامن لــەم هەڵوێســتەی خۆیــان لەبــەر چـەندین هـۆی جیـاواز و بەشـێوەکی دروسـت و پتـەو لـە ئەرکـەکانیان نزیـك نابنـەوە، پێویستە وازی لێبێنین و دەستبەرداری لەم هەڵوێستانە بکەن. هەروەها پێویستە هـەموو ئەوانــەی رۆڵــی خۆیــان لــە بوونیادنــانی رێکخســتندا دەبیــنن بەتایبــەتی ســەرکردە و پێشەنگەکان لەگەڵ ئەندامان و لایەنگرانیش، بەشێوەیەکی راست و دروست لەم قۆناخـە نزیك ببنـەوە و ئەرکـەکان جێبـەجێ بکـەن، بـەبێ ئـەوەی دوابکـەوێ و پشـتگوێ بخـرێ. لەهەمانکاتدا وەزیفە و راسپاردە هەرگیز بە تێڕوانینی منداڵکارانـە و تەڵەکـەبازی ئـەنجام نادرێت.

گەمەکردن بە ئەرك و رێنومابیەکان خراپترین هەڵوێستە بۆ ئـەو کادیرانـەی بـەو شــێوەیە رووبــەڕووی وەزیفــەکانیان دەبنــەوە، بــاش بــزانن ئێمــە هــەرگیز ئــەمجۆرە هەڵســوکەوت و رەفتارانــە پەســند ناکــەین، بۆئــەوەی ئــەمجۆرە مەســەلانە لەئێســتا و داهــاتوودا دەرنەکــەون، ئــەوا دەبــێ بەشــێوەیەکی شایســتە، نزیکــی ئەرکــەکانیان بــبن، هەروەها بەهەمان شێوە بۆ ئەو هەڤاڵانەی کە تازە هاتوونەتە نێو ریزەکانمان.

ئەو کەسانەی کە ئەرکی لێپرسراوێتیشیان لەسەر شانە و بە هۆشیارانەش دەرك بەم لێپرسراوێتیە دەکەن، پێویستە لەسەریان باش بزانن کە سەرکەوتن لەم کارە لەنزیکەوە پابەندە بە سەرۆکایەتی و پێشەنگەکەیان و، باش بزانن ئەو کەسانەی ئەم کارە بەرێوەدەبەن بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، لەبەر ئەمە دەبێ بەشێوەیەکی راست نزیك ببن و رووەو وەزیفەکانیان رێچکە بگرن هەتا کۆتایی و بەئەنجام گەیاندنی بەدڵنیاییەوە. بێگومان ئەمانەش گرنگی و بایەخێکی گەورەن، تاوەکو ئێستاش هەوڵمان داوە بەم شێوازە هەڵسوکەوت بکەین.

ئێوە خۆتان تەنها نەبینن و ئێمەش لەپاڵ ئێوەداین و بەیەکەوە ئەم رێگایە بەردەوام دەکەین و، ئێوەش پێویستە بایەخ بە زانست و هۆشمەندی راست بدەن. ئێمەش باوەڕیەکی تەواومان هەیە کە تێکۆشان بەردەوام دەکەین و لەڕۆژانی داهاتووشدا بۆ ئاستێکی بەرزتر پێشی دەخەین. مافی هیچ کەسێك نییە کە بەشێوەیەکی چەوت و هەڵەشە لەم مەسەلانە نزیك بێتەوە، بەڵکو دەبێ هەرچی لەتوانایدا هەیە بیبەخشێتە سەرچاوەی هەڤاڵبەندی. نزیکبوون لەناو ئێمەدا بەمجۆرە دەبێت، ئێمە لێپرسراوێتیەکی گەورەتر سەبارەت بەم بابەتە هەڵسوکەوت نیشان دەدەین و، نزیکبوونیمان لەسەر بنەمای ئەم نمونەیە دەبێت بەرامبەر بە پارتی و سەرجەم کادیران.

ئەگەر بێتو بەمشێوەیە نزیك ببنەوە، بەوپەڕی باوەڕوە دەڵێن لەم هاوینەدا دوژمن دووچاری شکستیەکی گران دەبێت و، لەپایزیشدا بەهەمان شێوە، تەنانەت گەلێك خراپتر رووبەڕووی تێکشکان دەبێتەوە.

سەبارەت بە ئێمەش لە پایزدا ئەگەر بە نزیکبوونێکی راست و ئامادەکاریەکی بەهێز بکەوینە ناوی، ئەوا بۆ ئێمە دەبێتە پایزێکی پڕ لە سەرکەوتن. بەدەستهێنانی سەرکەوتنێکی بەمجۆرە بۆ ئێوە مانای سەرکەوتنێکی زۆر گەورە دەبەخشێت. ئێمەش لەلای خۆمانەوە هەمووو توانا و تەقەلاکانمان چڕ دەکەینەوە لەسەر تەواوی گۆڕەپانەکان، بەڕستی شالاوی پایز بەم شێوەیە جێگایەکی بەرز و بەهایەکی پیرۆزی دەبێت و، پێویستیشە شایستە بێت بە گەلەکەمان و بیرەوەری شەهیدانمان. هەروەها بەڕاستی ئەو قوربانییەی لەم قۆناخەدا دەیبەخشین، دەبێتە مایەی ژیانێکی سەربەز و شکۆمەند. لەسەر ئەم بنچینەیە تواناکاریەکی ئێجگار زۆر بۆ ئێمە و هەمووو ئەندامانی

پارتی لەپێناوی سەرکەوتندا دەرەخسێ.

ئەم راسپاردانە بۆ ئێوەن و، سەبارەت بە ناوچەکانی تریش بەهەمان شێوە لێیان نزیك دەبین و راسپاردەیان ئاراستە دەکەین. بەڵام ئەوەی گرنگە ئەو چەند مانگەی بەردەممانە، چونکە ئەگەر تیایدا سەرکەوین ئەوا مێژووش لەبەردەمی ئێمەدا دەخولێتەوە.

ئەو هەڤاڵانەی تاکو ئێستا بەپیر بانگەوازی و راسپاردەکانمانەوە نەدەهاتن، لە ئێستا بەدواوە بەو پەڕی رێز و ستایشەوە بەپیر بانگەوازیەکانمانەوە دێن، ئێشتاکەش ئێمە لەگەڵ ئێوە دەدوێین، بەڵام ئەم قسانە بەتایبەت ئاراستەی ئەوکەسانە دەکەین کە نزیکبوونیان راست و دروست نەبووە. بێگومان ئەمجارەیان بەپێی پێویست بەدەنگمانەوە دێن و وەڵام دەدەنەوە. منیش پەیمان دەدەم لە پێناوی جێگیربوونی ئەم بانگەوازیە شێوازی پێویست پەرە پێبدەم، لەبەر ئەوەی مێژوو هەندێك ناچارمان دەکات.

بەدوای پێشکەوتنەکان بکەون بەپێی ئەم ئاراستەیە، کە دەەتوانن لەم رێیەوە گەلێك سەرکەوتن بەدەست بخەن و ئەگەر کارەکانتان بەگوێرەی لێکدانەوەی ورد ئەنجام بدەن، دەتوانین دەربازی قۆناخێکی شکۆدار ببین، جگە لەمە هیچ شتێکیتر لەئێوە داوا ناکرێ. بەڵام ژیانێکی بەم شێوەیە نابێ و هیچ شتێك بەدەست ناهێنێ. ماف هیچ کەسێك نییە تەنها بۆ چرکەیەکیش بەمجۆرە هەڵوێستانە ژیان بەسەر بەرێ.

دوژمن درندایەتی خۆی بە هەموو جۆرێك دەسەپێنێ و دەستبەرداری لە کوشتاری بەکۆمەڵ هەڵسوکەوتی سەرشێتانەی نابێ. هەبۆیە شەرێکی شۆڕشگێڕانە لەسەرمان خۆی دەسەپێنی. ئەگەر بتوانین تەواوی ئەو ئیمکاناتانەی لەبەر دەستماندایە بەشێوەیەکی چاك بیخەینە گەڕ، ئەوا دەتوانین شەڕی شۆڕشگێڕانەمان تەکانێکی باشی پێبدەین. ماف کەس نییە ئەم شەڕە بوەستێنێت یان کۆسپ و تەگەرەی بخاتە پێش. بەڵکو بە پێچەوانەوە پێویستە هەمووتان رەورەوەی شەڕ بەرەو پێشەوە ببەن. ئەگەر لەسەر ئەم بناخەیە لەمەسەلەکان بگەین، دەبینین کە هەر یەکێك لە ئێوە دەتوانێ ئیش و کاری زۆر گەورە بەرێوە ببات، لەکاتێکدا گەلێك ئەرك و کاری کرنگ هەیە بەئەنجامی بگەیەنن. ئەوپەڕی تواناماان خستە گەڕ و بایەخمان پێیاندا و لەهەر قۆناخێکدا زۆر بەچڕوپڕی هەڵمانسەنگاند. بۆچی؟ لەبەرئەوەی بەمشێوەیە نەبووایە سەرکەوتنتان بەدەست نەدەهێنا و، ئەگەر دەستمان لێتان لێبەر بدایە بەئاسانی هەموو شتێکتان

لەدەست دەدا. بەمجۆرەش هیچ سوودبەخش نابین، چونکە ئەوەی گەلەکەمان لەدەستیدا، ئێوەش لەدەستی دەدەن.

لەکۆتاییدا لەو باوەڕەدام کە ئەم مەسەلانە تێگەیشتوون، لەگەڵ ئەوەی کە راستیەکی کوردان هەیە زۆر بە زەحمەت تێدەگەن. بەهەمان شێوە راستی کادیرانیشمان لەناو پارتیدا وەهایە کە بە زەحمەت تێدەگەن، بەڵام ئیستاکە تا رادەیەك مەسەلەکانتان وەرگرتووە و تێی گەیشتوون، بەڕاستیش مەسەلەکان تێگەیشتوون، ئێمەش بەوپەڕی دڵسۆزی و بە نیازێکی پاکەوە هەموو شتەکانمان بۆ روون کردنەوە و ئێوەش پێویستە ئاستی جێبەجێکرنی ئەرکەکان پێشبخەن، بێگومان هەموومان بەیەکەوە هەوڵ دەدەین و خەبات دەکەین و ئەو شتەی دەکەوێتە ئەستۆمان پێکی دێنین و شەرکەوتنیش هەر بۆ ئێمەیە.

سەرۆکایەتی PKK
1990

# ئیسلامیەت و وڵاتپاریزی

*بۆ وڵاتپارێزانی موسڵمان و بەتایبەت خوێنکارانی ئەزهەر، کە دەستەیەك لاوی موسڵمانی کوردستان !.*

**ئیسلامیەت:** یەکێکە لە گەورەترین ئەو شۆڕشانەی کە ئێستا لەمێژوودا ناسراوە. ئێستا هیچ شۆڕشێك لەدنیادا بەدی ناکرێ، کە هێندەی ئیسلام بەقووڵی کاری لە رێڕەوی مرۆڤایەتی کردبێ. وێنەی شۆڕشی ئیسلام لە هیچ ئایینێکی تردا ئەوەندە بەڕوونی و بەئاشکرایی و لەهەر لایەنێکی ژیاندا یەکسانی و دادپەروەری و ئازادی تیا بەدی ناکرێ، هەروەها لەهەموو ئەو شۆڕشانەی تر زیاتر کە لەپێناو ئازادی و یەکسانی هاتوونەتە ئاراوە بەکاریگەرتر بووە. هەرلەبەر ئەوەشە ئیسلام بۆتە سەرچاوەیەك بۆ گەلێك لەو

شۆڕشانەی کە لەدوای پەیدابوونی هاتوونەتە ئاراوە .

بەڵام مەخابن کە ئەمڕۆ لەژێر ناوی ئیسلامدا ، هەر جۆرە چەمکێکی کۆنەپەرستانە و دژی شۆڕش هەیە، کە پێی دەپارێزرێ و لەدژی شۆڕشەکەمان بەکاردەهێنرێ.

گەوهەری شۆڕشی ئیسلام ، یەکسانی و ئازادی و دادپەروەرییە ، کە بەجۆرێکی تر گەورە و بە رەنگێکی خراپ و زوڵم و نکۆڵی و تاریکی و بێ دادپەروەری پێی پەردەپۆش دەکەن ، ئەمە گەورەترین خراپەکارییە و بەهیچ رەنگێك پەسند ناکرێت و نابەخشرێت .

دەبێ ئەو راستییە باش بزانین کە حەزرەتی موحەممەد شۆڕشگێڕێکی گەورە بوو. ئەگەر وابەستەیی بە راست و دروستی لەگەڵ پێغەمبەر هەبێ، پێویستە نزیکبوون لەمرۆڤ و لەنەتەوەیەك و وڵاتێك بە رەنگێکی دادپەروەرانە بێ.

بەناوی رێڕەوی زانستی پێغەمبەر (موحەممەد) وڵاتێك نکۆڵی لێبکرێت؟ کۆمەڵێك مرۆڤ بخرێتە ژێر زوڵم و زۆرەوە و، بە هەرشێوەیەك سەرکوت و بندەست بکرێت و، بەناوی ئیسلام و فەرموودەی پێغەمبەرەوە پشتگیری لێبکرێت؟ ئەمە گەورەترین خراپەکارییە، گوناهەکەشی گەورەترین گوناهە.

ئێمە سەیری گەوهەر دەکەین، تەنها قسە ناکەینە بناخە، کاتێك ئیسلام پەیدابوو هیچ شێوەیەك لەئارادا نەبوو، لەو سەردەمەدا بزووتنەوەیەکی هۆشیار لە دژی چینی سەردەستی جاهیل (بتپەرستەکان) لەئارادا بوو، بەناوی خودایەکی دادپەروەر و، دامەزراندنی سیستەمێکی سەرزەمینی لەشوێنی خودا. ئامانجی سەرەکی پێغەمبەر ئەوە بوو کە مرۆڤایەتی لەجەهالەت و کۆیلایەتی رزگار بکات، ئەمە رێگای رووناکی بوو، کەسیش ناتوانێت نکۆڵی لێبکات. لەو سەردەمەدا، جیاوازی لەنێوان قوڵە رەش و سپیدا نەبووە و، عەرەب هیچی لە عەجەم زیاتر نەبووە، کە هەڵوێست و فەرموودەی پێغەمبەر بوو. ئەگەر نکۆڵی لەمانە ناکرێت؛ ئەمڕۆکە چۆن ئەوەندە جیاوازی دەخرێتە نێوان کورد و تورك، چۆن هەتا ناوی کوردیش قەدەخە دەکرێت؟ ئەگەر فەرمانڕەوایان و بەڕێوەبەرانی تورك لەڕاستی موسڵمانێتی بگەڕێن، هەروەها ئاییندارانی تورك لەم راستییە بگەڕێن، ئەوکاتە چۆن دەتوانن ئەم نایەکسانییە بەناوی ئیسلامییەت روون بکەنەوە. ئەگەر بە فەرموودەی پێغەمبەر بکەن، چۆن ئەم نایەکسانییە لەلایەن

موسڵمانان و ئیمامی ئایینی و مەلاکانەوە پەسند دەکرێت، ئەگەر ئەمانە دووڕوو و ریياکار و درۆزن نین کە ئیسلام بۆ پارە کۆکردنەوە بەکاردێنین، ئەی ئەمانە کێن؟ گەلەکەمان لەپێناو باوەڕی ئیسلام و دادپەروەری و ئازادیدا بوونەتە ئیسلام. پێویستە ئەو راستییەش زۆر بەباشی لەبەرچاو بگیردرێ، کە ئیسلامییەت بۆ هەموو مرۆڤایەتی و بۆ هەموو گەلانە، ریزی ئیسلام بە عەرەب و تورك و فارسەوە سنوور نەدراوە، بەڵکو ریزی هەموو مرۆڤایەتییە، ئەمەش کەس ناتوانێت نکۆڵی لێبکات. کەواتە لەم بارەدا چۆن دەبێت گەلێ هێندەی کورد لەژێر فشار و بێ دادپەروەریدا بژیی؟! ئەوکاتە دەبێ هەموو گەلی موسڵمانی ئێمە و پیاوانی ئایینی ئیسلام ئەم راستییە ببینن و بەگوێرەی دادپەروەری ئیسلام راستی و چەوتی لەیەك جیابکەنەوە و، بۆ یەکسانی ئیسلام ئەگەر جیهاد پێویست بکات، ناچارن پێویستییەکانی بەجێبگەیەنن. بەپێچەوانەی ئەمەوە، موسڵمانێتی ئەوان لەموسڵمانێتیەکی ساختە بەولاوە هیچی ترنابێت. موسڵمانێتی هەر گەلێك لەپێناوی خاوەندارێتی نەتەوە و یەکسانی ئەو گەلە دایە. ئەگەر وانەبێت ئەو نەتەوەیە موسڵمانی تێدا هەڵناکەوێت، ئەگەر لەبیر و هۆشدا نکۆڵی لە بوونی خۆی و نکۆڵی لە مەزهەبی خۆی بکات، خەڵکێکی بەوجۆرە چۆن دەبێتە موسڵمان. هەر وەك چۆن حەزرەتی موحەمەد دەڵێ "ئەوەی نکۆڵی لەقەومی خۆی بکات لەئێمە نییە".

ئێستا یەکێك چەند زیاتر نکۆڵی لەخۆی بکات ئەوەندە مووچەی زیاترە. چەندە بە جەنگاوەرانی ئازادی و ماف و دادپەروەر بڵێ تیرۆریست و لەسەر ئەو بناخەیە ئایەتیش بهێننەوە دەوڵەت ئەوەندە پارەی دەداتێ، ئەمە بە دووژمنایەتی کردنی ئیسلام و موونافقکاری بەولاوە بەهیچ شتێکی تر لێك نادرێتەوە.

زۆر چاك دەزانن کە لەو دواییانەدا لەهەر لایەکەوە ئیسلام گەشەسەندنێك بەخۆیەوە دەبینێ، بەناوی ئیسلام زۆر جوڵانەوە دەرکەوتوونەتە روو، رێکخستن ساز دەبن و چالاکیش دەدرێن، وەك لەبۆسنە دەبینرێ لە ئەفغانستانیش دەرکەوتوون، لەجەزائیریش پەیدا بوون. هەموو ئەو جوڵانەوانە ئالای ئیسلام هەڵدەکەن و بەرێوە دەچن. ئایا ئێستا هیچ بزووتنەوەیەکی موسڵمانی کوردی لەئارادا هەیە؟ چۆن لەولاتێکی وەك ئەفریقیا بزووتنەوەی ئیسلامی پەیدابووە، کەچی لە شوێنێکی وەکو کوردستان بزووتنەوەیەکی ئیسلامی تیایدا سەرهەڵنادات؟ بەڕاستی بزووتنەوەیەکی کورد ـ ئیسلام

چۆن و بە چ رەنگێك دەبێ دەربكەوێت؟ ئەگەر وایە دەبێ بەرنامە و پرەنسیپەکانی بە چ رەنگێك بێ؟ ئایا لەشوێنی خۆیدایە بزووتنەوەیەکی کورد ـ ئیسلام بێتە کایەوە؟ ئایا پێویستی ئەمە هەیە؟ ئایا هیچ کاتێك ئەمەتان هیچ کات بە بیر و خەیاڵدا هاتووە؟ ئەگەر بەبیرتاندا نەهاتووە کەم و کورییەکی گەورەیە. ئەوانەی بەناوی ئیسلامەوە دەجوڵێنەوە خراپترین رەفتار ناکەن؟ من لەم خاڵەدا وا بەچاکی دەزانم روونکردنەوەی واقیعی مێژوویی گرنگییەکی زۆر گەورەی هەبێ؛ ئیسلام هێشتا لەسەرەتای پەیدابوونی دابوو کە لەو سەردەمەدا هەندێك کەس مونافقکارییان دەکرد بۆ لادان. ئەوکات ئەوانەیان بە (مرتجع) ناو دەبرد کە مانای گەڕانەوە بەرەو دواوە دەگەیەنێ. موسڵمانە راستەقینەکان لەمەککە بوون کە بۆجاری یەکەم ئایەتی ئیسلامیان بۆ هات و لەچوار دەوری خۆیان دەستیان کرد بەپڕوپاگەندە. لێرەدا سەرەتا کەوتنە بەر شاڵاوی ئەبوجەهل و بت پەرستەکانیتر دەستیان کرد بە ئازار و ئەشکەنجە دانیان. لەبەرامبەردا ئەوانەی شۆڕشگێڕ و ئیسلامی راستەقینە بوون و باوەڕییان هێنابوو، لەسەرەتادا حەزرەتی خەدیجە و حەزرەتی عەلی و حەزرەتی هەمزە بوون.

ئەو موسڵمانانەی هەر لەگەڵ سەرەتا و لەدایکبوونی ئیسلامییەتدا بوون، زۆر چاك دەزانرێت کە هیچ بەرژەوەندیەکی تایبەتییان نەبوو و، بەتەواوی بەباوەڕی و ئیمانەوە دەستیان بەجیهادێکی گەورە کرد و هەموو ژیانی خۆیان لەسەر دانا و رێژەیەکی زۆریان گەیشتنە ئاستی شەهادەت، ئەو موسڵمانانە بوون کە لەمەدینەوە کۆچیان کرد و رووبەڕووی هەر جۆرە زۆری و زەحمەتیەك بوونەوە. کاتێك مەککە سەرلەنوێ فەتح کرایەوە و، ئیسلام بووە دەوڵەت، ئەوساکە مرۆڤی وەکو موعاویە ئیسلامیان بەرەنگی سەڵتەنەتی ئیسلامی پەسندکرد. ئەمەش بەئامانجی ئەوە بوو کە ئەو نیعمەتانەی ئیسلام بەسەرکەوتنی خۆی بەدەستی هێناوە، بیخەنە خزمەتی بەرژەوەندیەکانیان. واتە لەسەر بناخەی ئەوانەی کۆنە مونافق بوون دەستە دەستە بەقسە نەك بەگەوهەر هاتنە ریزی ئیسلامەوە. هەروەها ئەو راستیەش باش دەزانرێت کاتێك حەزرەتی موحەممەد وەفاتی کرد و هێشتا تەرمەکەی بەخاك نەسپێردرا بوو، ئەوان شەڕی دەسەڵاتیان دەستپێکرد. بەتایبەتی ئەو هەموو فیتنە و فەسادییەیان بۆ ئەوە سازکرد کە خەلیفایەتی بدەنە دەستی هەندێکیتر نەك ئەوانەی مافی خۆیان بوو.

بەم جۆرە وەك باسمان کرد فیتنە و فەسادی پەرەی پێدرا، واتە شەڕی

ئیسلامیەت، لەلایەك لێكدانی رەوتی راست و چەپ، لایەنی شۆڕشگێڕ لەدژی هێڵی ناشۆڕشگێڕ دەستیان كرد بە تێكۆشان. هەر كەس باش دەزانێ كە حەزرەتی عەلی و لایەنگران و پیاوە چاكەكانی ئەهلی بەیت لەگەڵ ئەوانیتر موسڵمانی راستەقینە بوون، موسڵمانی شۆڕشگێڕ و موجاهید بوون. ئەوانەی نزیكی كەسایەتی معاویەش بوون راستڕەو بوون. واتە نوێنەری بەرەی دژی شۆڕش بوون.

بەهەمان شێوە لەشۆڕشی فەرەنساشدا راوچی و تێكشكاو هەبوون، كە ئەمانە هەندێكیان بە راست ناو دەبرێن و هەندێكیشیان بەچەپ ناو دەبرێن. لەشۆڕشی روسیاشدا بەهەمان شێوە. بەلشەفی و مەنشەفی هەبوون. شۆڕشی موسڵمانانیش هەر بەمرەنگەیە. بەلشەفییەكان بەرەنگی لایەنگرانی حەزرەتی عەلی دەركەوتنە روو، مەنشەفیەكانیش وەكو دەستەی معاویە بەدیار كەوتوون. ئەم ململانێیە تائێستا لەروسیا بەردەوامە. واتە لەزۆربەی شۆڕشەكاندا بەمجۆرە دوولەتبوونی تێدا دەبینرێ. وەكو باسمان كرد زۆر جار ئەم پارچەبوون و لەت لەت بوونە رێگای لەبەردەم سەدان ساڵ شەڕی خوێناوی كردۆتەوە. عەلەویگەری و شیعەگەری و سوننیگەری و ....هتد پەیدابوون. ئەوانە لەگەوهەردا كامیان زیاتر وابەستەن مەسەلەیەكی ترە، گرنگ ئەوەیە تائێستاش ئەم كێشەیە چارەسەر نەكراوە. لەهەمانكاتدا زۆر چاك دەزانرێ موسڵمانێتی سەڵتەنەكاری پەیدابوون، واتە سەڵتەنەتی معاویە لەسەرەتای پەیدابوونی لەشام بە پشتیوانی عەرەبەكان دەستیان كرد بە زوڵم و زۆری و داگیركردنی بەرفراوان. گەلێك خوێنرێژی وەك (حجاج بن یوسف ئەلسەقەفی) لافاوی خوێنیان هەڵساند. لەئێراق و ئێران و كوردستان، بەناوی ئەوەی كە خەڵك بەزۆر دەكەنە موسڵمان فەرمانڕەوایی خۆیان دەسەپاند. واتە بەمەبەستی سەپاندنی رژێمی داگیركەری ـ ئیمپریالیستی خۆیان ئەمەیان دەكرد. ئەوەی كە ئەمەویەكان كردیان داگیركاریەكی ئیمپریالیانە بوو بەناوی ئیسلامەوە لەژێر ماسكەی ئیسلامێتیدا. ئەمە جاری یەكەمە بێ دوودڵی دەتوانین ئەو راستیانە دوببڕین، كە لەو كاتەدا خەڵكی راپەڕین و یاخیبوونی گەورەیان لەبەرامبەردا نیشاندا، بەتایبەتی لەئێراندا ئەمە بەناوی شیعەوە خۆی نیشاندا، هەروەها عەلەوی؛ واتە لەژێر ناوی لایەنگرانی عەلی بزووتنەوەیەكی یاخیبوونی بەرفراوانیان ساز كرد، عەرەبەكانیش بەهەمان شێوە دژی ئەو ئیمپریالیستییە راوەستان. كوڕە گەورەكەی

حەزرەتی عەلی کە ناوی حەسەن بوو زەهر خواردیان کرد و دوای ئەوە ئیمامی حوسێنیان لەکەربەلا شەهید کرد، بەڵام ئەو ڕاپەڕینانە بەشێوەیەکی بەرفراوانتر تەشەنەیان کرد.

ئەو راپەرینە گەورەیەی ئێران بەسەرۆکایەتی ئەبو موسلمی خوراسانی باش دەزانرێت کە سەڵتەنەت و داگیرکەری و ئیمپریالیستی و دەوڵەتی ئەمەوییان هەڵوەشاندەوە. لەشوێنی ئەوان عەباسییەکان هاتنە سەر حوکم، کە لەزۆر لایەنەوە جیاوازییەکی ئەوتۆیان نەبوو لەگەڵ ئەمەویەکاندا و یەکسەر سەرکردەی راپەرینەکە وێنەی ئەبو موسلمی خوراسانیان کوشت و کۆلۆنیالیستی ـ ئیمپریالیستی خۆیان تەشەنە پێدا و، لە ناوەڕاستی ئاسیاوە تا دەگاتە ئەنادۆڵ و ئەفریقیا و ئیسپانیا. لەبەرامبەردا یاخیبوونی جیاواز لەژێر بەیداخی ئیسلام سەریانهەڵدا. لەئێران شیعە بەرەنگی ئیسلامێکی یاخیبوو پەیدابوو، لەئەنادۆڵ عەلەوی وەك فۆلێکی تری ئیسلامی یاخیبوو پەیدا بوون، لەم بابەتە گەلێك مەزهەب و بەرهەڵسکاری مەزهەبی هاتنە کایەوە.

داواکاری یەکسانی و دادپەروەری ئەم جوڵانەوانە لەچەمکی ئیسلامەوە هاتووە، یان سەرهەڵدانی ئەم بزووتنەوانە لەژێر بەیداخی ئیسلامدا لێك دەدرێتەوە.

فەرمانڕەوایانی عەباسی هەندێك کۆیلەی تورکیان خستە ناو ریزی سوپاکەیان. لەو سەردەمەدا تورکەکان تازە بەتازە لەئاسیای ناوەڕاستەوە بەسەر ئێراندا دەهاتن و ژمارەیەك لەو تورکمانانەی کە هاتبوون خۆیان خستە ژێر فەرمانی عەباسیەکان، چوونە ریزی ئەرتەشەوە، لەناو ئەرتەشدا گەیشتنە پلەی فەرماندەیی، دوایی وورده وورده کاریگەری ئەمانە زیادی کرد. بۆ نمونە لەساڵی 1000ی زایینی لەژێر ناوی سەلجوقیدا و بەو پشتیوانیەی کە لە عەباسیەکانیان وەرگرتبوو دەوڵەتێکیان بۆ خۆیان دروست کرد. ئیتر وای لێهات ئەم تورکانە بوونە هێزێك کە بوێنەرایەتی ئیسلام بکەن. دەیانویست هەموو ئێران و ئێراق و ئەنادۆڵ بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە، هەر لەبەرئەوە زوو زوو دەبوونە موسڵمان. واتە لێرەدا باسی ئیسلامیەتێکە لەپێناو بەرژەوەندیدا، موسڵمانێتی تورك موسڵمانێتی بەرژەوەندیە. واتە بۆ فەتح کردنی ئێراق، ئێران، ئەنادۆڵ و بەڵقان بوونە موسڵمان، نەك لەپێناوی یەکسانی ئیسلام و یەکسانی و بنچینەکانی ئازادی ئیسلامیان زۆر بەدڵ بووبێ. تورکەکان هیچ لەئیسلام تێنەگەیشتوون، هەندێك رستەیان لەبەرکردووە و بۆ لەناوبردنی گەلان و سڕینەوەی ئاساریان بەکاریدەهێنن. تا ئێستاش

چەمكی توركەكان لەموسڵمانێتیدا بۆ داگیركردن و زەوت كردنە و موسڵمانێتییەكەیان هی سەركووتكردن و بندەست كردنە. موسڵمانێتی خوێنڕشتنی هەموو گەلانە، تەنانەت موسڵمانێتی خوێنڕشتنی گەلی توركمانە. موسڵمانێتی سوڵتانی سەلجوقیەكان و دوای ئەوان سوڵتانی عوسمانیەكان و میرە توركەكان مانای ستەم، نایەكسانی، لەناوبردن و بەزۆر دەركردن و راگواستنی گەلانە. بەمجۆرە هەرشتێك بەناوی موسڵمانێتیەكی راستەقینە دەكەن كە موسڵمانێتی ساختەیە، پێویستە ئەم راستیانە بەچاكی ببینرێت. لەبنەڕەتدا عوسمانیەكان لەگەڵ ئیسلامدا شتێكی نامۆن بەیەكتر، بەڵام بۆئەوەی بەڵقان بخەنە ژێر دەستیان، دەبوایە بە چ ناوێك بیانكردایە؟ بەناوی ئیسلامەوە. لەژێر پەردەی ئیسلامێتی ئەستەمبوڵیان تاڵان كرد. بەكورتی چەند بەرژەوەندی و زەوت و داگیركەرییان هەیە هەموویان بەناوی موسڵمانێتی كرد و لەسەر ئەم بناخەیە بێ ئەوەی هیچ لەئیسلام تێگەیشتبن، دەستە دەستە موسڵمانێتییان بەكار دەهێنا. بە كورتی ئەو خەڵكەی لەژێر ماسكەی ئیسلامدا بەچاكترین شێوە ئامانجی ئیمپریالیستی و داگیركەریان جێبەجێ كردبێ، قەومی توركن. عەرەبەكانیش ئیسلام لەلایان وەك ئایدیۆلۆژی بۆتە پارچەیەك لەڕاستینەی ئەوان، وەك سیاسەتیش ژیاندوویانە، بەڵام بەقەدەر تورك و سوڵتان و فەرمانڕەوایانی تورك لەسەر بناخەی بەرژەوەندی نزیك نەبوون. هیچ فەرمانڕەوایەك نییە بەئەندازەی توركەكان بە دووڕووی و تەنانەت دژی گەلی خۆشیان ئیسلامیان بەكارهێنابێ، پێویستە ئەوە باش بزانین، كە ئەگەر تێنەگەین ناتوانرێ چەمكی موسڵمانێتی راستەقینە تێبگەیەنرێت و تێی بگەن. ئەگەر وا نەبێ هەر موسڵمانێتی لەبەركردنی هەندێك رستەیە و وەك تووتی (بەبەغا) دەیڵێنەوە، كە سەدان ساڵە دەكەوێتە خزمەت بەرژەوەندی ستەمكاران و سەردەستان.

ئەگەر لەپشت پەردەی ئیسلامەوە ئیمپریالیزمی شاراوە ـ ئیمپریالیزمی تورك ـ داگیركەری تورك نەبینین، ئەوا زیان دەبەخشنە ئیسلام و گەلەكەشمان.

ئەمڕۆ خەڵكی ئێران لەژێر ناوی شیعەگەریدا شۆڕشێكیان لەدژی ئیمپریالیزم سازكردووە. ئەم شۆڕشە دنیای سەرسوڕ هێناوە، كە شۆڕشی ئیسلامی پێ دەڵێن، لەسەر ئەو بناخەیەش كۆمارێكی ئیسلامیان دامەزراندووە. سەبارەت بە ئەوان رزگاركردنێكی زۆر گەورەیە. كاتێك سەرنج بدەین، ئایا لەكوردستاندا شۆڕشێكی ئیسلامی پەیدا بوو؟

بەناوی ئیسلامەوە وەکو باسمان کرد گەلێك شۆڕش بەرپا بوون ـ تورکەکانیش لەئەنادۆڵ ناوی ئیسلامیان بەکارهێنا، وڵاتی خۆیان سازکرد لەکاتێکدا کە لەئەنادۆڵ تەنانەت یەك تورکی تیا نەبوو، ئەنادۆڵیان هەموو کردە موسڵمانی تورك. هەروەها عەرەبەکانیش بەناوی ئیسلام لە هەرسێ کیشوەری ئاسیا، ئەفریقیا و ئەوروپا بڵاوبوونەوە. کە سەیری کورد دەکەین، ئیسلامیەت چی کردووە؟ یان بەناوی ئیسلامەوە کوردان بوون بەچی؟ تەنها نکۆڵییان لێکراوە، تەنها زیانیان پێ گەیشتووە، بەمەرجێ کاتێك ئیسلام تازە پەیدابووبوو کوردان پێشکەوتوو بوون لەبواری زمان و کولتووردا، لەعەرەبەکان و تورکەکان و تەنانەت لەفارسەکانیش پێشکەوتووتر بوون. ئیسلامیەت بەدەستی ئەمەویەکان و دوابەدوای ئەمە بەدەستی عەباسیەکان، لەکاتی هاتنیان بۆ کوردستان بەرەنگێکی زۆر خوێناوی سەپێنرا، کە کولتووری کوردی و کۆمەڵی کوردستانیان وێران کرد. ئینجا دوای ئەوەی ئیسلامیەت کەوتە دەست تورکەکان و، بەتایبەتی کە موسڵمانی ساختەیان وەك چینێکی بەکرێگیراو دروست کرد، ئیتر قۆناخێکی بێ ئامانی لەناوبردنی قەومی کوردان دەستیپێکرد. کە لێی وورد دەبینەوە، دێرینترین گەلی دنیا لەلایەن ئەمەوی و عەباسی و تورکە سەلجوقیەکان و عوسمانیەکانەوە کراونەتە سەرباز و داگیرکراون و باجیان لێ سەندراوە، لەبەرئەوەی ئەوانە گەوهەری ئیسلامیان لەڕاستی لاداوە و کردویانە بە دەمامکێك بۆ پەردەدانی سیاسەتەکانیان، بێگومان ڕێژەیەکی زۆر لە کوردەکان کە بوون موسڵمان ـ مەبەستم هەمووی نییە ـ بەڵکو زۆربەی بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندی خۆیان خستە ژێر فەرمانی عوسمانیەکان. بەم پێیە موسڵمانێتیەك لەدژی بەرژەوەندی کوردان پێشخراوە. بەمجۆرە موسڵمانێتی یەکسانی میللەت، موسڵمانێتی برایەتی، موسڵمانێتی دادپەروەری، لەبیر براوەتەوە . تایبەتیە ئازادیخوازانەکەی موسڵمانێتی لەبیر براوەتەوە، بۆ مووچەیەك سوڵتان هەر چ فەرمانێکی پێداون بەجێیان گەیاندووە. ئەمە ڕەنگێکی زۆر ترسناکی موسڵمانێتیە، بەداخەوە سەدان ساڵە ئەمجۆرە موسڵمانێتیە لەکوردستاندا باوە. موسڵمانێتیەکی وەك ئێران لای کوردان دروست نەبووە. ئەمڕۆ شیعە بەڕاستی موسڵمانێتی ئێرانیە، شیعەگەری سەدان ساڵە میللەتی ئێرانی لەسەر پێ ڕاگرتووە، لەگەورەترین شۆڕشیان سازکردووە، زۆر دەوڵەتی عەرەبی کە بزووتنەوەی بەو ڕەنگەی تێدایە دەوڵەتی پێ دورست دەکەن.

باسەیرێکی خۆمان بکەین ؛بەناوی ئیسلامەوە هیچ بزووتنەوەیەکی سیاسیمان هەیە؟ ئایا بەناوی ئیسلامەوە بزووتنەویەکی کوردی، بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی، یان هێزێکی دامەزراندنی دەوڵەت بەدی دەکرێ؟ نییە، کاتێك دەپرسین: بۆچی عەرەبەکان ئەوەندە دەوڵەتیان بەناوی ئیسلامەوە هەیە، بۆچی ئێرانیەکان بەناوی ئیسلامەوە دەوڵەتیان هەیە، بۆچی تورکەکان بەناوی ئیسلامەوە ئەوەندە دەوڵەتیان سازکرد، ئەی بۆچی کوردان بەناوی ئیسلامەوە دەوڵەتێکیان دروست نەکرد؟ گوایە خوا فەرموویەتی نابێ، حەزرەتی موحەممەد قەدەخەی کردووە؟ نەخێر پێغەمبەر فەرموویەتی فەزڵی عەرەب لەسەر عەجەم ناکرێت. ئەوکات مافی کوردانیش هەیە چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن و دەوڵەتێکی کوردی دابمەزرێنن، موسڵمانێتی لەم بوارەدا هەڵوێستی روون و ئاشکرای هەیە. بەڵام ئەوانەی ئەمە نابینن یان کە دەیبینن پێویستیەکانی بەجێ ناگەیەنن، کێن؟ ئیمپریالیزم و داگیرکەران و موسڵمانی ساختە و بەکرێگیراوانی کوردن. سەدان ساڵە کە بەمجۆرە خەڵکیان بێهۆش کردوە و بەداخەوە گەلی ئێمەیان کردۆتە ئامێری دەستی موسڵمانێتیەکی درۆزنانە. یان دەتوانین بڵێین شۆڕشی چەواشەی لەناوبردنی ئیسلام، لەڕاستیدا دەبێ بەوانە نەگوترێت ئیسلام. پێویستە ئەوانە بەدەستەی ئیمپریالیست ـ داگیرکەران لەژێر پەردەی ئیسلامدا ناوببرێن.

ئەمڕۆکە لەبەر رۆشنایی ئەو راستیانەدا سەیر دەکەین ئەو کەسانەی شەڕ دەکەن بۆ بەدەستهێنانی وڵات کە بەگیانی خۆیانەوە ئامادەن هەمووشتێك بدەن (ئەمانە نوێژ ناکەن، ناونابرێن بەموسڵمان) زۆر جۆرە ئیفترایان لەدوا دەکرێت و بەمەشەوە راناوەستن لەئەنقەرەوە چەند کەسێك دەهێنن بەمووچە و پارە ئایین و تەنانەت ئایەت و حەدیس بەناڕاسترین شێوە بەکاردەهێنن و، بڵاوکراوە چاپ دەکەن و بە هەلیکۆپتەر بڵاوی دەکەنەوە. ئەمانە گەورەترین خراپەکاری بەرامبەر ئیسلام دەکەن، خۆیان بەموسڵمان لەقەڵەم دەدەن. بێگومان دوژمنە، دەیکات. سەدان ساڵە دەیکات و ئێستاش دەیکات. بەڵام ئەی ئێمە چی دەکەین؟ خەڵکی موسڵمانی ئێمە چی دەکەن؟ رۆشنبیرانی موسڵمانی ئێمە چی دەکەن؟ من لەهەموو خەڵکی کوردستان و رۆشنبیران دەپرسم: ئێوە راستی ئیسلامێتی دەناسن؟ ئەگەر دەزانن لەڕاستیی وڵاتی خۆتاندا پەیڕەوتان کردووە؟ کوردستان لەتێڕوانینی ئیسلامەوە چۆن بەدەست دەخرێت؟ مێژووی کوردستان،

سیاسەتی کوردستان، لەگەڵ رەوشی کۆمەڵایەتی و ئابووری لەڕوانگەی ئیسلامەوە چۆن لێك دەدرێتەوە؟ یان پرەنسیپەکانی ئیسلامییەت بەگوێرەی قورئان و حەدیس چۆن پیادە دەکرێت؟ ئەگەر ئەم راستیانە نەخرێتە بەرچاو چۆن دەتوانرێ موسڵمانێتی لەکوردستاندا بونیادبنرێ؟ ئەگەر ئەم موسڵمانێتیە لەگەوهەری خۆی پووچ نەکراوە ئەی چییە؟

ئەمانە لەبەر ئەوە دەڵێم چونکە موسڵمانێتی لەوڵاتی ئێمەدا پەیڕەو ناکرێ، موسڵمانێتی بەیەکسانی پیادە ناکرێ، منیش لەمە سڵەمیمەوە و لێی دوورکەوتمەوە، دوای سۆسیالیزم کەوتم، ئەوکات سەیرم کرد سۆسیالیزمیش کراوەتە تورکی، ئێمە ئەوەمان بەسۆسیال شۆڤێنیزم ناوزەد کرد و، گوتمان لەسۆسیالیزمیشدا یەکسانی، دادپەروەری و ئازادی هەیە، پێیان گوتین کە سەرەتا ئێمە شۆڕش دەکەین (واتە تورکەکان) دوای ئەوە دان بەئێوەدا دەنێین. بەکورتی نکوڵیان لە بوونی نەتەوەییمان کرد. لەدژی راوەستاین. بەمجۆرە لەدژی ئیسلامەتی ساختە راوەستاین و لەبەرامبەردا سۆسیالیزمی زانستیمان هێنایە کایەوە.

ئەمڕۆ بەڕێبەرایەتی PKK شۆڕشێکی گەورەمان هێنایە کایەوە، لەڕستیدا مرۆڤ دەتوانێ بڵێ ئیسلامیەتمان لەکوردستان پەیڕەو کرد. من تەنها ئەوە ناڵێم کە سۆسیالیزممان لەکوردستان پەیڕەو کردووە، بەڵکو بۆ یەکەمجارە بنەماکانی ئیسلامی شۆڕشگێڕی لەکوردستاندا پیادە دەکەین. من بانگەشەی ئەوە دەکەم، کە ئیسلامێتی راستەقینە لەکوردستاندا ئەو ئیسلامێتیەیە کە PKK پیادەی کردووە. لەم بوارەدا PKK چییە؟ ئەگەر بەچەند وشەیەکیش بێت روونکردنەوەیەکی لەسەر بکەین...

PKKلەڕاستیدا پەیڕەوکردنی ئیسلامی شۆڕشگێڕی و سۆسیالیزمی شۆڕشگێڕییە لەناو یەکتردا لەڕاستینەی کوردستاندا. هەندێك دەڵێن وەك چەپە ساختەکارەکان وایە یان هەندێك موسڵمانی ساختەکار دەڵێن ئیسلامییەت و سۆسیالیزم دژی یەکترن. بەڕای من دژی یەکتر نین. موسڵمانێتی لەچاخی ـ سەعدەت بە چ رەنگێك بووە، ئەمڕۆ PKKش لەو ڕەوشەدایە. PKK ڕەنگی پێکهێنانی چاخی سەعدەتی ئیسلامیەکانی عەرەبستانە لەڕاستی کوردستاندا. ئەوانەی مێژووناسن، ئەوانەی مێشکی خۆیان ماندوو دەکەن ئەوە دەبینن کە موسڵمانیەتی راستەقینەیە لە PKKدا خۆی دەبینێتەوە. گەورەترین نرخی بۆ رزگاری گەلەکەمان داناوە. ئامانجی ئیسلامیش

هەرئەوەیە و پیرۆزبایی لێدەكات. هەر لەبەر ئەمەیە كە هەندێك مەلای هێژا خۆیان لەناو PKKدا بینییەوە. مەلا عەبدول رەحمان یەكێكە لەو مەلا هێژایانەی كە ناسیومە، لەگەڵ گەریلایەكی PKK هیچ جیاوازیەكی نەبوو. راستی ئیسلام و جیهادی ئیسلامی لەگەریلایەكی PKKدا بینی و هیچ جیاوازیەكی نەبوو. ئەو رێبازەی زۆر خۆشدەویست و هەر لەو رێگایەشدا شەهید بوو. بەئەندازەی ئەو دژی كەمالیزم، خۆراگر و بەهیچ رەنگێك خۆی نەفرۆشتبێ، مەلای ئەوەندە بەهێزم نەبینیوە.

ئەگەر باسی موسڵمانێتی بكرێ، دەبێ نرخێكی زۆر بەرز بۆ ئیسلامێتی ئەو مەلا (99) سالییە دابنرێ. وەكو ئەو مەلایە ژمارەیەكی زۆر لایان وایە كە راستی ئیسلام لە كوردستاندا لەلایەن PKK وە پیادە دەكرێ و لەم پێناوەدا دەیان كەس لەوانە شەهیدبوون، دواترینیان مەلا سەید گونگور دێتەوە یادمان كە دوژمن لەهەلیكۆپتەر فرێیی دایەخوارەوە و پارچە پارچەبوو، كە خەڵكی شاری مووش بوو. هەر لەو ماوەیەدا لەشارەكانی یوكسەك ئۆڤا(گەڤەر)، مەلازگرت و جزیرە ژمارەیەك مەلا بەدەستی دوژمن شەهید كران و، لەكەسایەتی ئەواندا نیشان دەدەن: كە ئەگەر لە PKK نزیك ببنەوە پارچە پارچەتان دەكەین. بەڵام لەباوەری مندا ئەمانە موسڵمانی راستەقینەی موجاهیدن. بەمجۆرە راستیەكی مێژوویيان سەلماند كە دەبێت موسڵمانی شۆڕشگێر لەكوردستاندا بە چ رەنگێك بێ و ئەمانە هەرگیز خۆیان نەدابەستەوە. 60 ـ 70 ساڵ تەمەنیان بوو و تا مردن بەرگریان لەكوردستان كرد.

ئیسلام بەو رەنگە تێگەیشتبوون و دوژمنیش ئەوانەی پارچە پارچە كرد، بوویەری شێخ سەعیدیش هەندێك بەو جۆرەیە. موسڵمانێتی ئەوان نەبووە ئامرازی دەستی داگیركەری، هەر لەبەر ئەوە یاخیبوون. تەسلیم بوون بە كەمالیزم بەواتای دژایەتی ئیسلام و خیانەت پێكردنی بوو. بەبۆچوونی ئەوان لەبەر ئەوە لەدژی راوەستان و لەسەر ئەو بنچینەیەش لەسێدارە دران، كە ئێستا سەرنج دەدەین، رێبازی ئەوان دەگرێ و، ئێستا ئەو مەلایانە لە چ بزووتنەوەیەكدا یەكیان گرتووە؟ بێگومان لەناو PKKدا.

سەرەڕای هەموو هێرش و لادانەكانی دەوڵەت، PKK لەگەڵ هێزی ئیسلامی شۆڕشگێر بەرەنگێكی زۆر گونجاو یەكیان گرتووە و لەگەڵ راستینەی كۆمەڵی

کوردستاندا هەڵدەکەن و هەر لەئێستاوە دەتوانین سەرکەوتنی هێژا لەم بوارەدا ببینین. ئەمەیە ئیسلامی راستەقینە لەوانەیە هەندێك هەبن خەڵەتێنرابن، بەلام من موسڵمانێکی بەباوەڕم، ڕێز و حورمەتم بۆ ئیسلام هەیە ئەگەر بێت و یەکێك ڕاست واقعی کوردستان نەبینێ و لەپێناو ئەو راستیانەدا دەست بە تێکۆشان نەکات، ئەوا بێ سێ و دووڕووە.

ئەوەی راستی میللەتی خۆی و ئازادی و دادپەروەری و یەکسانی گەلەکەی هەڵنەسەنگێنێ و بەشداری شەڕ و جیهادی نەکات و تەنیا لەدوای ئەوە بێت هەموو رۆژێك نوێژ بکات و ڕۆژوی خۆی بگرێت بڵێ من موسڵمانم! ئەمە موسڵمانێتی سەرزارە. موسڵمانێتی رووکەشە، گەوهەرەکەی بەتاڵە، موسڵمانێتی لەناخی مرۆڤدایە، موسڵمانێتی بۆ ئازادییە، موسڵمانێتی لەشەرەف و نامووسی مرۆڤدایە. ئەگەر ئەمانە نەبینن، نوێژ و رۆژو هیچ نرخێکی نامینێ. لەکاتی جیهاددا دەبێ جیهاد بکرێ. نوێژو رۆژو نابێ. دوای ئەوە بیکە، دوایی بیگرە، ئەمانە پێغەمبەر گوتویەتی.

ئێستا کە ئەلف بای ئەم ئیسلامە نازانن، ئەمانەش بخەرە لاوە بەڕیشێکی درێژەوە، مێزەر دەبەستن و باوەر دەکەن بەمجۆرە دەبنە موسڵمان! هەرگیز مەحاڵە، من باوەرم نییە، سەرەتا مێزەر نەبوو کەشی بوو، کەوا و سەڵتە نەبوو، وەك باسمان کرد موسڵمانی شۆڕشگێر هەبوون. شەکڵ و شەمایڵ نەبوو، نە نوێژ هەبوو نە ڕۆژ و، تەنها جیهاد هەبوو، شەری ئازادی هەبوو، دوای ئەمە کاتی نوێژ و ڕۆژو دیاریکرا. شەکل و شەمایڵ دوایی پەیدابوون.

ئێمەش شۆڕشی ئیسلامی خۆمان پەرە پێ دەدەین، پێویستیەکانی ئازادی بەجێ دەگەیەنین. دوای ئەوە نوێژ و رۆژوو دێ. منیش نالێم نوێژ کردن خراپە و رۆژوش مەگرن، بەلام بزانن جیهاد بەر لەهەموویان دێ، من بۆچی وازم لەنوێژکردن هێنا، منیش پێشتر نوێژم دەکرد، بەردەوام خەریکی دوعا بووم، بەلام کە شەڕ دەستیپێکرد، گەورەترین نوێژکردن لام بووە جیهاد و، لەو رۆژەوە شەڕێکی گەورە بەرێوە دەبەم، ئەمەش موسڵمانێتی راستەقینەیە. چۆنیەتی ڕێزگرتنی من لەئیسلام و نیشاندانی ڕێگای راست بە خەڵکی بەمجۆرەیە؛ بزوتنەوەیەکی ئیسلامی راستەقینە پێویستیەکە بۆ ئێمە، کە ئەویش لەسایەی ڕێبەرایەتی PKK پەیدا دەبێ و دەتوانێ پێشکەوتنێکی هێژا بەخۆیەوە ببینێ. رەنگە هەرشتێکمان نەکردبێ، گرنگ ئەوەیە کە بنکە و پرەنسیپە

بنەڕەتیەکانی ئیسلام پێك دەهێنین، من لەسەر بناخەی ئایەت ئەم راستیانە روون دەکەمەوە، هەروەها لەسەر بنچینەی فەرمووده و مێژووی ئیسلام بەڕەنگێکی ئاشکرا ئەم شتانە دێنمە بەرچاو و، لەو بوارەدا هیچ زەحمەتیەك نابینم.

موسڵمانانی هێژای رۆشنبیر. بەتایبەت خوێندکارانی ئیسلامی کوردستان، دەبینین ئیدی رۆژی ئەوەیە کە ئیسلام بە رێگەیەکی راست تێبگەن و لەواقیعی وڵاتی ئێمەدا جێبەجێی بکەن. رۆژ رۆژی بەدیهێنانی رزگاری گەلەکەمانە. کوردستان کەوتۆتە نێو شەڕێکی شۆڕشگێڕانەوە و دوژمنیش جارێکی دیکە موسڵمانێتی وەکو سەلجوقیەکان و عوسمانیەکان بەشێوەکی ساختە و پڕ درۆ و دەلەسە و دووڕووانە بەکاردەهێنێ. ئێوەش لەبەرامبەر ئەوەدا گەوهەری راستی موسڵمانێتی، گەوهەری راستگۆیانەی شۆڕشگێڕی ئیسلام بە دادپەروەریەکی مەزن و بەیەکسانی و ئازادی بکەن بە بناخە و کوردستانی پێ بپارێزن. موسڵمانێکی عەرەب چی بۆ عەرەبستان دەکات؟ شیعەیەکی موسڵمان، عەجەمێکی موسڵمان چی بۆ ئێران دەکات؟ دیسان موسڵمانی تورك چی بۆ تورکیا دەکات؟ دەبێ موسڵمانی کوردیش بەناچاری شتێك بۆ کوردستان بکەن. ئەگەر نایکەن ئیدی گەل هیچ نرخێکتان پێ نادات و کەسایەتیتان نامێنێ و بەناوی موسڵمانێتیەوە دەبنە کەسایەتیەکی بەکرێگیراو. ئیدریسی بەتلیسی بە موسڵمانێتی خۆی کوردستانی خستە ژێر رکێفی عوسمانیەکانەوە. بەم پێیە رەنگێکی دیکەی موسڵمانێتیان هێنایە مەیدان، کە بەتەواوی لەخزمەتی دوژمنان و داگیرکەراندایە. ئەم موسڵمانێتیە چ نرخێکی هەیە و چەند پارە دەکات؟ ئەو موسڵمانێتیەی لە خزمەتی خاك و گەل و وڵاتی خۆی نەکات، ئەوە مەسلمانێتی نییە، موسولمانێتی حەزرەتی موحەمەد نییە. موسڵمانێتی سوڵتانەکانە. دەبێ ئێمە لایەنی موسڵمانێتی موحەمەد بگرین، یان هی سوڵتانەکان؟ ئەم پرسیارە وەڵامی راستی پێویستە.

ئێوە موسڵمانانی هێژای کوردستان کە لەچەندین قوتابخانەوە هاتوون لەوانە زانکۆی مێژوویی ئەزهەر، هەروەها سەجەم خوێندکارانی موسڵمانی زانستگەکانی تورکیا و کوردستان، من لەو باوەڕەدام کە ئێوە گوڕ و هێزێکی مەزن بەڕاستی ئیسلام دەبەخشن، کە لەشێوەی یەکسانی و دادپەروەری و پرەنسیپەکانی ئازادیدا خۆی لە PKKدا دەبینێتەوە.

بۆ هەموو مەلاكانی كوردستان، بەتایبەتی پیاوانی ئایینی كە لەمەودوا دەكەونە خزمەت راستینەی كۆمەڵانی خەڵك لەپێناوی ئازادی و دادوەریدا، دەبێت ئەمە بكرێت بە بنچینە؛ كە موسڵمانێتی بە سوڵتانەكان و دەسەڵاتداران و دەوڵەتان نافرۆشرێت، ناپاكی دەرهەق بە ئیسلام پەسند ناكرێت. بۆئەوەی مەجاهیدێكی موسڵمان بناسرێت و بچێتە كۆڕی خەباتەوە، ئەوا پارتیمان باشترین چەشنی پشتیوانی بۆ تەرخان دەكات. پارتیمان PKK پارتی ئەمانەیە، هەروەها بەرەیERNK و ARGK بەرە و لەشكری ئەمانەن. باوەڕم بەوە هەیە كە لاوانی موسڵمان بەخوێنی پاكی ئەو مەلا شەهیدانە و لەسەر رێبازی ئەوان رێگە دەگرنەبەر و ئەو ئەركانە بەجێ دەهێنن كە دەكەوێتە سەر شانیان.

توێژینەوە و لێكۆڵینەوە لەسەر مێژووی ئیسلام و دەربارەی هەر زانستێكی ئیسلامی بكەن، لەهەر روویەكەوە بێ. قوتابخانەكان و زانستگەی ئەزهەر دەرفەتێكی فراوانیان لەبەردەمدایە. تەقەلای من لەم روونكردنەوانەدا لەو چوارچێوەیەدایە كە ئێوە بتوانن جارێكی دیكە چاوێك بەزانستی ئیسلامیدا بگێڕنەوە و ئەو ئەركانە بزانن كە بۆ پەیڕەوكردنی ئیسلام لەوڵاتی ئێوەدا لەئەستۆتاندایە. بەڕاستی سەرەتای ئەركێكی مێژوویی یەكجار گرنگتان لەپێشدایە. بۆ ئەم مەبەستە تاقم و دەستە و گروپ لەنێو خۆتاندا پێكبهێنن. لەشوێنێكی بەتایبەتی وەكو میسر دەتوانن كۆمیتەیەكی كوردستانی ئاوا بكەن، دەتوانن بزوتنەوەیەكی ئیسلامی كوردستانی رەنگڕێژ بكەن. پەیوەندیەكانتان لەسەر ئەم بنچینەیە توند و تۆڵ و پتەو بكەن. دەتوانن پەیوەندیەكانتان لەگەڵ ئەو مەلا هێژا و بزوتنەوە ئیسلامیانە پتر پەرە پێبدەن كە پەیوەندیتان لەگەڵ دەبەستن. هەروەها هەندێكتان لەوڵاتەوە هاتوون و خزم و كەس و ناسیاو و برادەرتان هەیە و پێیان دەكرێ پەیوەندی رێكخراوەیی یان بەپێی راستی ئیسلام لەگەڵدا پەیدا بكەن. ئەمانە تێكڕا ئەركن. ئێوە دەتوانن لەڕووی ئایینیەوە راستییەكان روونتر بكەنەوە. چۆن دەتوانرێت لەڕووی ئایینی ئیسلامەوە خزمەتی كوردستان بكرێت؟ چۆن دەتوانرێت لەشەڕی ئازادكردنیدا خزمەت بكرێت؟ پێویست ناكات ئەمە بخرێتە ئەستۆی هەندێكی دیكە. دەبێ ئێمەش لایەنی كەم ئەوەندەی تورك و عەرەب و عەجەم بزانین ئیسلامیەتەكەمان شیبكەینەوە. ئەمە جگە لەوەی مافی خۆمانە و، لەهەمانكاتدا ئەركێكە فەرامۆش ناكرێت. ئیدی كوردستان لەباری مێژووییەوە بەقۆناخێكی گرنگدا تێپەڕ

دەبێت. ئەگەر بێتو لەسەر ئەو بناخەیە نزیکی ئەرکەکانتان نەبنەوە و بەجێ یان نەهێنن، ئەوا رووتان نابێ لەنێو خەڵکا سەرتان هەڵبڕن.

خەڵکی کوردستان کەوتۆتە نێو بۆتەی شەڕێکی گەورەی ئازادی ماف و دادپەروەری، ئەگەر ئێوە گەورەیی ئەو شەڕە لەبەرچاو نەگرن و رۆڵی خۆتان نەبینن و کاری خۆتان نەکەن، ناتوانن پێ بنێنە ئەم وڵاتە، تەنانەت ئەگەر پێشی تێبنێن کەس سڵاوتان لێناکات. ئەوەی کە لەسەر شانی ئێوەیە پێشڕەوی کردنە لەم کارەدا. مێژوو گەلێك موجاهیدی راپەریوی بەخۆیەوە بینیوە کە پێشڕەوییان کردووە. شێخ سەعید موجاهیدێك بوو، شێخ رەزاش هەروەها. ئەوان تەمەنیان حەفتا ـ هەشتا ساڵ بوو، بەڵام ئێوە لاون، بۆچی جیهاد ناکەن؟ ئێوە ئەوە ئەزانن کە PKK زۆر مەلای هێژای تێدا بەدی دەکرێت. ئەوانیش جیهاد دەکەن، ئەوجا رۆژ رۆژی جیهاد و ئیسلامێکی جیهادکارانەیە. ئەو ئیسلامەی رێ بۆ جیهاد ناکاتەوە، بەباوەڕی ئێمە ئیسلامێکی راست نییە. ئیسلامەتی بۆ کوردستان ئەو ئیسلامەیە کە بڕیاری جیهاد دەدات. بەپێی ئەمە دەبێ رێکخستن ساز بکرێت و تین و تواناکان لەسەر هێزی خۆ بخرێتە کار و دەبێ ئیسلامێکی چالاك بن.

من باوەڕ دەکەم کە ئێوە بەپێی ئەم بنچینە مێژوویی و رۆژانەییە و لەبەر رووناکی پێشکەتنەکاندا هێزی توێژینەوە و لێکوڵینەوەتان تێدا بەدی دەکرێت. ئەگەر پێویستیتان هەبێ بە رێگەی دۆستانی پارتیمانPKK دابین دەکرێت. ئێمە لەم بوارەدا ئامادەیین بۆ هەرجۆرە هاوکاریەك. بەڵام دەبێت ئێوەش لەمەو دوا تین و توانای خۆتان بۆ خەباتی رزگاری نەتەوەیی گەلی کوردستان بکەنە یەك،بەتایبەت تێکەڵی و پەیوەندیەکانتان پەرە پێبدەن. ئەو ئەرکانەی تائێستا دوا خراوە، دەبێ لەمەو دوا بەبێ سێ و دوو لێکردن بەجێیان بگەیەنن.

ئێوە موسڵمانانی راستەقینەی کوردستان و رۆشنبیرانی ئایینی و خوێندکاران؛ من دەتوانم رێزی خۆم تەنیا لەسەر ئەم بناخەیە، واتا بە هێنانە ئارای شۆڕشی کوردستان، نیشان بدەم. بەراستی هەر لەمنداڵیمەوە رێزێکی زۆرم بۆ ئیسلام داناوە و یەکێکم لەو کەسانەی کە ژیانم بەپێی ئەو راستیانە پێوانە دەکەم. سۆسیالیزم بەبنچینە دەگرین و لەگەڵ بویەری ئیسلامی ـ خۆرهەڵاتی ناویندا یەکانگیریان دەکەین. باوەڕیشم وایە ئەمە

راسترین کاره که بیکەین. ئەوجا لەمەو دوا خەڵکی خۆرهەڵاتی ناوین بۆی نابێ سۆسیالیزم لەدژی ئیسلام بەکاربهێنێ، بەڵکو دەبێ هەر یەکەیان بە ڕەنگێکی راست ئەوەی دیکەیان هەڵبسەگێنێ و هەردووکیشان لەسەرچاوەی گەوهەری شۆڕشگێڕانەیانەوە یەکدی هەڵبسەنگێنن و لایەنی رزگاری گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین بکەن بەبناخە. ئەمرۆ بنچینەی ئەمە دورست بووە و PKKش نوێنەری ئەم رێبازەیە و، هەم لەڕووی مێژوویەوە لایەنی پێشکەوتنخوازی ئیسلام و دادپەروەری و یەکسانی و ئازادی و هەرچی هەیە دەکات بەبناخە، هەم لەدژی زۆرداری و داگیرکردنیشە. لەهەمان کاتدا لایەنی یەکسانی ئازادی و سۆسیالیزمی هاوچەرخ دەکات بەبناخە. کاتێك ئەوانە یەکانگیر دەبن گەورەترین هێز دێتە مەیدان. PKK لەم بوارەدا بانگەشەی گەورە هەن و هەنگاوی سەرکەوتوانەی ناوە و ئەم بزووتنەوەیە لەلایەن دۆستان و دوژمنانیشەوە ناسراوە. ئێوەیش ئێستاکە ئەم راسیانە بەباشترین شێوە دەبینن و نیازی خۆتان دیاری کردووە، کە بەشداری ئەم خەباتە بکەن. بۆ ئەمەش دەبێ خۆتان بە هێز بکەن. ئەرکی موسڵمانێتی راستەقینە بایەخێکی زۆری لە بەجێهێناندا هەیە. ئەمە شیبکەنەوە و مسۆگەر بەخەباتی خۆتان ئەم سەرکەوتنە دەسەلمێنن.

ئێمە لەناوجەرگەی کوردستاندا لەشەڕێکی گەرمداین. شەڕ لەهەر مەیدانێکدا بەردەوام پێشکەوتنی بەرچاو لەگەڵ خۆیدا دێنێتە ئاراوە و ڕۆژانە گەشە بەسەرکەوتنەکان دەدات. ئەم شەڕە سەرکەوتن بەدەست دێنێت. دەبێت بڵێن: یەکێتی سەرتاسەری کوردستان بۆ یەکەمجار لەمێژوودا لەسایەی رێبەرایەتی PKKدا مسۆگەر کرا. هەوەها دەکرێت لەمێژوودا بنوسین: ئێمە هەموو مەزهەبەکانی وەك (عەلەوی، شافیعی، سوونی و حەمبەلی) هێنامانە پاڵ یەکتری. تەنانەت لەنێو توێژەکانی سەر بە دەستە ئایینیەکانی دیکەش دۆستی خۆمانمان پەیداکرد. لەهەر توێژو هۆز و خێڵێك مرۆڤی جیاجیامان هێنایە لای یەکتری. ئەمرۆ ئێمە درێژترین و سەرکەوتوترین شەڕی ئازادی مێژوومان هەنگاو بە هەنگاو روو بەسەرکەوتن رێنوێنی دەکەین. ئەمە خەونێکە بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار بەدیدێت. ئەمە لەبنەڕەتدا ئەرکێکە دەبوایە ڕۆشنبیرانی ئیسلام و جیهادکاران ڕایان پەڕاندبایە. بەڵام لەبەر گەلێك هۆی جیاواز جێبەجێیان نەکردووە.

ئێمە ئێستاکە ئەم ئەرکە بەجێ دەهێنین. ئێوە لەم بوارەدا نرخێکی گەورە بۆ ئەم کارە دابنێن و ئەگەر درەنگیش بێ بیر لەئەرکی خۆتان بکەنەوە.

مێژوو هەموو کاتێك کاری وا شەرەفمەندانە لەبەردەم مرۆڤ فوت ناکاتەوە. کاتێ سەردەمی "سعدت" بەدیدێت، ئەو کاتە جیهادکاران چەندە پیرۆزن! بەڵێ سەردەمی سەعدەتی کوردستان بەو رەنگە دەبێت. بۆ ئەو کەسانە کە بەشداری تێدا دەکەن، چەند شتێکی پیرۆزە، بەتایبەت کەسانی رۆشنبیری وەکو ئێوە کە باوەڕدارن و گەورەترین خزمەت دەکەن. هەموو ئاینەکان و ئیسلامی راستەقینە هەوڵ بۆ سەرەمی سەعدەت دەرەخسێنن. بەدیهێنانی خەونی ئەوانە دەبێتە مژدە و بەدڵنیاییەوە لەبارترین زەمینەی دڵخۆشی سازدەکات. بەڵام دەبێت بزانن کە زۆربەی ئەم کارە لەمەو دوا دەکرێت. هەر لەگەڵ جێبەجێبوونی ئاواتەکانماندا، رۆژ لەدوای رۆژ هیوا و واتای ژیانمان لەلا بەرزدەبێتەوە و لەگەڵ ئەم سەردەمی سەعدەتەدا دەژین.

بەم پێیە ئەگەر بەکورتیش بووبێ لەسەر راستیەکان پێداگیریمان کرد، بۆیە تەنیا لایەنی بەجێگەیاندنی ئەرکەکان دەگرم. من نامەوێ تەنانەت یەك کەسی خەڵکی کوردستان بەدەست بەتاڵی بهێڵمەوە و، بگرە نامەوێ یەك کەس بێ پەیوەندی بهێڵمەوە، ئەمە فەرمانی موسڵمانێتیە. منیش جارێکیتر پێویستیەکانی ئەم فەرمانە بەئێوە رادەگەیەنمەوە. ئەوەی کەوتۆتە سەرشانی من کردوومە و لەمەو دوایش دەیکەم. چاوەڕوانی ئێوەشم لەمەو دوا پێویستیەکانی پێکهێنانی فەرمانی ئیسلام کە لەئەستۆتاندایە بەجێ بهێنن. ئەگەر ناتەواوی و کەموو کورتی لەئێمەدا هەبووبێت نایان هێڵین و ئێوەش مەیان هێڵن. بۆ ئەمەش چیمان لەدەست بێت درێخی ناکەین. بەم پێیە دەبێ لەمەو دوا بەڕاستی هەواڵی ژیانیتان بەپێی موسڵمانێتیەکی نوورانی سەردەمی سعدت و، دیسان وەکو جیهادکارێکی ئەو سەردەمەی ئیسلام شەر بۆ گەل و وڵاتی خۆتان بکەن و سەرکەوتنی ئەم شەڕە تاڕادەیەك بەخۆتانەوە ببینن، بۆئەمەش هەمووشتێکی خۆتان بخەنە مەیدانەوە و من مسۆگەر چاوەڕوانی سەرکەوتنتانم.

## وڵاتپارێزی و راستی گەلی کوردستان

بەتێڕوانینی ئێمە باسکردن لە فاکتەری وڵاتپارێزی جێگایەکی گرنگی هەیە، کە تاوەکو ئێستاکە وەکو پێویست لەم بوارەدا ورد نەبووینەتەوە.

من ماوەیەکی درێژە لە دەرەوەی وڵات دەژیم، کەسانیتر زۆر هەن کە ماوەیەکی درێژتر لە من لەهەندەران ماونەتەوە. ئەو کەسەی لە ناخەوە وڵاتی خۆی خۆشنەوێ (بە کەسانی وڵاتە سۆسیالیتەکانیشەوە) ئەوا بە بڕوای من ئەو کەسە خۆی بزرکردووە. بۆ کەسێکی وڵاتپارێز ژیانێکی ئاسوودە و خۆش رابواردن دوور لە وڵات هیچ نرخێکی نییە. کەسێك کە وڵاتی خۆی لەدەست بدات و تەنانەت لە بستێك خاکیش بێبەش بێ (لە کاتێکدا دەرفەتی هەیە بەئازادی لەسەری بژی) ئەوا ئەو کەسە هەگیز توانای سازکردنی بچووکترین پێشکەوتنی ئابووری، کولتووری، سیاسی، نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی نابێ. لەوانەیە مرۆڤ لە دەرەوە تا رادەیەك ژیانێکی خۆش دەستەبەر بکات، وەکو جولەکە و ئەرمەنیەکانی ئێستا و هەندێك لە فەلەستینیەکان، بەڵام پەنابەرێك هەزار ساڵی بە سەردا تێبپەڕێ و بە بستێك خاکی ئازاد نەگات، ئەوا ئەم گەلە ناتوانێ ئارام

ببێ و بگره بەردەوام بەدەست تەنگ و چەڵەمەکانەوە دەناڵێنێ، وەك ئەوەی بەسەر گەلەکەماندا هاتووە.

وڵاتپارێزی لەلای ئێمە سەرلەنوێ پەرەدەسێنێ. چونکە ئەو وڵاتپارێزیەی تورکیا بەسەر ئێمەیدا سەپاندووە بریتیە لە خۆشویستن و گرێدان بە تورکیاوە. ئەشق بۆ تورکیا و رۆحی وڵاتپارێزی تورکی لای گەلی تورك بەنرخە، لەسەر ئێمەشە رێزیان لێ بگرین. وەلێ گەر بڵێین وڵاتپارێزی تورکیا، وڵاتپارێزی کوردستان دەگەیەنێ، ئەو کات ئێمە خۆمان لەنامۆبوونێکی دوور لەوڵاتپارێزیدا دەبینینەوە، جگە لەوەی لەهەموو بەها و نرخێکی نەتەوەیی دادەبڕێین. هەریەکێکمان هەست بەم راستیە دەکەین. بەڵام بە حوکمی زمان، کولتوور و سیاسەت ئێمە ناچار کراوین شەیدای تورکیا ببین. بەکورتی هەموو بەهایەکی نەتەوەیی (کە زەوتکراوە و هیترمان بەسەردا سەپێنراوە) ناچاری ئەمەین و، هەر لەم روانگەیەوە هەوڵی تێگەیشتن و هەڵکردن لەگەڵیدا دەدەین. بەڵام ئایا دەتوانین بەیەکجار لە روویاندا بوەستین و یەکسەر بەرپەرچیان بدەینەوە؟ نەخێر. چونکە ئەم ئاواتەی ئێمە بە ماوەیەکی درێژ و دوای ئەوەی کۆششێکی چاکمان بۆی کرد پێکدێت. لەهەمان کاتدا دەستە وەستان نامێنین و بەرپەرچێکی سیاسیان دەدەینەوە و لە رووياندا خۆڕاگریەکی توندوتیژ دەکەین، بەو رەنگە ئەگەر ماوەیەکی درێژیش بکێشێ، ئەوا بە وڵاتپارێزیەکی کوردستانی جێگای دەگرینەوە. وڵاتپارێزی کوردستانی؛ دەبێ لەسەر بنەمای بایەخدان بەژیانی گەل گەشەبسێنێ. پێویستە چاك بزانین کە ئەم پارچە زەویە (کوردستان) دەبێ وەك پێویستیەك بیکەینە وڵاتێکی ئازاد و چارەنووسەکەشی بدرێتە دەست گەل. مێژوو لەم خاڵەدا گەواهی فرمێسك و خولیای گەلە خۆشەویستەکەمان و کەلەپوورە پڕلە بەرخودانەکەیەتی. مێژوو سەلماندوویەتی کە ئەم خاکە بنچینەی دامەزراندنی شارستانیەتی مرۆڤایەتییە. داگیرکەران بەرەنگێك فشار دەهێننە سەر گەلەکەمان وەکو ئەوەی بیانەوێ لە وڵات دایببڕن یاخود دەتوانین بڵێین دوور کەوتنەوە لە وڵات سەرئەنجامی پەیڕەوکردنی ئەم سیاسەتە داگیرکەریە دڕندانەیەیە. هەروەك دەزانن، جاران راگواستن بەزەبر و زۆر ئەنجام دەدرا، بەڵام ئێستا لەئەنجامی خراپی باری ئابووری، خەڵکی ناچاری کۆچ پێکردن دەکەن، بەمجۆرە گەلەکەمان دووچاری برسێتی دەکەن و دەرفەتی ژیان تەنها بۆ رێژەیەکی کەم

دەهێڵنـەوە، کـە ئـەوانیش بـە کولـە مـەرگی ژیـان بەسـەر دەبـەن. بەڵگـە نەویسـتە کـە لەدەرئەنجامی ئەم سیاسـەتەدا، رێژەیـەکی زۆری خـەڵك رێگـای راکـردن لـە وڵات دەگرنـە بـەر، چونکە دوژمـنی کۆڵۆنیالیست هـەلی ژیـانی بـۆ ئـەم رێژەیـە گـەمارۆداوە و توانـای گـوزەرانی بـۆ نەهێشـتوون. ئەمـەش نەخشـەیەکی تـا ئەوپـەڕی دڕندانـەی سیاسـەتی کۆڵۆنیالیستیە. لەم چوارچێوەیەشدا گـەلێك دامودەزگـای مژۆکـدار سـازدراون؛ بەتایبـەت لـەبواری ئـابووری و کۆمەڵاتیـدا، کـە دەرفـەتی بـژێوی تـەنها بـۆ ئـەو رێـژە دیـاریکراوەی سەرەوە دەستەبەر دەکەن. دواتر هەڵسان بـە داسـەپاندنی ئـەم سیاسـەتە لەسـەر تـەواوی کوردستان و ئەنجامەکەشی بووە هۆی دەسپێکردنی شەپۆلێکی بەرفراوانی کۆچبەری بـۆ رۆژهەڵاتی ناوین و ئەوروپا و ئەنادۆڵ. ئەمە چی دەگەیەنێ؟! ئەمە بەو واتایە دێـت کـە مـرۆڤ ببێتـە قوربـانی بزاڤێکـی پەرتـەوازەیی. لەڕاسـییدا بەجێهێشـتنی وڵات هـەروا بەئاسانی و دەستبەردار بوونی بەرهەمهێنان و گۆڕانی کۆمەڵایەتی و نەتەوایـەتی، واتـای لەدەستدانی گەلێك شت دەگەیـەنێ! هەرچـەندە گەلەکـەمان دەیـان سـاڵە بـۆ بـەدیهێنانی ژیـانێکی خـۆش و ئاسـوودە تێدەکۆشـێ، کەچـی هێشـتا بەدەسـت ژیـانێکی کـوێرەوەری و پەژارەییـەوە دەنـاڵێنێ. هـۆی بنـەڕەتی ئەمـە چـییە؟ لەئـەنجامی دوورکەوتنەوەیـەکی هـەرزان لـە وڵات و، هـەوەها بـەحوکمی ئـەوەی خـەباتێکی توونـد و چـالاکمان پیـادە نەکردووە، بەملیۆنان دووچاری ئەم دەردەسـەری و پەڕاگەندییـە بوونـە. تورکیـا ئەمـەی بەسەردا سەپاندووین، ئێمەش نەك هەر تەنها بووینەتە قوربـانی، بـەڵکو لەمـەش زیـاتر بەناوی (خۆ رزگار کردن) بۆ ئـەم کـارە ناچـار کـراوین. بێگومـان ئەمـە جووڵانەوەیـەکی پەرتـەوازە کردنـی زۆر گەورەیـە لـە وڵات. هـەر لەبـەر ئەمەیـە کـە پـێش هـەر شـتێك بەرپەرچدانەوە و راوەستان لەڕووی ئەم سیاسـەتە ئـەرکێکی وڵاتپارێزیـە. بۆیـە چالاکی دەرەوەی وڵاتمـان بـە بزووتنەوەیـەکی نەتەوایـەتی گـەورە دانـا و گوتمـان: "سـەرلەنوێ گەڕانەوە بۆ گۆڕەپانی وڵات، گەڕانەوەیە بۆ بنچ و بنـاوان، ئەگـەر ئـەم جووڵانەوەیـە بـە جۆش و خرۆشەوە ئەنجام بدرێ ئەو کات ئـەرکی خۆمـان پێکهێنـاوە. ئەگـەر نـا چـەمکی **ژیانی ئاسوودەی هەندەران** قووڵتر دەبێتەوە و هەتا هەتایی لە هەنـدەران دەمێنینـەوە".
ئێمە پێشتریش روونکردنەوەی لەم جۆرەمان کردووە، بەڵام بـەڵام لـە پراکتیکدا وەڵامـی ئەمەتان نەداوەتەوە، ئەمەش نیگەرانی ئێمەی زیاد کرد.

وەکو ئاشکرایە مانــەوە لـە هەنـدەران بـۆ ماوەیـەکی درێـژ گیـانی رەگەزپەرسـتی و دڵتـەنگی بەرامبـەر بیانیـان پەیـدا دەکـات. ئەگـەر هـەر گـەلێك بـەئازادی خـۆی بەرهـەم نەهێنێت و پێشکەوتنی کۆمەڵایـەتی و چینایەتی خـۆی ئـەنجام نـەدات، هـەتا ئەگـەر لـە وڵاتی خۆشی دابێت، مەحاڵە بگاتە ژیـانێکی بەختـەوەر و ئاسـوودە. کەواتـە رزگـاربوونی تاکە کەس و خێـزان لـە خـۆ هەڵخەڵەتانـدن بـەولاوە هیچیتر نییـە، ئەوانـەی ئـەمرۆ لـە ئەوروپا و لیبیا و سعودیا و تەنانەت تورکیـا و وڵاتـانی تـریش دەژیـن ئـەو رەوشـە دەرك پێدەکەن و باسی لێوە دەکەن و داد و بێدادیانە لە دەست نەبوونی یەکسانی ـ بێکاری و، جگە لە چەندین تەنگـژە و گیروگـرفتی تـر کـە هەراسـانی کـردوون. کەواتـە وڵاتپـارێزی بەشێکە لە ژیانی رۆژانە و پێویستە گەشەی پێبدرێ. چونکە گەلەکـەمان بەدەسـت دوور خســتنەوەیەکی دژوارەوە دەنــاڵێنێ و لــەژێر بــاری ســتەم و زۆرداریــدا لــە نــەزانی و کەمتەرخەمیەکی ترسناکدا دەژی.

لەسەر بزاڤی نەتەوەییمان پێویستە هەڵسێ بـە هانـدانی گـەل و بـە سـوپاکردنی، بێگومـان دەبـێ ئەمــەش لـەپێناو بەدەسـت هێنـانی هۆشـیاریەکی نەتـەوەیی زۆر قـووڵ دابێت. کەواتە ئەمەش یەکێکە لە رەهەندەکانی وڵاتپارێزی، کـە دەبـێ لێـی بکۆڵینـەوە و لەسەر ئەم بنچینەیەش هەڵیبسەنگێنین.

ئێمە نازانین سەیری وڵاتی خۆمـان و تەنانـەت جوگرافیەکەشـی بکـەین! سروشـتی کوردستان چۆن رازاوەتەوە؟ هـەروەك دەبیـنین لەسـەر رۆخـی هـەر جۆگـە و رووبـارێکی بچووك باخچەیەکی بچووك یا مەزن بەدی دەکەین، ئێمەش دەچـینە نـاوی رازی دڵمـانی تیادەکەینەوە. هاوکات وڵاتەکەمان پڕە لەدیمەنی سەرنج ڕاکێش، بەڕادەیەك ئەگەر بێتو تەنها مانگێك هەڵسین بـە بنیادنانـەوەی، ئـەوا دەبێتـە مایـەی سـەرنج راکێشـانی هـەموو گێتی. بەڵام مەخابن، ئێمە نازانین چۆن بەم دیمەنانە ئاسوودە ببین. هـەروەکو زۆربـەی هەڤاڵانمان بست بەبست خاکی وڵات تەی دەکەن، کەچی نـازانن سـەرنجی هـیچ دیمـەنێك بدەن، بێگومان ئەمەش ئاستی نامۆبوونمان لـە وڵات دەردەخاتـە روو. لێـرەدا ئـەوەی لـەم تێروانینە تەسك و ئاسۆ تاریکەدا بەرامبەر سروشتی وڵاتەکەمان بەدیار دەکەوێ ئەوەیـە کـە هەسـتی نەتەوایـەتیمان چەندە لاوازە. بەمشێوەیە تـەواوی هـەڤاڵانمان ئـەم هـەموو دەرفەتەیان لەبـەر دەسـتدایە و بەڕادەیـەکی بـێ سـنوور دیمـەنیان دیـوە، کەچـی نـاتوانن

نەك تـەنها رۆمـانێكی لەسـەر بنووسـن، بـەڵكو لـە توانایانـدا نییـە تێبینییەكیشی لەسـەر بدەن. ئەمەش لە كاتێكـدا كـە نووسـەران و هونەرمەنـدانی توركیـا دەچـن بـۆ هـەكاری و لەسـەر چـیرۆك و پاشمـاوەی كولتووریمـان فلـیم دەردەخـەن و شـیعر و رۆمـان دەنووسـن، بەڵام هەڤاڵانی ئێمـە سـەرەڕای ئـەوەی دەچـنە هـەر شـوێنێكی كوردسـتان بـەڵام نـاتوانن دەربڕینێكی خۆش لەسەر بستێكی ئەم سروشتە جوانە بكەن. كەچی مـن لـەو بـاوەڕەدام كـە كوردسـتان بریتیـە لـە لوتكـەی هـەرە جـوانی و دڵفـڕێنترین سروشـتی هەیـە لـە رۆژهـەڵاتی ناوینـدا. ئەگـەر بێـت و رزگـار بكـرێ و بـۆ ماوەیـەكی كـورت هەڵسـین بـە سازكردنەوە ئەوا دەبێتە جێگای سەرەنج راكێشانی هەموو جیهان و، لێـواری هـەر جۆگـە و رووبار و دۆڵێك خانوو و كۆشـك و تـەلار دەگرێتـە خـۆی وەكـو ئـەوروپا، لـە بنچـینەدا هەر بستێكی ئەو خاكە باخچەیەكی سروشتیە و پڕە لە شوێنەواری مێـژوویی و سـامانی سروشـتی. لێـرەدا بـە سـەدان میللـەت كەلـەپووری رۆشـنبیری دەوڵەمەنـدیان بـۆ خۆیـان پێكهێنـاوە، رۆژ لـەدوای رۆژیـش پێـی دەوڵەمەنـد دەبـن، تـاوەكو رۆژانـی ئەمرۆكـەشمان بەرجەسـتەیان كـردووە، كەچـی میللـەتی ئێمـە هـەر بـەدوا كـەوتوویی مایـەوە. یـەكێك مێژووی خۆی خۆش نەویێت مەحاڵە ببێتـە نیشتمانپەروەر. لێـرەدا: چـۆن گـەلان بـەبێ مێژوو دەتوانن ژیان بەرنەسەر؟ چ كولتوورێكیـان پێشخسـتووە تـا گەیشـتوونەتە رۆژانـی ئـەمرۆ؟ پادشـا و خوداوەنـد و كۆیلـە و خانەدانـەكان چـۆن تێكۆشـاون، هونـەر چـۆن لەناویاندا پەرەیسەند؟.

بێگومان هەركەسێ هەست بەم هەموو شتانە نەكات و نەیانناسێت و لەدڵی خۆیدا جێگیریان نەكات ئەوا ئەو كەسە هەر بەئاسۆیەكی تـاریكی دابـڕان لـە مێـژوو وەك خـۆی دەمینێتەوە و، دوور دەبێ لە هەستكردن بەجوانی سروشت. هەوەرها ئـەوەی هەسـت بـە ئێش و ئازاری دوورە وڵاتی نەكات و پێێ پەست نەبێت، ئەوا شۆڕشگێڕیەكی تەسك بینە و لە سێبەری لووتی بەولاوە هیچتر نـابینێ، شۆڕشـگێڕێكی بـێ گیانـە و لـە دۆگمـاتیكی و دووڕوویی تێپەڕی نەكردووە و، شۆڕشگێڕێكی ساختەكارە و گومانی ئەوەی لێدەكرێت كە بە ئاسانی رابكات و هەموو شتێك پشت گوێ بخـات. بـەڵام ئـەوەی كـە پێـی دەڵێن ژیـان: ئەوەنییە كە مرۆڤ پەنا بباتە بەر كەلاوەیەك و بەشێوەیەكی سەرەتایی بژی. لـەم جـۆرە ژیانـە نەك تەنیا كەسایەتی مەزن و لێهاتوو دەرناكەون، بەڵكو مانای ژیان بە واتایی وشە نابەخشێ. كە وابێ ئـەم شـێواز و جـۆرە ژیانـە، ژیـانێكی وڵاتپـارێزی نییـە. ئەگـەر وابـێ

بۆچی هونەرمەندی هەڵکەوتوو دەرناکەون؟ بۆچی ئەدیبی لێهاتوو لای ئێمە پەیدانابن؟ لەلایەکی تر ئاستی شارەزاییتان لە سەرچاوە مێژووییەکان چەندە کە بنەمای وڵاتپارێزی بە هێز دەکەن؟ زۆربەمان نەك شتێك دەربارەی جوگرافیا نازانین، تەنانەت بە هزر و چاویلکەی تورك سەیری کوردستان دەکەین، بەڕەنگێك کە لەگەڵ ئەوان جیا ناکرێتەوە. بێگومان بەمەش هەستی نەتەوایەتیمان نەك تەنیا گەشە ناکات بەڵکو دوادەکەوێ، چونکە دوژمن لەلای خۆیەوە درێخی ناکات لە داسەپاندنی ئەو ڕێبازەی کە دەڵێ: " ئەم ناوچەیە واتە (کوردستان) شوێنێکی قەدەخە کراوە و نابێ ژیانی تێدا بەردەوام بێت ..."

ئەگەر ئێمەش بەهەمان شێوە بیر بکەینەوە، ئەوا خیانەت دەکەین. لێرەدا لەجیاتی قووربانیدان لە پێناو وڵات، راکردن زیاد دەکات. هەروەها لە جیاتی گرێدان و پەیوەستبوون بە خاکی وڵات هەتا مردن، دەبینین هەڵاتن باڵی خۆی بەسەر تەواوی وڵاتدا دەکێشێ و، دوای راکردن دەڵێن: "هەزار شوکر کە رزگارمان بوو، هەر دەستێك ماچ دەکەین کە کارێکمان بۆ پەیدا بکات". ئێمە گوتمان راکردن لە وڵات خیانەتە، لەڕاستیدا ئەم هەڵاتنەی ئێوەش هیچ دەنگ و دەهۆڵێکی پێوە نییە (واتە ئەنجامی هیچ کارەساتێك نییە)، بەڵکو تەنیا بە هۆکاری ئابووریەوەیە، ئەمەش دەبێتە مایەی شکاندنی ئابڕووی مرۆڤ. بەڵێ راکردنێکی ناچاریە و هیچ ڕێگایەکی ترتان نییە، بەڵام بەلایەنی کەم دەبێ لە دەروونەوە ئەم دروشمە بەرزبکەنەوە: "حیسابێکی توونـد لەوانە دەخوازین کە دووچاری ئەم رەوشەیان کردین"، چونکە پشتگوێ خستنی دوارۆژ و مێژوو رەفتارێکی زۆر خراپە و، پشت گوێخستنێکی وەها مەزن وامان لێدەکات چاومان کوێرببێت و هیچ داخوازیەکمان نەبێت لە داهاتوودا و تەنانەت بەرامبەر سەردەمیش.

ئاستەمە بتوانین هەست بە پێداویستی ئەوە بکەین کە گەلەکەمان بگەیەنین بە کاروانی سەردەم، تەنیا بە دیتنی بەهای خۆمان و پێشکەوتنی گەلانی هاوچەرخ نەبێ بەهەموو رەهەندەکانیەوە. ئێمە خۆمان وەکو هەندێکی تر دەبینین! کە ئەمەش هەستکردن بە پێداویستی پاککردنەوە و دەوڵەمەند کردنمان لەلا دورست ناکات، ئەمە چ سوودێکمان پێدەبەخشێت؟ بێگومان دوورمان دەخاتەوە لە خواست و ویستی گەیشتن بە ئاستی گەلانی هاوچەرخ، کە ئەمەش هەستی نەتەوایەتیمان لاواز دەکات.

وشیار بوونەوەمان لەم سەردەمە بەشێکە لەهەستی نەتەوایەتی و جیاناکرێتەوە. هەر یەکێ لەناوخۆیدا ئەم هەستە گەشە پێبدا، ئەوا لەهەمان کاتدا هەست بە رێز و نەوازش دەکات بەرامبەر گەلانی ولاتپارێزی جیهانیش. لە ئاستیدا سەر ناچەمێنێ، بەڵکو رێزی لێدەگیرێت، هەوەرها رەتی ناکاتەوە، بەڵکو لەسەر بنەمای ناسینی گەلێك شت هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکات کە دەتوانێ سوودیان لێ وەربگرێ یا هاوبەشیان لەگەڵ بکات. گیانی ولاتپارێزی بەگەلێك شێوەی تریش دەڕوێت، بەلام پێویستە هەستی پێبکرێت.

لەوێدا ( واتە کوردستان ) لە توانادا هەیە ئابووریەکی پتەو بنیادبنرێ و، دامەزراو و بیناسازی زۆر پێشکەوتوو سازبکرێ و، هەموو شێوەکانی هونەر گەشەی پێبدرێ. هەتا وەرزیش، ئەم کاروبارانە هەمووی روون و ئاشکران. ئەگەر پێشکەوتن بەم شێوازە پیادە بکرێ، دەتوانرێ لە هەر بستێکی ئەم جیهانە ئەنجامبدرێ. ئەگەر بەم شێوەیە لەم مەسەلەیە گەیشتبین، ئەو کات دەردەکەوێ کە ئێمە گەیشتووینەتە ئەوەی کە یەکێك لەلایەنە گرنگەکانی ولاتپارێزی بنیادنانی ئابووریەکی پتەوە لەسەر خاکی ولات و سازکردنی سەرخانی کۆمەڵە لەسەر ئەم بنچینەیە. کەواتە هەڵسان بەم بنیادنانە هەستێکی نەتەوایەتی پتەو دەخوازێ. لێرەوە دەتوانین پشت بەم سەرەنجامانەی خوارەوە ببەستین: پێویستە بەقووڵی و سەر تاسەری بڕوانینە نەتەوایەتی، هەروەك لە رابردوودا نموونەمان هێناوەتەوە و هەندێك فاکتەریشمان دیاری کرد، ئەوا بایەخ پێدان و فراوانکردنی ئەم بابەتە وا لە مرۆڤ دەکات ببێتە نیشتیمانپەروەر. کەچی لەگەڵ ئەمانەشدا ئێستا رەوشی کوردستان بەمشێوەیەیە: هەریەکێ کوردستان وەسف دەکات بە (کەلاوە ـ چۆڵ و بیابان ـ پێویستی مرۆڤ تێرناکات ـ مژدەی پێشکەوتنی تێدانییە ـ ئەم ولاتە پێشناکەوێت تەنیا بە پەیوەندی بەستن نەبێ لەگەڵ داگیرکەران، کە دەتوانین ببینە فەرمانبەری ئەوان و مووچە وەربگرین ). بەلام ئێمە ئەمانە رەت دەکەینەوە و دەڵێین: نەخێر، دوژمنایەتی هەموو ئەم بیروبۆچوونانە دەکەین، چونکە بزووتنەوەی ئێمە لە ناوەرۆکەوە هەموو ئەم تێروانینانەی رەت کردۆتەوە و، لەسەر بنەمای وشیاربوونەوەیەك دەجوڵێتەوە کە ئەمە دەگەیەنێ "رزگاری ولات بناخەی هەموو پێشکەوتنێکە، جا ئەو هەنگاوانەی ئەمڕۆکە لەم پێناوەدا دەهاوێژرێن چەندە بچووکیش بن، گرنگ ئەوەیە ئەم هەنگاوە نەتەوایەتیانە سبەی خێزانێکی زۆر پایە بەرزی

مرۆڤایەتی بەدی دێنێت". مێژووی رابردوو بۆمان دەردەخا کە ژمارەیەکی بێ سنوور لە میللەتان پێکهاتوون و گەشەیان سەندووە و رۆژ لەدوای رۆژ خۆیان بەهێز کردووە، ئەی کەواتە بۆچی لە ئێستا بەدواوەش ئەمە روونادات، لەکاتێکدا کە "میزۆبۆتامیا" لانکە و سەرچاوەی مرۆڤایەتی و شارستانیەت بووە، کەچی ئەمڕۆ وەکو کەلاوە سەیری دەکەن؟!
"ئەگەر چی لە رۆژی ئەمڕۆماندا داگیرکەران بە حوکمی پرۆژەکانیان بە چاوێکی گەشبینەوە سەیری کوردستان دەکەن، بەلام لەهەمان کاتیشدا زۆر بە دڕندانەوە نزیکی دەبن". کەواتە بۆچی ئێمە خۆمان ئەم خاکە نەگۆڕین و نەیکەین بە زەمینەیەك لەپێناو بزووتنەوەی نەتەوایەتیمان؟ ئەم هەست و نەستە بە تەنیا بەسە بۆ بیرکردنەوە لە بەرزکردنەوەی شەڕی رزگاری نەتەوایەتیمان. بەهەزار شێوە و شێواز و، خەبات کردن لەپێناو رزگارکردنی مێژوو، هەروەها رزگار کردنی چەند بەشێك لە جوگرافیای کوردستان بەسە بۆ بنیادنانی ئابوورییەکی تایبەت بە گەل و ئابوورییەکی سۆسیالیستی لە دەشتی میزۆپۆتامیا. ئەو کاتە گەل دەتوانێ زۆر بەئاسانی بڕیاری چارەنووسی خۆی بە شێوەیەکی ئازادانە بدات. ئەمانەش هەموو بەسن بۆ پیادەکردنی شەڕێکی گران و گەیاندنی بە سەرکەوتن.

لە رەوشێکی وەهادا گەر سەیری هەموو ئەمانە بکەین، ئەوا نەوەك بەتێروانینێکی گوندێتی سادە و تەسکبین، بەڵکو لەسەر بنچینەی حەزکردن لەسەر بەرزی و شکۆمەندی لەم روانگەیەی کە ئێمە خاوەنی ئەم ولاتەین و، هەروەها ئەگەر زانیمان رەنگدانەوەی ئەم هەست و نەستە لەسەر هەموو چالاکیەکانی رێکخستنی سەربازیدا دەربخەین، تەنیا ئەو کاتە دەتوانین کوردستان بکەین بە گۆڕستانی دوژمنان و ژیانێکی خۆشی تێدا ئاوابکەین، هەروەها دەتوانین لەسەر ئەم خاکە هەبوونی مرۆڤایەتی خۆمان بەدەست بخینەوە کە سەدان ساڵە لە دەستمان داوە، هەر بەمشێوەیەش دەتوانین نرخ و رێزگرتن لەناو گەلانی تر بۆ خۆمان دیاری بکەین. بەتێڕوانینی من بە نزیکبوونێکی بەرفراوانتر لەو بابەتانەی کە باش دەیانناسین و بە پێشخستنی لێکۆڵینەوە و پێداچوونەوەکانمان لەسەر بناخەی ولاتپارێزی و، چاوخشاندنێك بە زانیاری جوگرافیمان و، بەهەمان شێوە نوێکردنەوەی وشیاری مێژوومان و لەسەر ئەم بنچینیەش لەدەرەوەی ولات هەڵسوکەوت لەگەڵ گیروگرفتە زەحمەتەکانیشی بکەین و

سەرنجێك لە مەسەلەی بنیادنانەوەی وڵاتەكەمان بدەین لە بواری ئـابووری، كۆمەڵایـەتی و....هتد، ئەوا لەسەر ئەم وڵاتپارێزیە بەهێز دەبن و بە رادەیەكی بەرزیش هیوا و ئاوات لە دەروونتاندا دەڕوێ، لەهەمان كاتدا جۆش و خرۆشی زیاترتان پـێ دەبەخشـێ لـەپێناو بەدەست خستنی وڵات و رزگاركردنی لەژێر دەستی داگیركـەرانی بیـانی. ئێمـە جارێكیتر هەنگاوی گەورە دەخەینەوە یادی خۆمـان و، لـە پێنـاوی ئەنجامـدانی ئـەم هەنگاوانـە بـۆ گەیشـتن بـە ئامــانجی پـیرۆز و پێكهێنــانی ئــەو ژیانــەی كــە دەمانــەوێ بەوپــەڕی حەماسەتەوە، پێش هەر شتێك پێویستە نیشتیمانمان هەبێت و، دروستكردنی كۆمەڵێكی ئازاد بە پێویست ببینین. بێگومان دەبێ ئەمانە بە بناخە بگرین بۆ بەئەنجام گەیانـدنی هەر هەنگاوێك. هەر كاتێك ئەم هەست و هۆشـیارییەمان لـە خۆمانـدا بەرجەسـتە كـرد، ئەوكات دەتوانین هەنگاوی گەورە بهاوێـژین. بـەڵام ئـەوەی هیـچ داخوازییـەكی نـەبێت و هەڵسێت بە بڵاوكردنەوەی وڵاتپارێزیەك بەپێی چەمكی: "رادەكـەم لـەم وڵاتـە وێـران و كەلاوەیــە! رادەكــەم ئەمــە پێویسـتی مــن تێــر ناكـات و دواكـەوتووە! رادەكـەم ئەمـە ناوچەیەكی قەدەغە كراوە و هیچ كولتوورێكی تێدا نییە! لێی رادەكەم ئەمـە ناوەنـدێكی ستەم و زۆرداری و چەوسانەوەیە". ئەم جۆرە كەسە تۆ بیشیكوژی ناتوانی بیگەڕێنیـەوە وڵات و ، بـەردەوام دەڵـێ: ژیـانی تـەواو لـە ئەوروپادایـە و لـەو موچـەی كـە داگیركـەران دەیدەنێ لە دامودەزگاكانی دەوڵەت. شتێكی روون و ئاشكرایە كە كاری ئەم جۆرە كەسانە و خـاوەن ئـەم چـەمكانە زۆر سـنوور دراوە، چـونكە بـەردەوام چـاوێكی یـا قاچـێكی لـە نۆكەری و وابەستەییدایە. لە وانەیە ئەو كەسە پاروێ نانی دەست بكەوێ، بەڵام بێبـەش دەبـێ لـە نەتەوایـەتی و تێـر دەبـێ لـە نۆكەرایـەتی. لەسـەر ئـەم بنەمایـە خـاوەنی ئـەم چـەمكانە نـاتوانێ لـە هـیچ كاتێكـدا هـیچ هـەنگاوێ بـبڕێ بـەڵكو لـە پێنـاوی وەرگـرتنی موچەیەكی دیاریكراو لەكۆتایی هەر مانگێكدا وەكو كۆسـپێك لەبـەردەم جوڵانـەوەی ئـەو كەسە دەبێتە ئاستەنگ. ئایا دەتوانی بیخەیتە سەر كارێك گەر بە كوشتنیش بێت؟ ئـەو بەو موچەیە خێزانی خۆی بەڕێوە دەبات. بۆیە ئەم موچەیە دەپەرستێت و ناتوانی لێـی دوور بخەیتەوە. جگە لەمانە ئەگەر چی ژیان لە ئەوروپا بەڕادەیەكی زۆر سەرنجی مرۆڤ رابكێشێ و بە تایبەتی لەكاتی ئەنجامدانی ئەمە لە ژێر نـاوی حیزبایەتیـەوە دەبـێ بـاش بزانین كە ئەو كەسانە بە هیچ شێوەیەك نە حیزبین و نە نەتـەوەیین، بـە پێچـەوانەوە ئەمانـە دژی شۆرشـن. ئـەوەی بـەم تێڕوانینـە سـەیری داگیركـەران و ئیمپریـالیزم بكـات،

ئەوە کەسێکی رووخاوە و، ئەگەر هێزی هەنگاونان لە یەکێکدا لاواز بێت دەتوانین هۆکار و سەرچاوەکەی بگەڕێنینەوە بۆ هەڵوێستی ئەو کەسە بەرامبەر ئیمپریالیزم و نەبوونی گیانی وڵاتپارێزی لە خودی ئەو کەسەدا. هەر بۆیە گەشەکردنتان و گەشەی کەسایەتیتان لەگەڵ تێپەڕکردنی ئەم کەم و کوڕیانە پێکدێت. لەوانەیە بڵێت: گەیشتن بەم ئاستە زۆر و زەحمەتە، بەڵام ئەو کەسەی بیەوێ ببێتە مرۆڤێکی مەزن و لێهاتو و خەباتگێڕێکی بەتوانا، ئەوا هیچ شتێك بۆ ئەو کەسە نابێتە کۆسپ و تەگەرە.

کێشە گرنگەکان لە مێژوودا بە فیداکاری و خوێن رشتن چارەسەر کراون. وڵاتپارێزی و نەتەوایەتی پیرۆزیش بە خەبات و تێکۆشانێکی دژوار و بێ ووچان بە چارەسەری خۆی دەگات، کە هەموو شتێکی تێدایە؛ فیداکاری و ئەشق لەگەڵ رق و کین، هەروەکو زانست و ئەشق بەجۆرێ یەکتریان بەرجەستە کردووە کە زانستی بەفراوان و ورەی پۆڵایین لەگەڵ هەست و نەستی مەزن زۆر بە پتەوی چونەتە ناو یەك و یەکتری تەواو دەکەن لە قووڵایی تاکە کەسدا. کەواتە چۆن دەتوانین خۆمان بخەڵەتێنین کە مێژوو لە نزیکەوە ئەم راستیانەمان پێ نیشان دەدات؟ چۆن دەتوانین دووره پەرێز بوەستین لە تایبەتمەندیەکانی بنچینەیی وڵاتپارێزی و جەنگی دیموکراتی، لەکاتێکدا کە تاکە ئەنجامێکی راست و دروست هەبێ دەتوانرێ لە راستی مێژووەوە وەربگیردرێ، بە تایبەتی لە سەردەمی ئێستاماندا کە داگیرکەری فاشی ئێمەی لە تایبەتمەندیەکانی بنچینەیی وڵاتپارێزی دوورخستۆتەوە و هەوڵی ئەوە دەدات کە بە تەواوی ئەو هەستەمان لەلابتوێنێتەوە و دایبچۆڕێنێ. لەم حاڵەتەشدا رادەی رووبەڕوو بوونەوەمان لە بەرامبەریاندا رۆڵی ئێمە دیاری دەکات. هەتاوەکو ئەوان بۆ خراپەکاریەکانیان هیچ سنورێك بۆ خۆیان دانەنێن، لەسەر ئێمەش پێویست دەکات کە بێ سنوور بین لە تێکدان و هەڵوەشاندنەوەیان لەکاتی رووبەڕووبونەوەدا و هەتاوەکو بەردەوام بن لە رووخاندنی ئیرادەی ئێمە، لەسەر ئێمەش پێویستە ئیرادەی خۆمان زیندوو بکەینەوە و بیکەینە پۆڵا.

## خیانەت و گێلی و نەفامی

خزمەتکردنی گەل کارێکی مەزنە. کەسانی نەزان و بێ بەرپرسیار لەناو گەلدا ناتوانن هیچ هەنگاوێك بهاوێژن، ئەوەی دەخوازێ بەناوی PKK بچێتە ناو گەل، پێویستە لە گەریلا شۆڕشگێڕتر بێت، لە شەرڤانێکی ناو شەڕ شەرڤانتر بێ. پێویستە ئەمە بزانێ و ئەنجامی بدات.

ئێوە بۆچی نازانن PKK چییە؟ هەر یەکێکتان بەجۆرێك هەڵسەکەوت دەکات، ئەمەش نابێ! هەر ئەڵێی خۆتان بۆ تێکدان ئامادە کردووە!... سۆسیالیست کێیە..؟ فیداکاریەکی مەزنی پێویستە. سەیر بکەن لەسۆڤیەتدا چی روویدا؟ سۆسیالیزمی حەفتا ساڵەیان رووخاند. ئایا ئێوەش دەتانەوێ ئەمە بکەن؟ بێگومان بەمرەنگە نابێ، چونکە ئێوە بۆ ئەمە نایەنە ئێرە. ئامانجتان لێرە درووستکردن و ئاواکردنە.

نە خۆتان ئازار بدەن و نە ئێمەش هەراسان بکەن. مەسەلەی گەل، مەسەلەیەکی ئاسان نییە. پارتی و گەلیش بێ خاوەن نیین. پارتی هێزی پێشەنگی گەلە، بێگومان پارتیش گەل و ژیانی گەل دەپارێزێ. با هیچ کەسێ حسابی هەڵە نەکات، ئێمە دەرفەت بەهیچ کەسێ نادەین گەمە بە گەل بکات. ئەقڵی هەندێکتان بەمجۆرەیە، هەندێکی دیکەش بەرەنگێکی دی. هەروەها بەگوێرەی خۆتان هۆکار دەخوڵقێنن، هۆکاری خوڵقاندنی ئەم هۆیانەش دوژمنە، دوژمن زاڵە بەسەریدا. بەمشێوەیە نابێ! پێویستە ئێوە بزانن لەبەرامبەر دوژمنەکانتاندا زانایانە شەڕ بکەن، پێش هەموو شتێك پێویستە مرۆڤ خۆی لە پلە و ئاستی گوناهباری دەربخات، بکەوێتە رێگای گەل و دادپەروەری گەل.

خۆی پرسیار لەخۆی بکات کە ئاخۆ ئاخافتن و ئەرکەکانی بەپێی ئەمە پەیڕەو دەکات، یان نا؟.

بۆئەوەی رووناکی زیاتر بخەینە سەر ئەم بابەتانە یان بزانین خیانەت، گێلی و نەفامی چین؟ خائین و گێل کێیە؟ ئێمە دەمانەوێ وەڵامی ئەم پرسیارانە بە بنەمای کۆمەڵایەتیانەوە روون بکەینەوە.

خیانەت ئەوەیە کە یەکێك لەدژی کۆمەڵی خۆی و راستی نەتەوایەتی خۆی کار بکات و دەبێتە یارمەتیدەری داگیرکەران بۆ سەرکوتکردن و لەناوبردن و داگیرکردن. هەروەها لەگەڵ ئەو هێزە داگیرکەرەی کە پێی دەڵێن دوژمن بەجۆرێك دەبێتە یەك، کە لەراستی خۆی دابڕێ و، لەدژی رادەوەستێ و شەڕی لەگەڵ دەکات، خائینیش کەسێکە نوێنەری ئەم رەفتارانەیە.

گێلی ئەوەیە لەشوێنی ئەوەی لەدژی ئەم کەسایەتیە چەپەڵە شەڕ بکات، دەبێتە ئامرازی دەستی خیانەتکاری و هەر خیانەتێك کە دەکرێ پێی هەراسان نابێت و بێدەنگ دەبێت. هەرشتێك رووبدات وەك بایەك بەلای گوێچکەیدا بڕوات وایە و هیچ پرسیارێك لەخۆی ناکات. لەسەر گازی پشت لێی دەکەوێ و دەڵێ:''ژیانی من باشە و بە ئازادی دەژیم'' و، بەمجۆرە خۆی هەڵدەخەڵەتێنێ و رۆژی خۆی بەسەر دەبات. ئیتر گەل یان کۆمەڵگا یاخود وڵات چ پێشکەوتنێکی بەسەردا دێت، ناخوازێ بیبینێ. هەموو شتێك بەیەك چاو سەیر دەکات. بەمجۆرە رووبدات یان بەرەنگێکیتر لای گرنگ نییە ''کێ بێت دەڵێ ئاغام، کێ بڕوات دەڵێ پاشام'' گرنگ ئەوەیە رۆژی خۆی بەسەر بەرێت، ئەوەی ئەم هەڵسوکەوتانەی هەبێ کەسایەتییەکی گێلە.

کاتێك بەگوێرەی ئەم پێناسەیە تەماشای راستینەی کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتیمان لەوڵاتەکەماندا دەکەین، دەبینین زۆربەی زۆری لە گێلی و نەفامی و خیانەت و خیانەتکاریدا دەژین. لەسەر ئەم بنچینەیە لەوڵاتدا گێلی بەجۆرێك زاڵە کە لەمێژووەوە پەرە دەسێنێ. ئەگەر زۆر دڵتەزێن و دژواریش بێ ئەوا، ئەو راستیە دەخەینە بەرچاو کە ئێوە نەوەی گێلی و خیانەتکارین. لەناوجەرگەی ئەوانەوە سەرتان هەڵداوە. ئەگەر هەندێکیش بەمجۆرە نەبن، ئەو راستیە هەمووتان دەگرێتەوە.

بۆچی کەسایەتیتان بێ گیانە؟ بۆچی نابنە شەرڤان؟ بۆچی خۆتان لەو هەڵە و کەموکورتیانە رزگار ناکەن؟ بۆچی زەبری کوشندە لەو خیانەتکاریە نادەن کە لای ئێوە ژیان دەباتە سەر؟ بۆچی ئەرکی بەشەرەف و ئابڕوومەندانەی خۆتان جێبەجێ ناکەن؟ بۆچی ئێوە بێ هێز و بێچارەن؟ بۆچی لەم بارودۆخە شەرم ناکەن؟ چ کێشەیەکتان هەیە؟ بۆچی بەمرەنگە ژیانی شەرمەزاری پەسند دەکەن؟ ئەم توانایە لەکوێ دەهێنن؟ من لە حەوت ساڵیەوە تائێستام هێناوە. بەڵام ئێوە هیچ سەرکەوتن و پێشکەوتنێکتان بەدی نەهێناوە، کەچی پێدەکەنن و قسە دەکەن و وەك بڵێی زۆر بەشەرەفانە دەژین. بێگومان ئەمە هەڵەیە و ئەگەر ئەمە لەخیانەتەوە سەرچاوە نەگرێ، ئەوا مانای گێلییە. ئێوە لەدژی دوژمن چەند شەڕتان کردووە؟ تا چ رادەیەك دوژمنی خۆتان ناسیوە..؟ تا چ رادەیەك مێژووی خۆتان ناسیوە..؟ دەزانن هێزی خۆتان لەکوێوە وەردەگرن؟ دەتوانن وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە؟ نا، وەڵامتان نییە..!

ئەوەندە خائین لە وڵاتی خۆیان بەئارەزووی خۆیان دەگەڕێن و ئەوەندە گێلی و نەفامی زاڵە، لەم بارودۆخەدا ئێوە چی دەکەن؟ بێگومان کاتێك خیانەت و گێلی و نەفامی زاڵ و باو بێ، مرۆڤ بار بخاتە سەر شانی ئێوە مانایەکی نییە، چونکە ئێوە نەوەی ئەم بارودۆخەن و لەو رەوشەدا گەورەبوون و لەژێریدا کارتێکراون. بۆچی رێگا بۆ شەڕێکی گەرم ناکەنەوە؟ بۆچی من وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەمەوە، ئەو شتانە دەڵێم: شەرڤانی مەزن، هیوای مەزن، بیری تیژ، زۆربەی شت دەبەخشرێ یان نابەخشرێت، ئەمانە وابەستەن بە تێڕوانین و شیکردنەوەی ئەوانەوە. تەنها بەمەشەوە ناوەستێ، ئەوانەی بۆ گەیشتن بەم رێکخستنە و پێکهێنانی ئەرکەکانی کار دەکەن، شەرڤانی گەورەن. ئێوە نزیکی ئەمە نابنەوە. کاتێك سەیری بارودۆخی وڵاتەکەمان دەکەم، هەزار جار پەست و بێزار دەبم. من بۆئەوەی ئەم پەستی و بێزارییە نەهێڵم، ئەو رێگایەم گرتەبەر. بەڵام مەخابن ئێوە لەناو ئەو رەوشەدان کە مرۆڤ هەراسان دەکات، کەچی هەندێك دڵیان پێی خۆشە. تەنانەت دوای ئەوەی هەستی پێ دەکەن و هۆشیار دەبنەوە، کەچی دیسان گیانی گۆڕانکاریتان لاوازە.

لەژێر پەردەی شۆڕشگێڕی و وڵاتپارێزیدا، بەناوی ئازادیخوازییەوە، با بزانین گێل و خیانەتکاری مەزن کێن؟ پێویستە هەندێك بە بەرفراوانی باسی ئەم مەسەلەیە بکەین، بۆئەوەی زیاتر ئازادی کەسایەتی PKK و گرێدانی بە خیانەتەوە ئاشکرا بێت.

دەسەڵاتدارانی سەردەستی تورك ئەوەندەی هێرشیان كردۆتە سەر گەلی ئێمە، بەهەمان ئەندازەش پەلاماری گەلانی دیكەشیان داوە. با ئێستا واز لەگەلانی دیكە بهێنین و بێینە سەر باسی رەوشی خۆمان. كاتێك تورك هاتن، كەس پێی نەگوتبوون وەرن و كەسیش ئەو مافەی نەدابوونێ، بەڵام بەناوی موسڵمانێتی دەهاتن، هەرچەندە لەو كاتەدا گەلی ئێمە موسڵمان ببوون و پێویستیان بەوە نەبوو كەس موسڵمانێتی باشیان فێر بكات. ئەم شتانە بۆیە باس دەكەین بۆئەوەی هەندێ راستی رۆژانی ئەمڕۆمان بێنینە بەرچاو. هەندێ كەس بەناوی "پارتی خودا" دەركەوتوون و كەسانی بەئابڕوو دەكوژن، ئەم "پارتی خودا"یە كە پێی دەڵێن "حزب اللة"، پارتی خیانەتكاری و شاراوەیە. پارتی داگیركەری سەدەكانی ناوین و وابەستەی خیانەتكاریە. با زیاتر تیشك بخەینە سەر ئەم مەسەلەیە، چینە سەردەستەكانی تورك بەئاشكرا دەڵێن: "ئێمە بۆ سیستەمی دنیا هەین"، پێویست بێ بۆ سەركوتكردن دەیكات. ئەمە ئەركی ئەوانە و خۆیانی تیا دەبیننەوە و دەڵێن "ئەمە ئەركی موسڵمانێتیمانە و فەرمانی خودایە". مەبەست لەوە نییە جگە لە تورك كەسی دیكە خائین نییە، بەڵكو هەر سیستەمێكی داگیركەر خیانەتكاری خۆی دەئافرێنێ. لەدێر زەمانەوە تا ئێستا بەمجۆرەیە، واتە سیستەمی كۆلۆنیالیستی لەگەڵ هاتنی خۆیدا خیانەتیش دەخولقێنێت. ئەوەی میزۆپۆتامیای داگیركرد لەگەڵ هاتنی خۆیدا چینێكی نزیك و وابەستەی بەخۆی دروستكرد. ئەو خێڵانەی كە لەسەر چیاكانیش یاخیببوون بە رێگای دەرەبەگە سەردەستەكانەوە پەیوەندیان لەگەڵ داگیركەر بەستبوو. لە میزۆپۆتامیادا هەر لەسەردەمی سۆمەریەكانەوە تا سەردەمی فارس، رۆم و ئەسكەندەر تاوەكو دەگاتە هاتنی عەرەبە موسڵمانەكان، داگیركەری بەردەوام هاتووە و لەڕاستی نەتەوایەتی و كۆمەڵایەتیدا داگیركەری وابەستەیی رەگی داكوتاوە و بۆتە رەنگێكی ژیان.

كاتێك، كە باسی خیانەتكاری دەكەین، شوێنێكی تایبەتی بۆ چینە سەردەستەكانی تورك دادەنێین، چونكە ئەمڕۆ خیانەتكاری وابەستەیە بەم سیستەمەوە، كە لەسەر پێی خۆی راوەستاوە. نۆسەد ساڵە داگیركەری توركی دەستی بە بونیادنانی خیانەتكاری كردووە و بەرەنگێكی ترسناك پەرەی پێداوە.

دەرەبەگە کوردەکان هەر لە سەردەمی سەلجوقی و عەسمانیەکانەوە پەیوەندی خیانەتکاری و وابەستەیان بەگەرمی پێشخستووە، بۆ ئەم مەبەستەش موسڵمانێتیان کردۆتە پەردە و تا ڕۆژی ئەمرۆش بەگوێرەی بەرژەوەندی داگیرکەران بەردەوامن لە گۆڕینی ڕووکاری ئیسلامێتیدا.

دوورکەوتنەوە لە کوردایەتی و ناسنامەی کوردی بەشتێکی شارستانی لەقەڵەم دەدا، سەردەمێکیش گەلی تورك بەمجۆرە بوو. چینە سەردەستەکانی تورك لە سوڵتان و بەگ و سەرۆك خێلەکان خۆیان بەتورك نەدەژمارد و خەڵکی ڕەش و ڕووتیان بە تورکی نەزان و جاهیل دەژمارد، بێگومان ئەم نزیکبوونە بۆ گەلی کورد زۆر خراپ بوو، زمان و کولتووری کوردی بەتەواوەتی لەڕاستی نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی دوورخرایەوە. چەندە نەریت و کەلەپووری جیاوازیان لەخۆ بئاڵاندایە، کەسایەتی خۆیان بگۆڕیایە و تا چ ڕادەیەك لە سیمای کوردایەتی دوور بکەوتنایەوە، ئەوەندە خۆیان بە شارشتانی و پێشکەوتوو حساب دەکرد و بە گەورەیی و شەرافەتمەندیان لەقەڵەم دەدا. بەواتایەك فەلسەفەی خیانەتکاری بەمجۆرەیە:"لەشوێنی ئەوەی شەرم بکات، لەڕاستی خۆی دوور دەکەوێتەوە و شانازی پێوە دەکات". بێگومان ئەمە پەیوەندیەکی زیندووی لەگەڵ هێز و دەسەڵات هەیە.

لەبەرئەوەی دەوڵەتەکان بەزۆری ئیسلامی تورك بوون، یان ئیسلامی عەرەب بوون و، بۆئەوەی بگەنە دەسەڵاتی دەوڵەت و پلە و پایە هەتا ئێستاش بەمجۆرەیە! دەڵێن: چەند لەکوردایەتی دوور بکەومەوە، ئەوەندە لای دەوڵەت جێی من دەبێـەوە. لەم باسەدا یەکسەر "حیکمەت چەتین، کامەران ئینان" دێنەوە بیری مرۆڤ، ئەمانە لە پادشا زیاتر پادشا پەرستترن، لەتورك زیاتر تورك پەرستن. هەر لەچاخە کۆنەکانەوە تا چاخەکانی ناوەڕاست ئەمانە بەمجۆرەن. سەرۆك خێل و دەرەبەگەکان بەناوی ئیسلامەوە لاسایی تورك و عەرەب و فارسیان دەکردەوە، هەر لەناو و نازناوەوە بگرە تا ناوەرۆك چەند خۆیان بگۆڕیایە ئەوەندە گەورە دەبوون.

وەکو باسمان کرد بناخەی ئەمە هەر لەسەدەکانی یەکەمەوە داڕێژراوە. ئێستا بۆچی ئەوەندە خائین زۆرن؟ بۆچی خیانەتکاری ئەوندە بەربلاوە؟ مرۆڤ بە چاوخشاندنێکی بە مێژوودا دەتوانێ زوو تێبگات. خیانەت لێرەدا بۆتە ڕێبازێکی ژیان، تۆ چەندە لە خیانەتکاریدا پێشبکەوی، ئەوەندە دەوڵەمەند دەبی و لەلای دەوڵەتی

داگیرکەر ئەوەندە جێی خۆت دەگریت. هەرکەسێکیش فێری ئەوە ببێ، دەکەوێتە پێشبڕکێ لەم رێیەدا، ئەوکات ئاشکرا دەبێت کە ئەم جولانەوەیە چەندە پێشدەکەوێت، بەواتا خیانەت لەلای کوردان رێبازی دەوڵەمەندبوون و دەسەڵاتبوونە. چەندە لەناسنامەی نەتەوەیی و راستی کۆمەڵایەتی دابڕێت ئەوەندە دەوڵەمەند دەبێت و، لەبەر دەرگای دەوڵەتانی داگیرکەر و تالانکەرە ئیمپریالیستەکاندا (وەك ئەمریکا) رێز و حورمەتێکی تایبەتیان هەیە. ئەوانەی پارە وەردەگرن و بەهێز دەکرێن بەبێ بەرامبەر نابێت، ئەم کارانە چییە دەیکەن...؟ بەتەواوی لە دژی کۆمەڵ و گەلی خۆیان و تەواوی تایبەتمەندییە نەتەوایەتیەکانی خۆیان رادەوەستن و بێ رێزی دەکەن و نکۆڵی لێدەکەن و دەڵێن شتی وا لە ئارادا نییە و ئەو شتانە هی کەس و چینی نابوودن، لەگەڵ ئەمانەش بە بەردەوامی خۆیان دەرازێننەوە، واتە ئەو کارانەی کە دەیکەن وەهای نیشان دەدەن کە کارێکی زۆرباشە، خۆیان بە خاوەن ئابروو و شەرەف نیشان دەدەن. ئەم پڕوپاگەندانە بەشێکن لە ئەرکە سەرەکیەکانی و ژمارەیەکی زۆر لە خائنیش تایبەت بۆ ئەم کارە تەرخان کراون. واتە کاتێك لە دەوڵەتی داگیرکەر و ئیمپریالیزم دەرفەت و دەسەڵاتیان دەداتێ و پیان دەڵێن: دەبێ ئێوە ئەم کارە لەدژی گەلی خۆتان ئەنجام بدەن، شتێکتان نییە بیپارێزن، جگە لەوەی کە ئێمە دەتاندەینێ، هیچتان نییە تاوەکو ونی بکەن، یان بیهێڵنەوە. واتە کاتێك داگیرکەر توانا و پارەیان دەداتێ بۆئەوەی لەدژی گەلەکەیان بەکاریبهێنن. بەگوتنێکی  دیکە واتە سیخوڕن. رەفتاری سیخوڕی لە دژی گەل و خێڵ و ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان ئەنجام دەدەن، کاری سیخوریش هەر بەمجۆرەیە. سەدان ساڵە بەمرەنگە بەردەوامن، بۆ زیادکردنی سیخوڕی پارە وەردەگرن. دەسەڵاتیان پێ دەدرێ بۆئەوەی خەڵکانێکی دیکە بهێننە سەر رێی خیانەت. ئێمە نامانەوێت زۆر باسی روودا و دیاردەی مێژوویی بکەین، ئەوانەی مێژوویان خوێندۆتەوە ئەمانە دەزانن، نموونەی ئەمانە وەك ئیدریسی بتلیسی لە مێژوودا زۆرن، کە بە چ شێوەیەك وڵات و میرنشینە کوردەکانی پێشکەشی عوسمانیەکان کردووە، لە سەردەمی مستەفا کەمالیشدا کەسانی بەمجۆرە هەن، لە بەرامبەری هیچدا ئەو سەرۆك عەشیرەتانە هەموو شتێکیان بە تالان داوە. لەم بوارەدا دەتوانین سەدان نموونە بخەینە بەرچاو.

با بێینە سەر باسی ئەمڕۆ، کە زیاتر ئێمە پەیوەندیدار دەکات، تا دوێنێ کەسانی وەك "کامەران ئینان" خەریکی ڕێکخستنی سیخوڕی کوردان بوون لەناو پارتی عەدالەت و پارتی دیموکراتدا، لەڕۆژانی ئەمڕۆدا لەناو پارتی " ANAP " واتە پارتی نشتمانی دایکدا پەرەی پێدەدەن، کاتێك دەکەوێتە ریزی ئۆپۆزسیۆن، ئەمجارەیان لە شوێنی ئەو حیکمەت چەتین دێت، باوکی حیکمەت چەتین لەکاتی سەرکوتکردنی راپەڕینەکاندا دەیگوت:"فلان بەرگریی کردووە، هەڵیواسن"، بەگوێرەی خۆی لیستەی لەسێدارەدانی دەنووسی. بەڵێ کوڕەکەی نەیتوانی سیاسەتی تەجریدی فراوان لە دژی PKK پەیڕەو بکات، بەڵام خزمەتی زۆر باشی بۆ تورکەکانی ئاسیای ناوین پێشکەش کرد، باب و باپیریشی خائینن، ئەو بۆخۆشی خائینێکی گەورەیە. ئەم خائینە خەڵکی "لیجەیە" و خۆی بە کوردیش دەژمێرێ، خائینێکی بەمشێوەیە. لە وەڵامی پرسیارێکی تاڵەبانیدا کە لێی دەپرسێت بە ئینگلیزی وەڵام دەداتەوە و دەڵێت "من کوردم!".

کاری حیکمەت چەتین زۆر سەرسووڕهێنەرە، پێش ئەو کامەران ئینان باش کاری دەکرد، ئەمانە زیاتر لەبەرامبەر رای گشتی ئەوروپا بەکاریان دەهێنن و لەنێوان خۆیاندا لەسەر ئەم کارە پێشبڕکێ دەکەن. ئەو کامەرانەی کە بەحساب کوردە لای ئەمریکیەکان و ئەوروپییەکان دەڵێت: من کوردم، ئێمە دەمانەوێ بەمجۆرە لەگەڵ تورکدا بژین. بەمجۆرە دڵنیایان دەکات. حیکمەت چەتینیش بە شێوازی "من کوردم، دەمانەوێ لەگەڵ تورکدا بەیەکەوە بژین، کوردەکان مافی رەسەنی هاوڵاتیان هەیە و هیچ شتێکیان ناوێت"، ئەم دوو کوردەی کە ناوم بردن لەبەرامبەر ئەو دەوڵاتانەی کە ئەگەر بە لۆژیکی سەرمایەداریش بێت دەیانەوێت باسی مافی کورد بکەن، دیسان دەیانەوێت بەو رادەیەش ئەم مەسەلانە پێش نەخەن، ئەمانە هەردووکیان کوردن کە وەك نمونە باسیان دەکەین. لەم بابەتە بەهەزاران هەن، یەکێکی دیکەی دیاربەکر هەیە، ئێوە دەیناسن، هێرش دەکرێتە سەر مافی مرۆڤ لە دیاربەکر، بەڵام ئەو وەزیرە هەر بەخەیاڵیشیدا نایەت، دەڵێت "مرۆڤێکی کوردی وەکو من وەزیری مافی مرۆڤە، چەند خۆشە تەماشاکەن، ژیان چەند خۆش دەرباز دەبێ!" ئەمە نوێنەری نکۆڵیکردنی گەلێکە و بێ ئابڕوویی خۆی نیشاندەدات. لەکاتێکدا کە میللەت لەناو دەبرێت. ئەگەر هەندێك قووڵ ببینەوە دەبینین ریزێك شتی گرنگ هەیە کە هەموو لەناودەبرێن لەکاتێکدا کە ئەم کوردەش وەزیری

مافی مرۆڤە! یەکیان وەزیری دەرەوەیە دەیانەوێ بەهەمموو جۆرێك دنیا هەڵبخەڵەتێنن، مستەفا کەمالیش دوو کوردی بەمجۆرەی ناردبووە لۆزان.

ئەمانــە نمونــەی خیانــەتکاری گــەورەن، لەبــەر ئــەوە باسـیان دەکـەم، چـونکە بەشێوەیەکی فەرمی ئاستی ئەم خیانەتکارییە لایان رەنگدەداتەوە. ئێمە کە باسی ئەوانە دەکەین لە ئەوان خراپتریش هەن کە خیانەتکاریان کردۆتە رەنگێکی ژیانی خۆیان. ئـەو شەڕەی کە چینە سەردەستەکانی تورك لە رۆژانی ئەمرۆماندا لـەدژی تـەواوی هـەبوونی رزگاری کۆمەلایەتی و نەتەوایەتی بەرپایان کردووە، هەروەها بـەبێ هـیچ دوو دڵیـەکیش ئەم شەڕە بەڕێوە دەبەن و رۆژانە سەرۆك وەزیران و سەرۆك کۆمار باسی دەکەن، سەدان ساڵە ئەمـە کاریانـە. ئەمـە بۆتـە ئـەرك و کولتـووری زەوتکـردن و سـتەمکاری دەسـەلاتی داگیرکـەران کـە لـە زووەوە شـەڕ و تالانیـان دەکـرد، ئەمڕۆکـەش کـاروانی شـەڕی تایبـەت بەڕێوە دەبەن.

بابزانین کاری خیانەتکارە کوردەکان لەم شەڕدا چییە؟ با فراوانتر سـەرنج بـدەین، کەسێك کە بە بەڕەگەز کورد بێت و بە ئایدیۆلۆژی دوژمن گۆشکرابێ و وابەستە بێ پێی و، خزمەتی دوژمن بکات، خیانەتـە و پێناسـەی خیانـەتیش هـەر ئەمەیـە. هـەر کەسـێك خزمەتی شەڕی تایبەت بکات، بەهەمان شـێوە دەناسـرێت. ئەگـەر دووکانـدارێك شـت بـە ئەفسەر و پۆلیسی داگیرکەر بفرۆشێت و دڵی پێی نەئێشـێت و ویـژدانی ئەمـە پەسـند بکات، مانای ئەوەیە چۆتە ریزی خیانەتەوە. لە ولاتانی دیکە ئەوەی شـتێکی بچـووك بـە سـەربازی داگیرکـەر بفرۆشـێت، ئـەوا بـە کـارێکی زۆرخـراپ دەژمێردرێـت، بـەلام چـینی بـۆرژوای بچـووك و نـاوینی ئێمـە هـەر بـیر لـەوە دەکەنـەوە کـە هێـزی داگیرکـەر لـە کوردستاندا زۆرتر ببن و شتی خۆیان ساخ بکەنـەوە. ئەمانـە بـەدڵی خۆیـان دەکـەن و لـە گـەل ئەمـە هاوکـات دەڵێن:" گـەورەم، بـەگم، پاشـام...هتـد" ئەگـەر ئـەم کەسـە رۆحـی نەکەوتبێتە نێو خیانەت، ئەمە بەچی ناودەوبرێت؟ ئەمانە پێش هەرکەسێکیتر تاواباری مەزنن.

با سەیرێکی ئەو کەسانەش بکەین کە هەوڵدەدەن بکەونـە خزمـەتی خیانـەتکاری، پارێزگـارانی گونـدانن (واتـە جاشـەکان) نـە، لـەناو پارتـە فەرمییەکانـدا شـوێنی خۆیـان دەگرن و شـەڕ بـەڕێوە دەبـەن، دەیانـەوێت بنکـەی ئـەم پارتـە فەرمیانـە لـە کوردسـتاندا

جێگیر بکەن. با سەرنجێکی ئەم پارتە کۆلۆنیالیستانە بدەین، ئەگەر بەوانە نەڵێین خائین ئەی بەچی ناوزەدیان بکەین! لەوەش زیاتر ئەو کەسانەی کە پێشبڕکێ دەکەن لەسەر خزمەتکردنی دەوڵەت، هەروەها کەسانێك هەن کە داگیرکەر پێشکەوتووخواز دەبینن و دەستیان دەکەنەوە بۆئەوەی موچەیەکی بچوکیان بدەنێ. ئەمانە لەبەرامبەر موچەیەکی کەمی دوژمن خۆیان دەفرۆشن. مامۆستا و فەرمانبەری بچووك هەن کە هیچ لەدەوڵەتی تورکیا بێزار نابن و بێشەرمانە خزمەتی دەوڵەت دەکەن، ئەگەر ئەمانە لە خزمەتی خیانەتدا ناژین، ئەی بۆچی دەژین؟ ئەمانە بۆ ئازادی دەژین یان بۆ ولاتپارێزی؟ با دێرسیم بێنینەوە یادمان، دوای جینۆسایدی دێرسم هەموو لاوان لەناو دەوڵەتدا پلە و پایەیان پێ دراو ئێستاش باشترین فەرمانبەرانی دەوڵەتن لە دێرسم.

ئایا ئێستا ئەمانە کەسانی راست و ئازاد و دیموکراتن، یان لەسەر ئاسەواری کۆکوژی و جینۆساید و بەرهەمی خیانەتکارین؟! بەڕاستی ناوزەدکردنی ئەمانە لە شوێنی خۆیدا زۆر پێویستە. گێلی و نەفامی، بەمشێوەیە خزمەتی خیانەت و داگیرکەران و زەوت کاران دەکات، ئەگەر نا مانای چییە؟ بەڵێ ئەمانە وابەستەن، خاوەنی ئەمانەش داگیرکەرانی تورکن، واتە دەوڵەت. ئەوانەی لە کوردستاندا خیانەت بەهۆیانەوە رەگ دادەکوتێ و لەسەر پێی دەهێڵن ئەمانەن. باسەیرێکی فەلسەفەی ئەمانە بکەین کە دەڵێن: "چەندە بۆ دەوڵەت سوودبەخش بیت، ئەوەندەش دەوڵەت پلە و پایەت بەرزدەکاتەوە. ناسنامەی ولاتی خۆت چەند سووك ببینی، نکوڵی لێ بکەی، مۆدێرن و ئەوەندە پێشدەکەویت". بێگومان لە بەرامبەر ئەم کارەیاندا پارە لە دەوڵەت وەردەگرن و دەوڵەت هێزیان دەداتێ و پشتیوانیان لێدەکات، ئەوانە بەرژەوەندیان هەیە لەمەدا، لەبەرئەوە هەر رۆژ کەسانی نوێ دەهێننە ئەم ریزەوە. لە رابردوودا خیانەت و کرێگرتەیی لە بۆتاندا زۆر لاواز بوو، هەر لەگەڵ ئەوەی کە PKK کەوتە ئەم ناوچانە، خوێڕیترین سەرۆك خێڵ کە لەهیچ قوژبنێکەوە دیار نەبوو، لە ئەنقەرە پێشوازیان لێدەکرد و بە هەلیکۆپتەری گەشت و گوزار دەیان بردن. ئێستاش زۆربەریان لەسەر کەناری دەریای رەش و ئیجە شوێنیان پێدراوە. لەسەر ئەم بناخەیە دەیانەوێت ئەمانە لە ولات دابڕن و بیانخەنە نێو ریزی خۆیان. بۆ ئەمەش ئەم ژیانەیان پێشکەش دەکەن. ئەگەر ئەمە خیانەت نەبێ ئەی چییە؟ لە 12ی ئەیلولی ساڵی 1980وە تا ئێستا هەزاران کەسیان خستۆتە سەر ئەم رێبازە بێگومان ئەمانە هەموو بە پارە دەکڕێن. پارە

له دەستی سەردەستی تورکانە و دەسەڵاتیش هەر لە دەستی ئەواندایە، هەم پارە بەکار دەهێنن و هەم دەسەڵات، تاوەکو ئەمجۆرە کەسانە بۆلای خۆیان رابکێشن. بەڵام کاتێ لەناوەڕۆکی ژیانی خەڵك وردببینەوە، سەیرێکی ئەم خاکە بکەین؛ بەراستی خەڵك بواری هەناسەدانیشی نەماوە، وڵات لەهەموو بوارێکەوە سەرتاپا وێران کراوە. ئەمانە بەلای ئەم خائینانەوە هەر بایەکە و بەلای گوێیاندا دەڕوات.

## سیاسەتی شاراوە

لەلایەکیتر کەسانێك دەبینرێن لەژێر پەردەی وڵاتپارێزی و دیموکراسی و شۆڕشگێڕیدا خیانەتکاری دەکەن. بەتایبەتی لەسەردەمی ئێستادا کە بزووتنەوەی رزگاری نەتەوەیی و سەربەخۆیی و ئازادی گەلان و دیموکراسیەت بەرادەیەك پێشکەوتووە کە خیانەتکردنی کلاسیکی لە بەرامبەریدا هیچی پێناکرێ. هەر لەبەر ئەمەشە کە خیانەت رەنگی خۆی دەگۆڕێت و کراسی نوێ لەبەردەکات و دەمووچاوی خۆی دەڕازێنێتەوە. واتا لەژێر دەمامك و بەرگی جیاواز وەك وڵاتپارێز، ئازادیخواز و دیموکراتخواز، تەنانەت سۆسیالیستدا دەیەوێ ژیان بەسەر ببات. ئەم رەوشە بەگشتی لەدنیادا کەم دەبینرێت، بەڵام لە وڵاتی ئێمەدا دەیانەوێت زۆر بە بەرفراوانی بەکاری بهێنن.

گەلێك پارتی لەژێر پەردەی دیموکراتی و ئازادی و سۆسیالیستیدا بەساڵان لە ئەوروپا خەریکی بەجێگەیاندنی ئارەزووی چەپەڵی کەسایەتین. ئەمانە گوایە لەسەر رێبازی سۆسیالیستن، بەڵام هیچ پەیوەندیەکیان بە گەلەوە نییە. تەنانەت زللەیەکیشیان لە دوژمن نەداوە. گەیشتن بە دیموکراسی پێویستی بە شەڕێکی مەزن هەیە، زیاتر پێویستی بە شەڕێکی قوورس لە دژی بەکرێگیراوێتی هەیە. واتا بەو رادەیەی کە لە بەرامبەر ئەو ساختەکارانەی بەناوی دیموکراتخواز قسەدەکەن، شەڕ بکەین ئەوەندە دەبێتە دیموکراتی و، ئەوەندەش دەتوانین لەسەر رێگای ئازادی و دیموکراتی و سۆسیالیزم بەرێوە بچین. بەڵام مەخابن ئەم چەکە پیرۆزانەی لەلایەن ئەو کەسانەوە بەکار دەهێنرێن و رەفتاری خۆیان لە باوەشی ئەوروپادا ئەنجام دەدەن، پارە لە ئیمپریالیزم دەستێنن، هێزیشیان لێ وەردەگرن. کاتێك سەردەستەکانی تورك کەمیان دەدەنێ بەهەڵەداوان بەرەو ئیمپریالیزم دەچن، کە ئیمپریالیزم زیاتر شوێنی کەسانی

ساختەکار و خاوەن رووی شاراوە دەکەنەوە. ئەمانەش لە هەردوو لاوە پارە وەردەگرن و دەڵێن: "ئای چەند شتێکی چاکە، ئێمە لەهەر دوولا دەخۆین!" و یەکەمین کار کە دەیخەنە پێشیان "PKK"یە. دەڵێن PKK زۆردارە، خوێنرێژە، دیموکرات نییە، ستالینیستیە، دیکتاتۆرە هەتا دەتوانن PKK تاوانبار دەکەن، چونکە پارەی تیایە. کاتێك سەردەستی تورکەکان لە ئەنقەرە جێگایان پێدەدەن، دەڵێن: "لە دنیادا ئیش هەیە لەمە باشتر بێ...؟".

سەرەتا کەمیان وەردەگرت، ئێستا زۆر وەردەگرن. جا ئەگەر کار وا بێ بۆ خیانەت بەرفراوان ناکەن و پێشی ناخەن؟! چۆن خیانەتیان ناگەیەننە ئاستی ئیمپریالیزمیش،؟. ئاشکرایە کەچی پێویست بێ دەیکەن و ئەم کارەش بەناوی دیپلۆماسی دەکەن و پێی دەڵێن پەیوەندی دیپلۆماسی. ئەمە راستەوخۆ خیانەتە و خیانەتکاری ئاشکرایە، مەگەر دەوڵەتانی ئیمپرایالیزم و داگیرکەر وڵاتی تۆ پەسند دەکەن؟ مەگەر گەلی تۆ پەسند دەکەن؟ نا! مەگەر سیاسەتی فڕکردن و پاکتاوکاری بەڕێوە نابرێ؟ بەڵێ بەڕێوە دەبرێ. مادام وایە ئێمە بە ئێوە نالێین " گێل " یش، بەڵکو دەڵێین: هەی خائینینە کاتێك دوژمن ئەوەندە هێرشی ناسنامەی گەل و جەماوەری گەل دەکات، تۆ چۆن دەتوانی بڵێی من کاری دیپلۆماسی دەکەم. مەگەر کاری دیپلۆماسی لە کوردستاندا بەمجۆرەیە؟ نەخێر، ئەمە راستەوخۆ بۆ بەرژەوەندی تاکە کەسی دەرگایەکی خیانەت دەکاتەوە و خۆی دەخاتە خزمەتی ئەوان. ئێستا ئەم کارە بەناوی دیموکراسی بەڕێوە دەبەن، چونکە ئەمەیان پارەی زۆری تییایە و دەڵێن: "دیموکراسی بۆ ئێراق، دیموکراسی بۆ تورکیا و ....هتد"، بۆ PKK ش دەڵێن: با واز لە چەك و تێکۆشان بێنێ و دەست لەڕۆژگاری نەتەوەیی هەڵگرێ و بچێ بۆ ئەنقەرە و پالی لێ بداتەوە"، ئاخۆ بەمەوە دیموکراسی پێشدەکەوێت؟! کە سەرەنج دەدەیت ئەوان پێنج سەد هەزار دۆلاریان وەرگرتووە، هەندێك شەکر و برنجیان وەرگرت، بێگومان کەسێکی خیانەتکار هەر تەنیا ئەم شتانەی دەست دەکەوێت. شەڕی تایبەت کە دەوڵەتی تورکیا بەڕێوەی دەبات، هەلودەرفەتی ئەوە نادات کە گەلەکەمان هەناسە بدات، مەگەر خائین چ باکی ئەمەی هەیە؟ کاتێ گیرفانی پڕکرد و ورگی داگرت، ئیتر بەسێتی. ئەمانە جۆرە خائینێکن کراسیان لەبەر کردووە، بەڵام مەخابن، لەبەر ئەوەی رووی ئەمانە نەناسراوە، ئەم پەردەیەش هەڵنەدراوەتەوە. لەبواری دارایی و ئابووریدا بەهێزن. دیسان دەوڵەتانی ئمپریالیست لە پشتیانەوە بەهێز

و ڕێکخستەیان دەکەن. واتە خیانەتکاری بەشێوەیەکی ڕێکخراو بەڕێوە دەبرێت، بۆئەوەی گەل بکشێننە نێو خیانەت، زەحمەتی نابینن. چیرۆکی باشوور باش دەزانن، ئەم چیرۆکە چیرۆکی خیانەتکاری و کەوتنە نێو زەلکاوی خیانەتە.

بەڕاستی کاتێك مرۆڤ ڕەوشی ئەمانە شیدەکاتەوە، هەناسەی سار هەڵدەکێشێ، چونکە ئەوەی دەیکەن زۆر گومان لێکراو و خیانەتێکی بەرفراوانە. لە هەموو لایەن و بوارێکدا ئاشکراکردنی خیانەت ئەرکی ئێمەی شۆڕشگێڕییە، کە هەر ڕەنگێکی خیانەت بەگەشەسەندنی مێژووییەوە و بەرپرسیاری بەڕێوەبردنی فەرمی و نافەرمی سیخوڕی گەورە و خائینی زۆر ترسناك و بچووك، ئەمانە هەریەکەیان لەشوێنی خۆیدا بناسێنین. ئێستا تیۆری ئەوە زۆر پێویستە، لەبەرامبەر تیۆری خیانەتکارانیش پێویستە لە تیۆری شۆڕشگێڕی بکۆڵرێتەوە. چ لە بواری چەمك، تێگەیشتن و ژیان دەبێ بزانین ژیانی خائین چۆنە و پێویستە ئێمە چۆن بژین؟! بەمجۆرە ئێمە پرسێکمان هێنایە مەیدان. شتێك کە من زۆر گرنگی پێدەدەم "ئێمە چۆن ئەو ژیانە بناسین، ئێوە چۆن کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ژیانی خائین؟ خائین کێییە؟ دەبێ ئێوە وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە".

بەڵێ، ئێمەش ساڵانە هەر لە ریشەی مێژوویی و کۆمەڵاتیەوە خیانەت چۆن پێشکەوتووە، خائین کێیە؟ چۆن ژیان دەباتە سەر و تاوانباری دەکات و پێشی دەخات؟ دەکۆڵینەوە و ڕوونی دەکەینەوە. ئێمە لە مانیفێستۆی خۆماندا وتمان "تاکتیکی بنچینەیی PKK لەبەرامبەر ئەو کەس و دەزگایانەی کە بوونەتە سیخور زەبروزەنگ بەبنەما دەگرێت"، ئەمە بۆچوونێکی ڕاستە کە 15 ساڵ پێش ئێستا وەك تاکتیك نیشانمان داوە.

## بێدەنگی بەرامبەر خیانەت مانای گێلی یە!

ئێستا بەکورتی لەسەر گێلی رادەوەستین، گێلێتی چییە؟ گێل کێیە؟ چ لەسەر ئاستی هەموو لایەنەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی گەلان و چ لەسەر بارودۆخی ئەمڕۆی ئێمە بێت هەر لە بوونیەی وڵاتێکەوە تا دەگاتە مرۆڤێك، لە سەپاندنی دوژمنەوە بیگرە،

تا سەپاندنی شۆڕشگێڕان یان لە بەرامبەر تەواوی ژیانی گەلێك كە  دەڵێن "وا هاتووە و هەروا دەروا، دوژمن چی دەكات با بیكات، گرفتاری نییە شۆڕشگێڕانیش هەندێك شت دەكەن، با بیكەن، بەمجۆرە لە شۆڕشگێڕی دەنۆڕن و دەڵێن: "من وام كرد، ناموسم رزگار كرد، مەگەر سەركەوتن لەسەر من راوەستاوە...؟!" ئەمانە هەمموو رەوشتی گێلی نیشان دەدەن و لەناو گێلێتیدا دەژین. هەچەندە كە هیچ پەیوەندیان بە دوژمنەوە نییە، بەڵام لەبەرامبەر ئەو شتانەی روو دەدەن بێدەنگ دەمێنن و هەراسان و یاخیبوونیان نییە، هەق و ناهەق جیا ناكەنەوە، خائین و وڵاتپارێز لەیەك جیا ناكەنەوە، هەر شتێك بە رووكەشی هەڵدەسەنگێنێ، هەژاری و بەلەنگازی هەر نەخۆشییەك بڵێیت تیایدا بەدی دەكرێت. ئەمانە رەوشتی گێلێتیە، ئاگای لەڕاستی نییە، لە پێشكەوتنی ژیان، لەدۆزەخی بێ ئاگایە. ئەمە رەوشتێكی گێلی دەنوێنێ. بەهادارترین ئابڕوو دەپلیشێنرێتەوە كە پێویستە شتێك بكات، بەڵام ئەو هیچ سەر بەرز ناكاتەوە و تەنازول ناكات سەیری بكات، دەڵێ "ئەمانە بۆ من پێویست نیین"، ئەمە باشترین نمونەی گێلێتی ئاشكرایە. مەگەر گێلی ژیانێكی ئاساییە، ژیانێكی وەهایە كە مرۆڤ بەئاسانی پەسندی بكات؟ نا، من باوەڕ ناكەم، چونكە نەماددی و نە مەعنەوی، مرۆڤ لە تەمبەڵی رزگار ناكات. هەتا بەردەوام بێت زیاتر مرۆڤ لەناو دەبات، مرۆڤ دەباتە رادەی نكۆڵیكردن و نۆكەری، وەهای لێدەكات كە مرۆڤ هەر بەها و نرخێك بە پێنج فلس بفرۆشێتە خائینان و داگیركەران.

ئەمانە ئاگایان لە مێژوو و نەتەوە نییە، لە راستی نەتەوەیی و دنیا بێ ئاگان، ئەمانە كێن...؟ بۆچی دەژین؟ من نەفرەتم لە ژیانی رۆژانەی ئەوان كرد، هەرچەند جارێك سەرنجی ئەوانەمدا، هیچ هیوایەك لەوانەدا بەدی ناكرێت، ئەمانە رۆژ دەرباز دەكەن یان خۆیان دەرباز دەكەن؟ من لەو بڕوایەدا نەبووم كە رزگاری بەو جۆرە بێت، ئەوانە پیلانێكی جددیان بۆ ژیان نییە، رۆژێك كار دەكەن و دە رۆژ دەخەون و بۆ كەسانی تر كۆیلەن، بە چوار دەست خۆیان بەم ژیانەوە گرتووە، كە ئەویش گێلێتیە. من بێزاری خۆم لەم ژیانە نیشانداوە و پەسندم نەكردووە و لە كۆتاییدا شێوەی ژیانێكی نوێم خوڵقاند.

ئێوە نە رێگای خیانەتتان گرتە بەر و نە رێگای گێلی، بە پێچەوانەوە رێڕەوی ناسنامەی كۆمەڵایەتی و راستی نەتەوایەتی ویستان دەرفەتی رزگاریان بۆ بكەنەوە. ئێوە ئەم هەڵویستەتان گرتووە و پەسندی دەكەن. لە هەمووشی راستر ئەمەیە. بەمجۆرە

هاتنە سەر ڕێبازی گشتی. بەڵام بۆچی ئێوە بەئاستی خائینێك یان وەك گێلێك یان تاڵانکەرێك کاریگەر نین؟ ئێوە چۆن دەتوانن وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە؟ پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە، دەبێ ئەوە دیاری بکەین کە تاڵانکار تاڵان دەکات و بخوازێ هەرچی بکات دەیکات و بەڕێوەی دەبات. بیری لێ دەکاتەوە و جێبەجێی دەکات. خائینیش خائینە، بیر لە خیانەت دەکاتەوە و تێیدا دەژی و جێبەجێی دەکات. گێلیش گێلە و گێلی بە چارەنووسی خۆی دەبینێ و باوەڕی پێی هەیە و لەسەر ئەم بنەمایە ژیانی بەڕێوە دەچێت. باشە! ئێمە تا ئێستا لەسەر ئەمانە گفتوگۆمان کرد و تێیدا قووڵ بووینەوە، خۆمان ڕێکخست و دەستمان کرد بە چالاکی لەدژی، بەڵام بۆچی ئێوە وەك تاڵانکەر، خائین و گێلێك بەکاریگەر نین؟ ئێوە بۆچی لە بەرامبەر ئەوانەدا بەکاریگەرتر ڕاناوەستن؟ من ئەمە لە ئێوە دەپرسم.

مێژووی پارتی، مێژوویی بەرخودانی مەزن و مێژوویی شەرڤانی ئازادی مەزنە، لە بەرامبەر ئەمەدا ئەو ڕەخنانەی کە دێتە سەرتان، لەگەڵ ئەو ڕەوشەی کە باسمان کرد، جیاوازی چییە لەگەڵ کەسێکی گێل؟.

ئەو شەرڤانەی ئێوە بەڕێوەی دەبەن، بەتایبەتی لە بواری فەرماندەییدا، ئەگەر ئەو ڕەوشە تێپەڕ نەکەن، ئەوا بزانن نزیکی گێلی و خیانەتن. هەروەها من نابمە ئامرازی ئەوە. من بەگەشبینی نابینم. ئێوە دەتوانن خۆتان هەڵبخەڵەتێنن، بەڵام ناتوانن من هەڵبخەڵەتێنن، ئەوەی کە ئێوە بەناوی شەرڤانی و فەرماندەیی پیادەی دەکەن، سەرنجی من ڕاناکێشێ. من خاوەن ئەزموونێکم، کە لەبەرامبەر خیانەتدا هەڵوێستێکم هەیە. من ئەوەی ئێوەم باش نایەتە بەرچاو. بەڕای من ئێوە شەڕێکی باش ناکەن، ژیانی ئێوە سەرنجی من ڕاناکێشی، مەگەر ئێوە دەتانەوێ بەزۆر خۆتان بە من بدەن پەسند کردن؟ من مرۆڤێکی بەئاگام، من هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ خۆم لەهەر شێوە خراپی و شتێك کە ڕێگا ناداتە ژیانی من، پاراستووە، نەفرەتم لێ کردووە و دوورم خستۆتەوە. واتا من وشیار و زانا و خاوەن ئەزموونم. ئێوە فیداکارن و ئازان، بەڵام شێوازی خەباتتان زۆر ئەنجام بەدەست ناهێنێ، من هەموو ڕۆژێ ئەمانە دووبارە دەکەمەوە، هەرگیز لەبەر ئەوە نییە کە من لەئێوە تەنگ بووم، بەڵکو شێوەی شەڕکردنی ئێوە لەلای من لەبواری سەرکەوتندا، لەسەندن و هەنگاونان و هەژاندندا،

مەبەست هەنگاو بۆ بەدەست هێنانی سەرکەوتن، من بەکەمی دەبینم، ئێوە باوەڕیتان بە سەرۆکایەتیش هێناوە.

لێرەدا من دەڵێم ئێوە کەوتوونەتە بواری گێلییەوە. گێلی لەناو پارتیدا، گێلی لە ڕێبازی فەرماندەیی پارتیدا، لەسەر ڕێبازی شەڕی پارتی گێلن. لەسەر بناخەی ئەزموونی خۆم وەك بەرپرسیاری بزاڤێك کە دوژمن ناوێرێ سەیری بکات. من دەڵێم کە ڕەوشی ئێوە بەس نییە بۆئەوەی سەرکەوتن بەدەست بهێنن. هەروەك چۆن سەرکەوتنیش گەشە پێناکات، بەهۆی گێلیشەوە دەبنە هۆی لەناو چوونی گەلێك بەها. لەبەر ئەوە بۆ ئەو کەسانەی کە لەناو پارتی و ریزەکانی فەرماندەکاندا دەبنە هۆی ئەم بنکەوتنانە، بەرپرسیاری ئەم کارانەیان ناخەمە ئەستۆی خۆم. ڕەخنەکانی ڕۆژانەم لەسەر ئەم بناخەیە پێش دەکەوێ، قسەکانی من بۆ ئێوە لە داهاتوودا ئەمەیە، جگە لە شێوەی ژیانی شۆڕشگێڕی کە دەبێ پێشبخرێت و هیچ شێوە ژیانێکی دیکە پەسند ناکرێت. ئەمەش مانای هەڵوێستە لە بەرامبەر ئەو خیانەت و گێلییەی کە لەناو پاتیدا پەرەدەسێنێت. زیاتر بۆ ئەو کەسانەی کە تەسفیەکاری دەکەن و بۆ خۆیان ئاگایان لێ نییە و خۆیان ناپارێزن و بە تێڕوانینێك باوەڕدەکەن و شەڕ دەکەن. بەبێ هیچ هۆیەك توانا و بەهای زۆر لەدەست دەدەن و هیچ پێویست نابینن کە حساب بدەن، ئەگەر ئەمە گێلێتی نەبێ ئەی چییە؟!

مەگەر ژیانی گێلێتی و نەفامی لە ناوچەواندا نوسراوە؟ ناتوانرێ بیر لە شێوە ژیانێك بکرێتەوە لەدژی ئەمە؟! مەگەر هیچ شێوەی کار و شێوەیەکی دیکەی شەڕ مەیسەر نابێ؟! سەیرێکی مێژوو بکەین، تەماشای ژیانی سەرۆکی هەموو گەلان بکەین، سەرنج بدەنە ئاوات و پیلان و پێشبینی ئەوانە و جارێکیش سەرنج بدەنە دوژمنی خۆتان، ڕۆژانە بەڕێوەبردنی کارەکانیان چی دەگەیەنن، هەروەها لە کەسایەتی خائین بنۆڕن، تەنانەت سەیری گێلی بکەن، بە فێلبازی لادێی و بۆرژوای بچووك خۆیان ڕزگار دەکەن. مەگەر شۆڕشگێڕی ساویلکەیی یە...؟! من ئەم مەترسییە لە ژیانی ئێوەدا دەبینم، ئەمە لای من ئاساییە. کاتێك سەرنج دەدەم نازانم گومان لەخۆم بکەم، یان لە ئێوە، من دەڵێم هەم و نەمردووم، هەندێ شتم کردووە، بەڵام ئێوە چین؟ ئێوە ئەندامی ئاسایی کۆمەڵن، یان شەرڤانێکی ئاسایین، یاخود فەرماندە و سەرکردەن؟ ڕەوشی ئێوە وەها لە مرۆڤ دەکات کە بیر بکاتەوە. وا دەردەکەوێ ئێوە تێکەڵی خیانەت و گێلێتی

بوون، ئێـوە خۆتـان پاکژ نەکردۆتـەوە. بەتایبـەتی لـە ریـزی پـارتی و شـۆڕش و سـوپادا، ئەرکەکان چۆن ئەنجام دەدرێن؟ چۆن لەسەر کار حیکمـەت دەکرێـت، ئێـوە نـازانن، دەبـێ خۆناسین و بڕیاردان و گەیشتن بە بەڕێوەبردنی راست لای ئێوە هەبێت. بەڵام ئایا ئێـوە بەمجۆرەن؟ ئەگەر ئێـوە بـەمجۆرەنین، چ خێرتـان هەیـە؟ خیانـەت کـە ئەونـدە فـراوان و تەشـەنەی کـردووە، گێلـی لـە ئاسـتێکدایە کـە نـاتوانرێ بەرگـەی بگیردرێـت، بـەڵام ئـەی شۆڕشگێڕی و فەرماندەیی ئێوە چۆنە؟ ئەویش لە بارێکدایە کە تەحەمول ناکرێت.

ئێوە دەڵێن: ئێمە هـاتووین بـۆ شـەڕ و سـازدانی سـوپا، پێویسـتە مـرۆڤ گاڵتـە بـەم قسانە نـەکات و راسـتی سـەرۆکایەتی پێچەوانە نەکاتـەوە. بـاوکی مـن گەورەیـە، منـیش گـەورەم، عەشـیرەتی مـن گەورەیـە، منـیش بـەو رادەیـە گـەورەم، مەگـەر ئـەم قسـانە هەڵخەڵەتاندنێکی مەزن نین؟ کە ناوێك لەخۆتان دەنێن مانای ئەوە نییـە کـە ئێـوە ئـەو شتەن. لە بەراورد لەگەڵ قارەمانانی مێژوویی، ئێوە لاوازن، ئێوە ناوی قارەمانانی مێژوو شایستەی خۆتان دەبینن، بەڵام کاتێك مەرجی ئەمـە پێـك نـەهێنن، ئـەوا مانـای گێلـی و نەفامی دەبەخشێت.

ئێمە جووڵانەوەیەکین کە هەتا دوایی رێگـرین لەکەسـانی خیانـەتکار، لەبەرامبـەر هەر جۆرە داگیرکەرییەك بەهەموو توانایەك رادەوەستین. لەهەمانکاتدا بزاڤەکەمان ئـەو بزاڤەیە کـە لـەپێناو مـافی مرۆڤایـەتی و کۆمەڵایەتیـدا تێدەکۆشـێت و ناسـنامەی ئەمانـە زینـدوو دەکاتـەوە و بـەرەو ئـازادی دەبـات. هـەروەك چـۆن شـەڕ دەکـەین لـەدژی هـەر کۆسپێك کە دێتە رێگای، بەو رەنگەش لەپێناو راسـتییەکاندا تێدەکۆشـین. لەهەمانکاتـدا بزاڤێکین، کە ئـەم رێبـازە بـەڕێوە دەبـەین و دەناسـێنین و پتـەوی دەکـەین و لەپێناویـدا شـەڕ دەکـەین. ئەگەر ئێـوە تـا ئێسـتا تێنەگەیشـتوون، ئـەوا جـارێکی دیکـە بۆتـان روون دەکەمـەوە. ئـەو تایبەتمەندیانـەی کـە دەبنـە کۆسـپ و پێویسـتە نـەفرەتیان لێبکـەن و جارێکیتر دەبێ بگەڕێنەوە سەر گەوهەری خۆتان و رێزی لێی بگرن.

# رۆڵی رۆشنبیران لە شۆڕشی نەتەوەییدا

من بە بەرپرسیارێتیەکی مەزن و بەناوی خۆم شۆڕشێکی مەزنم هەڵگیرساند. تەواوی گەل بەرەو مردن دەچوو و گەلێك دوژمنی هەبوو، دۆستەکانیشی رۆژ بە رۆژ بەرەو نەمان دەچوون. لەو باوەڕەدام کە لەئەمڕۆ بەدواوە نەك تەنیا لەبەرامبەر هونەرمەند و رۆشنبیران، بەڵکو لەبەرامبەر نوێنەری هونەری هەموو گەلی کورد دەبێ حساب بدەین، ئێمە چیمان کردووە و چۆن؟ ئەمڕۆش ئەوانەی خۆیان بە رۆشنبیر و هونەرمەندی گەل دادەنێن، چی لە مێشك و دڵیاندا هەیە با لێمان بپرسن. ئێمەش هەندێك پرسیار دەکەین پێش هەمووشتێك من یەکێکم لەوانەی خۆیان بە رۆشنبیر و هونەرمەند دادەنێن. نەك تەنها شۆڕشگێڕ، بەڵکو نوسەر و رەوانبێژێکیشم، لەڕاستیدا تاوەکو ئێستا من هیچ کارێکی چەکداریم نەکردووە، زۆربەی کارەکانی من ئاخافتن و نوسین بووە، چونکە من ئەڵێم رۆشنبیرێکم، لەم کارەشدا لە هەونەرمەندییەوە نزیکم.

خاڵێکی دیکە هەیە، ئەویش ئەوەیە کە نوسەر و هونەرمەند دووری یەکتر نین، بەڵکو یەکن، پێویستە مرۆڤ جیاوازی نەخاتە نێوانیان.

لێرەدا خاڵی سەرەکی کە پێویستە لەسەری رابوەستین ئەوەیە رۆشنبیری چییە؟ بە هەندێك نمونە دەتوانم ئەوە باش روون بکەمەوە، لەشۆڕشی مەزنی روسیادا گۆرکی نوسەرێك بوو، ئەو کاریگەرییەی کردیە سەر پارتی بەلشەفیك و لینین ئاشکرایە، گۆرکی جار جار لەناو پارتیدا بوو، جار جاریش لەدەرەوەی پارتیدا دەمایەوە و، بەتەنیا لەبەرامبەر پارتی و لینین رادەوەستا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دڵی لەگەڵ شۆڕش بوو و، نووسەری شۆڕش بوو، بەجەسارەتێکی مەزن کاریگەری لەسەر شۆڕش کرد؛ شۆڕشگێڕ

وەهایە! لەشۆڕشی فەرەنساشدا ئەوانەی بە ووتار و نووسینی مەزن شۆڕشیان ئامادەکرد ڕۆشنبیرانی فەرەنسا بوون. ئەوان دڵ و ئیرادەی شۆڕش بوون و نوێنەرایەتی بۆچوونی شۆڕشیان دەکرد. ئەگەر بمانەوێ بە خۆمان بڵێین ڕۆشنبیر و هونەرمەند، دەبێ لەخۆمان بپرسین چیمان بۆ شۆڕش و میللەت کردووە؟ بۆئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارەش بدەینەوە دەبێ بزانین کە شۆڕش و میللەت چین؟ شۆڕش و گەل چۆن بەیەکەوە گرێدراون؟ لەمەش زیاتر شۆڕش چ مانایەك بۆ میللەتی کورد هەڵدەگرێ؟ لەوانەیە شۆڕش بۆ هەندێك گەل شتێکی زۆر پێویست نەبێ، یان تا ئاستێك پێویست بێ، لەوانەیە بەچەند ریفۆرمێکی کۆمەڵایەتی گەلێك بەرەو پێشەوە بچێت، بەڵام بۆ رەوشی گەلی کورد شۆڕشێکی چۆن پێویستە؟ تا چ رادەیەك پێویستی بە شەڕی چەکداری هەیە؟ تا چ رادەیەك کاری سیاسی و دیپلۆماسی پێویستە؟ ئەم شۆڕشە تا چ رادەیەك پێویستی بە کاری ڕۆشنبیری و هونەری هەیە؟ ئەگەر ڕۆشنبیرێك بەقووڵایی لەسەر ئەم شتانە نەبێتە خاوەن بۆچوون و ئیرادەیەکی مەزن، ئەوا ناتوانێ بڵێ من ڕۆشنبیری گەلێکم، ڕۆشنبیری شۆڕشێکم، راستی گەلی کورد ئەوەیە کە ڕۆشنبیرانی دابڕاون و بۆچوونێکی تەنگیان هەیە و ئیرادەیان لاوازە. ئەگەر بتەوێ بەناوبانگ بی و ببیتە خاوەن بۆچوونێکی فراوان و دڵ و ئیرادەیەکی پتەو، ئەوا دەبێ دەست بە شۆڕش بکەی. ئەگەر پێناسەی ڕۆشنبیر بکەی دەبێ بڵێی ڕۆشنبیر ئەو کەسەیە کە دڵ و ئیرادە و جەسارەتی لەگەڵ شۆڕش و گەلدا دایە و، لە کەسانی چەکدار و دیپلۆمات و سیاسەتمەداریش زیاتر خاوەن بۆچوونێکی قووڵ و فراوانە و بەجەسارەت و دڵێکی مەزنەوە کارەکەی بۆ میللەت ئەنجام دەدا.

هەروەها ئەگەر بێتو ڕۆشنبیر خاوەنی پەرتووك، شیعر و گۆرانی بێت، نرخی ئەمانەش هەیە، بەڵام لەڕاستیدا مرۆڤ ناتوانێ بەوانە بڵێ ڕۆشنبیر و هونەرمەندی گەل. کاتێك من ئەو شتە دەڵێم سەیری مێژووی گەلان دەکەم، سەیری گەلێك ڕۆشنبیری مەزن دەکەم، ئینجا ئەمە دەڵێم. نەك تەنها شۆڕشی کرێکاران یان بۆرژوازی، بەڵکو لە هەموو شۆڕشێکدا بەمشێوەیەیە. ئەمرۆ هەر مرۆڤێکی کورد کە بڵێ من خاوەن بۆچونێکم، دەبێ هەندێ راستی ببینێ، راستیە سەرەکیەکان چین؟ گەلەکەمان لە چ رەوشێکدایە، وڵاتەکەمان لە چ رەوشێکدایە، چ شتێك بۆ گەل پێویستە، دەبێ کەی ئەم شتانە ئەنجام

بدرێن؟ ئەو کەسەی ئەو پرسیارانە لەخۆی نەکات، تۆ چ ناوێکیان لێ دەنێی؟..... ئەگەر چەند پەرتووکێك بۆ کۆمەڵ بنووسی و لەسەر هونەریش چەند شتێك بڵێی، بەڵام بۆ چارەنووسی گەلێك نەتوانی رۆڵی سەرەکی ببینی و نەتوانی وەك تۆڵستۆی، گۆرکی، هۆگۆ و سارتەر و رۆشنبیرانی دیکە رۆڵ ببینێ، وەك ئەوان نەتوانێ کار بکەی، ئەوا ناتوانی ببی بە رۆشنبیری گەلێك، ئەگەر دەخوازی وەکو ئەوان ببیت، سەیری ئەوانە بکەین کە چیان بۆ میللەتەکەیان کردووە، ئێوەش وا بکەن.

لێرەدا ئەڵێم ئێمە خاوەنی شۆڕشێکی مەزنمان و بانگەشەیەکی مەزنم هەیە و بەدەستی ئێمە و لە ژێر بەرپرسیارێتی ئێمەدا بەهەزاران لە دوژمن کوژران. هەندێك شەهیدیشمان داوە، زەرەر و زیانێکی گەلێك مەزنیشمان بەو کەسانە گەیاندووە کە بەدوژمنیان دادەنێین و شەڕێکی مەزنمان لەدژیان دەستپێکرد. مێژووی هەرە بەرچاویش ئەو شەڕەیە کە دژی رژێمی تورکیا دەیکەن. مومکین نییە یەکێك بڵێت من دووری ئەم شەڕەم و لەژێر کاریگەری ئەم شەڕەدا نیم. لە شوانێکەوە بگرە تا دەگاتە کوردێکی مۆسکۆ، ستۆکهۆڵۆم، واشنتۆن، هەموویان لەژێر کاریگەری ئەم شەڕەدان. جا ئەمە بەباشی ببینرێ یان بەخراپ، ئەوا ئەو شتەی کە هەیە نکۆڵی ناتوانرێ نکۆڵی لێبکرێ. بۆ ئەمەش دەبێ رۆشنبیران لەسەری بنووسن. چونکە کەر و لاڵی کاری رۆشنبیران نییە. گەر سەیر بکەین دەبینین بەتەنها شوانێکیش بێ دەنگ نامینێ. تانسۆ چیللەر کە ژنێکی بۆرژوایە، وەکو بارگیرێك وایە هەر رۆژ خۆی کۆدەکاتەوە و هێرش دێنێتە سەرمان و دەڵێ:"یان لەناویان دەبەین یان لەناویان دەبەین". هەموو هونەرمەند و نووسەرەکانیان لە پشتیەوە دەبنە یەك و دژ بە کوردان شەڕ دەکەن. ئایا کەس دەتوانێ نکۆڵی لەمە بکات. جگە لەچەند کەسانێك، بەڵام هەموو نووسەر و هونەرمەندانی تورك لەگەڵ سەرۆکی سوپا و سەرۆکی سیاسیان یەکن و لە رەوشی هێرشکردندان. ئەگەر ئەوانە دوژمنی ئێوەن، بەرامبەر ئەوانە کاری ئێوە چییە؟ دیسان گریمان ئێمە باش نین ئەوانیش باش نین، بەڵام لێتان دەپرسم راستی لە کوێیە؟ ئێوە PKK لەلایەك دابنێن و ئەو کوردەی سەرهەڵدان دەکات لەلایەکی دیکە، واتە گەلی کوردی ستەم دیدە و PKK لەیەك جیابکەیتەوە، ئەوا راست نییە و درۆیەکی هەرە گەورەیە. با مرۆڤ واز لەم درۆیانە بهێنێ. لەوانەیە ئەوروپا شتێکی بەمجۆرە بخوازێ، بەڵام ئەوە دەسەلێنم کە

تـەواوی دەوڵـەتانی ئـەوروپا دوژمنمـانن، دەخـوازن گـەلی کـورد لـە شۆڕشـی خـۆی دوور بکەوێتەوە.

ئـەوروپا بەفـەرمی و بـەکردەوە بـە هـەموو توانـای مـاددی و مەعنـەوی خۆیـەوە پشـتگیری لـە دوژمـن دەکـات. کاتێـك ئەمانـە راسـتی بنـەڕەتین، ئـەوا رۆشـنبیری کـورد لەناوەوە و دەرەوەی وڵات دەتوانن لەسەر ئەم بنەمایە خۆیان پێناسە بکەن و بڵێن ئێمـە چین و کێین و لەگەڵ کێ دایین و چۆن؟. دیسان ئەڵێم من رۆشنبیرێکم حەڤدە ساڵە لـە دەرەوەی وڵاتم و نـەچوومەتە ناو گەل و چەکیشم بەدەسـتەوە نـەگرتووە. دەتـوانم بڵـێم لەناو رۆشنبیراندا کەسانێك هەن کە چەکیان هەڵگرتووە، هەرچەندە زۆر نـزیکیش نـین، بەڵام دیسان کاریگەریەکی مـەزن لەسـەر ئـەو رووداوانـەی کـە لـە کوردسـتاندا روودەدەن دەکەن. مـن نوسـەرێکم زیـاتر لـە سـەدان پـەرتووکم نوسـیوە و، گـەلێك وتـارم پێشکەش کردووە. پێش هەموو شتێك بە ملیۆنان کەس بەدڵ و مێشك پەیوەستن بەمنەوە. ئەگەر من دەستبەرداریان بم، دیسان ئەوان دەستبەرداری من نابن، ئەمەش رۆشـنبیریە. نـاتوانم زێدە خۆم بە گەورە دابنێم، باوەڕ دەکەم گەلێك کەس ئەنجام لەم راستیە هەڵدەهێنجن. دەبێ مرۆڤ بە گوێرەی ڤۆناخ رێزی گەلەکەی بگرێ، هاوکات دەبـێ ئـەوەش بزانرێـت کـە گەل و شۆڕش بەیەکەوە گرێدراون. با نموونەیەکی دیکە بهێنمەوە، گەلێك کـەس لەگـەڵ سـەرهەڵدانی بارزانیـدا و بگـرە لەگـەڵ سـەرهەڵدانی کـۆنیش دابـوون، کـە نوسـین و کتێبیشان لەسەر دەرخستن، دیسان بەدرخان سێ رۆژ لە گـەلی"ئـەرۆ" بـەرخودانی کـرد، 15 هەزار چەکداری هەبوو، بەڵام تەسلیم بوو و، لە دواییدا چووە ئەستەمبوڵ و گـەلێك وڵاتیش گەڕا، گەلێك کوڕی هەبوو کاری ئەویان بەردەوام دەکرد، بەدرخان ئەوەندەیە کە گەلێك کتێبی لەسەر دەنووسرێ و پێویستە زیاتریشی لەسەر بنووسرێ.

بەڵام لە شۆڕشی ئێمەدا ئەو شەڕەی کە لە گابار و ئـەرۆ کردوومانـە کـە زیـاتر لـە 15 ساڵە بەردەوامە، بەچەند گەنجێکی کورد دەستمان پێکرد. دەوڵـەتی فاشیسـتی تـورك بە هاوکاری هـەموو هێزەکـانی جیهـان هێرشـی کـردە سـەرمان، دیسـان بـەرخودانی ئێمـە بەردەوامە و تەسلیم بوون رووی نەدا، تەواوی چیاکان لەدەستی ئێمەدان. ئەگـەر یـەکێك ئەو راستیانە نەبینێ و باسی بەدرخان و بارزانی و کەسانی دیکە بکات، ئـەوا ئـەو کەسـە ناتوانێ لە راستی گەلی کورد تێبگات. چـونکە راسـتییەکی مـەزن هەیـە، بـەڵام نـایبینێ.

یـەكێك شـتی گـەورە نـەبینێ نـاتوانێ شـتی بچـووكیش ببـینێ. لـە مێـژووی فەرەنسـادا "جانـدارك" هەیـە و پێـی دەڵـێن قارەمـانی نەتـەوەیی، گـەلێك كـەس هـەن كـە دەڵـێن قارەمانی نەتەوەییش نییە و خۆی نەسووتاندووە، بـەڵام بەسـووتاوی دادەنـێن. فەرەنسا لە سایەی ئەو قارەمانە بـووە گـەلێك. بـەڵام لەشۆڕشـی ئێمـەدا دەتـوانم بڵـێم گـەلێك لـە هەڤاڵانمان هـەن كـە خۆیـان سـووتاندووە، وەك فـەرهاد قورتـای و هەڤاڵـەكانی، بەسـەدان كەسی دیكەش خۆیان سووتاند. بەسەدانی دیكەش بۆ ئـەوەی تەسـلیم نـەبن نارنجۆكیـان بە خۆیاندا تەقاندۆتەوە و پارچـە پارچـەبوون. ئێـوە نیـاز و داخـوازی چـەند لەمانـەتان زانی؟ ئەگەر ئێوە شتێك لەسەر ئەوانە نـەزانن و بڵێن ئێمـە رۆشـنبیر و هونەرمەنـدین، ئەوا قەلەڕەش پێتان پێدەكەنێ. ئەگەر مرۆڤ خۆی لەم رەوشە دەرنەخات شوورەییە.

ئەوانە قارەمانی مـەزن بـوون، لاوی هـەژدە ساڵی خۆیـان سـووتاند. ئێسـتا مـن بـە خۆم دەڵێم رۆشنبیرم و، گـەلێك كەوتوومەتـە ژێـر كاریگـەری ئەوانـە. ئەوانـە كـچ بـوون خۆیان سووتاند، نـاڵێم مـن سیاسـەتمەدارم بۆیـە ئەوشـتانە دەبیـنم، چونكە ئەگـەر ئـەو شتانە نەبینم ناتوانم خۆم بە مرۆڤێكی بەشەرەف دابنێم. لەم وڵاتەدا، لەناو ئەم گەلەدا، دوای ئـەوەی كـە كـچ و كـوڕی هـەژدە ساڵی خۆیـان سـووتاند، ئێمـەش بڵـێین قارەمـان و رۆشـنبیر و هونەرمەنـدی كوردین، بـە هـیچ شـێوەیەك ئـەو شـتە پەسـند نـاكرێ. هـەتا ئامـانجی ئـەو كوڕ و كچانە كـە خۆیـان لەپێناویـدا سـووتاندووە بەسـەر نەكـەوێ، ئـەوا دەستبەرداری لەم تێكۆشانە ناكەین. ئەگەر خۆتان نەگەیەننە ئەو راستیە، ئـەوا نـاتوانن بڵێن خاوەن هونەرین. لەبەر ئـەوە كاتێـك مـرۆڤ وتوێـژ لەسـەر هەنـدێك بابـەت دەكات، دەبێ مرۆڤ لەسەر راستی بێت.

ئـەوەش دیسـان بۆچـوونێكی رۆشـنبیرییە، كـە لەسـەر مـن چـەندە رەخنـە دەگـرن بگرن، بەڵام بۆ گەلەكەمان شتی مەزن دروستبوون. گەلەكەمان تەنیا یـەك رۆحـی هەیـە ئەویش تەنیا لە پێناو شۆڕشدا بەختی دەكات. لەبەر ئەوە پێویستە ئەوانە تـاجی سـەری ئێمە بـن. بۆیـە پێویسـتە ئـەو بەختكردنـە بكەینـە هونـەر. چونكە ئەوانـە رۆڵـەی ئـەم گەلەن. باشە بۆچی گەل ئەوانەی سووتاند؟ ئەو گەلەش ئێمەین بۆچی ئاوانمان سوتاند؟ ئایا ئەوەندە بێ دڵ و ئیمانین ئەوانەمان سوتاندن؟ ئەگەر ناتوانین ئەوانـە لـەیاد بكـەین و خۆمانیان لێ دوور بگرین، ئایا مەسەلەی بنچینەیی كورد و رۆشـنبیر و هونەرمەنـدی كورد ئەمەیە؟

ئەوانەی کە شەهید بوون، ئەوانەی کە خۆیان سووتاند، ئەوانەی کە لەسەری چیا شەڕ دەکەن، بۆ ناوی گەلێك بەبێ مەرج خۆیان فیدای گەل و وڵات دەکەن. من ناچارم بەوانەوە گرێدراوبم، بۆچی؟ چونکە ئەگەر بەوانەوە گرێدراو نەبین ــ کە گەورەترین قوربانی لەپێناویی گەلدا دەدەن ـ و لەهەموو روویەکەوە بە قووڵی و بەفراوانی لەسەر ئەوان رانەوەستین، ئەوا ناتوانین پیوەستبوونمان بەگەلەوە نیشان بدەین. ئەگەر ئێوەش لەگەڵ گەلی کورددا نەبن، ئایا چۆن خۆتان بە رۆشنبیری کورد دادەنێن. ئەگەر بە کوردێکی گرێدراوی دوژمن بڵێن ئەویش باشە، ئەوکاتە چۆن لەگەڵ گەلی کوردن. لێرەدا پێویستە مرۆڤ راستی خۆی باشتر بناسێ. مەسەلە من نیم، مەسەلە پارتی کرێکارانی کوردستانیش نییە، لەوانەیە ئەوانەی کە شەهید دەبن نەشزانن کە PKK چییە، بەڵام لەمێژووی هیچ گەلێکدا ئەو جەسارەت و خۆکردنە قوربانیە دروست نەبووە. ئێستا رۆمان چۆن بنوسین، کۆنسرتۆ چۆن دروست بکەین، شایی چۆن بکەین و....هتد، ئەو شتانە لەچاو ئەو فارەمانێتیەی شەهیدان ناتوانێ ببێتە هونەر و رۆمان. ئەوەش ئەوە دەسەلمێنێ کە رۆشنبیری کورد مردووە و ناتوانێ بنووسێ. ئەوە شتێکی بچووك نییە، کە ئێوە لەسەر ئەحمەدی خانی هەندێك شت ئەڵێن، هەموو کەسێك ئەحمەدی خانی و مەم و زین دەناسێ، بۆچی ئەحمەدی خانی بە مەم و زین بەناوبانگە؟ دیارە مەزنبوونی ئەحمەدی خانی لەسەر ئەشقی مەم و زینە. دەزانین مەم و زین لە جزرە بۆتان سوتاوون. ئەمرۆکەش بە هەزاران مەم و زین دەسووتێنرێن، لەوانەیە مەم و زینی ئەحمەدی خانی کوڕ و کچی ئاغا و بەگ بووبن، زێدە ئەشقێکی وڵاتپارێزی نەبووبێ. بەڵام ئەمرۆ بەهەزاران مەم و زین بەئەشقی بۆتان و ئەم وڵاتە دەسووتێنرێن. ئەحمەدی خانی نووسەرێکی دروست بوو، مەم و زینی دیت و یەکسەر دەستی بەنووسین کرد، بەڵام ئێوە هەزاران مەم و زین دەبینن و لەبەرچاوتانن، خەیاڵیش نین، بەڵکو حەقیقەتن. باشە بۆ ناتوانن شتێك بنووسن، بۆچی ئەو هێزەتان نییە، بۆچی ناتوانن وەکو ئەحمەدی خانی بنووسن؟ بوێری ئێوە کوا تاوەکو بڵێن دەتوانین. بەرهەمی ئەحمەدی خانی مەم و زینە، بەرهەمی ئێوە کوا؟ ئەحمەدی خانی بە ئەشقی مەم و زین مەزن بوو، بەڵام ئەمرۆ بەهەزاران مەم و زین لەبەرچاون کەچی ناتوانرێ دەربڕدرێ و بنووسرێتەوە. ئایا چۆن ئەوشتانە لەگەڵ رۆژی ئەمرۆمان گرێ دەدرێت؟ بەدرخان بەگ

چـۆن بەئـەمرۆوە گـرێ دەدرێ، شـێخ سـەعید چـۆن بـە ئـەمرۆوە گـرێ دەدرێ؟ هـەر رۆشنبیرێك ئەگەر ئەو شتانە نەزانێ و مێژوو و هونەری دوێـنێ و ئـەمرۆ نەکاتـە یـەك، ئەو کاتە ناتوانێ بڵێ من رۆشنبیرم و ماڤی هیچ کەسێك نییە. هەر کەسێك ئەگەر بەناوی گەلی کورد و خوێنی شەهیدان قسە بکات، دەبێ جێگای خـۆی بـەو رەنگـە بگرێـت، ئـەوە مێژووی منە.

هەنێك دەزگا هەن هونەری و کولتوورین و خۆیان بە سیاسی دادەنێن، هەنـدێکیان سیاسـین و کـاری سیاسـی بـەرێوە دەبـەن، بـەڵام دەیانـەوێ وەکـو دەزگایـەکی هونـەری و کولتووری تەماشـای خۆیـان بکـەن، ئەوانـە هەردووکیشـیان راسـت نـین. هـەر لەبـەر ئـەو هۆیانەشـە خـەبات گـەلێك دوادەکـەوێ. لەکۆنـدا ئـەو شـتە زۆر بـاو بـوو، بـە ئـەزموون دەرکەتووە کە هەتا ئێستا ئەو کارەی کردوویانـە، کـارێکی کولتـووریی و هونەریـە، بـەڵام بـەناوی پـارتی سیاسـیەوە کـراوە. وەکـو پـارتی سۆسیالیسـت، پـارتی دیمـوکرات، پـارتی شۆڕشگێڕ، بەڵام ئەگەر تەماشـای کارەکانیـان بکـەی، ئـەوا زیـاتر کـاری کولتـوورین، نـەك کارێکی سیاسی، بەڵام ئەوانە وا دەزانن کـارێکی سیاسـیان ئـەنجام داوە. هەنـدێکیش هـەن لەژێر ناوی کولتوور، کاری سیاسی دەکەن و دەڵێن ئێمە دەوڵەت هەڵدەخەڵەتێنین، ئـەوە هەڵەیە. بەتایبەتی لەم دواییەدا گەلێك زەرەر لەو بۆچوونانە بینـرا. دەبـێ مـرۆڤ کـاری سیاسی و کـاری کولتـووری لەیـەك جیـا بکاتـەوە و تێکـەڵاویان نـەکات. پێویسـتە هـەموو کارێك بەئەندازەی خۆی نـرخ و بەهای بدرێتێ. بۆ نمونـە دەتـوانم لەسـەر خۆشـم شـتێك بڵێم؛ کاتێك لەسەر کاری سیاسی و سەربازی رادەوەستام، من خۆم زۆر بە سیاسەتمەدار و فەرماندەیـەکی سـەربازی دانـانێم، بـەرەنگی نووسـەر کاریگـەرییان لەسـەر دەکـەم. بـەڵام کاتێك نزیکـی کـارێکی سیاسـی یـان سـەربازی دەبم، دەزانم ئـەو کـارە چـۆن دەکـەم، ئـەوە چـەندین سـاڵە ئامادەکاری ئـەو شـتەش دەکـەم. لەراسـتیدا هێـدی هێـدی خـۆم لـەکاری سیاسی نزیك دەکەمەوە. بەنووسین و وتاربێژی خۆم ئەو شتەم کرد و پـارتی کرێکـارانی کوردستان ناوبانگی دەرکرد.

بـەمجۆرەش کـای سـەربازی و چـەکداری ئەوەنـدە بـەهێز دەرکـەوت، بـەڵام دیسـان لەرووی سیاسی و سەرباوییەوە بەهێزم. دەتوانم بڵێم رەوشی مـن رەوشـی وەکـو رەوشـی رۆشنبیرێکی شۆڕشگێڕە. پێویستە هەموو کەسێك لەو رووەوە سەرنج بـدات، ئەگـەر هـەر کەسـێك بـەمجۆرە بـژی و کـاری خـۆی ئەنجامبـدات، ئـەوا دەتوانێـت گـەلێك شـتی مـەزن

بەدەست بێنێ. ئێمە گەلێك مەزنمان خوڵقاند. ناڵم خەباتی کولتووری و هونەری هیچ نرخێکیان نییە، لەم میانەوە باسی ئارام تیگرانیشمان کرد، کاتێك یەکەم جار گوێم لە گۆرانی ئارام تیگران بوو، ئەو کاتە ووتم پێویستە ئەم دەنگەی کورد نەمرێ و مرۆڤ بۆ ئەم دەنگە خەبات بکات، ئەمەش بەکاری سیاسییەوە گرێی بدات، واتە لەو خاڵەدا خەباتی هونەری کاریگەرییەکی مەزنی لەسەر سیاسەتی من دروستکرد، من گەلێك کەس بە مامۆستای خۆم دادەنێم، لێرەدا بەهیچ شێوەیەکیش خۆم بچووك نابینم، بەڵام خەباتی مامۆستایەتی و چلاکی هونەریش بە شتێکی گەلێك گەورە دادەنێم، واتە نرخ و بایەخێکی زۆریان هەیە، جێی ئەوانە لێرەدا گەلێك گەورەیە، لەسیاسەتی ئێمەشدا گەلێك گەورەن، پێویستە مرۆڤ هەست بەوە بکات، ئەگەر هەست بەوە نەکات و لەخەباتی خۆیدا ئەوشتە نەناسێت، ناتوانێت خۆی پێش بخات.

وەکو دەزانرێ لەناو ئێمەدا موریدێتی گەلێك بەهێزە، پێش ئەوەی ببین بە موسڵمان بووین بە مورید، ئەمەش گەلێك زەرەری پێ گەیاندین و، پێش ئەوەی ببین بە بزاڤی سیاسی، ئەمجارە بووین بە موریدی سیاسی، ئەوەشیان زەرەر و زیانێکی زۆری پێگەیاندین.

پێش هەموو شتێك ئێستا من بەناوی PKK خەبات دەکەم، لەناو PKKدا بەرادەیەکی سەرسورهێنەر کادیری لەشێوەی مورید دروست دەبن، بەڵام کادیری سیاسی دروست نابن، ئەم رەوشەش گەلێك هۆکاری هەیە، یەکێك لەو هۆیانەش بۆ لاوازی رۆشنبیر و رۆشنبیرێتی دەگەرێتەوە.

وشەی موریدایەتی لە مێژووی کورددا بەدی دەکرێت و بەمانای "مردوو" دێت، لەراستیدا ئەمە شتێکی باش نییە، چونکە مرۆڤی نەزان مردووە، تەنانەت دەتوانم وشەی "پێشمەرگە"ش بەمشێوەیە شیبکەمەوە کە بە مانای "پێش مردن" دێت، ئەمەش راستییەکە، چونکە مردن لەخۆوە دەگرێ. لەکاتێکدا کە پێویستە هەر کەسێك هەنگاو بەرەو ژیان بنێت، ئێمە مردوونین، بەڵکو لەهەموو روویەکەوە خاوەن بانگەشەی ژیانین. چونکە دوژمنان لەجیاتی ژیان مردن شایستەی ئێمە دەبینن. بۆیە موریدی لەنێو ئێمەدا بەرێوە دەبەن، دژ بەم بۆچوونەش ئەرك و کارێکی زۆرمان دەکەوێتە سەر شان و پێویستە جێبەجێی بکەین. من لەلای خۆمەوە بەباشی ئەم ئەرکەم جێبەجێ دەکەم.

من ناڵێم دڵی رۆشنبیر گەرم نییە و گەیشتوونەتە رادەی گوناهبار، من هەرگیز ئەو شتە لەسەر نووسەرانی ئێستا و رابردوو ناڵێم؛ من پێناسەی شتێك دەکەم پێویستە کەس خۆی هەڵنەخەڵەتێنێ، نووسینی ئێوە لەلامان گەلێك بەنرخە و کاریگەریشی لەسەر شۆڕش هەیە، ئەم راستیە نکۆڵی لێناکرێ، ناڵێم: دەبێت هەموو رۆشنبیرێك ببێ بە شۆڕشگێڕ و بەشۆڕشەوە گرێدراو بێت، رۆشنبیریش بەگوێرەی سەردەم رۆشنبیری سەردەمی خۆیانن، واتە هی کۆمەڵگای ئەو سەردەمەن.

ئەوە راستیەکە مرۆڤ ناتوانێ نکۆڵی لێ بکات، ئەو شتەی لێرەدا دەیڵێیم نکۆڵی کردن نییە و گوناهبار کردنی ئەوانەش نییە بەڵکو بەپێچەوانەوە ئێمە دەڵێین بە گوێرەی سەردەمە. ئەو رۆشنبیرە، ئەو هونەر و کولتوورەی کە هێناویانەتە بەرهەم پێویستە چۆن بیانگەیەنینە رۆژی ئەمرۆ. پێویستە بە باشی لەمە بگەن، ئەو کەسانەی کە خۆیان سووتاند، رۆڵەی ئێوەن، هی PKK نین، بەڵکو هی کۆمەڵگای کوردن. بۆچی ئەو مرۆڤە خۆی دەسووتێنێ، ئەمە پرسی ئەو گەلەیە با نووسەرێك بە رۆمانێك ئەم راستیە روون بکاتەوە. وابزانم ئەوەی خۆی دەسووتێنێ لاوازە، شتێکیان لەدەست نایەت و دڵیشی زۆر گەرمە. وڵاتپارێزە، ئازادی دەوێ، بەڵام ناتوانێ بیگاتێ، کەچی دڵی ئەمە دەخوازێت، لەبەرئەوەی ناتوانێت ژیانی خۆی بەردەوام بکات و خۆی دەسووتێنێ. 100٪ ئەو خۆسووتاندنە لە پێناو گەلێکە بۆ مێژووی کورد. بۆ مێژووی کەوتوو، بۆ ئەو مێژووەی کە بەدەستی دوژمن نوسراوەتەوە کە ئەو لاوازیەی لەسەر کۆمەڵگا و خێزان دروستی کردووە و، رێکخستنی بەهێزیش نین، شۆڕش بەهێز نییە، ئێمە بەهێز نین نەمانتوانی ئەوان لەخۆ سووتاندن رزگار بکەین، کچ و کوڕ سووتان، فەرهاد قورتای سووتا، هەروەها ئێمە ئەم راستیانە چۆن روون بکەینەوە ئەگەر ئێمە ئەو کۆمەڵگایە بە مێژووەوە گرێ نەدەین، ئەگەر رۆشنبیرانی ئێمە ئەمرۆ ئەمانە لەگەڵ مێژووی دوێنێ و ئەمرۆ گرێ نەدەن، ئەوا چۆن دەتوانن بڵێین ئێمە رۆشنبیرین. واتە لێرەدا کەموکوڕیەك هەیە ئێمە دەمانەوێت ئەو کەموکوڕیە لە کاری رۆشنبیراندا نەمێنێ.

دیسان لێرەدا دەمەوێ رەخنەیەکی بچووك بکەم، دوژمن هەتا ئێستا پڕوپاگەندەی مەزنی دژی شۆڕش کردووە، لەسەرەتادا دەیگوت ئەوانە چەند شوانێکن، لە دوایشدا لەگەڵ دۆستانی خۆی رێککەوتنێکی جیهانی لەدژی ئێمە ئەنجامدا و گوتی: ئەوانە تیرۆررستن و، گوتیان تیرۆرست، بەمرەنگە و بەو رەنگە خراپن. بەداخەوە ئەم

پروپاگەندانە گەلێك كاریگەریان لەسەر رۆشنبیری ئێمەش كرد بەتایبەتی كاریگەری زیاتر لەسەر ئەوانەی كە لە ئەوروپادان كردووە، دڵی ئەوان لە شۆڕش سارد بۆتەوە، دەتوانم بە راشكاوی بڵێم لێرەدا تێكەڵی دوژمن كارێكی بنەڕەتییە.

ئێستاش شتێكی دیكە دەكەن و دەڵێن بۆچی بەباشی لەسەر ئەم شۆڕشە راناوەستن. شتێك بۆ ئەوانە دەڵێم، ئەگەر یەكێك رەخنە لەخۆی بگرێ، بەو كارە مەزنبوونی خۆی دەسەلمێنێ. ئەگەر حەفتاساڵیش تێبپەڕێ بێ دیسان مامۆستای مەزن كەموكوڕیەكانی خۆی دەبینێ. ئیتر كەموكوڕی خۆت پەسند بكە و خۆی لێ رزگار بكە. ئەگەر بەم شێوەیە بڕۆی ئەوا لەوانەیە ئەو كەموكوڕیانە مەزن ببێ، ئێمە لە بنی پێمانەوە تا تەوقی سەرمان لەناو كەموكوڕیدا گەورەبووین، لەناو هەڵەی دوژمندا گەورەبووین، ئایا شیمانە دەكرێ لەتوانامانداندا بێ كە هەتا دوایی بەو شێوەیە بەردەوام بین؟ پێویستە ئەو كەموكوڕیانە دەرباز بكەین، ئێمە ناڵێین ئەوانەی ئەمە ئەنجامنەدەن گوناهبارن، مەسەلە گوناهباری و بێ گوناهی نییە، بەڵكو ئەوە مەسەلەیەكی ویژدانی و ئەخلاقیە. رۆڵەكانی ئێمە بۆ دەسووتێن، چۆن ئەو سووتانە بوەستێنین؟. ئەگەر رۆشنبیران وەڵامی ئەو پرسیارە نەدەنەوە، ئەوكاتە زۆر گوناهبارن.

من لەئێوە زیاتر لە ژوورێكدام، لەوانەیە ئێوە بچنە دەرەوە و دنیای دەرەوە ببیت، من زێدە دەرفەتی ئەوەم نییە. ئەوە خۆی لەخۆیدا شتی هەرە راستە كە ئەنجامبدرێ، بە پێچەوانەوە لە ژوورێكدا نوسەری مەزن دروست دەبن. ***مرۆڤ لە زیندانیشدا دەتوانێت ببێتە نوسەر و رۆشنبیری مەزن،*** لەوانەیە لەقسەكانم بەهەڵە تێبگەن، بەڵام دیسان دەتوانم باسی **ئەحمەدی خانی** بكەم، **مەم و زین** سەرەتای رۆمانێكە، بەڵام لەدوای ئەو بەرهەمی گەورە دروست نەبووە و بەردەوام نەبووە، بەگوێرەی سەردەمی خۆی ئەحمەدی خانی بەڕاستی دەیەوێت گەل بكات بەخاوەن دڵ و زمان، دیسان مرۆڤ دەتوانێ بڵێ مەم و زینیش لەوڵاتپارێزیدا بەگوێرەی سەردەمی ئێستا لەنوێوە دروست دەبێت، بۆ ئەمەش پێویستە مرۆڤ بەباشی لە هەندێك مەسەلە تێبگات. ئەوكاتەی ئەحمەدی خانی ئەو شاكارەی نووسی سەردەمی شۆڕشی بۆرژوازی بوو، لە ئەوروپاش هەستی نەتەوەیی هاتبووە ئاراوە، دیموكراسیەتیش هێدی هێدی دروست دەبوو، وابزانم ئەو شتانە كاریگەریان لەسەر ئەحمەدی خانی دروست كردووە، بەڵام دیسان بەگوێرەی ئەو

سەردەمە نەتەوایەتی و دیموکراسیەت گەلێك لاواز بوو. هۆی سووتاندنی مەم و زینیش ئەوە بوو! واتە کۆمەڵگای کورد تواناکاری نادات سەربەخۆیی و ئازادی. چی بکات و چۆن بیر بکاتەوە کۆتاییەکەی هەر سووتاندنە. ئەحمەدی خانیش ئەو شتەی باش نووسیوە و بەگوێرەی سەردەمی خۆی شتێکی لەجێدایە. لەڕۆژی ئەمڕۆماندا مرۆڤ ناتوانێ وەکو سێ سەد ساڵ پێش ئێستای دابنێ، دیسان سووتاندنیش بەهێزە، نەتەوەی کورد دووچاری قڕکردن دەبێت، ئەو شەڕەی لەسەری پیادە دەکرێ وەکو شەڕی دژ بە میللەتانی دیکەش نییە، بەڵکو شەڕی قڕکردنە. ئەمە خاڵێکی گرنگە، هەروەها ئەو کارەش کە میللەتی کورد دەیکات کاری دیموکراسیەت نییە، بەڵکو لەوە زیاتر کاری "مان و نەمانە" هەموو شتێك دەکات بۆئەوەی ژیانی بەردەوام بکات، بۆئەوەی وڵاتی بمێنێ و ژیانی بمێنێ، ئەوەش بە خاڵێکی دیکەوە گرێدراوە، ئەمەش سەربەخۆیی وڵات و ئازادی ژیانە. ئەوشتانە گەلێك یەکانگیرن و ناتوانین لە یەکیان جیابکەینەوە. تۆ لەهەر روویەکەوە بتەوێ رۆمان بنووسی دەبێ ئەو دوو وشەیە بەبنچینە بگری. ئەوەی دەیەوێ رۆمانی کوردی بنووسی، دەبێ ئەو قڕکردنەی لەسەر گەلی کورد پیادە کراوە بەشێوەیەکی زانستی ـــ مێـژوویی لێکبداتـەوە. هـەروەها دەبـێ ئەمـە لەلایـەنی سۆسـیۆلۆژی، سایکۆلۆژیشەوە شیبکرێتەوە. بۆ نمونە رۆمانی **شەڕ و ئاشتی**، ئەوەی ئەو رۆمانە بخوێنێ دەبینێ کە بەشێوەیەکی بەهێز لایەنی سۆسیۆلۆژی و سایکۆلۆژی و مێژووی... هتدی، لەخۆوە گرتووە. هەروەها لەسەر ئەو شەڕەی کە ناپلیۆن لە بەرامبەر روسیا کردی، هەتا بچووکترین خاڵ لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە و، گەلێك رۆمانی مەزنیان لەسەر نووسی و کاریگەریان تا رۆژی ئەمڕۆش هەر بەردەوامە. بۆچی؟ چونکە ئەو شەڕە نەتەوایەتی و دیموکراسیەت بۆ میللەتی روسیا دەنوێنێ. لەو شەڕەدا سەربەخۆیی و ئازادی گەلی روسیا یان بن دەست دەبێ یان تەسلیم دەبێ، بەجۆرێك یان ئەوەتا گەلی رۆسیا سەردەکەوێ و پێش دەکەوێ یاخود شکست دێنێ، هەر لەبەر ئەمەشە کە تۆلستۆی بەباشی لەسەری راوەستاوە، رۆمانەکەش زۆر مەزنە، لە فەرەنساش شاکاری بەم رەنگە هەیە، لەمێژووی هەموو گەلانیشدا ئەمە بەدیدەکرێت.

لێرەدا دەمەوێت بە بەرفراوانی لەسەر ئەم راستیە رابوەستم کە ئەگەر ئێمەش بمانەوێ لەسەر رۆمانی کوردی رابوەستین، ئەوا دەبێ ئێمە راستی کورد لەرۆژی ئەمڕۆماندا، لەلایەنی مێژوویی، سایکۆلۆژی و هەموو لایەنەکانی دیکەی کۆمەڵایەتیەوە

بناسین . پێش هەموو شتێکیش ئێستا شەڕێك لەئارادایە، ئەگەر یەکێك ئەو شەڕەی کە لەکوردستاندا هەیە، لەهەموو رووییەکەوە نەبینێ، دیسان بەسەدان گوند چۆڵ دەکرێت، بە هەزاران کەس بە دەستی بکەری نادیار بەشێوەیەکی دڕندانە دەکوژرێن، بە ملیۆنان کەس کۆچبەر بوونە، ئەوانەی کەماون تینوو و برسین ، رووتن و مرۆڤی ئێمە لە رەوشێکدایە کە ئەگەر سایکۆلۆژی ئەوان و رەوشی کۆمەڵگای ئەوان لە هەموو رووییەکەوە نەناسی، لەوەش زیاتر ئەگەر سووتاندنی ئەوان، کوشتنی ئەوان نەناسی، ئەوا تۆ ناتوانی رۆمان بنووسی. راستی کورد و راستی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی گەلی کورد بەم رەنگەیە. خاڵی دووهەم ئەوەیە کە ئێستا شۆڕشێك و بەرخودانێکی شکۆمەند لە ئارادایە، هەروەها گەلێك خاڵی لاوازی هەیە، پێویستە رۆماننووس لێرەشدا هەتا دوایی لەسەر خاڵی لاواز رابوەستێ.

ئێستا پارتی کرێکارانی کوردستان رابوەتە سەر پێ و لە رابردوودا هیچ ئامادەکاری و بنگەیەکی پتەوی نەبوو، چەند گەنجێکی رووت و هەژار بوون و، ئەو کارەی کردوویانە وەکو کاری هیچ شۆڕشێك نییە، هەندێك پێی دەڵێن: ***موعجیزە!*** هەندێك پێی دەڵێن: ***کاری پێغەمبەرە!*** هەندێکی تریش هەن پێی دەڵێن: ***کاری ستالینیزم!*** هەندێك پێی دەڵێن: ***کاری دیکتاتۆری!*** واتا هەرکەس ناوێکی لێدەنێ. با مرۆڤ ئەو پارتیەش بناسێ، ئەو شۆڕشگێڕانەی خۆیان سووتاند، ئەوانەی کە نازانن بەباشی شەڕ بکەن، هەتا لەسەر سەرۆکی ئەو پارتیەش رابوەستن، ئەو سەرۆکی چییە؟ پێویست ناکات ئەو شتانە بڵێم، چەند هەفتەیەك پێش ئێستا رۆژنامەنووسێکی ئینگلیز چۆتە گوندی ئێمە دەربارەی من پرسیاری لە خۆشکێکی من کردووە و وتویەتی؛ ئەو بە منداڵی چۆن بوو؟ بەڵام گەلێك نووسەری کورد هەن، هەتا ئێستا ئەو شتەیان نەکردووە، دەبینین نووسەرێکی ئینگلیزی دەچێتە گوندی ئێمە لەگەڵ خوشکی من گفتوگۆ لەسەر من دەکات، فسە و ئەو پرسیارانەی لێ دەکات، دیارە مرۆڤی ئینگلیز ئاقڵن! دەزانن ئەگەر بیانەوێ گەلی کورد بناسن، پێویستە من بناسێ و، ئەگەر بیەوێ من بناسێ، پێویستە گوند و خێزانی من بناسێ و هەندێك شتیان لێ بپرسێ. هەتا ئێستا ئەو شتانە بەیادی نووسەرانی ئێمەدا تێنەپەڕیون ، ئەوەش کەموکورییەکی مەزنە. گەلێك رۆژنامەنووسی تورك، گەلێك شتیان لە دایکی من پرسی هەتا رۆژنامەنووسی تورك چەند کتێبێکیشان

نووسی، رۆمـان بـەو ڕەنگـە دەنووسـرێ بـە ڕەنگێکـی تـر نانووسـرێ، هـەروەها گـەلێك مەسـەلەی دیکەش هەیە، ئەمانـە هـەموویان مەسـەلەی نـاوەڕۆکن، ئەگـەر زۆر بـەقووڵ و فراوانـی ئـەو شـتانە نەناسـی تـۆ نـاتوانی لـە کـوردی ئـەمڕۆ تێبگـەی، ***خـودا ئـاپۆی لـە ئاسمانـەوە نەناردوە، بەدەستی هیچ کەسێکیش دروست نەبووە، من ناڵێم ئـاپۆ کەسـێکی سەیر و سەمەرەیە و شانی وایە باڵی وایە، بەڵام شتێکە کە ڕەنگە کەموکوڕی و هەڵەی خۆی هـەبێت و لـە گـەلێك لایەنیشـەوە باشـی خـۆی هـەبێت، بـە ملیۆنـەها کـورد وەکـو پێغەمبەرێکی لەقەڵەم دەدەن!*** ئەوە ڕاستیەکە کە تۆ ناتوانی نکۆڵی لێ بکەی، باشە چۆن دروسـت بـوو، لاوازی گـەلی کـورد چـیی بـوو، بۆچـی بـەو شـێوەیە خـۆی بـەو کەسـەوە گرێداوە، ئەگـەر تـۆ ئـەو شـتانە نەناسـی چـۆن رۆمـان دەنووسـی، **ژیـانی ئێمـە بـۆ خـۆی رۆمانێکە**، بیست ساڵە ئـەو رۆمانـە دەخوێندرێتـەوە، تەماشا دەکـرێ، چـرکە بـە چـرکە کاریگەری نەك تەنیا لەسەر ژیانی گەلی کورد بەڵکو لەسەر ژیانی گەلانی عـەرەب، فـارس و تـورك و تەنانـەت هـی ئـەورووپاش دروسـت دەکـات. بـا مـرۆڤ لەسـەر هـەموو ئەمانـە ڕابوەستێ، بەڵێ بنەگەی مێژوویشی هەیـە، لـەکوێوە هاتوومەتـە گونـدی ئـەممارە، مانـای گەوندی ***ئەممارە*** چییە، چۆن بە کوردایەتیـەوە گرێـدراوە، ئەگـەر تـۆ ئـەو شـتە نەناسـی ناتوانی رۆمـانی کـوردی بنووسـی. مـن بـاش بم یـان خـراپ ئەمـەیان شـتێکی تـرە، بـەڵام ئەگـەر تـۆ نووسـەرێکی بـەتوانای ئـەوا دەبـێ بـە ئەنـدازەی رۆژنامەنووسـێکی ئینگلیـز، لەسەری ڕابوەستی.

گەلێك خـاڵی بـەم ڕەنگـە هەیـە، دەبیـنم رۆشـنبیر و نووسـەری کـورد لەسـەر ئـەم ڕاستیانە ڕاناوەستن. لەیادمە سیاسەتمەدارێکی کورد دەیگوت؛ بۆ ئاپۆ خاوەنی عەشیرەتە، کوڕی کێیە؟ پێویستە مرۆڤ هیچ باسیشی نەکات. ئەمـە بۆچوونێکی ڕاسـت نییـە و ئـەو شتەی کە دروست بووە ڕێگا بەوە نادات، پێویستە مرۆڤ واز لەمانە بهێنێ.

دیسان دەڵێم مەسەلە من نیم، منیش تەنگەتاو دەبم و ئازار دەچێژم، ژیان و شـەو و رۆژی من نەماوە، بەڵام دیسان ناچارم ئەو ژیانە بەردەوام بکەم و من بۆخۆم خـۆم بـە سەرۆك هەڵنەبژارد، هەروەها خۆشم بە سەرۆك ڕانەگەیاند، پێم دەڵێن یان سەرۆك یـان سەرۆك، پێویستە ئێمەش خۆمان بناسین، بزانین سـەرۆکایەتی چییە؟ مـن وەڵامـی ئـەو شتە دەدەمەوە یان نا؟ چۆن سەرۆکایەتی بکەم؟ پێش من پێویستە نووسـەران ئـەو شـتە بڵێن، بڵێن ئەی ئەو کەسەی ناوت بـە سـەرۆك دەرکـەوتووە؛ تـۆ بـێ ئـەزموونی لـە فلان

مەسەلە وریا بە. بەو رەنگە خۆت سیاسی بکە، خۆت وەها بپارێزە رەوشی گەلی کورد بەم رەنگەیە. گەلی کورد فلان شتی دەوێ، ئەمڕۆ وا باشە، یان باش نییە، کێ تائێستا ئەو شتانەی گووتووە، ئەگەر ئەو شتانە بڵێن مرۆڤ دەتوانێ گەلێك سوودی لێ وەربگرێ، بەڵام ئەگەر تۆ بڵێی "نەمبینی و نەمبیست و شتێکی وەها نەبووە" ئەوە بۆچوونی نکۆڵی کردنە و هیچ سوودێك نابەخشێ. لەبەر ئەوە دەڵێم ئێستا گەلێك هەل و دەرفەت بۆ رۆشنبیران هاتۆتە ئاراوە دەرفەتی هەرە گەورەش ئەوەیە کە شۆڕشی ژیان بەردەوامە، دوژمنی کورد ئاشکرایە، گەلی کوردیش لە بەرخودان دایە. رۆمان رۆمانێکی شۆڕشگێڕیە بە شێوەیەکی دیکە زەحمەتە، دەتوانیت رۆمانێك بنووسی باسی حەفتا ساڵ پێش ئێستا بکەی، بەڵام ئەوە دەبێتە رۆمانێکی مێژوویی، ئەگەر دەتەوێ رۆمانێکی کۆمەڵایەتی و هاوچەرخ بنووسی، پێش هەموو شتێك دەبێ رۆمانی شۆڕشگێڕی بنووسی. بۆ ئەو رۆمانەش بناخەیەکی زۆر قووڵ و فراوان هەیە. تەماشای ئەو گەلانە بکەن کە بە قۆناخی شۆڕشدا تێپەڕ بوون، رۆمانی ئەوان چۆن نووسراوە، با بەهەمان شێوە ئێمەش لەسەر رۆمانی خۆمان بنووسین. مەسەلەی زمان زێدە گرنگ نییە، مرۆڤ دەتوانێ بە زمانی تورکی و عەرەبیش بنووسێ، بەڵام زمانی کوردی سەرەکیە، ئەگەر یەکێك بڵێ؛ بەبێ زمانی کوردی رۆمان نانووسرێ، ئەو بۆچوونە زێدە لەجێگای خۆیدا نابینم، بۆ نمونە گەلێك رۆماننووس هەن کە لە گەلانی دیکەن، بەڵام بە زمانی روسی، ئینگلیزی و فەرەنسی گەلێك رۆمانی مەزنیان نووسیوە. ئەوانە نووسەری گەلانی خۆشیان بوون، کاریگەریان لەسەر گەلانی خۆیان بەهێز بوو. خاڵێکی دیکە هەیە، کە زمانی کوردی لە راستیدا هێشتا نەبۆتە زمانێکی نەتەوەیی. ئێمە گەلێك دەخوازین کە ئەم زمانە ببێتە زمانێکی نەتەوەیی و هەموو کوردان لێی تێبگەن، بەڵام ئەمەش پێویستی بە کات هەیە و هەروەها ئەمەش پێویستی بە شۆڕش هەیە. سەربەخۆیی سیاسی و ئازادی کۆمەڵایەتی پێویستە. واتە ئەوە مەسەلەیەکی درێژخایەنە. دیسان مرۆڤ دەتوانێ بە زاراوەی سۆرانی، کرمانجی، هەتا زاراوەی زازاکی هەندێ شت بنووسێ، ئێمە دژی ئەمە نین. بەڵام ئەگەر مرۆڤ بەزمانی بیانی رۆمانی کوردی بنووسێ شتێکی هەڵە نییە.

لە راستیدا نەمزانی بوو کوردێك هەیە، کە لە سەمفۆنیادا بە شێوەیەکی وەها مەزن رۆڵ ببنێ، زۆر بەوە دڵ خۆش بووم ئەو شتەی کە وتم راستە مەرج نییە، رۆشنبیر

و هونەرمەنـد بەتـەواوەتی لـە خزمـەتی شۆڕشـدا بـن. هـەموو کـاتێکش هونەرمەنـد و ڕۆشنبیر بێ شۆڕش نابێ و شۆڕشیش نەبێ کاری ئەوان نابێ. راستی بۆ گـەلێك گرنگـە و بە بـەردەوامی مـرۆڤ بـەهۆی ئـەوەوە ئـەو گەلـە دەناسـێ و هونـەر و ڕۆشـنبیری گـەلیش لێرەدا دەردەکەوێت.

ئایـا ئێسـتا هونەرمەنـدانی کـورد لـە گۆرانیەکانیانـدا سـەمفۆنیایەکی بـەهێزیان دروست کردووە؟ نازانم ئەو مامۆستا چەند سەمفۆنی کوردی دەربـارەی کولتـووری کـورد دانـاوە! پێویسـتە هـەموو بوارەکـانی ڕۆشـنبیری کـورد وەرگێڕێتـە سـەر زمـانی مۆسـیقای جیهانی. تا ئێستا ئـەو کـارە نـەکراوە، هێشتا لـە سـەرەتای خۆیدایـە. شـۆڕش لـە هـەموو شتێك زیاتر پێویستی بە هونەر هەیە. ***شۆڕش بەخۆی هونەرە***، بەڵام هونەری سەمفۆنیا رۆڵی لە شۆڕش کەمتر نییـە، ئەگـەر دروسـت ببوایـە، ئـەوا کـارێکی زۆر مـەزن دەبـوو بـۆ گەلی کورد. بێگومان دەبێ بە باشی لەسەر ئەوەی کە چۆن کولتووری کوردی بخەینە نێو قاڵبی سەمفۆنیایی، یاخود چۆن وەریگێڕینە سەر زمانی مۆسـیقای جیهـانی، رابوەسـتین. ئەگەر مۆسیقای گەلی کورد بە مۆسیقای گەلانی جیهانـەوە گرێبـدەین، ئـەوا هـەنگاوێکی مەزنە و پێویستیشە. ئەگەر هەندێ هونەرمەنـدی کـورد ئـەو شـتە بکـەن، ئـەوا هـەرگیز ناتوانین بەوانە بڵێین: لە شۆڕش و گەلی کورد دوورن، بەپێچەوانەوە ئـەوان گـەلی کـورد مەزن دەکەن، دەیگەیەننە ئاستی گەلانی جیهان، ئەمـەش کـارێکی زۆر پێشکەوتووە. مـن بە قووڵایی لەمە تێدەگەم و هەستی پێدەکەم. بەڵام دیسان شتێکی دیکە هەیە کە ئەگەر یەکێك بیەوێ سەمفۆنیایەکی بەهێز بنووسێ، دەبێ پەیوەست بێ بە رەوشی گەلەوە. لـە ئــەوروپادا هونــەر زۆر پەیوەندیــەکی پتــەوی بــە هەڵســوکەوتی گەلــەوە، هەیــە. هونەرمەندانی ئەوروپا لە دڵ و مێشکی گەلانی خۆیاندان. ئەوانە بۆخۆیان روح دروست دەکەن، سەمفۆنیاکانی ئەوروپا رۆحی گەلانی ئەوروپایە. تا دوارادە بەدروست بوونی ئەو گەلانەوە گرێدراوە. ئێمە چـۆن ئـەو رۆحـە دروسـت بکـەین، لـە راسـتیدا هـەروەکو چـۆن مەسەلەی کورد گرێکوێرەیە، ئەوا مۆسیقاکەشی گرێکوێرەیە. پێویستە ئەو گرێکوێرەیـە بکرێتەوە، هەروەکو چۆن شۆڕش گرێی سیاسی، کۆمەڵایەتی و..هتـد دەکاتـەوە، بەهـەمان شێوە گرێی مۆسیقاش دەکاتەوە.

تەماشاکەن هەرچەندە مۆسیقای سـەرەکی و بـەناوبانگ دروسـت بـوون هـەموویان بە مەسەلەی نەتەوەوە گرێدراون، هەتا ئەو سروودانەی کە لە فەرەنسادا دروسـت بـوون،

هەروەها گەلێك شتی دیكە هەن بەو رەنگە بەپتەوی بە شۆڕشەوە گرێدراوە. ئەمە لە هونەرمەندی ئێمە دەخوازرێت. ئێستا هەندێك سروودی كوردی دروست بوون، بەڵام ئەوانە بەس نین. گۆرانیەكانی ئێمە هەتا ئێستا كلاسیكن، نە لە رووی شێوە و نە لە رووی ناوەڕۆكەوە بەگوێرەی قۆناخ دروست نەبوون. تەنانەت بەگوێرەی زمانی مۆسیقای جیهانیش دروست نەبوون. ئەگەر هەل و دەرفەت هەبێ دەبێ مرۆڤ بەگوێرەی قۆناخ نوێ بوونەوە ئەنجام بدات. ئێستا هونەرمەند "جوان حاجۆ" دەیەوێت هەندێ شتی نوێ دروست بكات، ئەوەش شتێكی بە نرخە، مرۆڤ ناتوانێ بڵێ مادام ئەوشتە دوورە باش نییە، نەخێر جێگای ئەویش هەیە لە كلاسیكەوە. مرۆڤ دەتوانێ بەو زمانەش مۆسیقای كوردی گەلێك فراوان بكات و بەخەڵكی بناسێنێ. **بێگومان لەو باوەڕەدام مۆسیقای كوردی دەرفەتی زۆر دەداتە مرۆڤ بۆ دروست كردنی سەمفۆنیا.** دەربارەی شۆڕشیش بە بەردەوامی دەڵێم ئەو شۆڕشەی كە ئێستا لە كوردستاندا بەرێوەی دەبەین بۆخۆی هونەرە و لەهەمووهونەرێكیش زیاتر نزیكی هونەری مۆسیقایە. گەلی كورد بە مۆسیقای خۆی ماوەتەوە، لە بوارەكانی دیكەی وەك نووسین، چیرۆك، رۆمان، نیگاركێشان و...هتد، گەلێك دواكەوتووە، بەڵام گەلی كورد لە رووی هونەری مۆسیقاوە بەهێزە، مرۆڤ دەتوانی لەم گۆڕەپانەدا گەلێك پێشكەوتن بئافرێنێ. ئەگەر تواناكاری هەیە با هونەرمەندانی كورد گۆرانی كلاسیكی بڵێن، هاوكات دەتوانن بەزمانی مۆسیقای جیهانیش سەری كوردان بڵند بكەن و لە گەلێك بواردا گەلێك پارچە بەشێوازی مۆسیقای جیهانی بڵێن. مۆسیقای كورد بناخەیەكی پتەوی هەیە. پێویستە هونەرمەندان بە مۆسیقای جیهانیەوە گرێبدەن و زمانی مۆسیقای جیهانیش بە زمانی مۆسیقای كوردیەوە گرێبدەن.

## شەڕی ناوخۆیی لە كوردستاندا و رۆڵی چارەسەریانەی پرۆلیتاریا

شەڕە ناوخۆییەکانی کوردستان کە هەڵقووڵاوی هۆکاری قووڵی مێژوویی، کۆمەڵایەتی و سیاسین، ئەمڕۆ سەرلەنوێ بەردەوامە لە هەڵدانەوەی قەتماغەی برینی نوێدا.

لەهەر هەنگاونانێکی بزووتنەوەی رزگاری و سەردەمێکی نوێدا، هەمیشە شەڕی ناوخۆیی بۆتە یەکێك لە گەورەترین کۆسپ لەبەردەم تێکۆشاندا. مێژوو ئەمجارەش بە رەنگێکیتر ئەم راستیە لەباشووری کوردستان دەخاتە بەرچاو. لەم شەڕە ناوخۆییانەدا بەسەدان شۆڕشگێڕ و وڵاتپارێز گیانیان لەدەست دەدەن و زیانێکی گەورەی ماددی و مەعنەوی لێدەکەوێتەوە. سەرەنجامی وێرانکاریەکانیش رۆژ بەرۆژ زیاتر دەبێ و بەپرسیارێتیەکی گەورەتر دەخاتە ئەستۆی خەباتی ئەمڕۆی باشووری کوردستان.

ئەگەر بەشێکی تاوانی خۆشکردنی زەمینەی ئەم شەڕە ناوخۆییانە دەکەوێتە سەر لایەنی بابەتی و خۆیی کوردستان، هاوکات بەشێکی گەورەی ئەم تاوانەش دەکەوێتە ئەستۆی هێزە شۆڕشگێڕەکانی نەتەوەی سەردەست. ئەم هێزە ناوبراوانە، بە هێزێکی هاوپەیمانی ستراتیژی بزوتنەوەی رزگاری نەتەوەیی کوردستان ناژمێردرێن. بۆ پیادەکردنی بەرنامەی خۆیان ئەم کێشانە وەك ئامرازێك دەبینن، کە لەم بارەدا ئەو سەلبیاتانە زیاتر قووڵ دەکەنەوە.

پارتیمان، هەر لەسەرەتاوە چ لەباکوور یا باشووری کوردستان یاخود پارچەکانی تر، لەبەرامبەر هەڵوێستی میللگەرای سەرەتایی و ریفۆرمیستی و چەمکەکانی و بەتایبەت لەبەرامبەر ئەو پارتە کلاسیکیانە و هێزە بەناو شۆڕشگێڕەکانی نەتەوەی سەردەست، کە سوود لەم ناکۆکیانە وەردەگرن؛ بەتووندی راوەستاوە.

لەبەرامبەردا تاکە رێگای چارەسەرکردنی بە دانانی ستراتیژ و تاکتیکی راست و پیادەکردنی ئەم نزیکبوونەی بەرێگای رێکخراوی هاوچەرخی بەهێز زانیوە، کە پێوانەی گونجاوی هەبێ و لەچوارچێوەی بەرەی رزگاری نەتەوەییدا رێکخستنی هابەش ساز بکات و چالاکی هاوبەش ئەنجامبدات، لەسەر ئەم بۆچوونە سوور بووە و پاراستوویەتی.

پارتیمان، لەم بوارەدا مانایەکی قووڵی دا بەو پەیوەندیانە و تەقەلایەکی بێووچانی لەگەڵ هەموو ئەو لایەنانەدا کە بەشدارن لەم شەڕانەدا داوە و، لەم دواییانەشدا لە 2ی ئاياری 1983 دا دوو شەهیدی لەم پێناوەدا بەخشی کە یەکێکیان ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی بوو بەناوی "محەمەد قەرە سونگور" لەگەڵ

میلیتانێکی پارتی بەناوی "ئیبراهیم بلگین".

شەڕە ناوخۆیەکانی کوردستان، چ لەدژی هێزە داگیرکەرەکانی کوردستان بێ یان لەنێوان چینەکانی ناوخۆییدا بێ کە ئەمرۆ روو دەدەن، لە بەهێزبووندایە. ئەم پێکدادانە ناوخۆییانە، کە رابردوویەکی مێژوویی دوور و درێژیان هەیە، ئەمڕۆکە لەنزیکەوە وابەستەیە بەو مێژووەوە.

ئەمڕۆ ئەو هێزانەی لەیەك دەدەن، هۆیەکی مێژوویی درێژی هەیە کە وابەستەیە بە ململانێی نێوان ئەو هێزانەی کە لەسەر کوردستان داگیرکەرن و ناکۆکییان هەیە.

ئەو هێزانەی کە بە بەردەوامی وەك لایەن بەشداری لەم کێشانە دەکەن، چ پێشکەوتووخواز چ کۆنەپەرست کە شەڕێکی چینایەتی بەڕێوە دەبەن، وەکو ئاشکرایە هەروا بە ئاسانی ئەم مەسەلانە نابینرێن. ئەم پێکدادانانە هۆکاری مێژوویی، سیاسی و کۆمەڵایەتیان هەیە و پێویستە ئەوانیش ئەو راستیە پەسند بکەن. چونکە ئەو لایەنانەی کە ئەم شەڕانە دەکەن تەنگاو دەبن لەوەی کە دەرەنجام لەو شەڕانە وەربگرن. تەنانەت ئەگەر زیانی زۆر گەورەشیان لێبکەوێ، هەرناکەونە سەر رێگایەکی راست و لە کۆتاییدا لە بەردەوامکردنی ئەم شەڕە ناوخۆییانە زیاتر هیچ چارەیەکی تر بەدی ناکەن.

راستیەك کە شایەنی تێگەیشتنە، ئەو لایەنانەی بەشداری لەو شەڕە ناوخۆییانەدا دەکەن، کێشەکە لەچوارچێوەی ئیرادەی ئەوان دەرچووە. وەك لە سەرەوە روونمان کردەوە، ئەم کێشەیە وەك برینێکی کۆمەڵایەتی لێهاتووە، بەر لەهەموو شتێك لاوازی ئەو هێزانەی ناو کوردستان نیشان دەدات کە تا چ رادەیەك لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی ناوخۆیی رێکخستنیان پەرە پێداوە.

گرنگترین خاڵ لێرەدا باس بکرێت ئەوەیە کە چارەسەری ئەم کێشەیە لەسەر چی بەندە و بە چ شێوەیەك رێگاچارەی راستەقینەی دیاری دەکرێت؟ لەجیاتی ئەوەی ساکارانە نزیکی ئەم کێشەیە ببینەوە؛ پێویستە واقیعی دنیا، مێژووی رابردووی نزیکی کوردستان، شوێنی ئەو هێزانەی لەسەر کوردستان شەڕ دەکەن (داگیرکەران) لەگەڵ رەچاوکرنی پێشکەوتنە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان. کاتێك ئەمانە هەموویان شیدەکینەوە باشترین رێگا دەبینین بۆ چارەسەری کێشەکە.

سەرەتا پێویستە لەژێر تیشکی پێشکەوتنە هاوچەرخەکان سەیرێکی شوێن و

گرنگی خەباتی چینایەتی و نەتەوایەتی بکەین. مامۆستایانی سەرەتای مارکسیزم کە بریتین لە "مارکس و ئەنگلس" لە ساڵانی1850 کان لە مانفێستۆی کۆمۆنیستیدا لەپاڵ هەر پەرەسەندنێکدا شەڕی چینایەتی وەك یاسایەکی بنەڕەتی دیاری دەکەن. بەگوێرەی ئەم یاسایە پێشکەوتنی چینایەتی لە بونیەی نەتەوەیەکدا، لە دیاریکردنی چارەنووسی ئازادی ئەو نەتەوەیەدا، واتە لە پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ ئەو نەتەوەیە بە تەواوی وابەستەیە بە رەوشی چینایەتی. تەنانەت بۆ پێشخستنی شەڕی چینایەتی پرۆلیتاریای ئەوروپی لەدژی ئەو ئیمپراتۆریانەی کە زۆر نەتەوەیان ژێردەست کردووە، بە مەرجێکی بنەڕەتی دەزانێت کە ئەم نەتەوە ژێردەستانە دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان دابمەزرێنن، ئەوکات دەتوانرێت ئەو ئیمپراتۆریەتانە هەڵبوەشێنرێن. مانای ئەوەیە لەپێناو یەکلابوونەوەی شەڕی چینایەتی و پێشکەوتنی پرۆلیتاریا مەرجێکی بنەڕەتیە کە بەر لەهەر شتێك دەسەڵاتی داگیرکەری تێك بشکێنرێت و چەوسانەوەی نەتەوایەتی نەمێنێ.

بۆ ئەوەی شەڕی چینایەتی بەهێز و پێشبخرێت، یەکەمین مەرج ئەوەیە لەدژی داگیرکەری بیانی شەڕی رزگاری نەتەوەیی پێشبخرێ. خەبات لە زۆر وڵاتانی ئەوروپای رۆژئاوا ئەم راستیەی سەلماندوە. بۆ نەهێشتنی دەسەڵاتداری بیانی پێویستە هەموو هێزە نەتەوەییەکان لەدژی داگیرکەری دەرەکی بخرێنە گەڕ. هەر لەبەر ئەم هۆیە بوو کە پرۆلیتاریا و هەموو هێزە زەحمەتکێشەکان لەسایەی رێبەرایەتی بۆرژوازی پێکەوە لەژێر ئاڵای نەتەوەییدا لەدژی سیستەمی پاشایەتی جۆربەجۆر شەڕیان کرد. لەهەر وڵاتێکدا ئەگەر دەسەڵاتی بیانی زاڵ و بەهێز بێ، ئەوا خەباتی چینایەتی لە ئاستێکدا رادەوەستێت. هەموو پێشکەوتنێکی ئازادانەی کۆمەڵ رووبەڕووی کۆسپ و تەگەرەی گەورە دەبێتەوە. لەبەر ئەم هۆیە کلیلی پێشکەوتنی ئەم کۆمەڵگایانە بریتیە لە نەهێشتنی دەسەڵاتی داگیرکەر و پاککردنەوەی شوێنەواری بیانی.

راستی پێشکەوتنی شەڕی چینایەتی کە لەدژی دەسەڵاتدارانی بیانی پەرەدەسێنێ، زیاتر لەهەر حاڵەتێك لەدژی داگیرکەری ئیمپریالیستی گەشە بەخۆیەوە دەبێنێ.

زۆرترین پێشکەوتنی شەڕی چینایەتی لەو کۆمەڵگایانەی کە لەژێر دەسەڵاتی داگیرکەری بیانیدان، لەقۆناخی رزگاری نەتەوەیی دایە.

لەیاسای دەسەڵاتداری بیانیدا ئەو ململانێ چینایەتییەی کە تا رادەیەك پێش

ناکەوێت، لەسەر بنچینەی شەڕ لەدژی دەسەڵاتداری بیانی پێشکەوتنێکی بە پەلە دروست دەکات و لەم کاتەدا کێشە لەسەر گەیشتن بە دەسەڵات پەرەدەسێنێ و، هەر چینێکی کۆمەڵ دەیەوێ سەرجەم چین و توێژەکانی تری کۆمەڵ لەژێر ئاڵای رزگاری نەتەوەییدا بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی. لەمێژووی گەلاندا ململانێی توندوتیژ لەسەر مەسەلەی سەرکردایەتی کردن لەنێوان چینی جیاوازدا پەیدا بووە. چونکە نەهێشتنی دەسەڵاتی داگیرکەری بیانی لەهەمانکاتدا زەمینەی سەپاندنی چینێك بەسەر چینەکانی تردا دەردەخاتە مەیدان. نموونە: چین یەکێکە لە نموونە ئاشکراکانی ئەم راستیە. لەوێ ئاغا و بۆرژوا کۆمپرادۆرەکان کە لەشەڕێکی ناوخۆیی و بەردەوامدا بوون لەدژی کرێکاران و جووتیاران، بە هاتنی کۆلۆنیالیستی یابانی و زاڵکردنی دەسەڵاتیان ئەم واقیعە دەگۆڕێ. لە سەرەتادا زۆردەستی بیانی لەئارادا نەبوو یان زۆر لاواز بوو، دەبینین کە شەڕی ناوخۆیی (چینایەتی) لەوپەڕیدا بوو. لە ساڵانی 1924 تا 1927 شەڕی ناوخۆیی گەلێك بەربڵاوبوو. بەڵام لەگەڵ تەشەنەکردنی دەسەڵاتی یابان بەسەر زۆربەی ناوچەکانی وڵاتی چیندا؛ چین و توێژەکان شەڕی ناوخۆیی نێوانیان دەکەنە ململانێی پلە دوو، لەنێوان خۆیان سازشکاری دەکەن و مەیلی دورستکردنی بەرەیەکی هاوبەش دێتە ئاراوە. تەنانەت ئەم سازشکاری و بەرە ناوخۆییانە کەس و لایەنی وەهای گرتە خۆی کە پێشان وابەستە بوون بە هێزی ئیمپریالیستەوە. بە واتا تەنها ئەو هێزانە نەبێت کە وابەستەبوون بەداگیرکەری یابانی، هەموو چین و توێژەکانیتری ناوخۆ لەنێوان خۆیاندا یەکێتیەکیان سازکرد. ئەم هێزانە کە لەسەر بناخەی بەرەیەکی رزگاری نەتەوەیی پاڵیان بەیەکەوەدا، ئیتر لەنێوان خۆیاندا شەڕی ناوخۆییان بەلاوەنا و، ئەوەی زاڵ بوو سازشکاری بوو. نموونەیەکی تر لە تێکۆشانی رزگاری نەتەوەیی ڤێتنامدا دەبینین، بەڵام باشووری ڤێتنام و خەباتی رزگاری لەوێ کە سیمایەکی گرنگی هەیە و لە شوێنی تر جیاوازە. ئەم وڵاتە بەشێوەیەکی کلاسیك راستەوخۆ لەلایەن ئیمپریالیزمەوە داگیر نەکراوە، بەڵکو دەسەڵاتداری لەوێ هەر لەسەرەتاوە بەئیمپریالیزمەوە وابەستە بووە. واتە کۆلۆنیەکی نوێیە. لەسەر ئەم بنچینەیە خەبات لەدژی ئیمپریالیزم و لە دژی دەسەڵاتدارانی ناوخۆی ڤێتنام یەك دەگرێت و دەبێتە یەك تێکۆشان. لەبەر ئەوە شەڕی نەتەوەیی و چینایەتی تا رادەیەکی بەرز دەچنە ناو یەك و پێشدەکەون. لێرەدا هەموو

ئەو هێزانەی بەرژەوەندیان لە رزگاری نەتەوەیی دایە، یەك دەگرن. بەڵام ئەمەش مانای ئەوە نییە کە هیچ ناکۆکی لەنێوان ئەم چینانەدا نەمابێت، بەڵکو ئەم ناکۆکیانە بەردەوام دەبن. شایانی سەرنجە کە شێوەی چارەسەرکردنی ئەم ناکۆکیانە زیاتر لەسەر بنچینەی رازیکردن و روونەدانی پێکدادانی توندوتیژیە. ئەو زەبر و زەنگەی کە لەدژی هێزی ئیمپریالیزم و داگیرکەری بەکاردەهات، بۆ چارەسەرکردنی کێشە و ناکۆکیەکانی نێوان هێزە جەماوەریەکان هەرگیز بەکار نەدەهات. چارەسەری ناتەبایی نێوان چینەکانی ناوخۆ دوای پاککردنەوەی هێزە بیانیەکان لەسەر خاکی وڵات دەردەکەوێتە روو. ئەو کاتە زیاتر هەوڵدەدرا بەشێوەیەکی سیاسی بگەنە چارەسەری. ئەگەر شێوازی زەبر و زەنگیش بەکارهاتبێ لەنێوان هێزە جەماوەریەکاندا، ئەوا دوای رامالینی هێزی بیانی بووە. لە وڵات و دوای ئەوەی کە هیچ شێوازێکی سیاسی لەئارادا نەماوە، تەنها ئەو کاتە رەوشێکی بەوجۆرە دورست بووە.

کاتێك لەژێر تیشکی راستیەکانی سەردەمەوە دەڕوانینە کێشەکان، دەبینین لە کوردستاندا زۆر جیاوازە و ئەو هێزانەی کە دەبێ چارەسەری ئەم مەسەلانە بکەن گەلێك دوورن لەو راستیانە. زۆر باش دەزانرێت کە ئەو هێز و لایەنە جیاوازانەی خۆیان بە وڵاتپارێز لەقەڵەم دەدەن، دەیان ساڵ لەنێوان خۆیاندا شەڕی خوێناوی دەکەن و هەر چواردەوریش بە دوژمنی دەرەکی دەور دراوە، کەچی هەتا ئێستا لە دژی دوژمنی دەرەکی و لە خزمەت سازکردنی بەرەیەکی هاوبەش و خەباتی هاوبەش لەپێناوی پاکتاوکردنی بەکرێگیراوی ناوخۆیی، تەنانەت یەك هەنگاویان نەناوە و هیچ نەخشە و چالاکیەکی هاوبەشیان لەم بوارەدا بەدی ناکرێت. ئەم بارودۆخە هەم لەسەر ئاستی خەباتی رزگاری نەتەوەیی و هەم چینایەتی ئەو لادان و لەرێگا دەرکەوتنەی خولقاندوویەتی لەبەر چاوانە. ئەم تێکچڕژانە پێویستی بە روونکردنەوە هەیە. تەنها روونکردنەوە بەس نییە، بەڵکو دەبێ هەنگاوی چارەسەریانەی لە کردەوەدا بۆ بهاوێژرێ. لەبەر ئەوە سەرەتا دەبێ هۆکارە قووڵەکانی ئەم کێشەیە تێبگەین. بەر لەوەی دەست بدەینە کار شتێکی گرنگە کە ئاوڕێك لەڕابردووی مێژووی ئەم کێشەیە بدەینەوە.

وەکو ئاشکرایە لەسایەی سەدان ساڵ ژێردەستەیی کوردستان لەلایەن داگیرکەرانی بیانیەوە، کۆمەڵی کوردستان بارودۆخێکی ئازادی نەبینیوە بۆئەوەی تیایدا پێشبکەوێ. بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی پێویستە ناکۆکی نێوان هێزەکانی بەرهەمهێنان و

پەیوەندیـەکانی بەرهـەمهێنان بەشـێوەیەکی راسـت چارەسـەر بـبێ و، ئـەم پێشـکەوتنە پابەندە بـەم چارەسـەرییەوە، بـەڵام بـۆ گەیشـتن بـەم چارەسـەریە پێویسـتە میکـانیزمی نـاوخۆیی، شـەڕی چینایەتی نێـوان هێـزی کۆنەپەرست و هێـزی پێشکەوتوخوازی ئـەو کۆمەڵگایـە لـە کـەش و هەوایـەکی ئـازاددا گەشـە بسـتێنێت. ئەگـەر گـەلێك لـە دەرەوە دووچاری هێرش و پەلاماری توونـد ببێتەوە، ئەوا گەشەسەندنی کۆمەڵ ئاسایی نابێت و ئەو ناکۆکیە کۆمەڵایەتیانەی نـاوی پـەرە ناسـێنێ و ناکەوێتـە خزمـەت پێشکەوتنی ئـەو گەلـە، بـەڵکو ئـەو ناکۆیانـە تاڕادەیـەك سـەرکوت دەکرێـت و بەشـێوەیەکیتر دەکەوێتـە مەیدان و لە شوێنی چارەسەری مەسەلەکان ئاڵۆزیەکانی زیاتر دەبێ.

دەسەڵاتداری و داگیرکـردن و زەوتکردنـی کوردسـتان و پـەیڕەوکردنی زۆر و سـتەم بەشـێوەیەکی بـەردەوام لەلایـەن هێـزی بیانیـەوە بۆتـە هـۆی ئـەوەی کـە گـەلی کـورد لەدەسەڵاتی خۆی بێبەش بێ. لەکاتێکدا لـە بەدەسـتهێنانی ئـەم دەسـەڵاتەدا سـەرکەوتوو نەبووە، ئەوا ناچار بـووە یـان بچێتە چیا سـەختەکانی کوردسـتان یـاخود بـەرەو ناوچـە دەشـتاییەکان بـڕوات و خۆڕابگرێـت. لـەژێر سایەی ئـەم فشارەدا پێکهاتـەی کۆمەڵایـەتی بەرەنگی خێڵ و هۆز مەحکوم بووە و بواری پێشکەوتنی بەخۆیەوە نەبینیوە.

ئاشکرایە بەهۆی ئەوەی کە لە کوردستاندا خێڵایـەتی ئەوەنـدە بـەهێز و بـاوە کـە هـەتا ئێسـتاش کاریگەریـەکانی لەبـەر چـاوە و بـە رادەیـەك کـە کـاری لـە پێکهاتـەی کۆمەڵایـەتی کـردووە. هۆیەکـەی بەتـەواوی بـۆ زاڵبـوونی دەسـەڵاتی داگیرکـاری و ئـەو پاشماوانـەی کـە بوونیادیـان نـاوە و بـەجێیان هێشـتووە دەگەڕێتـەوە. هـۆز و خێڵـەکانی کوردسـتان هـەل و دەرفـەتی ئـەوەیان نـەبینیوە کـە سنووری خێڵایـەتی تێپـەڕ بکـەن و لەچوارچـێوەیەکی کۆمەڵایـەتی پێشـکەوتوودا خۆیـان رێکبخـەن. هێـزی بیـانی کـە دەیانویست لەسـەر ناوچـەکە دەسـەڵاتداربن، لەلایەکـەوە لـەنێوان خۆیانـدا لـە نـاکۆکی توندووتیژدا بوون، لەلایەکی تر سەرکوتکردنیان لەسەر کۆمەڵانی خەڵك زۆر دژوار بوو. گـەلی کوردسـتان لەبەرامبـەر ئـەم زوڵـم و کۆکوژییـەدا هـەموو کـات ناچـار بـووە خـۆی بگەیەنێتـە چیاکانی کوردسـتان و، لەبـەر ئـەوە ناچـار بـووە کـە بـوونی خـۆی بەشـێوەی خێزان، هۆزی بچووك بەردەوام بکات.

ئەم مەرجانەی بۆتە هـۆی دواکـەتنی بـاری کۆمەڵایـەتی لەهەمانکاتـدا بۆتـە هـۆی

فەتیسمانی چینەکانی کۆمەڵ لەبوارێکی تەسکدا. هێزە داگیرکەرە بیانییەکان ئەم پارچەبوون و ناکۆکیانەیان وەك ئامرازێك لەدەستی خۆیاندا بەکار دەهێنا. لەبەر ئەوە بەردەوام کۆمەڵ لەناوخۆدا لە بازنەیەکدا سوڕاوەتە. ئەم کۆمەڵە بچووکانە بەشێوەی هۆز و خێڵ کە دووری هەر پێشکەوتنێك بوون، بۆیە کە گرفتارییەکی بچووك لەنێوان خۆیاندا دەبینین، بەسەدان ساڵ لەیەك دەدەن و شەڕی ناوخۆیی بەردەوام دەکەن و هەر ئەم بارودۆخەشە ئەوانی بێ ڕۆڵ کردووە.

ئەم بوارانە لە مێژووی کوردستاندا لە سەدەکانی کۆنەوە تا ئێستا بەردەوامە، هێزی بیانی داگیرکەری جیاواز کە دەیانویست کوردستان بخەنە ژێردەستیان و، وەك ناوچەیەکی قەدەخەکراو لەنێوان خۆیان بەکاری بهێنن، بۆ سەپاندنی زۆردەستی خۆیان، هاتن شێوازی کڕینی سەرۆك خێڵ و هۆزەکانیان گرتەبەر و، ئەمانەیان لەدژی یەکتر بەشەڕداوە لە پێناو ئەوەی بگەنە ئامانجی خۆیان. ئەم بارودۆخە هەر لەسەرەتای دروستبوونی ئیمپراتۆریەتی فارسەوە تائێستا بەمجۆرە بەردەوامە، بەتایبەتی لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا لە دژایەتیکردنی نێوان عوسمانی و سەفەوییەکاندا دەستپێکردووە و گەلێك بەرفراوان بووە و لەسەر تاسەری کوردستان بەرەنگی شەڕێکی سەد ساڵی تا ئێستاش بەردەوامە.

کاتێك ئەم سەرۆك خێڵ و دەرەبەگانە دەبوونە داردەستی هێزە بیانییەکان بەجۆرێك کە لەشەڕیشدا بەکار دەهێنران، وایکردووە کە هەر پێشکەوتنێکی ئازاد لەناو کۆمەڵی کوردستاندا بێتە ئاراوە.

ئەم سەرۆك خێڵ و هۆزانە هەمیشە هێز و دەسەڵات و نفوزی خۆیان لە سوڵتانی عوسمانی یان لەشای ئێران وەرگرتووە و، ئەم نفوز و دەسەڵاتەی کە دەستیان کەوتووە هەمیشە لەدژی یەکتر بەکاریان هێناوە.

ئەم شێوە خێڵ و هۆزانەی کوردستان تا ئێستا لەناو خۆیاندا هیچ جیاوازیەکی (گۆڕان) ئەوتۆیان بەدی نەهێناوە. چونکە ئەم خێڵانە چ لەناو خۆیاندا بێ یان لەدەرەوە هەمیشە دووچاری هێرش و پەلاماردان بوون. ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە ناکۆکی لەنێوان ئەو خێڵانەدا سەرهەڵدات و تەنانەت ئەو بارودۆخە وایکردووە کە یەکێتی و پەیوەندیەکانی ناوخۆی خێڵەکان بەهێزتر بێ.

دەسەڵاتی خێڵایەتی لەسەر کۆمەڵ بەڕادەیەك زاڵە کە ئەم زەمینە کۆمەڵایەتییە

دواکەوتووەی کە لە گەلێك وڵاتانی دنیادا لەبیر کراوە، لەڕۆژانی ئەمڕۆشدا دەیانەوێ پەرەی پێبدەن.

ئەم پێکهاتە کۆمەڵایەتییە دواکەوتووە لەبەردەم پێشکەوتنی گەورەی کۆمەڵایەتیدا ئیفلیجە و، لە ئامێزی پیلان و رەتاندنەوەی دوژمندا ناتوانێت خودی خۆی رزگار بکات و، ئەستەمە نەبێتە ئامێرێك؛ سۆنگە لەوێوە رەوشی سەرۆك خێڵ و هۆزەکان بوونەتە گەمەیەکی هەرزان.

بەهۆی پەرەسەندنی دەسەڵاتی دەرەکی لەسەر کۆمەڵی کوردستان لەسەدەی نۆزدەهەمدا، سۆنگە چینە سەردەستەکانی کورد زیاتر چوونە ژێر رکێفی هێزی بیانیەوە، هەروەها بەهۆی پشێوی رەوتی کۆمەڵایەتی و دژایەتی دەسەڵاتە ناوخۆییەکان و خۆ پێڕانەگیرانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەبەرامبەر پێشکەوتنی سەرمایەداری رۆژئاوادا بووە هۆی ئەوەی کە ئەو ناوچانەی لە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتەکەدا بوون لەدەستیان بچێت.

ئەو بۆخۆی گۆڕا بۆ وڵاتێکی نیوە کۆڵۆنی، زۆری پێویستی عوسمانیەکان بە ئازووقە و سەرباز لەو هەل و مەرجەدا دەتوانرا زەبروزەنگ لەسەر کوردستان بەهێز و چڕبکاتەوە، چونکە کوردستان سەرچاوەی دابینکردنی ئەم کەرەستانە بووە بۆ ئەوان.

لەگەڵ ئەو چاو تێبڕینانەی تورکە عوسمانیەکان بۆ کوردستان و هەوڵدانی دەوڵەتانی ئەوروپا و رۆژئاوا بۆ گەیشتن بە خۆرهەڵاتی ناوین بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی، کوردستان دەبووە مەیدانێکی بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژ و دژوار.

ئەو کاتە سەرۆك خێڵ و دەرەبەگەکان ئەگەر چی وابەستەی دەرەوە بوون، بەڵام حوکمێکی ناوخۆییان هەبوو لە شێوەی ئۆتۆنۆمیدا. هۆی هێرشی تورکەکان بۆ سەریان ئەوە بوو کە ئەو دەسەڵاتەیان بنەبڕ بکات یان تەنگی پێهەڵچنرێ و بەرەو کزی بڕوا، لەبەرامبەر ئەم هەڵوێستەدا سەرۆك خێڵ و دەرەبەگە کوردەکان بۆ پاراستنی کێشی دەسەڵاتی خۆیان هەستیان بە بزواندن و وروژاندنی هەست و رقی خەڵکانی زەحمەتکێشی خۆیان و سازکردنی بەرخودان لەدژی تورکەکان، لەلایەك لەبەر لاوازی سەرکردایەتی و رێکخستنی ئەم راپەڕینانە و، لەلایەکی تر بەهۆی ئەوەی ئەوکاتە هەلومەرجی دەرەکی لە بەرژەوەندی عوسمانیەکاندا بوو، ئەم راپەرینانە بەرلەوەی

پێشکەوتنێك بەخۆیانەوە ببینن دەبوونە بەردەبازێك لەڕێی ئیمپریالیست و داگیرکەران بۆ گەیشتن بەمەرامە نامرۆییەکانیان. ناوە ناوە قەیسەری روس و جارێکی تریش ئیمپریالیستی بەریتانی ئەم راپەرینانەی لەدژی عوسمانیەکان بەکاردەهێنا لەپێناو ملکەچ پێکردنیان لەبەردەم داواکانیان. لەبەر ئەم هۆیانە ئەم راپەرینانە بەر لەوەی بگەنە قۆناخی سەربەخۆیی دادەمرکانەوە.

گەلێك جاریش سوڵتانە عوسمانیەکان لەدەمی راپەریندا گەلێك سەرۆك خێڵ و هۆزیان بۆ خۆیان کڕیوە و بە مەبەستی ئاژاوە نانەوەی ناوخۆیی و بەرپاکردنی نا تەباییەکان بەکاریانهێناون. لەئەنجامدا بۆتە هۆی کۆتایی پێهێنانی ئەم راپەرینانە. ئەم راپەرینانە کە لەسەرەتاوە بۆ بەدەستهێنانی مافەکانی خەڵك بەرپا دەبوون، زوو بەزوو گەشەیان دەکرد. دوای ماوەیەك لە رێگای ئەو خۆفرۆش و ئەڵقە لەگوێیانەی کە لەلایەن چینە سەردەستەکانەوە کڕابوون، کەوتنە خزمەت بەرژەوەندی ئەوان و بەو رەنگە لەناوخۆ و دەرەوەدا زەبریان لەم بزووتنەوانە دا و دەرەنجام گۆڕیان بە سەرچاوەیەکی کۆنەپەرستی.

سەدەی نۆزدەهەم پڕە لەم نموونانە کە ئەزموون و وانەی لێ وەربگرین، گەلێك راپەرین لە قەوارەدا گەورە بوون بەئەندازەی سەد هەزار کەسی و هێز و جبەخانەی بێ ژمار، وەك باسمان کرد تەنانەت یەکێکیان لێی رزگار نەبوون، ناتوانرێ سەرجەم تێکشکانی ئەم شەڕە ناوخۆییانە بە شتێك لێك بدرێتەوە، جگە لە پیلانگێڕی دەرەکی.

لەبەر بەربڵاوی دەستێوەردانی دەرەکی لەسەدەی نۆزدەهەمدا، کوردستان نەبووە خاوەن تێکۆشانێکی کۆمەڵایەتی و تەنانەت خەباتیان لەدژی زۆردەستی بیانی نەگەیشتە ئاستێکی نەتەوایەتی و لەچوارچێوەی ناوچەیی تەسکدا مانەوە، لە سەدەی نۆزدەهەمدا کۆمەڵی کوردەواری بەهۆی ئەو تایبەتمەندیە نۆکەریانەی سەرۆك خێڵ و دەرەبەگەکانی کوردەوە، بەتەواوی کەوتنە خزمەتی سوڵتانی عوسمانیەکان، ئەم نۆکەریە بە رادەیەك پەرەیسەند کە عوسمانیەکان لەو سەدەیەدا، لەو ساتە وەختەدا دەسەڵاتی ناخۆییشیان لەدەست دەرەبەگە کوردەکان سەند و لەشکرێکی بەکرێگیراویان لێ دروست کردن، کە ناوی"ئالآی حەمیدی" بوو، ئەمەشیان لە دژی هەموو بزووتنەوەیەکی جەماوەری و راپەرینی کۆمەڵانی خەڵکی کورد بەکاردەهێنا. ئالآی حەمیدی رێکخراوێکی چەکداری بوو کە راستەوخۆ سەر بە سوڵتانی عوسمانیە تورکەکان بوو. ئەم رێکخراوە کە لەسەر

بنــەمای خێڵایــەتی ســازکرابوو و لــە خزمــەت درێژەپێــدانی تەمــەنی دەســەڵاتی دەرەبەگایەتیدا پەرەی پێدرا. بەتایبەتی بۆ بەرپاکردن و قووڵکردنەوە و فراوانکردنی شەڕی کۆنەپەرستانەی ناوخۆیی هێنرابووە مەیدان.

ئەوەی جێی سەرەنج و تێڕامانە ئەم خێڵە کوردانە کە پێکهێنەری ئالای حەمیدی بوون بەردەوام کوشت و بڕی خوێناویان بەرپا دەکرد لەسەر ئەوەی کام خێڵە بەرپرسیاری ئەم لەشکرەیە و باڵادەستی خۆی بەسەر ئەوانی تردا بسەپێنێ. ئەمانە پەیتا پەیتا هێرشیان دەبردە سەر گەلی ئەرمەنی و گەلانی دراوسێکانی تر، ماڵ و گوندیان تالان و وێران دەکردن لەپێناو زیادکردنی دەسەڵاتی خۆیان و هەروەها جێی متمانە و رەزامەندی سوڵتانە تورکەکان بن.

بە کورتی لەو ساڵانەدا دەرفەتی راپەڕینێکی نەتەوەیی لەئارادا بوو، بەڵام لە جیاتی ئەوە دەبینین کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم بۆ کۆمەڵگای کوردەواری بوونەتە مێژوویەك کە نغرۆی خوێن و نەهامەتی شەڕی ناوخۆیی ببوون، بە تایبەتی لەسەردەمی سوڵتان عەبدولحەمید دا کە وەك سوننەتی ژیانی تایبەتی خۆی بە "لەناوبردنی گەل بەدەستی گەل" بەناو بانگە. بەهۆی ئەمەش خەڵکانی کوردی ئەوکاتەی پەرت کرد. کاتێك دەگەینە ساڵانی (1920)، خێڵە کوردەکان ئەوەندە یەکتریان ئازاردابوو کە ئاسۆی کۆمەڵی کوردەواری تاریك ببوو و، سەرۆك خێڵ و ئاغاکان بەشێوەیەك بەرژەوەندی بنەماڵەی خۆیان دەپاراست. هەرچەندە ئەوسا زەمینەی خەباتێکی نەتەوەیی لەئارادا بوو، بەڵام کەسێك بیری لێ نەدەکردەوە، هەروەها لایەنێك یا کۆمەڵێك کە ئەوە بکاتە کاری خۆی پەیدا نەبووە. بەڵام بزووتنەوەی کەمال ئەتاتورك کە ئەوکات لەئارادا بوو، لەڕادە بەدەر دژوار بوو بۆ کوردان، کەچی پشتگیری تەواوی لێدەکراو بەئارەزوو و سەربەستی خۆیان زۆر بەتامەزرۆوە خزمەتی نەتەوەی تورکیان کردووە!!

جوڵانەوەی ئەتاتورك وەك دەزانرێت لەسەر بنەمایەکی بەو جۆرە پەرەیسەندووە. کەمالیزمەکان لە سەرەتادا لەباکووری کوردستاندا بە پشتگیری پیاوانی ئایین و سەرۆك خێڵەکان شەڕی رزگاری نەتەوەیی تورکیان پێشخستووە و داب و نەریتی چینی دەسەڵاتداری تورکیان درێژەپێدا و هەر لە سەرەتای شەڕیشەوە ئەوەیان رەچاو کرد کە

چۆن درێژە بەو دەسەڵاتە بدەن.

دەرەبەگ و سەرۆك خێڵەكانی كورد لەشوێنی ئەوەی بیر لە رزگاری نەتەوەیی خۆیان بكەنەوە، هەڵسان بە دژایەتیكردنی و، لەپێناو نۆكەرایەتیكردنی كەمالیستەكان، كەوتنەتە ململانێ و پێشبڕكێ. لەو كاتەدا كە كەمال ئەتاتورك دەیویست لە رەگەوە ماڵ و خەسڵەتی نەتەوایەتی و نەتەوەیی ئەوان لەناوببات، ئەتاتورك هەر لەگەڵ بەدەستگرتنی دەسەڵاتداریێتی بۆئەوەی بنكەی تەواوی چینە سەردەستەكانی كورد هەڵبوەشێنێ و كوردستان و ئابووری كوردستان و خەڵكی كورد بكاتە ئامرازێكی خزمەتكردنی تورك، بۆئەوەی یەك زمان یەك رەگەز زاڵ بێ و باڵادەستی خۆی بنوێنێ، بێباكانە هەموو هێز و توانای خۆی بەكارهێناوە.

هۆی سەرەكی بەرێوەبردنی ئەم سیستەمەی لە كوردستان دەگەڕێتەوە بۆ سێ خاڵی سەرەكی، یەكەم دواكەوتوویی كۆمەڵ؛ دووەم ململانێ و دژایەتی بێ شوماری نێوان كوردان و هەروەها سێهەم؛ لاوازی چینە باڵادەستەكانی كورد.

زەقترین سیمای سەرەكی كەمال ئەتاتورك ئەوە بوو كە دەیویست هەموو رووخسار و بنەمای نەتەوەی كورد لەریشەوە هەڵبتەكێنێ. لە شۆڕشی "شێخ سەعیدی پیران"دا راستی مێژوویی جارێكیتر بەرەنگێكی دژوارتر خۆی دووبارە كردەوە. هێزە خێڵەكیەكانی باكووری كوردستان جیاوازی ئایدیالی و دیالەكتیكیان كردە بەهانە و بەشێوەیەكی نەهەموار بەسەر ئەم جولانەوەیەدا شكایەوە و وەك پێویست نەیان هێشت ئەم بزووتنەوانە بگەنە ئاستێكی نەتەوەیی. بزووتنەوەی نەتەوەیی تورك بۆ خۆیان ئاسۆیەكی نوێ و گەشی دروستكرد، بەڵام ئەمەش زۆر بەگران لەسەر كورد كەوتەوە، كە سەرەنجامی زۆنگاوی ناتەبایی سەدان ساڵەی نێوان خێڵەكانە، لە كاتێكی زۆر ناسكدا كە توركەكان دەیانویست سیمای نەتەوەیی كورد بسڕنەوە، جارێكیتر دوژمن توانی ئەم هێزە كوردانە لەدژی یەكتر بخەنە گەڕ، بەمجۆرە دوژمنانی كورد توانیان بە رێگای سەركوتكردن و جینۆساید و بەرپاكردنی جەنگی ناوخۆیی دەسەڵاتی درندەی خۆیان بسەپێنن. بەڵام راستی ئەوە بوو یەكەم هەنگاو لە رێگای شەڕی ناوخۆوە توانی كۆمەڵی كوردستان لەناو بەرێت و ئەوسا خۆی زاڵ بكات. بەكورتی لە كوردستان پێشكەوتنی مێژوویی هەردەم بەمجۆرە بووە. سەردەستی بیانی رۆژ بەرۆژ لەسەر كوردستان پێشدەكەوێ، پیشخستنی ئەم سەردەستیە و گرێدانی كوردستان بە داگیركەری هەڵدەستێ

بە بەکارهێنانی ناکۆکی مەزهەبی و خێڵایەتی. لەسەر ئەم بناخەیە سەرجەم کۆمەڵ بەخۆیەوە گرێدەدات و تەواوی راستی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی ئەم گەلە دەشێوێنێت. هۆی سەرەکی ئەمەیە کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا هەر هێرشێکی بیانی بە ئاسانی کەوتۆتە کوردستان و بە ساڵان تێیدا جێگیربووە.

لە زۆربەی وڵاتانی دنیادا راپەرینەکان خۆیان گەیاندۆتە ئاستی شەڕی رزگاری نەتەوەیی، هەر پێشکەوتنێکی کۆمەڵایەتی لەسەر ئەم بنچینەیە روویداوە. ئاسۆی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی بەگشتی بەمرەنگەیە، بەڵام ئەوەی لای ئێمە دەیبینین بەتەواوی پێچەوانەیە. لەکوردستاندا راپەرینەکان هیچ کاتێك نەگەیشتوونەتە ئاستی رزگاری شەڕی نەتەوەیی یان تەنانەت نەگەیشتوونەتە ئاستی بەرخودانی نەتەوەیی. شەڕی ناوخۆیی ئەم راپەرینانەی شێواندووە، لەبەر ئەوە سروشتیە کە نەك تەنها گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی نەخوڵقاندووە، بەڵکو بەرەو بنبەستبوون رۆیشتووە. لەلایەکەوە ئەم راپەرین و سەرهەڵدانانە خۆیان لە سنووری شەڕێکی نەتەوەیی نەداوە، لەلایەکی ترەوە میکانیزمی کۆمەڵایەتی پێشکەوتنێکی ئازادی بەخۆیەوە نەبینیوە. کۆمەڵی کوردستان بە گرانی لەژێر کاریگەری لێکدابڕانی خێڵایەتی و هۆزایەتیدا هێڵراوەتەوە، کە کاریگەری ئەم لێدابڕانە تا ئێستاش هەستی پێدەکرێت.

لەسەدەی بیستەمدا زۆربەی ئەم نمونانەی لە بزووتنەوەی رزگاری گەلاندا دەبینرێت، سەرەتا شەڕی رزگاری نەتەوەیی و پاشان لەسەر ئەم بناخەیە پێشکەوتنی میکانیزمی کۆمەڵایەتی بەشێوەی سەربەخۆیی و دیموکراتی بۆرژوازی دێتە مەیدان، کەچی لەسەردەمی مێژووی رابردووی کوردستان، سەرەڕای هەموو ئەو راپەرینانە ئەم رەوشە نەکەوتۆتە مەیدانەوە. پێشکەوتنی کوردستان لەسایەی داگیرکەری بیانی و خیانەتی تەسفیەکاری دەرەبەگایەتی قەتیس ماوە، گەلێك هێزی زەبەلاح لەناوخۆدا ئەوەندە یەکتریان خواردووە، یەکتریان لەناوبردووە و تا ئێستاش کاریگەری بەردەوامە.

کاتێك مێژووی رابردووی نزیك بەمجۆرە بێت تائێستاش ئەم بارودۆخەی شەڕی ناوخۆیی کێشمەکێشی بەردەوام بێ، ئیتر چۆن دەتوانرێ مانایەکی پێ ببەخشرێ؟! بۆئەوەی وەڵامێکی شایستەی ئەم بابەتە بدەینەوە و سەرچاوەی ئەو شەڕە ناوخۆییانە بدۆزینەوە کە دەکەوێتە باشووری کوردستان، باشتر وایە ئەگەر بەشێوەیەکی کورتیش

بێ چاوێك بخشێنین بەمێژووەكەیدا. لەدوای جەنگی ئیمپریالیزمی یەكەم باشووری كوردستان كەوتۆتە ژێر دەستی بەریتانیاوە، بەریتانیا دەسەڵاتدارێتی خۆی بەرادەیەكی زۆر سەپاندووە و پاشان كەوتە دەستی بۆرژوازی عەرەب، لەبەرئەوەی ماوەیەكی درێژ ئەم دەسەڵاتداریە دەرەكییەی بەتووندی لەسەر نەبووە. تارادەیەك شێوە ئۆتۆنۆمییەكی پاراستبوو. دوای جەنگی دابەشكردنی دووەم، ئینگلیزەكان ناچاربوون لەم ناوچەیە بكشێنەوە، هێشتا دەسەڵاتداری عەرەب دەسەڵاتیان لاوازبوو، ئەمانە هەموو بۆ چینە سەردەستەكانی باشووری كوردستان دەرفەتی دەرخساند كە فەرمانداری خۆیان پێشبخەن. بەتایبەتی بە رووخانی رژێمی پاشایەتی مۆنارشی لە ساڵی 1958و بەرپابوونی شۆڕشی بۆرژوای دیموكراتی عەرەب بۆ یەكەمجار هەلومەرج بۆ باشووری كوردستان هاتە كایەوە كە بەرەو بزوتنەوەیەكی رزگاری نەتەوەیی هەنگاو بنێن و ئەمەش دەتوانرا بكرایە بنەمایەك بۆ راپەڕاندنی سەرتاسەری كوردستان.

لەبەرئەوەی دوای رووخانی پاشایەتی، دەسەڵاتدارییەكی لاوازی بۆرژوای میللی عەرەب دروست بوو، هەرگیز نەیاندەتوانی ئەو پێشكەوتنانەی كوردستان كۆنترۆڵ بكەن. لەم هەلومەرجە لەبارەدا كە فشاری دەرەكی لاواز بوو، راپەڕینەكانی باشووری كوردستان لەماوەیەكی كورتدا پەرەیسەند و كاری لە هەموو پارچەكانی تری كوردستان كرد. باشووری كوردستان بەجارێك بووە ناوەندی جوڵانەوەی كوردی و ئەو زەمینەیەشی بۆ رەخسا. بەڵام باشووری كوردستان بۆ ئەوەی رۆڵێكی گرنگ لەم ئاستەدا بگێڕێ، لە گەلێك بواردا بەبەراود لەگەڵ پارچەكانی دیكەی كوردستاندا لاوازی تێدا دەبینرێت. ئەویش كەم بوونی ژمارەی دانیشتوان، یان كەمی رووبەری جوگرافی بگرینە بەرچاو یاخود لەهەر لایەنێكەوە دواكەوتوویی بەدی دەكرێت، ئەم هۆیانە و گەلێكی تریش دەبنە هۆی ئەوەی كە ناهێڵێ ئەم پارچەیە ئەو رۆڵە بخاتە ئەستۆی خۆی. بەڵام ئەوەی زیاتر ئەم رۆڵەی دایە باشووری كوردستان، لەلایەك ئەو هەلومەرجە بوو كە لەئەنجامی پێشكەوتنە شۆڕشگێڕیەكانی ناو ئێراق دروست ببوو، لە لایەكیتر لەپارچەكانی تری كوردستاندا لەئەنجامی سەركوتكردن و فشاری بەردەوامی داگیركەری گەشەكردنیان راوەستا بوو.

بزووتنەوەی كورد لە باشووری كوردستاندا، دەسەڵاتێكی وای كەوتە دەست كە لە توانای خۆی بەدەربوو، بەڵام لەهەمانكاتدا بەزۆر نەخۆشی درێژخایەنەوە دەناڵێنێ كە

تا ئێستاش لێی رزگار نەبووە. باشووری کوردستان ناوچەیەکە کە بنەمای عەشیرەتگەری ـ دەرەبەگایەتی زۆری تێدا بەهێزە لەسەر ئەم بنچینە کۆمەڵایەتی و نیشتمانییە دواکەوتووە هەر بزووتنەوەی سیاسی کە لەسەری گۆش بووە و پەرەیسەندووە، دوای ماوەیەکی کورت، هەروەك چۆن لەمێژوودا بینراوە جارێکی تر؛ جگە لە بۆرژوازی عەرەب دەکەونە ژێر دەسەڵاتی ئێران و تورکیا و تا دەگاتە ئیمپریالیستی ئەمریکی، دەکەونە ناو دەستی ئەوان و لەساڵی 1965 بوو کە لادان دەستیپێکرد و لە تایبەتمەنیە جەماوەری و نیشتیمانیەکان دوور دەکەوتەوە.

## مافپەروەری بەشێوەیەکی گشتی و جۆری ئەو پێشکەوتنانەی کە PKK هێناویەتە ئاراوە

*با بەشێوەیەکی دروست لە راستیەکانی دادوەری لەنێو $PKK$ تێبگەین و هەوڵ بدەین بۆ دەستەبەرکردنی هەموو پێداویستیەکانی.*

مافەکان (ماف بەخۆدان) گوزارەکردنە لە هەڵوێستی خاوەن هێز لەدژی ئەو کەسانەی ناتوانن بەشێوەیەکی تەواو پابەند بن بەو پرەنسیپانەی کە ئەو بۆ خزمەتی ژیان و شەڕ و ئامانجەکانی خۆی دایڕشتوون.

بۆمان هەیە کە ئەو بۆچوونە بەمجۆرە چڕ بکەینەوە، کە هەرکاتێك رێکخستنێك گەیشتە ئاستی پێکەوەنان و خستنەگەڕی دەسەلات، پێویستە چەند پرەنسیپێك بۆ بەرەنگاری هەڵە ناوخۆیی و دەرەکیەکان و لێپرسینەوەی ئەو کەسانە دابڕێژێ کە لێیان بەپرسیارن. هەروەکو چۆن رژێمی دەوڵەتەکان ئەم مافە پەیڕەو دەکەن، دەتوانین بەمەش بڵێین مافەکانی رێکخستن. لێرەشدا بۆمان دەردەکەوێ کە ماف پەیوەستە بە هێزەوە. واتە ئەگەر هێزت نەبێ، ئەوا ناتوانی مافی خۆت رەچاو بکەیت. چونکە هەر خودی هێز سیتەمێکی یاسا و رێسای ئەوتۆی هەیە کە لەکاتی بەزاندنی سنووری ئەو یاسا و رێسایانە لەبەرامبەردا پێویست بە هەڵوێست وەرگرتن دەکات. هەر ئەمەشە کە ئێمە ناومان ناوە ماف. جا کەواتە پرەنسیپەکانی مافپەروەری، بۆ بەندەوارکردنی ئەو کەسانە دەخرێتە گەڕ کە دەیانەوێت پێیانەوە پەیگیر بن. هەر سیستەم و دەوڵەتێکیش چاو لەوە بپۆشێ و بەگری لەخۆی نەکات، ئەوا مانای ئەوەیە کە ئەو سیستەمە، یان ئەو دەوڵەتە گەیشتۆتە قۆناخی هەرەسهێنان. یان ئەگەر سنووری یاساکانی ئەو سیستەمە بەزێنران ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە خودی ئەو سیستەمە بەرەو لەناوچوون دەچێت. هەروەها رادەی هێزی هەر سیستەمێك بەرادەی پێکهێنان و پراکتیزەکردنی یاسا و رێساکانیەوە بەندە. مەرج نییە تەنیا ئەو سیستەمە دەوڵەت بێت، بەڵکو لەوانەیە پارتی، سوپا، کۆمەڵە، بنکەیەکی سەربازی، یان کۆمیتەیەکی رێکخراوەیش بێت، مەبەستیش ئەوەیە کە بڕی سەرکەوتن، بەبڕی پەیگیربوون بە پرەنسیپەکانی سیستەمەکە دەپێورێ. ئەگەر سیستەمێك رێبازێکی شایستەی خۆی هەبێت و ئامانجەکانی روون بێ، خۆ ئەگەر خاوەن دۆزێکی رەوا و نەخشەیەکی سیاسی دروست بێ و هەموو کەلێنێکی لەبەرامبەر بەزیندا پڕ کردبێتەوە، ئەوا سەرکەوتنی مسۆگەرە. بۆشمان هەیە بڵێین داداگا و مافپەروەری لە پۆشاك دەچێ، کە نەبوونی لەش دەخاتە ئاستی مەترسی داڕووشان و بۆی نالوێ خۆی بپارێزێ. بەکورتی ماف بەو پرەنسیپانە دەگوترێت کە ژیان ناچار دەکەن رێچکەی سروشتی خۆی بگرێتە

بەر. بۆنموونە: دەگرێ ناوی مافەکانی شەڕ ببەین. واتە بەردەوامبوونی شەڕ بەپێی چەند پرەنسیپێکی دیاریکراو. کۆمەڵگاش لەنێوان سەردەمی دوو شەڕدا یان دوای بەسەرچوونی بەگژداچوونەوە نێوخۆییەکان ملکەچی ئەو پرەنسیپانە دەبێ. بەڵام ئەو ڕێکخستنەی ئەم یاسا و ڕێسایانەی بۆخۆی ڕەچاو کردبێ، دێتە ئەو واتایەی کە ئەم ڕێکخراوە دامەزراوە و توانیویەتی بچێتە نێو شەڕ و گەیشتۆتە ئاستی پارێزگاریکردن لە مافەکانی. ڕادەی پەیوەستبوون بەو یاسا و ڕێسایانەش، مانای ڕادەی بەهێزی مافەکان دەگەیەنێ.

ناتوانین لەقۆناخی سەرەتادا ئاماژە بۆ ماف بکەین، چونکە ئەو قۆناخە بەسەردەمی کاری ئارەزوومەندیی و چۆنێتی پەرەگرتنی سروشتی و ڕێکنەخراو دەناسرێ. لەوانەشە لەبارودۆخی داڕوخانێکی بەکاریگەر یان شەڕێکی بێ ئاماندا، یاخود کاتێ ڕەوشی نوێ، پەڕینەوە لە سنووری ڕەوشی کۆن بەتەواوی پرەنسیپ و مافەکانیەوە بسەپێنێ، پێویستیمان بەچەند پرەنسیپێکی نوێ دەبێ. ئەوکاتەش ئیدی باسی ماف و ڕێسا کۆنەکان ناکەین، بەڵکو کێشەی مافی نوێ دێنە ئاراوە و بۆ بەلاوەنانی مافە کۆنەکان دەبێ پرەنسیپی نوێ دابڕێژین. سەبارەت بە پارتەکەشمان، کە بۆتە خاوەن پێوەر و پرەنسیپی مافە نێوخۆییەکانی و گەیشتۆتە ئاستی ڕاپەڕاندنیان، ناتوانین چاوپۆشی لێبکەین. گەورەترین خراپەش کە دەرهەق بە ڕێکخستنەکانی بکرێ، کاری هەوەسبازی، تاکڕەوی و خۆپەرستین. چونکە ئەگەر هەرکەس دوور لە ڕێسا و پرەنسیپی مافەکان بێ و بەگوێرەی هەست و سۆزی خۆی ڕەفتار بکات، ئەوا تەنگژەی سەخت بۆ کاری ڕێکخستن پەیدا دەکات و دەبێتە سەرە ڕمی زیانە دەرەکیەکان. ئەو کەسەی کە پرەنسیپەکان بەگوێرەی ئارەزووی خۆی شی دەکاتەوە، یان بەجۆرێك لە خزمەت بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆیدا دەیانخاتە گەڕ کە نەگونجێ لەگەڵ پێوەرەکانی ڕێکخستن و تایبەتمەندیە ستراتیژی و تاکتیکیەکان و ڕەچاوی لایەنە سیاسی و سوپاییەکانی نەکات، واتە پەیگیر نەبێ بە بڕیاری دامەزراو و لق و کۆمیتەکانی ڕێکخستن و پەیڕەوی ناوخۆ، هەرچەندەش نیاز پاك بێ و بەئەنقەست کاری زیانبەخشی ئەنجام نەدابێ، دیسانیش گەررەترین زیان دەگەیەنێتە ڕێکخستن.

دوای ئەوەی پێناسەی مافمان بەگشتی کرد، ئیدی پاراستنی نیشتمان و کۆمەڵایەتی و پاراستنی پارت و، سوپاکەمان بەسەر بکەینەوە و بوویەری واقعی خۆمان ببینین.

هەروەکو ئاشکرایە ئەو ماف و یاسا و ڕێسایانەی کە لەناو وڵات و کۆمەڵگاکەمان پەیڕەو دەکرێت، بریتین لە یاسا و ڕێسای دوژمنان و، لەخزمەتی ئامانج و سیاسەتی کۆمەڵگای دەسەڵاتداردایە، کە مەبەستیان لەناوبردن و تواندنەوەی گەلی کوردە. دەستووریش کە پوختەی یاساکانە لە یەکەمین خاڵیدا ئەڵێت "میللەت یەکەیەکی کامڵە بەنیشتمان و دەوڵەت و نەتەوەکانیەوە و مومکین نییە پارچە بکرێت". ئەم پرەنسیپەش بە کۆمەڵێك یاسای سزایی دەپارێزرێت، کە دوژمن ئەو یاسایانەی وەکو هەموو بڕیار و یاسا و ڕێسا زۆر و زەبەندەکانی دیکە دایڕشتووە و هەر هەمووشیان مەبەستیان تەنیا خزمەتکردن و پاراستنی ئەم ماددەیەیە. واتە تەنیا لەپێناو پاراستنی ئەم ماددەیەدا، قوربانی بە گەلێکی دێرین دەدەن. لەبەرئەوە ئەو مافانە مافی تواندنەوە و فڕکردنە و بەیاسای "پاراستنی ئاسایش" دەستپێدەکات، کە لەکاتی ئاواکردنی کۆماری تورکیادا کەمال ئەتاتورك دەری کردووە و هەتا ئەمڕۆش بە شێوازی جۆربەجۆر بەردەوامە. لە دەستووری بنچینەیی تورکیادا، بەهیچ شێوەیەك باسی ڕاستی گەلی کورد نەکراوە و هەرکەسێکیش ئاماژە بەم ڕاستیە بکات، ئەوا بەلای ئەوانەوە دژی یاسا و ڕێسا و دەستوورە و گەورەترین خیانەتە دەرهەق بە گەل و نیشتمان و شایانی لە سێدارەدانە. دەبینین کە ئەو مافانە لەڕاستیدا فەرمانی لەسێدارەدان بەسەر تەواوی گەلێکدا دەدات.

هەروەها ئەوەی جەسارەت بکات و بڵێ گەلێکی دیکەش هەیە و ئاماژە بە مافەکانی بکات، ئەوا گوناهی دەبێتە دوو هێندە. جا یان دەگیرێ و بێ سەروشوێن دەکرێ یان لە بۆسەیەکدا دەکوژرێ، یاخود بێ دادگاییکردن لەسێدارە دەدرێ. هەتا ئێستاش ئەمە بە کردار لە تورکیادا پەیڕەو دەکرێت. هەربۆیە ناتوانین بڵێین ئەم مافانە لەگەڵ یاسا و پرەنسیپ و پەیماننامە نێودەوڵەتیەکاندا جووتن، بەڵکو بە پێچەوانەی مافەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانە. هەروەها هەر شتێکی لەم بابەتە لەناو داب و نەریت و ئەو مافانەشدا کە هەبوونی نییە دەوڵەتانی دنیا لەناو وڵاتانی خۆماندا پیڕەوی دەکەن. ئەمانە مافی دڕندایەتین و ئەگەر بەناهەق بە ماف ناونرابن، بەڵام دەبێ پێیان نەڵێین ماف، بەڵکو پێویستە پێیان بوترێ هۆڤێتی و بێ مافی.

تائیشتاش ئەم مافە باڵادەست بووە و هەموو بنەماکانی کۆمەڵایەتی و ئابووری بەگوێرەی ئەم دەستوورە دارێژراون. بەمەش میللەت لە میللەتی خۆی دەردەکەوێت، کۆمەڵگاش لە کۆمەڵگایەتی خۆی دەردەکەوێت و دووچاری تواندنەوە و لەناوچوون

دەبێت. هەرچی تاکە کەسیشە ئەوا کەسایەتی خۆی ون دەکات و ناتوانێت دوو قسەی باش بکات، یان بەدروستی بیر بکاتەوە و ناتوانێ لەچالاکیەکی مرۆڤایەتیدا بەشدار بێت. ئەمەش راستیەکی حاشا هەڵنەگرە. کەچی ئازادی تەنیا لەمەدایە، مرۆڤی کورد بێت و بڵێت من تورکم و، دوای ئەوە خیانەت لەخۆی دەکات و نەفرەت لە کوردایەتی دەکات، ئەو کاتە مافی ئەوەی دەدرێتێ کە بژی. ئەمەش واتای کۆتایی پێهاتنی مرۆڤ دەگەیەنێت و، هەرکەسێك تۆزقاڵێك زانیاری هەبێت دێتە سەر ئەو بیروڕایەی کە ئێمە تەنیا لەناو چوارچێوەی ئەو مافانەی کە باسمان کرد هەبوونمان هەیە. خۆ یاساکانی سوپا زۆر لەوەش ستەمکارترن، دەبێ هەرواش بن چونکە هەر ئەوەیە کە بەرپەرچی گەلی کورد دەداتەوە، ئەو یاسایانەش کە باسمان کرد هەموویان لە یاسا سەربازیەکانەوە سەرچاوەیان گرتووە. لەبەرئەوەش دەتوانین پێیان بڵێین "مافە کۆڵۆنیالیستە سەربازیەکان". ئێمە ئێستا لەبەرامبەر یاسا و رێسایەکی بێ بەزەیی و دڕندانەداین، چونکە ئەمانە ماف و یاسا و رێسای سەربازین.

بەدەرکەوتنی PKK بەو مافانەمان وت راوەستن. دەرکەوتنی PKK خۆی لەخۆیدا پێشێل کردنی مافی داگیرکارییە و سیاسەتی قڕکردن دەوەستێنێت، هەروەها لەژێر پێنانی تەواوی ئەو یاسا و رێسایانەیە کە لەدەستووری تورکیادا هاتوون. دەرکەوتنی PKK مانای نەهێشتنی کاریگەری مافەکانی داگیرکاری و هەموو ئەو یاسا و رێسایانەیە کە لەدەستوری تورکیاوە سەرچاوەیان گرتووە و، بانگەوازێکە بۆ یاخیبوون لەدژی مافی داگیرکاری و تێپەڕاندنیان. هەروەها هەنگاوی یەکەمە بۆ سەقامگیرکردنی مافی کۆمەڵایەتی و نیشتمانیان کە یاساکانی مرۆڤایەتی بەبنچینە دەگرێت و پشت بەستەیە بە رێبازی رزگاری نیشتمانی لە بەرەنگاربوونەوەیدا لەبەرامبەر سیاسەتی قڕکردنی نیشتمانی و، پتەوکردنی بنەماکانی کۆمەڵگا و ژیاندنەوەی، لەجیاتی پارچەبوون و پەرش و بڵاوبوونەوە. ئەمانە ئامانجەکانی هەنگاوی یەکەممانن و، ئەو مافانەی کە ئاماژەمان بۆکرد، نەك تەنیا بۆ سیاسەتە، بەڵکو بۆ تەواوی لایەنە سەربازی، مافپەروەری، ئابووری و کۆمەڵایەتیەکانمانن. ئەمەش وەك بەرگری کردنێکە لەمافەکانی گەل، بەمەش رێڕەوی رزگاری نیشتمانی دەپارێزێت و خزمەتی مافی مرۆڤ دەکات و بەندەکانی گەردوونی جاڕنامەی جیهانی مافی مرۆڤ لەبەرچاو دەگرێت. هەروەها هەموو

یاسا دەوڵەتیەکان لەبەرچاو دەگرێ و دەیانپارێزێت، بەتایبەتیش ئەوانەی کە پەیوەندیدارن بە مافەکانی مرۆڤەوە. هەربۆیە پێوەرەکانی PKK گەردوونین و، لەبەرامبەر سیاسەتی قڕکردنی داگیرکەران، بزاڤەکەی رزگاریخواز و نیشتمانیە و، بزاڤی رزگارکردنی کۆمەڵگایە لە دەستی ئەو دوژمنەی کە کۆمەڵگا پەرش و بڵاو دەکاتەوە و دەیتوێنێتەوە.

بە دەرکەوتنی PKK رێکخستنێکی هەمەلایەن و فراوان دروست دەبێ، ئەمەش راستیەکی بەرچاوە، ئەو یاسا و رێسایانەی کە PKK بانگەشەی بۆ دەکات، رێز لەهەبوونی مرۆڤ دەگرێت. جا ئەوە عەشیرەتی بێت یان خێڵەکی یاخود میللەتێکی تازە پێگەیشتوو، جیاوازی نییە، رێز لەهەموو کەسێك دەرگرێت کە بەخۆی بڵێت مرۆڤ و تایبەتمەندی میللەتان و پەرەسەندنی کۆمەڵگاکان بەخۆیەوە بگرێت و هەوڵ بدات بۆ پاراستن و پەرەپێدانی ئەو تایبەتمەندیانە. ئەمەش ئەو پرەنسیپە مرۆڤایەتیەیە کە یاسا و مافەکانمان پشتیان پێ دەبەستێ.

ئەمانەش مانا راستەقینەکەی ئەو یاسا و رێسایەیە. بۆئەوەی ئەم پرەنسیپانە مانایەك ببەخشن، ئەوا پێویستی بەوە هەیە کە ببێت بەهێز. واتا پێویستە پارتیمان ببێت بەهێز، تا بتوانێ ئاماژە بە ماف و یاسا جۆربەجۆرەکان بکات. چونکە تەنیا بەهێز دەتوانین ئاماژە بەسزا بکەین. بۆ نمونە: سزادانی هێزی داگیرکەران و بەرکێگیراوان بە جێبەجێکردنی ماف و یاسا و رێسا بە دیلەکان یان مافی ئازادی یاخود دادوەری راستەقینە دەبێت. ئەگەر بەبێ دوو دڵی بەرەو ئامانجەکانمان هەنگاومان هاوێشت و بەتوندی بەرپەرچی دوژمنانمان دایەوە، ئەوکاتە ئێمە بەم کارە بەرپەرچی ماف و یاسا و رێسا و دادوەری دەوڵەتی تورکیا دەبینەوە، و دەیگۆڕینەوە بە هێزی ماف و رێساکانمان. لەبەرئەوە شەڕەکانمان مانای دابینکردنی مافەکانمان دەگەیەنێت و گەڕانەوەی مافەکانی گەل لەم شەڕەدا بەرجەستە دەبێت.

پاریتیمان لە سەرەتای دەرکەوتنیەوە و، هەتا ئێستا پەیوەست بە ئامانجەکانیەوە شەڕێکی رزگاری نیشتمانی بەڕێوە دەبات، کە لەدژی هەموو شێوەکانی هێزی داگیرکەری و بەکرێگیراوێتیە. پارتیمان دەیەوێت یاسا و رێساکانی بکات بە ئەلتەرناتیقی ئەو رژێمانەی کە لەئارادان. لەم پێناوەشدا هەموو توانای خۆی دەخاتە کار. PKK تێدەکۆشێ بۆ ئاواکردنی سیستەمێکی یاسا و رێسا کە لەگەڵ راستی کۆمەڵاتی و نیشتمانیدا بگونجێت.

لەوانەیە PKK نەتوانێت ئەو یاسا و ڕێسایانە لە هەموو کونجێکی کوردستاندا بالادەست بکات، بەڵام ئەمەش ئەو ناگەیەنێ کەوا ئەم سیستەمە پێویستییە بە پەلەکان دابین ناکات، بەواتا بە لایەنی کەمەوە وەکو رابردوو هەموو شتێك بێ سەروبەر و ئالۆز نابێت، ئەوکاتە ئەگەر بە ڕێژەیەکی سنووردراریش بێت ئەتوانین دادگایی بکەین و ئەم مافانە لەواری کرداریدا پێك بهێنین. پەیوەستبوون بە پرەنسیپی خەباتی نیشتمانی و جێبەجێ چالاکیەکانی، بەیاسا و ڕێسا سەرەکیەکان دادەنرێت.

کاتێك ئاماژە بەمافی نیشتمانی دەکەین ئەمە مانای لایەنگیری ڕێبازی رزگاری نیشتمانی دەگەیەنێت، ئەگەر وابکەیت ئەوکاتە تۆبە داواکاریەکی مافەوە گرێداویت، ئەوکاتەش دەتوانین کە بڵێین تۆ لەگەڵ مافدا هاوتەریبی. بەڵام ئەگەر ئامانجەکان رەچاونەکەیت و ئەنجامیان نەدەیت جا ئەمە چ لەناوخۆ بێت یان لە دەرەوە، بۆ نموونە ئەگەر لەگەڵ رزگاری نیشتمانیدا نەبێت، بەڵام لەگەڵ جێبەجێ کردنی چالاکییەکاندا بێت، یان بە ڕێکخستنەکەوە گرێداونەبێ و لەگەڵ جێبەجێ کردنی چالاکیەکاندا نەبێت، ئەمانە ئەوە دەگەیەنن کە تۆ بەپێچەوانە (مخالف)ی مافی. یان تۆ لە دژایەتیکردنی مافی نیشتمانی و مافەکانی گەلی و تەنانەت لە دژی مافەکانی تاکە کەسیشی. هەروەها مانای ئەوەیە کە تۆ هەم لە ناوەوە و هەم لە دەرەوە دژی ڕێکخستنی. ئەوکاتەش خۆت دووچاری دادگا دەکەیت و ئەویش حوکمت لەسەر دەدات. بۆیە بۆمان هەیە بپرسین دادوەری چییە؟ لەکاتی بڕینی مافەکان و ئەو بنەمایانەی کە لەسەری دامەزراوە، ئەو کاتە دادگا بێتە ئاراوە بۆ حوکمدان. ئەمەش پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە، لێکۆڵینەوەش واتا روونکردنەوەی جۆری تاوان و لاساری لە مافەکان و دەستنیشان کردنیان. دەبێ لێکۆڵینەوەش لەسەر بنەمای رزگاری نیشتمانی بێت و لەڕێگای هێڵی ڕێکخستنەوە گوزارەی لێ بکرێت و خەسڵەتە تاکتیکییەکانی ئەو ڕێڕەوەش بناسرێت. بۆیە هەندێ جار پێی دەگوترێ پەیڕەوی ناوخۆ، یان لیستەی یاساکان. ئیدی ئەمانەن ئەو بنەمایانەی کە بەپێی ئەمە دادوەری دەکرێت. ئەگەر هاتوو هەڵوێستی کەسێك یان کۆمەڵێك یان تەنانەت دەوڵەتێکیش لەم یاسا و ڕێسایانە لابدات یاخود هاودژ بوو لەگەڵیاندا؛ ئەوکاتە پێویستە پەنا ببرێتە بەر دادگا و لێکۆڵینەوە. ئەو هێزە چەکداریەی کە PKK خاوەنێتی بەسە بۆ ئەوەی ئەو مافانە سەقامگیر بکات. ئەگەر سەیری ئەو ڕێسایانە بکەین، دەبینین

هەموویان روون و ئاشکران. هەموو دنیا دەزانێت کە شەڕێکی رزگاری نیشتمانی هەیە و، دەزانن ئەمەش بە خەباتێکی چەکداری بەڕێوە دەچێت. هەروەها ئەوەش دەزانن کە رێکخستنێکیش هەیە کە کاروبارە تەکنیکیەکانی رۆژانە بەڕێوە دەبات و چاودێری ئەو شەڕە دەکات و لەسەریشی رادەوەستێت. هەموو کەسێك ئەمە بە هێڵە پان و تاکتیکە روونەکانیەوە دەبینێ، بەڵام هەندێك هەن کە پێچەوانەی ئەم رێڕەوە رەفتار دەکەن، کە ئەویش دەوڵەتی تورکیایە.

بێگومان شەڕیش لە دژی ئەم دەوڵەتە دەکرێت، واتا ئێمە شەڕ لە دژی ئەوان دەکەین تا ماف و یاسا و رێساکانمان بەدەست بهێنین. گەلێك رێکخستنی بڵندتریش هەن کە دژایەتیمان دەکەن، هەروەها بەکرێگیراوەکانیش هێرشیان دکردە سەرمان، بەڵام ئێمە لەدژی هەموویان جەنگاین. واتا ئێمە بە شەڕکردنمان لەگەڵیاندا مەبەستمان دامەزراندنی ماف و رێسایەك بوو کە رزگاری نیشتمانیمان لەبەرچاو بگرێت. هەروەها پیلانگێڕە ناوخۆییەکان کە لە هەموویان مەترسیدارترن، ئەوانەی لەناوخۆدا سیستەم و رێساکان پێشێل دەکەن، ئێمە بە پیلانگێڕ و بەکرێگیراو ناویان دەبەین. پێویستە لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنە لەگەڵیاندا بکرێت، چونکە دوژمن و بەکرێگیراوەکان لە دەرەوە و لەهەمانکاتدا پیلانگێڕەکان لەناوخۆدا هێرش دەکەنە سەرمان. هەروەها خیانەتکار و دەمامکدراوەکانیش لەدەرەوە هێش دێنن و خۆشیان ئاشکرا دەکەن. بەڵام هەندێکیان بەڕووکەشی لەنێو پارتی و رێکخستندان، کەچی هەموو کارێکی پێچەوانە دەکەن و گوێ بەیاساکان نادەن و خۆشیان بە لێپرسراو و گەورە نیشاندەدەن و ئەرکی گەورەش بەجێ دەگەیەنن.

بۆچی ئێمە دەمانەوێ لەسەر بەکرێگیراوە پیلانگێڕە ناوخۆکان رابوەستین و لێکۆڵینەوەیەکی زۆریان لەسەر بکەین؟ چونکە ئەمانە لەدوژمن ترسناکتر و وێرانکەرترن. گاڵتە پێکردنێکی مەترسیدار بەو رێسایانە هەیە کە ملیۆنەها رۆڵەی گەل پێوەی پەیوەستن. هەندێك هەڤاڵ دەڵێن: "من رێزی رزگاری نیشتمانی و ئازادی گەل دەگرم، من لەگەڵ PKKدام و، رێڕەوەی چالاکیەکانیش پەسند دەکەم"، کەواتە لێرەدا ناکۆکی لە کوێدایە؟

بەڵام هەروەکو دەزانین ئەو هەڤاڵە تاکتیک رەچاو ناکات و بەگوێرەی ئەویش هەڵس و کەوت ناکات، ئەمەش ناکۆکیەکی مەزنە، تەنانەت جێبەجێ نەکردنی ئەرکی رۆژانەی سوپاش لادانە لە پەیڕەوی ناوخۆ و یاساکان.

ئەگەر ئەمە هەندێك بەگشتیەوە وەربگرین، ئیدی باس لە بنەمایەکی رەوشتی دەکەین، رەنگە رەفتارێك لەگەڵ مافەکاندا هاودژ نەبێت، بەڵام لەلایەنی رۆحیەوە لەگەڵ پارتیدا نییە، یان گیانی سەربازی تێدا نییە، یاخود خاوەن بۆچوونێکی سەربازی و جەنگاوەری نییە. ئایا دەکرێ ئەمە رووبەڕووی دادگا بکەینەوە؟

بۆیە دەبێ لە رووبەڕوو بوونەوەی نمونەی ئەمانەدا رەوشت و ئاکاری شۆڕشگێڕی بپارێزین. چونکە ئەوان بەپێی ئەو رۆشنبیرییە دەژین کە لە دەوڵەتی تورکیا و چینی دەرەبەگ وەریان گرتووە. لەسەر ئەو پرەنسیپە تایبەتیانەش کە بە دەستیان هێناوە سوورن. ئێمەش بە جەختکردن لەسەر شێوازی ژیان و رەوشتی شۆڕشگێڕیمان رووبەڕووی تایبەتمەندی ئەو کەسایەتیانە دەبینەوە و، لە بەرامبەر ورە داروخاوەکان پێویستە بەگیانێکی شۆڕشگێڕی و زیندووکردنەوەی ئەو گیانە رووبەڕوویان ببینەوە. بەمجۆرەش کاریگەری ئەو کار و کردەوانە پووچەڵ دەبێتەوە.

لێرەدا پێویستە جیاوازی لەنێوان ماف و رەوشتدا بکەین، رەوشت هەندێ شتی دەرەوەی چوارچێوەی ماف دەگرێتەوە. رەوشێکە کە ماف باسی لێوە ناکات. هەندێك کەس لە رووخساردا هەموو شتێك بەپێی ماف و یاسا و رێساکان بەڕێوە دەبەن و، رەوشێکی وەها نیشاندەدەن کە یاسای مافەکان نایانگرێتەوە، بەڵام لە ژیان و لە رۆحیاندا بەتەواوی پێچەوانەن. لەبەرئەوە پێویستە شەڕێکی رەوشتی دژواریان لەگەڵدا بکەین، هەرچەندە رووی دەرەوەیان یەکانگیرە لەگەڵ مافەکانمدا، بەڵام گیان و ورەیان بەڕەنگێکی پێویست نییە. ئەوانە تەنیا لەو کەسانە دەچن کە لەسەر دەستی بەڕێوەبەرایەتی دەزگای شەڕی تایبەت راهێنراون. ئەوانەی تەنها بۆ دڵەڕاوکێ و سەر لێتێکدان و ورە رووخاندن هاتوون، بەبێ ئەوەی دژایەتی هیچ یاسا و رێسایەکیش بکەن ئەمانە وەکو مشەخۆرن کە گەوهەر خراپ دەکەن. ئەمەش هێرشێکی ئەخلاقیە و خزمەتکردنێکی شاراوەی دوژمنە. بۆیە پێویستە لەگەڵیان شەڕ بکەین و بەبێ ئەوەی لە یاسا و رەوشتمان لابدەین بەرەنگاریان ببینەوە.

پێویسته لەسەر ئەوانە رابوەستین کە پەیگیری بەرەوشتی پارتیـەوە ناکـەن، ئەگـەر زێدە لە هەڵسوکەوتەکانیان بکۆڵینەوە، ئەوا دەگەیەنە ئەوەی کە ئەمانە بۆیە بەمشێوەیە رەفتـار دەکـەن، چـونکە لەڕاسـتیدا رێساکانی پـارتی رەچـاو ناکـەن، ئەوکاتـەش دەتـوانین لەسەر ئەو رەفتارانەیان دادگاییان بکەین.

لەهەنـدێ راپۆرتـدا کـە بۆمـان دەنێـرن، دەڵـێن: فـلان هـەڤاڵ بێکـارە ژیـانی پـارتی لەبەرچاو ناگرێت، کاتێکیش لێیدەکۆڵینەوە، ئەوا دەبینین کە پرەنسیپ و یاسـانی پێشـێل کـردووە. لێـرەدا پێویسـت ناکـات بـەدوای نیـازدا بگـەرێین، ئـەو کەسـە، یـان دەیـەوێت پەیوەست بێت بەیاساکانەوە، بەڵام ئەو هێزەی تێدا نییە کە لەگەڵ مافە شۆڕشگێڕیەکان هەماهەنگ بێ، یاخود دەبێ کەسێکی کەوتوو و ئاڵۆز بێت، یان لـە ژێـر کاریگـەری رژێمـی دەوڵەتدایە، یاخود لەوانەیە دوژمنی چینایەتیمان بێـت، یـان لـە چـینێکی دیکەیـە. ئەمـە پێشـێلکردنی مافـە، هـەروەها ئەمـە کەسـایەتیەکی نـابووت و لاوازە و بـێ بـاوەڕە و تـەنیا کۆیلەیەکی ئاساییە. لەبەر ئەوەی کۆیلە ناتوانێ پرەنسیپەکان رەچـاو بکـات و پـەیڕەویان بکات، ئیـدی سـنووری مافـە شۆڕشـگێڕیەکان دەبـەزێنێ و دەرگـای دادگـا لەبـەردەم خۆیـدا دەکاتەوە. بەمجۆرە دەبینین کە چۆن دادگا دەتـوانێ خـۆی لـەم بوارانـەدا هـەڵقورتێنێ کـە ماف و یاسا کارپێکراوەکانیان تێدا پێشێل دەکرێن.

دوای لێکۆڵینــەوە و هــەبوونی بەرچــاو نــۆرەی ســازدانی دادگــا دێــت و بەڵگــەکان پێشکەش بەدادگا دەکرێت و تاوانەکان روون دەکرێنەوە و، بەپێی یاسانی رێکخستن سـزای پڕ بەپێستیان دەدرێت. ئەم کـارە هێشـتا لـەلای ئێمـە پـەرەی نەسـەندووە، بـەڵکو شـتێکی سەرەتاییە. ئایا ئـەم دادگایـە لـەلای ئێمـە لەسـەر شـێوەی دەسـتەی دادوەرانـە یـان لەسـەر شێوەی کۆمیتەیە؟ هێشتا ئەمـە بەتـەواوەتی لـەلای ئێمـە نەچەسـپاوە. ئێمـە ئـەم بابەتـە دەخەینە روو بۆ ئەوەی بیکەین بە بناخەیەکی نەگۆڕ. تائێسـتا ئـەوەی لـەلای ئێمـە بـاوە ئەوەیـە کـە کۆبوونەوەیـەکی بـەرفراوان بـەدەنگی هـەموو ئامـادەبوان سازبکەین و بڕیـار بگـرین، یـان حوکمەکـە لـەڕێی گروپـی بچـووکەوە دەردەچـێ. هەنـدێ جـار حوکمەکـە جێبەجێ دەکەین و هەنـدێ جـاریش دوای دەخـەین. لەهـەموو ئەمانەشـەوە ئـەوەمان بـۆ ئاشـکرا دەبـێ کـە پێویسـتمان بـە سیسـتەمێکی نـوێ و نـەگۆڕ هەیـە، بـەڵام بـە شـێوەیەکی سەرەکی باسی لایەنەکانی دیکە دەکەین.

## پەرەگرتنی مافەکان لەنێو PKKدا لەڕووی مێژوویی و توانای خستنە گەڕیان

دوای ئـەوەی پووختەیـەکمان لـە چـەمکی مافـەکان و ئاسـتی پەرەسـەندنیان لـەلای PKK باس کرد، بەباشـی دەزانـین باسـی ئـەو سـنور بەزاندنـەی نێـو خۆمـان بکـەین کـە دەرهەق بە پرەنسیپەکانی پارتیمـان، بەتایبـەتیش ئەوانـەی دەرهـەق بـە پرەنسـیپەکانی شەڕی چەکداری کراون. ئێمە لە قۆنـاخی دامەزرانـدنـدا تـا گەیشـتینە سـاڵانی هەشـتاکان، هێندە بایەخمان بە بنەما و پرەنسیپەکان نەدەدا. هەر بۆیـەش بنـەمای دادگامـان نـەبوو، کـەم جـار دادگامـان سـازکردووە، ئەوانـەی کـە هەنـدێکیش ئەنجامـدراون، ئـەوا بـەپێی پرەنسیپ و رەوشـتێکی دیـاریکراو نـەبووە تـا لێتوێژینـەوە و لێکۆڵینـەوە و لێپرسـینەوە رۆڵی خۆیان تێدا ببینن. بۆچی؟ چونکە هێشتا پارتەکەمان لە سنووری دامەزراندنی هێز و یاسا و پرەنسیپ و مافەکاندا بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نـاکۆکی گـەورە هـەبوون، وەکـو پەیگیر نەبوون بەئامانجەکان و رێکخستنەوە، وازهێنان لە رێکخستن و رەوشی لەو بابەتە. ئێمە بەرامبەر ئەوە بـە خـەڵکمان راگەیانـد کـە ئەوانـە لادەرو گێرەشـێوێن و تێکـدەرەن. دادگـایی کـردن هـەر ئەونـدە بـوو، سـزاکانیش لـە چوارچـێوەی لایـەنی رەوشـتی دابـوون. چونکە خـاوەنی هێـز نـەبووین و تـەنیا بـە شـەرمەزار کردنیـان وازمـان دەهێنـا. ئەمـەش سـزایەکی رەوشـتییە، نـەك مافپـەروەری یـان کـەمترین ئاسـتی سـزادانە. هەرچـەندە زۆربەشیان کرێگرتە بوون، وەلێ عەوداڵی برِی سزادانەکە نەدەبووین، بەڵکو زیاتر بیرمان لـە سـەلامەتی گروپـەکانمان و نهێنیـان دەکـردەوە، وەك تـەگبیر وەرگرتنێـك بـۆ دووبـارە نەبوونەوەی ئەو جۆرە کردەوانە. ئیدی سزاکان مەودایەکی سیاسیان هەبوو، بە هەڵوێست و دەبرِینی سیاسیانە هەڵدەستاین بە شەرمەزارکردیان. بۆ ئەمەش بەتایبەتی پشتمان بـە پڕوپاگەندە دەبەست، لەو کاتەدا ئەو جۆرە تەگبیر وەرگرتنانە بەس بوون بۆ ئێمە.

پەرەسەندنی بنەڕەتی لەنێو PKK دا لەدوای ساڵی 1982 هاتە ئاراوە، ئـەو کاتـە نیازمـان هـەبوو کـە پـەیرەوی نـاوخۆ رابگەیـەنین، بێگومـان تـەنیا راگەیانـدنی پـەیرەوی ناوخۆیی بەس نەبوو، بەڵکو گرنگ ئەوە بوو گۆشت لە چواردەوری ئێسقان کۆببێتـەوە و پـارتی بگۆڕیـت و کـادیر و، لایـەنگران بگـەن بەگرسـەیەکی جـەماوەری. لـەمجۆرە

حاڵەتانەشدا پەیڕەوەی نـاوخۆیی زێـدە گـرنگ نـەبوو، هـەروەکو گوتمـان پەرەسـەندن لـە دوای ساڵی 1982 وە دەستی پێکرد.

دوای ئـەوەی پارتیمـان لـە بەرامبـەر فاشـیزمی 12 ی ئـەیلول خـۆی سـەلماند و، لەئـەنجامی شـەڕەکەمان لـەدژی 12ی ئـەیلول بـە پێویسـتمان زانـی کـە بـۆ قۆناخـەکانی دواهاتوو پەرە بە مافە نیشتمانیەکان بدەین.

پـاش قەڵـەمبازی 15ی ئـاب و خسـتنەگەڕی شـێوازی دڕندانـە لەلایـەن دەوڵەتـەوە، ئاشکرا بوو کە ئەم ڕەفتارانەی دوژمن و بەرخودانی گەل تا ماوەیەکی نـەزانراو بـەردەوام دەبێـت، لەبـەر ئـەوە پێویسـت بـوو سوپای گـەریلا دورسـت ببێـت. ئەمـەش پرەنسـیپ و سیستەمی سەربازی پێویست بوو. ئەمانـە وایـان لـە PKK و سـەرۆکایەتیەکەی کـرد کـە بەدواداچوونی بەجێهێنانی سیستـەم و یاسـا و ڕێسـای پێویسـت بکات. دەریـش کـەوت کـە سەردەمی گروپ و ڕەوشـی ناسـك بەسەرچوو و، دەبـوو پـەرە بـە پێـوەری نـوێ بـدرێ بـۆ داڕشتنی زەمینەی پارتی و سوپا لەسەر بنەما و یاسای پتەو. چونکە پێویست بوو ڕەوشی سیاسی پارتیمان و ئاسۆی نیشـتمان و گۆڕەپانـە نێودەوڵەتیـەکان و ئایـدیۆلۆژی سـەربازی پەرەبگرن.

بۆمـان هەیـە بڵـێین قۆنـاخی دوای سـاڵی 1987 قۆنـاخی گواسـتنەوە بـوو بـەرەو بەگەریلابوون و بەجەماوەربوون. ئەمەش قۆنـاخێکی نـوێ بـوو بـۆ ئێمـە، دەبـوو پـەیگیر ببین بە پرەنسیپەکان و ململانێکردن لەگەڵ کەسانی سەرکێش. دەبێ ئەوەشمان لەبیر بێ کـە تـا ئەوکاتـە پـارتی هەنـدێ کەسـی تێـدا بـوو، کـە پـەیگیر نـەدەبوون بـە پرەنیسـپ و ڕێساکانەوە، بەتایبەتیش چالاکی پیلانگێڕەکان، کاریگەرییەکی وێرانکاریان هەبوو لەسـەر ڕێکخسـتن. پێویسـت بـوو تـەگبیری جـددی وەربگیرێـت بـۆ سـەپاندنی پـارتی لەسـەر ئـەو پیلانگێڕانە. چونکە کۆڵەکەکانی پارتی هێدی هێدی پتەوتر دەبوون. شەڕی ئێمە لـەدژی ئەوانــە بــوو کــە گومــان و بــێ بــاوەڕی و بــێ ورەییــان بڵاودەکــردەوە و لەبــەردەم جێبەجێکردنی پرەنسیپ و ڕێساکان، ئاستەنگیان دروست دەکرد.

بەمەش هەرکەس بەگوێرەی خۆی تەفسیری ڕێساکانی دەکرد و بە پـەیگیر نـەبوون بە ڕێکخستن و بەگوێرەی یاساکان هەڵسوکەوت نەکردن ببوە کارێکی باو. ئەمەش وایکـرد کە مـۆرکی تایبەتمەنـدی مافـە نێوخۆییـەکانی بداتـە ئـەو قۆناخـە. هـەروەکو چـۆن مـاف ناوخۆ و دەرەوەمان بەسـەر دوژمنـدا سـەپاندبوو، دەوڵـەتی تورکیـاش دەیویسـت لـەڕێگای

کرێگرتەکانیەوە ڕێگایەکی بەمشێویە بەکاربهێنێ. بۆ ئەمەش نوێنەرەکانیان دەستیان دەکرد بە بەزاندنی پرەنسیپ و ڕێساکانی پارتی، بۆ دروستکردنی قەیرانی جەرگبڕ و داشۆرینی پارتەکەمان لە پرەنسیپ و مافەکانی، بەئامانجی ئەوەی پارتەکەمان نەبێت بە پارتێکی خاوەن ماف و یاسا و ڕێسایەکی نەگۆڕ. لەم پێناوەشدا کرێگرتەکان چالاکیەکانیان زیاتر کرد و لەبەردەم کۆبوونەوە وەرزیەکانمان و بەجێهێنانی بەندەکانی پەیڕەوی ناوخۆی پارتیمان بوونە ئاستەنگ.

ئاشکراشە دامەزراندنی سیستەمێکی مافپەروەری ناوخۆیی کارێکی سادە نییە و، کارێکی ناوخۆیی لە هی دەرەکی زەحمەترە. چونکە گەل خۆی بەیەکێک لە هەڤاڵان دەزانێ و پایەیەکی شیاوی هەیە لەنێو پارتیدا.

جا ئەگەر کەسێکی گومان لێکراو بوو و ترسی پاکتاوکردنی لێنیشت، ئیدی ئەو ڕەوشە هانی دەدات کە بەرەنگاری بنوێنێ و ئارەزووی خۆی بەسەر ڕێکخستندا بسەپێنێ. لەڕاستیدا ئەوانە پیلانگێڕ و کرێگرتەی ناوخۆیین، چونکە بەرگەی ژیانی شۆڕشگێڕی ناگرن، هێندە نابا هەوڵدەدەن بەرگری لەخۆیان بکەن، ئەوەش شێوەی شەڕێك پێکدێنێ، مەبەستیان داخوراندنی پارتی و لەباربردنیەتی. ئەو قۆناخە کە ململانێی سیاسی بەسەردا سەپاندین بۆ ئێمە پڕ زەحمەتی بوو، تەنیا بە ریسوا کردنیان، لەبەلایان ڕزگارمان نەدەبوو، ئەوان چەشنی دزی نێو ماڵ، یەخەگیرمان دەبوون و وازیان نەدەهێنا، بەخەیاڵی خۆیان دەیانویست PKK بپوکێننەوە و لەناوی ببەن، ئەو ڕەوشەش بوونی دادوەری کردە پێویستیەك.

کاتێك گەیشتینە قۆناخی کۆنگرەی سێیەمی پارتی، بارودۆخ ئەوەی لەسەرمان دەسەپاند کە بیر لە پەرەپێدانی دەزگای دادوەری بکەینەوە، چونکە ئەو کاتە لە گۆڕەپانەکانی شەڕ و گۆڕەپانەکانی دیکەشدا گەلێك سنوور بەزاندن و پەیگیر نەبوون و پێشێل کردنی یاسا و ڕێساکان ڕویان دەدا، بگرە لەوەش زیاتر، ئاستەنگی لەبەردەم پێشکەوتنی PKK دادەنرا و پێیان لەسەر ئەو بۆچوونە هەڵانە دادەگرت و دەیانویست پیسەپێنن بەسەر هەمووماندا. وێڕای هەموو ئەو هەوڵە سیاسیانەی کە دەدران بۆ دڵنیا کردن و کارتێکردنیان بەڕێگایەکی هەڤاڵانە دیسان دەستبەرداری شێوازەکانیان نەبوون و بەئاشکرا دەستیان بە پیلانگێڕی کرد و ناچاریان کردین بەرگری لەخۆمان بکەین. جا

ئـەوان کـە مەبەسـتیان بـوو ڕێکخسـتنەکەمان بپـێکن، دەبـوو ئێمـەش بـەرگری لـەخودی ڕێکخستن بکـەین، واز لـە لایـەنی سیاسـی و ڕەوشـتی و ئـەدەبی بێنـە، تەنانـەت مرۆڤێکـی ئاسایش نەیدەتوانی ئەو یاسایانە پەسند بکات. لەڕەوشێکی بەمجۆرەشدا هەر دەبوایە یاسا و ڕێسا نێوخۆییەکان پێك بهێنرێت. کاریان پێبکرێت و لـەم بارەیـەوە بـۆ یەکـەمین جـار پێویسـت بـوو شـێوازی لێپرسـینەوە بخەینـە کـار. ئـەوان هـەر لەسـەر هەڵوێسـتی خۆیـان سووربوون، هەروەك دەڵێن: " PKK چۆن پەیـدا بـووە، ئـاواش لـەناو دەبـرێ"، "بـەهیچ شـێوەیەك لێناگـەڕێین PKK پێشبکەوێ و هـەرەس بـە ڕەوتـە جەنگیەکـەی دەهێـنین"، "نـابێ تـاکتیکی PKK و کـاروانی شـەڕی چـەکداریەکەی و پرەنسـیپەکانی ڕێکخسـتنی بەئارامی هەنگاو بنێ"، "کاتێکیش باسی ڕێکخستن دەکەین، ئەوا هەر کەسێکمان ئازادە لە سەپاندنی شێوازی تایبـەتی خـۆی دەرهـەق بـە شـەڕ و کـەی ویسـتی شـەڕبکات بابیکات و هەرکاتێکیش نەیەوێت با نەیکات و کەسیش پێی نەڵێت بـۆ وادەکـەی". لەڕاسـتیدا ئەمـە لـە مەترسـیە سـەرەکییەکانی گـەلێك ترسـناکتر بـوون، بـەڵام ئەگـەر وریـای ئـەم ڕەوشـە نەبووینایە، ئەوا دەیانتوانی ڕێکخستنەکەمان لەناو ببەن، هەربۆئەمـەش دەبـوو پـەرە بـە لێپرسینەوە بدەین.

هەوڵماندا ناخی ئەو کەسانە بناسین کە هەوڵی تێکدانی ڕەوتی ڕێکخستن دەدەن، تا بزانین ئەو کەسانە کێن و لـەکوێوە هـاتوون، ئایـا نیازیـان خاوێنـە؟ یـان گڵاوە؟ ویسـتمان ئەوانە شی بکەینەوە.

ئاشکراشە کە لەمیانی ساڵی 1986دا شیکردنەوەکانمان قووڵتر بوو، وێـڕای ئـەوەش پەنامان بردە بەر ناساندنی کەسایەتی و ڕادەی گرێـدانیان بەشـێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆ بـە دەوڵەتــەوە و کاریگـەری لەسـەریان و بنـەمای ڕەوشـتیان و ئـەو نێوەنـدە پاشـفەڕۆ و دواکەوتوو و داب و نەریتـەی کـە لێـوەی هـاتوون. بەمـەش بۆمـان دەرکـەوت کـە چـەندە زیانیـان بـە پارتەکـەمان گەیانـدووە و تـا چ ئاسـتێك توانیویانـە تاکتیکـەکانی شـەڕ بپوکێننەوە. لێرەدا ڕادە و پلـەی خراپـەکاری هـەر یـەکێکیان جیاجیا بـوو. لەبەرئـەوەش پلەی سزادان لەنێوان سوکترین و قورسترین ئاستدا بـووە، بەمشـێوەیە لـەماوەی کـۆنگرەی سێیەمی پارتیماندا، کەشـێکی دادگـایی و لێپرسـینەوەمان بەسـەر بـرد، هەرچـەندە ورد و ڕێکوپێکیش نەبوو، بەڵام ئەمە بۆ ئێمە بووە ئەزمونێکی گەورەو یەکەم هەنگاوی جـددی بوو لەو پێناوەدا.

لەقۆناخی دوای ئەوە گەشەسەندن و پەرەگرتنـەکان بـەبڵاوتر بـوون، دامەزرانـدنی گـەریلا لەلایـەك و پارێزگـاریکرنی بونیـادی پـارتی و ڕۆڵـی پێشـڕەوانەی لەهـەموو گۆڕەپانێکدا لەلایەکی دیکەوە، لە بەرامبەریشدا بڕی ئەو کرێگرتەیەی کە دەوڵەتی تـورك چاندبووی و نوێنەرەکانیان گەشەیان کرد، چیرۆکی ئەم پیلانگێڕانـەش دیـار و بەرچـاوە. ئەوانەی تاوانیان ئەنجام دەدا جا ئەوە گرنگ نییە بەبێ مەبەست ئـەوەیان کردبێـت یـان بە مەبەستێکی نەخشە بۆ کێشرا و، چونکە لە هەردوو حاڵەتدا پەیگیر نەدەبوون بە یاسا و ڕێسـاکانی بزاڤـی ڕزگـاریخوازی نیشـتمانی و هـیچ بایـەخیان نەدەدایـە سـەرۆکایەتیە پێشـەنگەکەی. گـرنگترین شـتیش پەیگیرنـەبوونیان بـوو بەبنـەما تکتیکیـەکان و، بـە بـەردەوامی بەربـەرەکانییان دەکـردین. بـۆ ئـەوەی لـە بەرامبـەریان ڕابوەسـتین ناچـار دەبـووین لـەنێو کۆمـەڵگادا، ئاشـکرا و ڕیسـوایان بکـەین و ئـەو توندووڕەوانـەی هـەر سووریشبوون لەسەر ڕەفتارەکانیان، ئەوا پێویست بوو لە ڕێگای دادگایی کردنیانەوە سزای پڕ بەپێستیان بدەین.

وەك ئاشکرایە لەساڵی 1988دا هێرشێکی بەربڵاومان کرایە سەر و هەمان ڕەوشـی سـەخت، نێـو زینـدان و چـیاکان و ئەوروپاشـی گرتـەوە. ئەوانـەی لـە ئەوروپاشـدا سـەرکردایەتی ئـەم هێرشـەیان دەکـرد دەیـانگوت: ئێمـەین ئەوانـەی نوێنـەراتی PKK دەکەن و دەستمان بەسەریدا گرتووە و هەموو ئەوروپاش لەبن دەستی ئێمەدایە و گـەلێك گۆڕەپانی وڵاتیش پابەندن بە ئێمەوە. ئەمانـەش هـەموو ئـەوەیان نیشـان دەدا کـە ئـەوان هێرش دەکەنەسەر ڕێکخستن، ئەمـەش دۆزێکی لـە مافپـەروەری بـەدوور نییـە. چـونکە ئەمـە ڕەنگاربوونەوەیـەکی ناهێرشـبەرانەی ناراستـەخۆ بـوو و بـەڵێنی هەنـدێ قـازانـج و چاوچنۆکی زۆر لە کۆنەپەرستانیان دەدا. ئێوەش دەزانن ئەوە ڕەوشێکی زۆر نیگەران بوو کە تەنانەت لەناو زیندانەکانیش ڕەنگی دایەوە. ئەمەش مانای ڕەتکردنەوەی پارتەکـەمان بـوو لـەبواری ئارمـانـج و پرەنسیپ و تاکتیکیەکەیدا. لەبـەر ئـەوەی پارتیمـان ناچـاربوو بـەرگری لەمافـەکانی بکـات و ئـەو هەنگاوەشـی بەسـەرکەوتوویی هاوێشـت. ئـەوە بـوو لێپرسـینەوەی فـراوان سـازادران و دادگـا بڕیـاری هەنـدێ سـزای دا. ئەمـەش وایکـرد دادپەروەری و یاساکانی هەندێك پەرەبسێنێ.

هـەروەك ئاگـادارن لەسـەرەتای سـاڵی 1990 و دواتـریش پارتیمـان دووچـاری هێرشێکی چەکدارانەی ئاشکرا بـوو، کـە بەمەسـتیان لـەباربردنی ژیـانی حزبایـەتی و بـۆ چونەکانمان و ڕێبزەکەمان لـە ڕێگـای پیلانگێڕیـەوە بـوو. ئـەمجارەش پارتیمـان بەهـەمان شێواز کەوتە بەرگریکردن لەخۆی و توانی سەربکەوێت.

ئەوانەی باسمان کردن قۆناخە سەرەکیەکان بوون. دیارە ساڵانەش چـەندان پیلانـی گـەورە و بچـووکمان لەگشـت گۆڕەپـانێکی بەندیخانـە و دەرەوەشـدا لـە دژ سـازدەکرا، هەمووشـیان دژی ڕەوتـی شـەڕ و بەتایبـەتیش دژی ژیـانی حزبایـەتیمان بـوون. تەنانـەت پارتیمـان لـەدەرەوە زیـاتر لەناوخۆیـدا کەوتـە بـەر هێـرش و پـەلاماردان، تـەواوی ئـەو پەلاماردانـە نێوخۆییانـەش لەشـێوازی بەزانـدنی پرەنسـیپەکان و نەناسـینی پێوەرکـان، بەتایبـەتی پێـوەرە ڕەوشـتییەکان و پـەیگیر نـەبوون بەڕاسـپاردەکانی پارتیـەوە بـوو. تـا سـەرەنجام پارتەکـەمانیان گەیانـدە ئاسـتێك کـە ڕووبـەڕووی پاکتـاوکردن و لەنێوچـوون ببێتـەوە. لەبـەر ئـەوەش پێویسـت بـوو کـە شـەڕێکی پرەنسـیپی و یاسـایی و کاریگـەریان لەگەڵدا بکـەین. بەمـەش پارتیمـان لەئاسـتی نـاوخۆدا شـەڕێکی توندوتیـژی لـەو جـۆرەی بەرپاکرد.

تـا گەیشـتینە سـاڵی 1992 ئـەو ڕەوشـە هـەر بـەردەوام بـوو، بەتایبـەتی لـە بـواری پابەندنەبوون و پەیگیرنەبووندا، کە هەردووکیان لەمیانـەی شـەڕی باشـووردا دەرکـەوتن، لە شـێوەی ئامادەنـەکردنێکی پێویسـتی گـەریلا، دوورکەوتنـەوە لـە سـیماکانی پێشـەنگ و پابەندن نەبوون بە پێودانگەکانی و پەیگیرنەبوون بە شـێوازی ژیـانی پـارتی. لـە کاتێکـدا پارتیمان لە هەموو بوارێکدا لە ڕەوشێکی وەهادا بوو کە دەیتوانی سەربکەوێت. بەڵام ئەم سنوور بەزاندنانە خستیانە وێزەی قەیرانێکی ئەوتۆ کە بگاتە ڕەوشێك ڕووبەڕووی شکان ببێتەوە.

بەدرێژایی سـاڵی 1993ش دادگـایی درێـژەی کێشـا، لەمیانەیـدا کۆششـمان کـرد بـۆ پەیگیربوون بە بیر و باوەڕی پارتی و یاسا و پێشەنگەکەی، هەروەها رادەی پـەیگیربوونش بـە چـەمکەکانی گـەریلا، کـەس نـەما لێپرسـینەوەی لەگەڵدا نـەکرێت، هەنـدێك سـزاش ڕاگەیاندرا. ئەگەرچی ئەمە سنوورداریش بوو، بەڵام بۆچی؟ چونکە ئێمە نەمان دەویست بکەوینە نێو ئـەو قەیرانـەی کـە دوژمنـان دەیانویست. هـەروەها نـەشمان دەویسـت پشـوو بدەین، کەسانی وەهاش زۆر بوون کە هەڵپەیان دەکرد. هەربۆیەش پێویست بوو سیاسیانە

رەفتار بکەین. ئیدی بەمجۆرە پارتیمان بۆ دانانی سنوورێك لەبەردەم بەزاندنی ماف و یاساکان و ژێر کەوتنیان لەمیانی سالانی 1980 ــ 1993 کەوتە پەرەپێدانی تەگبیر وەرگرتنی سیاسی و سەربازی، ئەوەش شەڕێکی دیکە بوو.

کەی دەتوانرێ مافەکان بە شێوەیەکی باش بخرێتە گەڕ؟ کاتێك تەگبیری سیاسی و سەربازی وەربگرێ و، کاتێك پارتی بخەینە رەوشێکی بەهێزەوە، ئیدی دوای ئەوە دەتوانین لەسەر بنەمای دەرخستنی کەموکوڕیەکان بنەماکانی رووبنکەینەوە. دەشتوانم بلێم لە مێژووی پارتیدا ئەمە بۆیەکەمین جارە کە دەتوانین لێپرسینەوە و دادگایەکی دروست ئەنجام بدەین. ئەمە قۆناخێکە کە پێویستە لێپرسینەوە و دادگایی کردنی تاوانەکان بە تایبەتیش تاوانکاریە نێوخۆییەکانی تێدا ئەنجام بدەین.

لەقۆناخەکانی پێشتردا، لێپرسینەوە و دادگاییەکانمان ناتەواو و سنووربەند بوو، هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکانی رەوتی پارتەکەمان لەخۆوە نەگرتبوو، هەربۆیە لێپرسینەوەکانیش هەموو راستیەکیان دەرخست و پشتیشیان بە هەندێ شێوازی ئەوتۆ دەبەست، کە نابێ پەنا ببەینەبەریان. بۆ نموونە؛ پێویستە لێپرسینەوە پشت بە ئەشکەنجەدان نەبەستێ، لەوانەیە هەندێ شێوازی فشار بەکاربهێنین، بەلام ئەشکەنجەدان نییە. چونکە ئەشکەنجەدان، لێپرسینەوە بەلاڕێدا دەبات لەڕەوشە یاساییەکەیدا و تاوانباری راستەقینەش دەشارێتەوە. ئەو جۆرە رەفتارانەی نا دروست و زانستی نین و خزمەتی رەفتاری هەوەسبازیانە دەکەن، شایانی رەخنە لێگرتنن. ئێمە دەبینین کە ئەم شێوازانەی لێپرسنەوە هی ئێمە نین، بەلام پێویستە چۆن بێ؟ پێویستە لێپرسینەوە زانستی بێت و پشت بە وردەکاری ببەستێ. بۆ ئەم مەبەستەش زۆر شیکردنەوەمان هەیە. ئەگەر رەفتارەکان بەپێی ئەم لێکدانەوانە بەراود بکرێن، ئەوا ناتوانرێ هەلەکان بشاردرێنەوە. ئەوانەی بەشێوەکی باش ئەم شیکردنەوانەیان تاوتوێ کردووە، باش لێی تێگەیشتوون، ئەوانە دەتوانن لێپرسینەوە و لێکۆلینەوەیەکی دروست ئەنجام بدەن. بەلام ئەوانەی کە لە رەوت و شیکردنەوەکانمان تێنەگەیشتوون، ئەو کەسانەن کە لێپرسینەوە و لێکۆلینەوەی نا دورستیان ئەنجام داوە و پەنایان بردۆتە بەر شێوازی توندوتیژی، ئەوەش بۆتە هۆی لەرێ لادانی لێکۆلینەوەکان. تەنانەت ویستوویانە شێوازەکانی دوژمنیش بەکاربهێنن و زیانی گەورەیان پێ گەیاندووین. بۆیە پاشان ناچاربووین رەدی ئیعتیبار بۆ

زۆر له ئەندامانی پارتیمان بگێڕینەوە، کەتووشی ئەم جۆرە رەفتارانە بوون، هەندێك لەوانە شەهیدیش بوون. چونکە لەوانەیە هەندێ لەو کەسانەی لێپرسینەوەکانیان ئەنجام داوە دوژمنیش بووبن. بۆ نموونە؛ هۆگر هەیە کە لەژێر پەردەی لێپرسینەوەدا گەورەترین تاوانی کردووە، هەروەها مەتینیش بەهەمان شێوە.

لەسەر ئاستی سەرتاپای بوار و گۆڕەپانەکاندا پراکتیکی ناوێزە خرابوونە گەڕ، تەنانەت شێوازی ئەوتۆ دەرهەق بە هەڤالان و کادیرانمان بەکاردەهێنرا کە نەدەبوو دەرهەق بە دوژمنانیش بەکار بهێنرێت. هەربۆیەش پێویستە ئەو کەسانەی ئەو کردارانەیان ئەنجام داوە بیانخەینە ژێر لێپرسینەوەوە. ئەوانەی لە ژێر دەمامکی لێپرسینەوەدا گەمەیان بە شێوازەکانی لێپرسینەوە کردووە، پێویستە بخرێنە ژێر لێپرسینەوە و لێکۆلینەوە. لەڕاستیدا لەئەنجامی ئەم کردارە چەوتانە هەزاران گەریلا و جەنگاوەرمان لە دەستداوە. ئاشکراشە ئەم پراکتیکانە هەر تەنیا مەبەستیان خودی کەسەکان نەبووە، بەڵکو دارایی و موڵکێکی زۆری پارتیشمان بەفیڕۆ چوو. دەتوانم رێچکە فراوانەکانی هەندێ لەکردارە کۆنەکان بێنمەوە یاد، وەك دیارە زۆر لەچەکەکانمان لە ئەنجامی تەگبیر وەرنەگرتنی پێویست ژەنگاوی بوون یان لەئەنجامی کەمتەرخەمی کەوتنە بەر دەستی دوژمن. خۆراکێکی زۆریشمان لە ئەنجامی کەمتەرخەمیەوە خراپبوون یان کەوتە دەست دوژمن. هەرچەندە بەئەندازەی سوپایەکی مەزن ئیمکانمان هەیە، کەچی ئەویش دیسان لە ئەنجامی کەمتەرخەمیەوە دووچاری خراپبوون بووە. هەرچیەکیان لەبەر دەستدابوو، هەموویان بەکارهێنا. ئەگەر ئەو کاتە یاسا و بڕیارێکی پارتی دەرهەق بەوە هەبوایە، ئەوا ئەمە روونەدەدا. جۆرە گوزەرانێکیان بەسەردا سەپاندین کە بەهیچ جۆرێك لەگەڵ ژیانی گەریلادا نەدەگونجا، بگرە سڵاوی بەیانیانیشان لەگەڵ هەڤالان نەدەکرد و ئەوەندەیان رەفتاری بەد رەوشتی کرد کە پێچەوانەی هەموو پرەنسیپێکی مافپەروەری و یاسایی بوون. ئەگەر ئێستا ئەو رەفتارانە هەڵبسەنگێنین، ئەوا دەبینین نەك هەر لەگەڵ مافەکاندا ناکۆکن، بەڵکو سنووری سەرتاپای ماف و یاساکانیان بە شێوەیەك بەزاندووە کە دوژمن نەیتوانیوە بەو شێوەیە بەسەرماندا بیسەپێنێ. کەچی چەند ساڵێك بەسەریدا سەپاندین. ئەمانەش هەمووی لە پەنای کۆمەڵێك هۆکارەوە ئەنجامدراون. ئەو کەسانەش کە ئەمە کرداریان بێ هەر تەواو لە تێگەیشتنی چەمکی حزبایەتی دوورن و هیچ هێزێکی لێکدانەوە و دەستپێشخەریان نییە

و بــه پرەنســيپە سياســی و ســەربازيەكان ئاشــنا نــين، بــەڵكو تــازه ئێمــه خــەريكی پەروەردەكردنيانين. ئـەو مافانـەی ئەوانـە دەيانخنـە گـەڕ، لەو مافانـە دەچـن كـە كـابرای قەرەج بەسەر باوكيا ساخی كردەوە، زۆرجار گوێبيستی ئەم پەندە بووين، كـابرای قـەرەج كاتێك كرديانە فەرمانڕەوا باوكی خۆی لە سێدارەدا. لای ئێمەش لێكۆڵەرەوەكان هەر ئـەم شـێوازەيان پـەيڕەو كـردووە. كـاتێ كـراوە بـە دادوەر هـاتووە فـەرمانی لـە سـێدارەدانی هەڤاڵەكەی خۆی داوە. ئێمە هەوڵ دەدەين كە ئەمجۆرە رووداوانە دووبارە نەبنەوە. بۆيـە گەيشتينە ئەو رەوشەش كە پێويستە ئەوانە يەكسەر لە قـەرەجێتی خۆيـان رزگـار بكـەن. كەسانی وا پان و پۆڕ هەن بانگەشەی ئەوە دەكەن كە رۆشنبير و لادێيـی و نـەرم و نيـانن، وەلـێ هيچيشـيان پـرەنسـيپەكان ناناسـن. چـونكە داگيركـەر بەدڕەوشـتی كـردوون و وای لێكردوون ئاشنای هيچ ياسا و رێسايەك نەبن، بەڵكو فێربوون كە چۆن بەشێوەيەكی بـاش چۆك دابـدەن. هـەر كـە دەرفەتيشـيان بـوو بـاوكی خۆيـان لەسـێدارە دەدەن و قـەيرانێكی گـەورەی مافپـەروەری دروسـت دەكـەن. زۆرمـان لـە شـوينەواری ئەمانـە بەسـەرەوە ديـارە، مافـەكان لـەژێر پـەردەی جێبەجێكردنيانـدا لـەكار دەخـرێن، بـەوەش دەمانخەنـە بـەردەم رەوشێكی مافپەروەری.

لەمێــژووی پارتيمانــدا دەبيــنين بەزانــدنی ســنووری پرەنســيپەكان بەبچـوكی سەريهەڵداوە و تا ئەمڕۆكە بەبەردەوامی لەگەورەبووندا بووە. هـاتوون خۆيـان خسـتۆتە شـوێنی پـارتی؛ هـەروەك يـەكێك لـە پيلانگێڕەكـان دەڵـێ: "هـەموو پياوێـك بەشـێوازی تايبەتی خۆی ماست دەخوات و هەركەسێكيش سەر بـە PKK بـێ بـەپێی زانـينی خـۆی ياساكان دەخاتە گەڕ"، ئەم هەڵوێستە نە دان بەهيچ پرەنسيپێكدا دەنێت، نە دان بە هيچ مافێكی نيشتمانی و حزبايەتی و سەربازيشدا دەنێ. ئەمە مانای ئيستغلال كردنـی ئـازادی دەگەيەنێ. بەواتايەكی ديكە وەك ئەوە وايە بڵێ "ئامادام من هێزم پەيدا كردووە، ئەوا بۆ منە".

لەكۆندا شا دەيگوت: " من ياسـام"، ئێمـەش كەسـانی وامـان هەيـە، هـەر كـە چـاوی كردەوە هێزی بينی، ئيدی يەكسەر وای لێهات بڵێـت "مـن پاشـام". ئـەمجۆرە كەسـايەتيانە لـەژێر كاريگـەری تونـدی توركـدان و نمونـەی زۆريشـيان لـێ سـەرهەڵدەدا. ئێمـە هـيچ زەحمەتيـەكيش نـايبنين لـە ناسـين و دەستنيشـانكردنی ئەوانـدا، بـەڵام داشـۆرينيان لـەو

کاریگەرییە، هەوڵدانێکی گەورەی PKKی پێویستە و لەسەر بنەمای ستراتیژی و تاکتیکی شەڕێکی بێ ئامان بۆ رزگار کردنی پارتی لە بەڵای ئەمانە، ئەو شەڕەی کە بەڕێوەی دەبەین شەڕێکە لەسەر ئاستی سیاسی و رێکخستندا خاوەن شارەزاییەکی باشە.

ئەوانە ئامانجیان ئەوەیە رێکخستنەکەمان والێ بکەن کە نەتوانێ لەبەردەم دوژمندا خۆی رابگرێ و سوپاکەشمان نەتوانێ شەڕ بکات. وەلێ ئەوانەی کە پرەنسیپەکانی شەڕی گەریلایان سەراوژێر کردووە دەبێ مەبەستیان چی بێ؟ ئایا بەو کردەوەیە دەیانەوێت بڵێن:"ئێوە ناتوانن هیچ هێزێك پێکەوە بنێن و یاسای تایبەت بە مافە گشتیەکانیش دابڕێژن". ئەوانەی کە پەیڕەوی بنەماکانی پێشەنگایەتی ناکەن دەیانەوێت بڵێن:"دەرکەوتنی PKK شتێکی سەرەتاییە و پەسند ناکرێ، بەڵکو پێویستە لەنێو ببردرێ. هەروەها ئەوەی کە پەسند بکرێ، هەر پێودانگەکانی مافە کۆلۆنیالیەکانی داگیرکەرانن". لەڕاستیدا بە راشکاوییەوە دەڵێن: "ژیانی سروشتی ئەوەیە کە نەریت و رەوشتە چەوساوەکان رەچاو دەکات و ژیانی PKK شتێکە لە تواناداا نییە کە بەرگەی بگری و پەسەندی بکەی"، ئەم هێرشانەش لە سێ لاوە ئاراستەمان دەکرێن، لایەنی دوژمن گەورەترینیانە. دەشتوانین رووبەڕووی بوەستین و بەپیلانی گونجاو سنوورێکی بۆ دابنێین. بەڵام ئەی لایەنی بەرەی نێوخۆییمان؟ چی لەوە بکەین کە لەکەسێکدا رەنگدەداتەوە و لەنێوماندا، نازانێ ماف و پرەنسیپەکانی رێکخستن چین و، نازانێ بەرگریشیان لێبکات. هەروەها کۆمیتە و یەکە و نمایندەکانیش ناناسێ و لەماناکانیان تێناگات، تا بتوانێ پەیڕەوییان بکات. خۆ ئەگەر بشیان ناسێ ئەوا ئەو هێزەی نییە کە لەواری کرداریدا پراکتیزەیان بکات، چونکە ئەو تا بتوانێ بنەمای کۆمیتەکان جێبەجێ ناکات. دەبێ بە شەڕ و ئامانجەکانەوە پەیگیر بێ، بەڵام ئەو مرۆڤەی کە ئاستی پەیگیربوونی بە ئامانجەکانەوە لاواز بێت، مەشقکردنی تێگەیشتنی لاواز بێت، چۆن دەتوانێت بەرگری لەو هەڵوێست و یاسایانە بکات، کە تەنانەت نازانێ چۆن و کێ دایان دەنێت و چۆن سنووری پرەنسیپەکانیش دەبەزێنێ و دەتوانێت رووبەڕووی ئەوانە ببێتەوە کە ئەو یاسا و پرەنسیپانە پێشێل دەکەن.

لەهەموو ئەو راپۆرتانەی کە دەگاتە دەستمان ئەو شتانە هاتوونەتە زمان. بەڵام یەکێك لەوانە دەڵێت: ئەو شتەم دەدەی بەڵام نەمدەزانی چۆن بەرەنگاری ببمەوە، لەبەرئەوە پانام بۆ سازشکاری برد. ئەوەش هەمووی مانای بەشداربوونە لە خەتا.

بۆئەوەی سنوورێك بۆ ئەو رووداوانە دابنێین پەنا دەبەینە بەر گۆنگرەكان، ئێمە یاسا سەرەكیەكانی چۆنیەتی داخورانی پێشەنگایەتی و چۆنیەتی بەفیرۆدانی تواناكاریەكانی گەریلابوون روون دەكەینەوە. گەلێك كەس هەن حەز ناكەن بیر لەو شتە بكەنەوە، بەلاّم ئێمە ئەو شتە پەسند ناكەین و بۆئەوەی ئەو بابەتانە چارەسەر بكەین خەبات دەكەین. ئەوانەی كە كارەكانی خۆیان جارێكی دیكە لەبەرچاو ناگرن لەوانەیە ببن بە هەموو شتێك، بەلاّم نابن بە شۆڕشگێڕ. ئەو كەسەی كە لەڕەوشی شەڕدا لەخۆی ناپرسێ، ئایا ئەركی من چییە؟ و چۆن جێبەجێم كرد و تا چ رادەیەك بەیاسا و رێساكانەوە پەیگیر بووم. ئەوا ئەو كەسە ناتوانێت ببێت بەئەندامێكی PKK و ناشتوانێت پاساوی كارەكانی خۆی بداتەوە، بەڵكو دووچاری لێكۆڵینەوە و لێپرسینەوە دەبن و بە گرانترین سزا حوكم دەدرێن.

## بناخەكانی پراكتیزەكردنی ئاستی ئەو دادوەریەی كە PKK پێی گەیشتووە

ئێستا ئێمە بە رەوشێك گەیشتووین كە بتوانین هەموو ئەو شتانە ببینین، بەڵكو لە ئاستێكداین كە بتوانین لێپرسینەوە و لێكۆڵینەوە ئەنجام بدەین. با كەس نەڵێت من لەناو پارتیدا خاوەنی بەساڵان ئەزموونم و دەبێ لێكۆڵینەوەم لەگەڵدا نەكەن. باوەڕیەكی تەواوم هەیە كە ئەم قۆناخە لەهەموو قۆناخەكان زیاتر پێویستی بە لێكۆڵینەوە و دادوەری هەیە.

بەشێوەیەكی گشتی گەلەكەمان گەیشتۆتە قۆناخێك كە دەتوانێ بڵێ: ئەوەی دەیەوێت بمرێ با بمرێ، ئەوەی ژیانیشی دەوێت با بژی. گەل لۆژیكی شەڕ بەكاردەهێنێت و بەگوێرەی ئەوەش بڕیاری خۆی دەدات. بەلاّم دەبینین لەناو پارتیدا هەندێك هەن لەبەردەم پێشكەتنەكان و دادوەری و مافدا ئاستەنگی دروست دەكەن. ئەمەش لەكاتێكدا كە ئەوانە لەڕەوشێكی وەهادان كە دەبوو ئەو یاسا و پرەنسیپانە جێبەجێ بكەن و سەقامگیری بكەن.

گەلێك خەتاو کەموکوڕی هەمەلایەنە هەن، هەندێك کەس بە ئاشکرایی گەمە بە ڕێبازی پارتی دەکەن. ئەگەر لەترسی ئێمە نەبوایە، ئەوا وەکو دز بێ شەرەفی خۆیان بەسەر هەمووان‌دا دەسەپاند. هەر ئەوەیە کە هەموو بەهایەك بە هەدەر دەدات و خۆی لە بەر پرسیارێتی دەزێتەوە و دەیخاتە ئەسۆتی یەکێکیتر، ئەگەر بەدڵسۆزیەوە هەوڵ بدات، ئەوا دەتوانێت گەلێك ئەفسانە بخولقێنێ. بەڵام لەجیاتی ئەوە تەنانەت بیر لەوە ناکاتەوە کە چۆن خۆی بژێنێتەوە. سەرەڕای ئەمانەش دەیەوێت خۆی دەربخاتە پێش و مەزن بکات. ئەمە لەکاتێکدا تەنها یەك هەڤاڵیشی قازانج نەکردووە و بچوکترین ئیجرائاتیشی نەکردووە بۆ ئەوەی بەهایەك یان تواناکاریەك رزگار بکات، تەنانەت بیریشی لەمە نەکردۆتەوە.

لەو باوەڕەدام باشترین کار کە لەکۆنگرەی پێنجەمدا پێی هەڵسین، ئەو دادگایی کردنەیە، چونکە بنەما ستراتیژیەکانی پارتی راست و پتەون. ئەگەر هەر بڕیارێکیش وەربگرین، ئەوا لەڕووی سەربازی و سیاسیەوە دووچاری گرفت نابین. ئەو کێشانە روونی و ئاشکرایی بەخۆیانەوە دەگرن. دابەشکردنی ئەرکەکان بە شێوەیەکی راست و کاری پێویست، بەهەموو وردەکاریەکانیەوە ئاشکران. بۆ ئەمەش تەنیا رەوشی رێکخستن دەمێنێ و بۆ وەرگرتنی ئەو جۆرە ئیجرائاتانەش کۆنگرە دووچاری هیچ ئاستەنگیەك نایەت.

کێشەکە هەرتەنیا دادگاییکردن نییە، بەڵکو کۆنگرەی پێنجەم دەبێتە کۆنگرەی دادگاییکردن. لێرەدا مەبەست چەند کەسایەتیەك نییە، بەڵکو دادگاییکردن هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە دەرهەقی گەریلا و پێشەنگەکەی هەڵەیان کردووە. تەنیا دادگاییکردن نابێت، بەڵکو هەروەك چۆن گەلەکەمان دادگاییەکی مێژووییانە بەڕێوە دەبات، ئێمەش بیست ساڵی تەمەنی PKK دادگایی دەکەین. بەو شێوەیە ئەوەی شایەنی مانەوەیە بابمینێتەوە. منیش یەکێکم لەوانە، پێویستە لەسەر هەموو کەموکوڕیەکانم لێم بپرسرێتەوە، بەتایبەتی لەسەر لایەنە دواکەوتووەکانی کەسایەتیم. منێك کە بە شێوەیەکی بێ وێنە لە مێژوودا بەرەنگاری کۆنەپەرستی گەورە دەبمەوە، ئیتر چۆن دەبێ نەتوانم شەڕی لایەنە کۆنەپەرستیەکان و ئەو کەموکوڕیانەی کە لەکەسایەتیمدا هەیە بکەم؟ بۆچی دادگاییان نەکەم؟ بۆچی خەباتێکی مەزنتر بەڕێوە نەبەم؟ کاتێ من ڕووبەڕووی خۆم دەبمەوە و بەو شێوەیە لەخۆم دەپرسمەوە، ئەوا ئەو شیواز و هەڵوێستە

لەسەر هەموو ئەندامانی پارتی پیادە دەکەین. با هەموو کەسیش ئەوە بزانێ، چونکە مێژوو فەرمانی ئەوەمان پێدەدات کە ئەو هەڵوێستە وەربگرین. مێژوو ئەڵێ: "ئەی گەلی کورد ئایا لەخۆت پرسیوەتەوە؟ بەسە ئەو نەفرەت و سەرشۆڕییەی تێیدا دەژیت؟ هەستە و لەخۆت بپرسە و لەپێناو ئەو لێپرسینەوەیەشدا راپەڕە" و، مێژوو بە پێشەنگی ئەو گەلە دەبێت کە دەڵێت:"ئەی رێکخستن هەموو ئەو کەموکورِیانەی کە گەلەکەت دەرهەقی خۆی دەیکرد، تۆش دووبارەی دەکەیتەوە، بۆیە خۆت دادگایی بکە".

ئەرکی من ئەوەیە کە لەپێناوی سازکردن و ئەو دادگاییە مێژووییانە هەموو تواناکاریەکان بخەمە کار. لەو باوەڕەدام کە لەڕابردوودا لەچوارچێوەی ئەو دادگایانە گەورەترین پەرەسەندن بەخۆمانەوە دەبینین. ئێمە پێویستمان بە قوربانیدان و مەردایەتی و ئازایەتی نییە، چونکە ئەوانە لەلای ئێمە زۆرن، بەڵکو پێویستمان بە جێبەجێکردنی پرەنسیپەکان و رەوشتێکی راست و دروست و دەرخستنی ئەو هێزە هەیە کە ئەو پرەنسیپانە دەپارێزێت و بەرگریان لێدەکات. واتا پاراستنی مافەکانی رێکخستنی ناوخۆ، یاساکانی گەریلا و پەیڕەو کردنیان لەسەر بناخەی تاکتیکە رۆژانەییەکان و پەیوەست پێیانەوە، هەروەها پەیگیرکردن بە بنەماکانی رێکخستن و کاری بەکۆمەڵ (هەرەوەزی) و هەر کۆمیتە و نوێنەرایەتیەك و یەکەیەکی سەربازی و فەرمانداریێتیەکەی مافی خۆیان بدرێتێ و، ئەو یەکە سەربازیانە وایان لێبکرێت کە بە شێوەیەکی راست و دروست شەڕ بکەن. هەروەها دەبێ لەخۆمان بپرسین ئایا ئەو ئەرکەمان ئەنجامداوە یان نا؟ بۆچی کەسێك بەدرێژایی مێژوو ئەو کارانەی جێبەجێی نەکردووە؟، دەرەنجامەکانی ئەوەش چی بوو؟ و کێ یاساکانی پێشێل کردووە و لە چ گۆڕەپانێکدا و رادەی ئەو پێشێلکاریەش چەندە؟ ئەو پرسیارانە زیاتر فراوانی دەکەینەوە و بەرو پێشەوەیان دەبەین. هەروەها لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوە فراوانتر دەبێت و ئەمەش وادەکات کە ببێتە لێپرسینەوەیەکی خۆیی سەرسوورهێنەرانە.

ئەو لێپرسینەوانەی کە تا ئێستاکە کردوومانە، لێپرسینەوەی سەمبۆلی بوون، رەنگە تەنها بۆ ئاگادارکردنەوە بووبن، بەڵام دادگایی کردنی تەواوەتی و ریشەییانە لە کۆنگرەی داهاتوودا دەبێت (مەبەست کۆنگرەی پێنجەمی PKK یە).

ئەگەر سەرنج بدەین نزیکەی ساڵێکە ئێمە بەهەر شێوەیەك بووبێت یان جاری وا هەبووە بە روون و ئاشکرایی لە شیکردنەوەکانماندا باسی دادگاکانمان کردووە.

هەروەها شیکردنەوەکان گرێکوێرەی هەڵەکانیان نزیکی چارەسەری کردۆتەوە و جەختمان لەسەر ئەوە کردەوە کە شیکردنەوەکان بەشێکی گرێکوێرەی هەڵە تێکچڕژاوەکانی کردۆتەوە. وەکو تاوانبار و بێ تاوان هەق و ناهەق سەرکەوتوو لەگەڵ ژێر کەوتوودا هەموویان تێکچڕژاو بوون و ئەو گرێکوێرەیان دروست کردبوو. لەهەمانکاتدا کردنەوەی ئەو گرێکوێرەیە بریتییە لەدانانی بنەماکانی بەرەو پێشچوونی دادوەری و گەیشتنی مرۆڤی ئێمە بەو هێزەی کە بتوانێت پەنا بباتە بەر دادوەری و لەخۆی بپرسێتەوە. هەروەها دەتوانین لێپرسینەوە لەگەڵ دوژمنیش بکەین و ئەمەش پەرەسەندنێکی سروشتی نییە.

ئەو مرۆڤەی لێپرسینەوە لەگەڵ خۆی نەکات، هەروەها ئەو رێکخستنەی لێپرسینەوە لەگەڵ خۆی نەکات، ئەوا ناتوانێت لێپرسینەوە لەگەڵ دوژمنانی بکات و سەربکەوێت بەسەریاندا. لەبەر ئەوەش ئەو دادگاییانەی کە پەرەیان پێدەدەین و بەرەو پێشەوەیان دەبەین، مەرجی پێویستیش بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن، پاککردنەوەی رێکخستنەکەمانە. واتا هەموو شانە و نوێنەرایەتی و پەیوەندییەکانی ژێر و ژوور وایکرد کە سەرکەوتووانە بەو دادگایی کردنەدا تێبپەڕن. نەك تەنها بە ئاخافتن و دادگاییکردنی رووکەشانە؛ بەڵکو بە شێوەی راستەقینە، ئەوا دەتوانین بڵێین بەو کارە مەرجی بنەڕەتیانەی سەرکەوتنمان هێناوەتە دی. بە مەرجێك ئەو دادگاییکردنە هەموو کەسایەتییەکان و لایەنی ویژدان و هەڵسوکەوتی هەڤاڵانمان لەبەرامبەر گەل و کۆمەڵگا و مێژوو بگرێتەوە، تاوەکو لاپەڕەکانی سپی ببنەوە. ئەمەش بە پەیوەستبوون و تێگەیشتن لە یاسا و رێساکان لەسەر ئاستی ستراتیژی و تاکتیکی رۆژانەدا، یاخود لە رەوشت و هەڵسوکەوتی تاکدا هەر لەشێوەی خواردن و خواردنەوەیان بگرە تا دەگاتە بنەماکانی شەڕی دژوار. ئەمانەش هەمووی ئاستی تێگەیشتن و خاوەن دەرکەوتن و پەیڕەوکردنی سات بە ساتی ئەو بنەمایانە دەگەیەنێت. کاتێك بەو رەنگە بین، ئەو کاتە مەرجی پێویست و بنەڕەتیانەی سەرکەوتنمان بەدیهێناوە و ئەو ئەرکەی دەکەوێتە سەر شانمان جێبەجێمان کردووە، ئەوکاتە جگە لە سەرکەوتن ناتوانرێت بیر لە شتێکی دیکە بکرێتەوە.

ئایا دەتوانین بگەینە ئەو ڕەوشە؟ ئەمەش پێویستی بە شەڕ و پەروەردە و تێکۆشان و پاراستنی ژێرخانی بەهێزی ڕێکخستن هەیە. هەروەها دەبێ پارێزگاری لەهەموو ئەو ئاستانە بکرێت کە پارتی پێی گەیشتووە، ئەو ڕەوشەش دەرەنجامی ڕێکخستنێکە کە دەزانێت لەهەموو پێگەکانیدا جێگە بگرێت و بیانپارێزێ.

بەڵام ئەو قۆناخانەی کە ئەو داداگاییانەی تێدا ئەنجام دەدرێت، ئەو قۆناخانەن کە پارتی کۆنتڕۆڵی بە سەریاندا هەیە. لێرەدا مەترسی هەبێت ئەوا ناتوانین دادگاییەکی سەرتاسەری ئەنجام بدەین. ئەگەر گەل ڕووبەڕووی کوشتارێکی گشتی و ڕەوشێکی دژوار ببێتەوە و ڕێکخستن لە تەنگژەدا بێت و لە هەوڵی خۆدەربازکردن دا بێت، ئەو کاتە ناتوانێ دادگاییەکی تەواو و ریشەییانە سازبکرێت. ئەمانەش ئەو هۆیانەن دەکەونە پاڵ ئەوەی کە تائێستا بە دادگاییکردنێکی بەو جۆرە هەڵنەستاوین.

کاتێك پەرە بەدادگا و دادوەری دەدەین و دەیکەن بە شێوەیەکی هەمەلایەنە شانبەشانی ئەوەش چارەسەری و ئاواکردن پەرە دەسێنێ. پێویستە پێش هەموو شتێك ئەوە بزانن کە ئێمە مێژوو دادگایی دەکەین. ئێوە باش دەزانن کە شتێکتان بۆ هێز و تواناکاریەکانمان زێدە نەکردووە، زێدەنەکردنی هێز و تواناکاریش خۆی لەخۆیدا خەتایەکی گەورەیە. ئێوە بوونە هۆی لەدەستچوونی سەدان هەڤاڵ کە لەژێر فەرمانی ئێوەدا بوون. هەروەها تواناکاریەکی مەزن خرابووە بەردەستتان، بەڵام بە فیڕۆتاندا. بۆچی ئەوشتانە بەتاوانێکی گەورە نابینن؟ مەرج نییە نیازی ئێوە خراپ بێ. نەگەیشتن بە ئازادی و بەدیهێنانی، هەڵەیەکی گەورەیە. دەرنەچوون، کەوتنە. لەدووتوێی ئەمەشدا تاوانێك لەتاوانەکان خۆی حەشارداوە. کۆیلایەتیش تاوانێکی دیکەیە. بۆچی دەمانەوێت دادگاییەکی بنەڕەتیانە سازبکەین؟ باکەس نەڵێت: مەبەستی من ئەوە نەبوو، تواناکاریەکان کەم بوو، هەرچیەکم پێکرا کردم و زیاترم لەدەست نەدەهات. ئەم قسانە خۆپاراستنێکی هەرزانن. لەوانەیە هەندێك لەئێوە بخوازن خۆیان بپارێزن، پێویستە خۆپاراستنی ئێوە بەمرەنگە نەبێت، چونکە ئەمجۆرە خۆپاراستنانە جێی متمانە نین. لەوانەیە بتوانن لە ڕێگای ئەمجۆرە قسانەوە ڕەوشی خۆتان ئاشکرا بکەن، بەڵام هەرگیز خۆپاراستن بەو شیوەیە نابێت. بەڵکو ئەمجۆرە خۆپاراستنە خۆی لەخۆیدا پێداگرتنە لەسەر هەڵوێستە کۆنەکانتان. بەمەش مەترسی دووبارەبوونەوەی هەڵەکانتان

دەردەکەوێت. هەموو ئەو پاراستنانەی کە پێشتر بینیومن لەو چوارچێوەدا بوون، ئەمەش بەس نییە.

منیش هەوڵ دەدەم خۆم بپارێزم، بەڵام بە شێوەیەکیتر، بەبەردەوامی هەوڵ دەدەم کە ئەو کەموکوڕیانەی کە تێیکەوتم چاکیان بکەمەوە یان پارسەنگیان بدەمەوە. ئەگەر لەلایەنی پەروەردەوە کەموکوڕی هەبێ، هەمووتان دەبینن چۆن خۆم پەروەردە دەکەم، ئەگەر ورەو مەعنەویات کەمە، دەبینن چۆن پەرە بەو ورەو مەعنەویاتە دەدەم. ئێوەش تێبینی ئەوە بکەن، ئەگەر لەلایەنێکدا کەموکوڕیم هەبێ هەوڵدەدەم پارسەنگی ئەوە بدەمەوە. ئەگەر پێویست بێت وەرو مەعنەویاتی گەل بڵند دەکەم. واتا من ئەو ئەرکانە پێك دەهێنم کە پێویستە کەسایەتیەکی سەرۆکایەتی بیکات. هەوڵ دەدەم بێ سنوور هەموو هێز و توانایەکی خۆم بخەمە گەڕ، راوەستانم لەسەر کەموکوڕیەکانی سەرۆکایەتی مێژوویی و تایبەتمەندیەکانی لەسەر ئەم بناخەیە بووە. ئێوەش دەزانن کە لەسەرەتادا بەبێ پشتگیری و هاوکاری هیچ کەسێك و، لەهیچەوە دەستم پێکرد، تەنانەت ئەوانەی کە بۆ ساڵانێکی دوور و درێژ لەگەڵمدا بوون، نەیاندەتوانی هەنگاوی پێشکەوتووانە بهاوێژن، چونکە ئەو هێزەیان تێدا نەبوو. بەڵێ لەو قۆناخەوە گەیشتینە ئێرە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تائێستاش بەدوای ئەوەدا دەگەرێم کەچۆن ببم بەسەرۆکایەتیەکی سەرکەوتوو. لەسەر ئەوەش لەخۆم دەپرسمەوە، ژیانم هەمووی بەخۆ دادگاییکردنێکی بێبەزەییانە دەبەمەسەر. ئەمەش داداگاییکردنێکی راستەقینەیە، بۆچی؟ چونکە ئەنجامەکانی ئەو دادگایی کردنە خزمەتی رزگاری نیشتمانی و رێکخستن و گەریلا دەکات. سەرکەوتنێکە بۆ هەموومانە، سەرکەوتنێکە بۆ PKK و هەموو ئەو لایەنانەی کە پەیوەنیان بە PKKوە هەیە.

ئێوەش کاتێك بەرەنگاری دادگایی و خۆپاراستن دەبنەوە، پێویستە لەسەر بناخەی سەرکەوتن دادگایی بکرێن، ئەگەر نا ئەوا خۆپاراستن راستگۆیانە نابێت و هیچ سوودێکیشی نابێت. ئەوانەی کە بەو شێوەیە خۆیان دەپارێزن، لەوانە زیاتر دووچاری سزا دێن کە لەسەر هەڵەکانیان پێدا دەگرن. لەوانەیە لەکاتی خۆپاراستندا داوای هەڵێکی دیکە بکەن بۆ خۆچاککردنەوە. ئەو دەرفەتی بەخۆچاککردنەی کە داوای دەکەن پێویستە لەسەر بناخەیەکی دورست هەڵی بسەنگێنن، ئەوەش گرێدراوە بەو هەلەی کە داوای دەکەن. بۆ نمونە: گریمان تۆ بەرپرسیاری گروپێکی گەریلای بەڵام بەشێوەیەکی باش ئەو

گروپەت پەروەردە نەکرد، یان لەجێگایەکی گونجاودا گروپەکەت جێگیر نەکرد و پێویستەکانت ئامادە نەکرد، چالاکییەکانیت بە شێوەیەکی باش ڕێك نەخست...هتد و گەلێك کەموکوڕی دیکە کە دژی ڕێسا سەرەکیەکانی گەریلایە و، یاسا و ڕێساکانی گەریلاییت بەشێوەیەکی باش پەیڕەو نەکرد، ئەوا لەم ڕەوشەدا ئەو خۆپاراستنەی کە دەبێ بیکەی، دەبێ لەسەر بناخەی لابردن و نەهێشتنی ئەو کەموکوڕیانە بێت. تەنیا بەم شێوەیە دەتوانی خۆت بپارێزی، خۆپاراستنی ڕاست و دروستیش هەر بەم ڕەنگە دەبێت. ئەگەر ئەمەت کرد ئەوکاتە دەتوانی سەربکەوی. ئەگەر کەموکوڕی دیکەش دەربکەوێت دیسان دەتوانی لەکاتی خۆیدا نەیان هێڵی. ئەم شێوازەی خۆپاراستن پەسند دەکرێ و ئەو کاتە دەتوانرێ هەلێکی دیکەت بدرێتێ. ئەگەر توانیت ئەو دەرفەتە بەسەرکەوتووانە بەکار بهێنیت، ئەوا لێبووردن بەدەست دەهێنیت. واتا ڕەوشی تاوانباری دەرباز دەکەیت و دەگەڕێیتەوە ڕەوشی سروشتی ئەندامێتی پارتی، بەڵام ئەگەر پاساو و بڕوبیانوو بهێنیتەوە، ئەو کاتە خەتاکانت دووقات دەبنەوە و بەگوێرەی ئەوەش سزا دەدرێیت. هەندێك خەتا هەن کە زیاتر لەسەد جار دووبارە بوونەتەوە، ئەگەر کەسێکی دوای سزادان جارێکی دیکەش ئەو خەتایانە دووبارە بکاتەوە، ئەوا ناتوانێ بیر لە ڕزگارکردنی ئەو کەسە بکەینەوە، بەڵکو سزادانی ئەوە دەبێتە شتێکی حەتمی.

بەروون و ئاشکرایی پێتان ئەڵێم پێویستە لەسەر تایبەتمەندیە ژەنگگرتووەکانتان دادگایی بکرێن. ئەو تایبەتمەندیانەی کە لەقۆناخێکی مێژوویی وەك ئێستادا تاوانێکە، بۆیە پێویستە هەریەك خۆی دادگایی بکات. ئەمەش هەوڵدانێکی باشە بۆئەوەی خۆمان ڕاست بکەینەوە. من هەموو ڕۆژێك لەخۆم دەپرسمەوە، پێویستە ئێوەش هەمان ڕێگا بگرنە بەر. با هیچ کەسێك نەڵێ هەڵەم بەئەنقەست نەکردووە، کەس ناتوانێت بەدیماگوجیەت و بە ڕێگای پێچ و پەنا ڕاستییەکان بگۆڕێ، ئێمە دەمانەوێ شایستەی مێژوو و گەل بین. پێش هەموو شتێك دەمانەوێ شایستەی ئێوە بین، دەمانەوێ ڕێزی خۆمان بگرین و بە باشترین شێوە ئەرکەکانمان جێبەجێ بکەین. باوەڕ ناکەم لە خۆرزگارکردن لەکەموکوڕیەکانتان و بوونتان بە کادیرێکی ڕێکوپێك و خاوەن ڕێز بەولاوە شتێکی باشتر هەبێت کە شایستەی ئێوە بێت. بۆچی دەتانەوێت بەدیماگوجیەت و گریان و فرتوفێڵ ڕێگا لەبەردەم ئەم شتە بگرن و کەموکوڕیەکانتان داپۆشن. ئایا چ

سوودێك لەوە دەبینین؟ ئایا زەحمەتە لەلایەنی شێوە و ناوەڕۆکەوە ببین بە کەساییەتیەکی پەیوەست بەپێودانگ و ڕێساکانی پارتی؟ بە ئاشکرا پێتان ئەڵێم ئەگەر من هەڵەم ئاگادارم بکەنەوە، ئێمە لە دەرکردنی ئەم بڕیارە لەڕوویی مێژوویی و بارودۆخ و ئەو هەلومەرجەی کە گەلەکەمان تێدایە، لەرووی راستی ڕێکخستنەوە هەموو شتێکمان لەبەرچاو گرتووە. ئەگەر ئەم شتانە راستن ئەوا دەبێ پێیانەوە پەیگیر بین. بەڵام ئەگەر بڵێی من خۆ پەرستم.. بەرپرسیارم... خاوەن نفوزم... هتد ئەوە پەسند ناکرێ. لێرەدا هیچ کەسێك بەرپرسیار و خاوەن نفوز نییە، تەنانەت ئەو شتە خودی منیش دەگرێتەوە. نفوز، (صلاحیات)، هێزی پەیگیربوون بە ڕێساکان و بەکارهێنانی ئەمانە هەموویان ئەو هێزەن کە سەرکەوتن دابین دەکەن. کێ دەتوانێ لە دەرەوە خاوەن نفوز بێ؟ ئەگەر بڵێن ئەوەیان هەڤاڵێکی کۆنە و ناو و ناوبانگی هەیە، دەبێخاوەن پلەیەکی جیازوازبێ. ئێمەش دەڵێین کۆنبوون بەو سەرکەوتنانە دەپێودرێ کە بەدەستی هێناون. ئەگەر کارێکی شایستە و مێژوویی کردووە یان چالاکیەکی گەورەی لەدژی دوژمن ئەنجام داوە، ئەگەر توانیویەتی لە بەرامبەر دوژمن سوپایەکی گەورە دروست بکات، ئەگەر شتێکی بەمرەنگە بکات ئەو کاتە ناو و ناوبانگی لەسەر ئەو بناخەیە دروست دەبێت. زۆر کەس دەناسم کە بەهۆی هەڵکێشانی دوژمنەوە بەناوبانگ بوون. بێگومان دوژمن ئەمە دەکات بۆ ئەوەی بەگوێرەی حیساباتی خۆی کەسایەتیەك بە گوێرەی خۆی ئاوابکات. ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی کە ئەوانە ببن بە دکتاتۆر و ئەو ناوبانگانەی خۆیان وەکو شمشێری دیمۆقلیتس لەدژی ئێمە بەکاربهێنن. ئێمەش بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم کەسانە تەگبیری خۆمان وەرگرتووە. هەندێك وا دەزانن کە پەیوەست نەبوون بە یاسا و ڕێساکانی ڕێکخستن و رەوشتی پارتییەوە، مانای هێز و پیاوەتی دەگەیەنێ. بێگومان ئەوانە بەبەردەوامی ڕێساکان دووچاری داخوران دەکەن و دەیانەوێت هەڵسوکەوتەکانی خۆیان بەسەرماندا بسەپێنن. هەروەها دەیانەوێت بەشێوەیەکی جیاواز و شەخسی لێیان نزیك ببینەوە.

من دەمەوێ ئێوە تێبگەن، بەتایبەتیش مەبەستی تەواوەتیم ئەوانە دەگرێتەوە کە ئەندامی سەرکردایەتین و بەپرسیارێتی دەزگا جۆربەجۆرەکانی پارتیان گرتۆتە دەست. دەبێ بزانن ئەو دادگایی کردنە چ واتایەکی هەیە و، ئەوەش بەتەواوەتی لەسەر خۆیان پەیرە بکەن. دەبێ بزانن بەگریکردن چۆن دەبێت. ئەوەش بەباشی تێبگەن و، هەروەها دەبێ بزانن ئەو شتانە چین کە بنەماکانی ریکخستنیان لەسەر ئاوادەکرێت؟ ڕێگایەکی

دروستتان نیشان دەدەین بۆ هەنگاونان. بۆیە پێویست بە ترس و دڵەڕاوکێ ناکات. تەنانەت ئەگەر زەرەر و زیانیشتان لێمان دابێ دیسان هەلێکی دیکەتان دەدەینێ بۆ خۆ راستکردنەوە. بەڵام بەشێوەیەکی گەنجاو ئەو دەرفەتە بەکار بهێنن و هەوڵبدەن جارێکی دیکە نەگەڕێنەوە بۆ سەر ئەو کارە ناتەواو و بێ سوودانەی کە هیچ یاسا و بنەمایەك لەخۆوە ناگرن، جگە لە تاکڕەوی و خۆ سەپاندن و هەرەسێکی بێ سنوور نەبێ. بۆیە دەبێ بەتاکڕەوی و ئارەزووەکانی خۆتان نێو ریزەکانمان لێڵ نەکەن.

ئەگەر لەسەر ئەو خووانە بەردەوام و سووربن ئەوا بەشی خۆتان وەردەگرن و فڕێ دەدرێنە دەرەوە. چونکە ئەو گەلە بەرگری لەخۆی دەکات بەهەمان شێوەش ئەم رێکخستنە بەرگری لەخۆی دەکات. ئەم رێکخستنە پێشەنگەش لەبەرامبەر کارە خراپ و ناتەواوەکان و سووربوون لەسەر خۆ و راستنەکردنەوە بەرگری لەخۆی دەکات و خۆی دەپارێزێ. بێگومان دەبێ باش بزانن ئەو بەرگرییە سەرکەوتوو دەبێت. ئەگەر پێویستیتان بە پەروەردە بوو، پەروەردە ببینن، ئەگەر وا دەزانن پێویستیتان بە پشتگیری هەیە، یارمەتیتان دەدەین. بەڵام ئێوەش لێمان تێبگەن. چونکە بنەماکانی ئەو رێکخستنە بەخوێنی ژمارەیەکی زۆری شەهیدان ئاودراوە، تۆش لەمە تێبگە، مێژوو داوای ئەوەمان لێدەکات و پێویستە بەپیریەوە بچین. ئەو زیانەی کە تائێستا بەخۆمان گەیاندووە بەسە.

هەروەها دەمانەوێ بناخەی ژیانێکی ئازاد بەپێی یاسا و رێساکان دابرێژین، بۆئەوەش بەرەو ئاژاوە و گێروگرفتمان ئاراستە مەکەن و دەست لەو تایبەتمەندییە تێکدەرەی خۆتان بەربدەن. چونکە ئەوانە کردەوەی مرۆڤی ئاقڵمەند نیین. دەمەوێ بە روون و ئاشکراییەوە پێتان بڵێم هەر وشەیەك ئەگەر لەشوێنی خۆیدا نەگوترێت ئەوا تێکدانە، یاخود هەر هەنگاوێك لەجێی خۆیدا نەبێ ئەوا پێچەوانەی تاکتیك دەوەستێت. کەواتە بۆچی من لەشوێنی خۆیدا هێزی ئاخافتن لەبەرامبەر ئێوەدا بەکار دەهێنم؟ بۆئەوەی لەگەڵ پرەنیپیەکاندا یەك بگرمەوە و بەبنەمای بگرم و، بگەمە ئەو شتەی کە ئەو بنەما و پرەنسیپانە داوای دەکەن. بۆئەوەی هێزی چارەسەری لەجێی خۆیدا بەکاربهێنم، لەژیانی رۆژانەدا بەبەردەوامی پەیڕەوی هەمان سیستەم دەکەم؟ بۆئەوەی بە تاکتیکەوە پەیوەست بم کێ دەتوانێ جیاواز بێت لەگەڵ ئەوە؟ کێ دەتوانێ

بەرپرسیاریتی گەورەتر هەلگریت؟ کێ دەتوانێ خۆی بسەپێنێت؟ ئەو ئاخافتنەیان زۆر دووبارە دەکردەوە و دەیانگوت:"وامان دەزانی ئێمە دەسەلاتدارین" بەرپرسیاری ناوچەیەکە وا دەزانێ بەرپرسیارێکی بچووکە، یان خۆی لەشوێنی ئاغا دادەنێ، ئایا شەرم لەخۆتان ناکەن؟ تا ئێستا ئێمە بیر لەوە دەکەینەوە چۆن سەری خۆمان رزگار بکەین و ئەوەش بەئەرکی یەکەمین دەزانین. هەرچیەکی هەمان بووە ختوومانەتە گەڕ، تەنها بۆئەوەی دووچاری لەناوچوون نەبین. لەکاتێکدا تائێستا ئێمە بیر لەوە دەکەینەوە کە چۆن رزگارت بکەین. هەندێك خۆت بناسە و ڕێز لە ژیان و ڕاستیەکان بگرە، وا بەپەلە ئاشقی دەسەلات مەبە، تۆ تا ئێستا نازانیت بەڕێوە بچیت و خۆشت بە دەسەلاتدار دەزانی، بەلایەنی کەمەوە ئەمجارەیان وەرەوە سەر خۆت. ئێوە بارێکم دەخەنە سەر نازانم چۆن هەلێبگرم، هەموو ئەو یاسا و ڕێسیانەش پێشێل دەکات و چاپۆشی لەو هەموو راستیانە دەکات، ئەو کات چۆن رزگاری بکەم؟ ئەو هەموو ناتەواوی و کەموکوڕیەی لە ئسلوب (شێواز)دا هەیە، هەرکەس دەیەوێ ببێتە ئاغا، ئەوە خۆی لەخۆیدا ژیانێکی کۆنی کوردانە و، هەرکەس وا دەزانێ کوڕەکەی گەورە دەبێ و دەبێتە پاشا. بۆیە لەئێوەدا نە پاشا و نە هیچ شتێکیتر هەلدەکەوێ. یان دەلێی:"من تێ ناگەم.. من تاکڕەو و بە ئارەزووی خۆم دەجولێمەوە، بەمرەنگە من وون بووم" ئەگەر تۆو ون بوویت ئەوکاتە چ نرخێکت هەیە، برۆ خۆت بفرۆشە بە دوژمن و خۆت مەفرۆشە بە پارتی. رابکە و برۆ... ئەگەر ڕێکخستنت دەوێ ئەوا لەناو ڕێکخستندا یاسا و پێوەری مانەوە هەیە. بەبێ بوونی ئەو پرەنسیپانە نەمدەتوانی بگەمە ئەو هێزە. هەرچەندە زیرەك بیت، بەلام ئەگەر یاری بە ڕێسا و یاساکان بکەیت، ئەوا هەر بە تێکدەرێکی گەورە دەمێنیتەوە.

پێویستە تەواوی ئەو ئاخافتن و ئاکارانە لەمێژوودا لەناو ببرێن. دەبێ ئەوەش بزانن کە لەئێستا بەدواوە ناکرێ ئەو تایبەتمەندیانە لەناو پارتیدا درێژە بەخۆیان بدەن. بۆئەوەی سبەی پارتی قورگتان نەگرێت ئەوا ئیمە دلنیاتان دەکەینەوە، چونکە پارتی بەو رادەیەی زەبر لەدوژمن دوەشێنێت بەهەمان رادەش زەبر لەوانە دەدات کە یاسا و پرەنسیپەکان پێشێل دەکەن و بە شێوازەکانی پارتیەوە پەیوەست نابن. ئەگەر دەتانەوێ لەسزای پارتی رزگارتان بێ، ئەوا بەخێرایی هەولبدەن بە پێوەرەکانیەوە پەیوەست بن و بیانپارێزن و خۆتان پێشبخەن و لەپەیوەستبوونتان بە ڕێبازی پارتیەوە

سەرکەتووبن. ئەو کاتە من تەنها بەوشەیەکیش چییە هێرش ناکەمە سەرتان، ئەگەر لەجێی خۆیدا نەبێ. بەڵام ئێوە دەبینن کە رەوش گەیشتۆتە خاڵێك کە ئۆقرە ناگرێت. من دەتوانم بەگوێرەی یاسا و رێساکان چاوەکانم دەربهێنم، پێویستە نەڵێن تێنەگەیشتین و گوێمان لێ نەبوو، هەرچەندە ئەگەر تۆ جوان و باش بیت بەڵام یاسا و رێساکان لەتۆ بەنرختر و جوانترن. ئەو راستییەی کە ئێمە پێی دەژین، تەنها پرەنسیپ و بنەماکانن، بۆیە پێویستە لە سەرووی هەموو شتێکەوە بن.

پێویستە راستی کوردایەتی لەگەڵ ئەم شیکردنەوانەدا بگاتە ئەم ئاستە. دەبێ لەسەر بنەمای ئەم شیکردنەوانەش، کەسایەتی ئێوە بۆ رێکخستن بگاتە ئاستی پێوەرەکان، جگە لەمە هیچ رێکخستنێکی دیکە رزگارتان ناکات و، کاتێك من بە پشت بەستن بە مێژوو و راستیەکانی تێکۆشام. بەڵام لەمەودوا ئێوە خاوەنی هێزی جێبەجێکردنی ئەم ئەرکانەتان هەیە و ئێمەش هێزی پرسیارکردن و دادگاییکردنمان هەیە و لەو ئاستەداین کە بتوانین سزاکانیش پەیڕەو بکەین.

ئەگەر توانیتان ئەو قۆناخە دەرباز بکەن ولێپرسینەوەیەکی راست و دروست ئەنجام بدەن، ئەوا دەبێ خۆتان زۆر بە بەختەوەر دابنێن و پێویستە بەو رەنگە کاروبارەکان هەڵبسەنگێنن و لێی بڕوانن، هەروەکو ئەوەی کە لەنوێوە ئاشنایەتیتان لەگەڵ خودی خۆتان و مرۆڤایەتی و مێژوو و پارتی و هەڤاڵان پەیدا کردبێ. شتێکی جوان و بەواتایە ئەگەر بتوانن سەرلەنوێ راستینەی خودی خۆتان و ژیان بناسنەوە.

بەڵام ئەگەر هاتوو هەروەکو پێشتر هەڵسوکەوت بکەن و بەشێوەیەکی بەردەوام کارەکانی پێشووتان دێژە پێبدەن، ئەگەرچی ساڵێکی تریش بەسەر بەرن، ئەوا دەستبەجێ وەکو تاوانبارێك لەکاتی ئەنجامدانی تاواندا دەستگیر دەکرێن و دادگای دەکرێن. لە ئێستا بەدواوە رێکخستن بەو شێوە دەبێ و تەنها بەو شێوەیەش رێکخستن دەتوانێ پرەنسیپەکانی خۆی جێبەجێ بکات و لەسەر رێبازی خۆی بەرێوە بچێت. چونکە بەمرەنگە نەبێ سوپایەکی گەلەری هەبوونی نابێ و، بەبێ ئەمەش PKK ناتوانێ رۆڵی پێشەنگایەتی بگێرێ. هەر بزووتنەوەیەك بگاتە ئەو ئاستە بێجگە لەم رێگایە ناتوانێ بە رێگایەکی دیکە تێبکۆشێ. پێویستە ئەوە تێبگەن و هیچ کەسێك باسی تەنگبوونی دەروونی و سیاسی و سەربازی، یان رێکخستنی خۆی نەکات و نەڵێ لەبەر

ئەوانە کەموکوڕی دەردەکەوێت. من پێتان دەڵێم خۆتان لەو رەوشە رزگاربکەن. ئەو هەمووو تواناکاریە مەزنەمان پێشکەش کردوون و، لەپاش ئەو هەمووو شتانە ئەوەی کەموکوڕیەکانی خۆی دووبارە بکاتەوە، ئەوا نغرۆ دەبێ. ناتوانین بە بەردەوامی بەرگری لەو نغرۆبوونەی ئێوە بکەین، هەروەها ناتوانین ماوەی چەندین ساڵ بەرگری لە کەموکوڕیەکانتان بکەین. دووڕوویی لەو مەسەلەیەدا هەیە، چونکە چەندین ساڵە ئەم هەڵە و کەموکوڕیانە دووبارەدەکەنەوە. ئاخۆ چۆن تا ئێستاکە خۆتان لەمانە رزگار نەکردووە، ئەگەر ناتوانی ئەوا یان تۆ نەخۆشیەکی درێژخایەنت هەیە، یاخود تۆ دیماگۆجی دەکەی، یان نیازێکی خراپت هەیە. هەر یەکێکیش لەو ئەگەرانە بەسە بۆ سزادانی ئێوە. بۆیە هەوڵ نەدەن بەگریان و پاڕانەوە خۆتان هەڵخەڵەتێنن و، ئیتر وا نەزانن کە پارتی دەرفەتی رەخنە لەخۆگرتنتان پێدەبەخشێت و، پشت بە من نەبەستن چونکە ناتوانم رزگارتان بکەم.

دەبێ باش بزانرێ کە لەنێو رێکخستندا یاسا و رێسا و هێزی بەڕێوەبردنی ئەمانە هەیە. هەروەها رێکخستن ئامادە نییە کە لەگەڵ ئەو هەمووو کەموکوڕیانەی پێشووت، تۆ پەسند بکات. چونکە تۆ پێکهاتەی کۆمەڵێك تاوان و گرێیەکی ئاڵۆزی لە هەڵە و کەموکوڕی و ئەو (واتا رێکخستن) ناچار نییە باری تۆ هەڵگرێ، هەروەها لەلایەنی مێژوویشەوە، ئێمە بۆ دەربازکردنی قۆناخی هەڵە و تاوانەکان خەبات دەکەین. بۆیە ئەو کەسەی کە دەتوانێ لەسەر خۆی زاڵ بێت و پەیوەستی رێباز و ژیانی پارتی بێت و لەسەر چۆنیەتی بەڕێوەبردنی شەڕ کۆنترۆڵی هەبێت، ئەوا ئەو کەسە لەناو ئێمە دەتوانێ بژی و جێگای دەبێتەوە. ئێمە ئەو شتە بەمافێکی سروشتی و ئاسایی خۆمان و ئەرکێکی سەرەکی دادەنێین.

رۆژ بەڕۆژ ئێمە بە پشتبەستن بە دادگا رەمزییەکانی قۆناخی رابردوو، دادگاکانی قۆناخی داهاتوو بەرەو پێش دەبەین و لەگەڵ هاتنی وەرزی زستاندا، قۆناخی داهاتووی کۆنگرەی پێنجەم قوورسایی دەخاتە سەر ئەو لایەنەی کە ئەرکەکانمان لەسەرەوە بۆ ژێرەوە لەهەمووو ئاستەکان، یەکە و گۆڕەپانەکاندا بەپێی پێویست بەرفراوان دەبێت. بەهەمووو توانەیەکمانەوە کار دەکەین لەپێناو دەستەبەرکردنی پێداویستیەکان. من بەدڵنیاییەوە لەو باوەڕەدام کە ئەگەر بتوانین بە تەواوەتی ئەمانە جێبەجێ بکەین، ئەوکاتە هەمووو چالاکیە سیاسی، سەربازی و رێکخراوەییەکانی دیکە دەکەونە سەر رێگای

راستی خۆیان و لەسەر بنەمایەکی پتەو بەڕێوە دەبردرێن. بەمجۆرەش پارتیمان رزگاری دەبێت لەو تایبەتمەندیانەی کە زیانی پێ دەگەیەنێت. بەدرێژایی مێژووی پارتیمان و بەتایبەتی مێژووی شەڕ، هەروەك چۆن گەلەکەمان لە مێژووی خۆیدا لەهەموو گەلانی جیهان زیاتر زیانی بەخۆی گەیاندووە، ئەوا لەپارتەکانی دیکەش زیاتر پارتیمان زیانی بەخۆی گەیاندووە، لەڕێگای ئەمەشەوە پارتیمان خۆی لەو ئاکارە رزگار دەکات. لەسەر ئەو بنەمایەش بۆ بەڕێوەبردنی شەڕ؛ ئەو ئازایەتی و قوربانیدانە مەزن و رەنج و کۆششە راستەقینەیەی کە لەم قۆناخەدا دەخوازرێت، بەرجەستە دەکات. لەئەنجامی جێبەجێکردنی ئەمانەشدا، پێشکەوتنی وا دروست دەبن کە سەد جار زیاترین لەو پێشکەوتنانەی کە پێشتر بەدەستمان هێنابوو. چونکە لە رابردوودا کەموکوڕی گەورەمان هەبوو، ئەگەر بێتو بتوانین ئەو کەموکوڕیانە پڕبکەینەوە، ئەوا لە قۆناخی داهاتوودا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان، هیچ ئاستەنگیەك لەسەر رێگامان‌دا نامینێ. ئەگەر بتوانین پەیوەست بین بە پرەنسیپ و پلانە دارێژراو و بابەتیەکانی قۆناخی داهاتووەوە، نەك تەنها ئەوە، تەنانەت لەتواناماندا دەبێت بەو ئامانجە بگەین کە لە قۆناخەکانی رابردوودا نەمانتوانی پێیان بگەین. من لەوە دڵنیام کە دەبینە سوپا و پارتێکی وەها کە لادان و هەڵەی زۆر کەم بێ و، لەهەموو ئاستێکدا کۆنترۆڵمان بەسەر رێڕەو و ئەندامەکانمان لە شەرڤانەکانەوە بگرە تاوەکو یەکە و سوپایەکی زیاتر رێك و پێك و یاساییانە، زیاتر دەبێ. بەمەش ئەگەر هاتوو توانیمان هەموو کەموکوڕیەکانمان لەناو ببەین، ئەوکاتە بەشێوەیەك دەرفەت بۆ سەرکەوتنە یەك لە دوای یەکەکان دەرەخسێ کە چاوەڕوانی لێنەدەکرا. لەم بارەیەوە من بەرپرسیارێتی ئەوە زیاتر لە ئەستۆی ئێوەدا دەبینم. باکەس خۆی جیانەکاتەوە و هەوڵی خۆ رزگار کردن نەدات، پێویستە کەسێك لە ئێمە خۆی دوورنەخاتەوە و لەم دادگایی کردنە خۆی نەدزێتەوە و نەترسێت. با لەم رۆژەدا بەهەموو توانایەك رووبەڕووی مێژوو و راستی تێکۆشانی خۆمان ببینەوە، بەتایبەتیش ئەوانەی لە شەڕدا باوەڕیان بە ئێمە هەیە کە شایستەی بەرپرسیارێتین و وەکو پێویست ئەرکی خۆیان جێبەجێ دەکەن و لە راستیەکان تێدەگەن و دەبنە هێزی جێبەجێ کردن، بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن، ئەوەی دەکەوێتە سەر شانیان پێویستە

جێبەجێی بکەن و تا دواڕادەش تواناکاری خۆیان بخەنە گەڕ. لەسەر ئەم بنەمایە دەکرێ سەرکەوتنی یەکجارەکی بەراپەڕاندنی ئەرکەکانی سەرشانیان مسۆگەر ببێت.

1994/10/24

## وڵاتپارێزی و دوورکەوتنەوە لە وڵات!!

### لەڕاستیدا کۆچبەری پەیوەندیەکی پتەوی بە شەڕی تایبەتەوە هەیە

با هیچ کوردێك نەڵێ من بە ئارەزوو و دڵی خۆم وڵاتم بەجیهێشتووە و چوومەتە هەندەران، چونکە کۆچبەری نەك تەنها لەڕۆژانی ئەمڕۆ و دوای کودەتاکەی 12ی ئەیلول لەژێر کاریگەری شەڕی تایبەتەوە دەستیپێکردووە، بەڵکو بە هەزاران ساڵ پێش ئێستا ئەو کوردەی لە کوردستان کە خاوەنی زمان و کولتوور و وڵاتی خۆی بوو و، لەهەموو گەلانی ناوچە بەهێزتر بوو، کەچی ئێستاکە دەبینین لەدونیادا هەر ئەو بەتەواوی بێ وڵات و ئامانجی گەیشتن بە وڵات ماوەتەوە و، وڵات و ئازادی لەدەست چووە و خۆشی بە شتێك لەقەڵەم نادات. لێرەدا کاریگەری شەڕی تایبەت بەدیار دەکەوێ، هەروەها بەد بەختی و بێچارەیی هەرە گەورەش ئەوەیە مرۆڤ کە بکەوێتە رەوشێکی بەمشێوەیە. باشە ئەمە چۆن روویدا؟ بۆچی وا لە غەفڵەتدا گیراین و قۆڵ بەست کراین؟ وڵاتێك کە لە رۆژهەڵاتی ناویندا بە بەهەشت لەقەڵەم دەدرێ، چۆن کردمان بە کەلاوە و چۆڵمان کرد و نەمانتوانی ژیانی تێدا بکەین؟هۆیەکانی چ بوون؟! پێش هەرشتێك بۆ وەها لاواز بووین و دەستمان لەم وڵاتە بەردا و نامانەوێ سەیری بکەین؟! میللەتێك خراپەیەکی ئاوا بۆ خۆی بخوازێ، بەدبەختی لەوە گەورەتر نابێت.

ئێستا ئەوەی تۆزێك کوردایەتیەکی بەشەرەف و وەهای بوێت کە شتێ بە مرۆڤایەتی ببەخشێت، پێویستە پێش هەمووشتێك لەسەر مەسەلەی وڵاتی خۆی هەڵوەستە بکات. مەسەلەی وڵات تەنها خاك و مەسەلەیەکی جوگرافی نییە، بەڵکو مەسەلەیەکی مێژوویی و رۆح و باوەڕییە. یەکێك بڵێ من ئاایینخوازم، ئایین بێ وڵات نابێ، یان یەکێکی دیکە بڵێ من ئازادیخواز و دیموکراتخوازم، دیسان بێ وڵات نابێ، تەنانەت بەبێ وڵات ئاستەمە یەکێك بیەوێ کەسێکی بەشەرەف و بەناو و دەنگ بێ، کەسێکی بێ وڵات تادوایی بەدبەخت و چارەڕەشە. جا هەرچەندە بۆ خودی خۆی مرۆڤێکی ژیر و بۆ خەڵکیش باش بێ، بابزانێ کە بوونی نییە و مرۆڤێکی بێ سوودە، چونکە بێ وڵاتە. دەرد و ئێشی هەرە گەورەی کوردان ئەوەیە کە لەبەرامبەر وڵات خۆیان خستۆتە نێو رەوشێکی بەمجۆرە.

خەباتی ئێمە، لەناو وڵات دەستیپێنەکرد، بەڵکو لە دەرەوەی وڵات هەنگاوی یەکەممان هاوێشت، لەناو وڵات نەمانەدەتوانی چاوی خۆشمان بکەینەوە، چاومان لەپایتەختی دوژمندا هەڵهێنا و، هۆکارەکەشی گەورەیە؛ لەمێژوودا گەلێك میللەت لە خاك و وڵاتی خۆیان دابڕاون، گەلێك شۆڕشگێڕیش لەوڵاتی خۆیان دابڕاون. ئەمە شتێکی شەرم نییە، لەبەر ئەوەی کاتێك ستەم و زۆرداری پەرەبستێنێ، ئەوا شۆڕشیش مەزن دەبێ. لەبەر ئەمە دوژمن زۆر دڕندانەتر رووبەڕووی شۆڕش دەبێتەوە. ئەو کاتە کۆچبەری و هێشتنی وڵاتیش دەبێتە شتێکی ناچاری. لەسەر ئەم بنچینەیە من نالێم بۆچی ئێمە کۆچبەر بووین؟ بۆچی وڵاتمان بەجیهێشت؟ من بەخۆم بەناچاری وڵاتم بەجیهێشت و 17 ساڵە لە هەندەران دەژیم، بەڵام ئەمە بۆچی روویدا و لەوەش زیاتر چۆن خۆمان ئامادە دەکەین بۆ گەڕانەوەی وڵات، هیچ ئامادەکاری هەیە؟ لەم خاڵەدا هەڵە و کەموکوڕی پەسند ناکرێت. راستە دوژمن گەلی کوردی بەزۆر دووچاری کۆچبەری کرد، بەڵام ئەگەر گەلی کورد باش تێبگەن، ئەمەیان بۆچی بەسەرهات و خۆیان باش بناسن، بەواتایەکی دیکە راستی دوژمن و لاوازی خۆتان باش بناسن ئەوکاتە بۆخۆتان رێگەی گەڕانەوە بۆ وڵات بکەنەوە. هەروەها ئەو هێزەی لەسەر دەستی کوردەکانی دەرەوەی وڵاتدا هەیە، ئەگەر لەم پێناوەدا یەکبخرێت بەتەنها بەسە بۆ رزگارکردنی وڵات، بەڵام ئەو هێزە تائێستا وەکو پێویست رێکنەخراوە و کۆنەکراوەتەوە، بۆچی؟ چونکە ئێوە خۆتان نەناسیوە.

دەوڵەتی فاشیزمی تورك، گەلێك میللەتی لە ئەنادۆڵ کوشت و پەرتەوازە کرد، پاشان ئەو دەوڵەتە فاشیزمەی لەسەر بونیادنا. لەڕاستیدا ئەنادۆڵ بووە گۆڕستانێك بۆ گەلان، دەتوانین بڵێین ئێستا ئەم دوژمنە دەیەوێ ئەو کارەی خۆی بەرامبەر گەلی کورد تەواو بکات، کۆسپی سەرەکی لەبەردەم ئەم دوژمنە فاشیزمە، کوردن. واتە ئەو کوردانەی لە وڵاتدا ماون و ئەوانەی کە لەشارەکانی ئەوانیشدا دەژین، ئەگەر بتوێنەوە کاری دوژمن تەواو دەبێت. لە مێژووشدا هەر بەمشێوەیە بووە، بەڵام بەتایبەتی لەڕۆژی ئەمڕۆماندا هەموو حکومەتە یەك لەدوای یەکەکان و تادەگاتە پەرلەمان و سەرجەم پارتەکانیش، کێشەی یەکەمیان بنبڕکردنی گەلی کوردە؛ ئەوانەی بەرخودان دەکەن قڕبکرێن و ئەوانەی دیکەش کە دەمێننەوە بتوێنرێنەوە، بەمشێوەیە کۆتاییان پێ بهێنرێت. بەڵێ بڕیاری دوژمن بەمشێوەیەیە و باکەس نەڵێ بواری ژیانم هەیە. یەکێك هەندێ ئاقڵ بێ

و لەسەر خۆی راوەستێ و دوژمنی خۆی بناسێ، دوو بڕیاری لەسەر پەیڕەو دەبێ؛ یان دەبێتە کوردێکی بە شەرەف و بە کوشتنیش تەسلیم نابێ، یاخود ئەوەی ژیانێکی هەرزان بخوازێ دەبێ لەناو دوژمن بتوێتەوە. ئەوەی بڵێ ڕێگایەکی دیکەش هەیە، راست ناکات و سەختەکارێکی گەورەیە. بەڵکو ئەوەی هەیە یان بەرخودانە یان مردن، جگە لەمانە بۆ کوردان هیچ ڕێگایەکی تر نییە. دەرکەوتنی PKKش لەسەر بنەمای ئەم راستیە بوو. کاتژمێر بەکاتژمێر ئەو کاتەم لەبیرە؛ دەمگوت یان دەبێ خۆم لەکوردایەتی داشۆرم و بەبێ شەرەفی بتوێمەوە لەپێناو ئاغایەتی و پاشایەتی، یاخود کوردایەتی پەسند بکەم و هەتا دوایی بەرخودان بکەم. من ڕێگای کوردایەتی و بەرخودانم هەڵبژارد و، لەو ڕۆژەوە تاوەکو ئەمڕۆ بە شەڕێکی مەزن، بە ئەقڵ و سیاسەتێکی مەزن هەتاوەکو ئەم ئاستەمان هێنا، ئەگەر ڕێگایەکی دیکە هەبوایە من دەمبینیەوە، بەڵام لە بەرخودان بەولاوە هیچی دیکەم نەدۆزیەوە. هەروەها لە پیادەکردنی شێوازێکی زانایانە، لە پیادەکردنی شەڕ زیاتر بوارێکی دیکەم نەدۆزیەوە بۆ ژیان. کوردان گەلێك بەرخودانیان کردبوو، بەڵام هەمیشە کەوتبوون، لەبەر ئەمەش هەر جار خراپتر دەکەوتن. دوژمن ویستی ئەم بەرخودانەی PKK تێکبشکێنێ، چونکە دەیان گوت 28 سەرهەڵدانی کوردانمان تێکشکاندووە و 29 یەمیش تێکدەشکێنین. ئەگەر سەرهەڵدانی 29 یەمینیش تێکبشکابوایە، ئەوا نە لەباکوور و نە لەباشوور و نە لەڕۆژهەڵات کوردایەتی نەدەما. ئەمە راستیەکی حاشاهەڵنەگرە، چونکە بڕیاری دوژمن لەسەر بناخەی قڕکردن بوو، بڕیاری PKKش لەسەر بنەمای هێشتنەوەی کوردان و پاراستنی مافی گەل و رزگاری کوردستان و ئازادی گەلی کوردستان بوو. ئێمە زۆر جار خۆمان گورج و گۆڵ کرد بەرامبەر ئەو بڕیارەی دوژمن. ئەگەر ئەم توندوتۆڵیەی ئێمە نەبوایە ئەوا کوردایەتی نەدەما.

ئێوە ئێستا بەخۆتان رەوشی خۆتان دەهێننە سەر زمان، چۆن لە وڵات دەرکەوتن؟ چۆن بێچارە ماون؟ زمان لەدەست چووە، پێشتر عەشیرەت و هۆز هەبوون، ئەویشتان لەدەست چووە. مرۆڤ لەسەر ویژدانی ئیمپریالیزم و دوژمنان چ بکات؟! پێشتر قوولەڕەش هەبوون و نەیاندەتوانی وەکو هاونیشتمانیەکی ئاساییش لە ئەمریکا بژین. ئێمە لە ئەوانمان خراپتر بەسەر هاتووە و وەکو ئەوانیش ناتوانین بژین، ئەوانە خاوەنی

زمانی خۆیـانن و ئێستا لـەناو کۆمـەڵگای ئـەمریکا گـەلێك شـوێنیان بـۆ خۆیـان گرتـووە. گەلی ئەرمەنیش وەکو ئێمە بەکۆمەڵ کوژراون و پەرتەوازە بوون. لەگەڵ ئەمەش دیسان رەوشـی ئـەوان لـە ئێمـە باشـترە و بـەتواناترن، بوونـە خـاوەن وڵات و هونـەرێکی پێشکەوتوویان هەیە و گەلێك زمانیش دەزانن، جێگاو کاروباریان باشە، ئێمە وەکو ئەوان ناتوانین لە دنیادا جێگای خۆمان بکەینـەوە، بـەڵێ رەوشـی ئێمـە لەهـەمووویان خـراپتر و نالەبارترە.

لە جیهاندا گەلێك میللەت پەرتەوازە بوون؛ یەهودی و قوولـە رەشـەکانی ئـەفریقا بەنێو گەلانی دنیادا بڵاوبوونەوە، لە مێـژووی کوردستانیشـدا هـەردوو گـەلی ئاشـووری و ئەرمەنی پەرتـەوازە بوون، گەلانی ئـەنادۆڵیش نموونـەی رۆمـەکان هـەموویان پەرتـەوازە بـوون، ئـەوەی مـابۆوە ئێمـە بـووین و ئـەوەی لەهەمووشـیان زیـاتر و خـراپتر دووچـاری پەرتەوازەیی هات گەلی کـورد بـوو. بۆیـە پێویسـتە چـارەیەکی خۆمـان بکـەین. بـا کـەس نەڵێ ئەمە چارەنووسمانە و ژیانێکی باشە، یـەکێك بەمشـێوەیە خـۆی ون بکـات، بـا بـاش بزانێ ژیانی رۆژ لەدوای رۆژ تاریکتر دەبێت. هەرچەندە چاوی لەشـتی باشـیش بـێ بـۆی دابین نابێ، واتـا بـا خـۆی هەڵنەخەڵەتێنێ، خـۆ لەخشـتەبردن نەخۆشـیەکی کوشـندەیە، یـەکێك لەسـەر بناخـەی درۆکـردن بـژی و درۆی خـۆی بەراسـت ببـینێ و خـۆی پـێ فریوبدات، ئەمە بۆخۆی خۆی کوشتووە نەك دوژمن. ئێمەی کوردیش زۆربەمان تووشـی ئەم نەخۆشیە بووین، بـەخۆمان خۆمـان کوشـتووە. لەبـەر ئـەوە پێویسـتە مرۆڤـی کـورد خـۆی لـە درۆ پـاك بکاتـەوە، گـەورەترین درۆش ئەوەیـە کـە مـرۆڤ خـۆی بـێ وڵات و پەرتەوازەیی بهێڵێتەوە. کوردێك بڵێ من ناتوانم هیچ بکەم و هیچ لەدەستم نایەت! ئـەوا درۆیەکی هەرە مەزن دەکات. چونکە هیچ کوردێك لەمن فەقیتر و بـێ چـارەتر نـەبوو و، دوژمنەکانیشیان وەکو دوژمنی من بـەهێز و زێـدە نـەبوون، تەنانـەت کەسێکیشـم لەگـەڵ نەبوو، کەواتە چۆن ئێمە تا ئێرەمان هێنا؟! چۆن لە نەبوون ئەم هێزەمان دروست کرد؟ ئەمـە بەڵگەیەکە کە ئێمـەی کورد بـە گشتی و کـوردی هەنـدەران بەتایبـەتی دەتـوانین خۆمـان بـە هێـز بکـەین و زۆر شتیشـمان لـە دەسـت دێـت. هەربۆیـە لەسـەر تـەواوی کوردەکانی دەرەوەی وڵات هەر لە ئوستڕالیاوە تا دەگاتە ئەمریکا، لە ئەفریقیاوە تـا ئاسـیا و ئەوروپا، پێویستە ریزەکانی خۆیان لەسەر سیاسـەتێکی دروسـت رێکبخـەن. بەتایبـەتی لەسـەر سیاسـەتی PKK، کـە خـۆی سـەلماندووە و بەشـەڕ رێگـای گەڕانـەوەی وڵاتـی

ئاوەڵاکردووە، پێویستە ئێوەش جێگای خۆتان لەنێو ریزەکانیدا بگرن، ئەمەش بە تەنها بەسە بۆ ئەوەی وڵات رزگار بکەن.

ئەو کۆچبەرییەی ئێمە تێیداین خراپترین مردنە، لە بەرامبەردا ئەوەی دەکەوێتە سەرشانمان خۆ وشیارکردنەوە و خۆ ناسینە. دوژمن لەدەرەوە هیچ توانایەکی نییە و دەسەڵاتی بەسەر مێشك و دڵماندا ناشکێ، لەبەر ئەمە دەبێ مێشك و دڵی خۆمان خۆماڵی بکەین، بەو مانایە دەبێ مێشکمان بۆ وڵات کار بکات و، دڵمان بۆ وڵات لێبدات. ئەمەش بەتەنها بەسە بۆ ئەوەی تۆ هەرچیەکت بوێ پێی هەڵسی و ئەنجامی بدەی. واتە کوردانی هەندەران توانایەکی مەزنیان هەیە، ئەگەر ئەم توانا و دەرفەتانە بەهێز بکرێ و پێش بخرێ، ئەوا پیلانی دوژمن پووچەڵ دەبێتەوە. بەسەدان ساڵە دوژمن ئێمە لە وڵات دەردەخات، بەڵام پێشتر رەوانەی ئەوروپایان نەدەکردن، بەڵکو بۆ ناوچەی ئەنادۆڵ رایاندەگواستن، پێش 100 ــ 150 ساڵ لەمەوبەر کوردانیان رەوانەی " قۆنیا "ی جەرگەی ئەنادۆڵ دەکرد، دوای دامەزراندنی کۆماری تورکیا و سەرهەڵدانی دژ بە رژێمی کۆماری ئیدی کوردانیان دەربازی خۆرئاوای ئەنادۆڵ کرد و لە شارە گەورەکاندا نیشتەجێیان کردن، بۆئەوەی لەنێو ئەواندا بتوێنەوە. کەچی لە ساڵی 1978 بەدواوە لە رێگای شەڕی تایبەت زۆربەی کوردستانیان چۆڵ کرد، نەك تەنها بە برسی و تینووکردنی گەل، بەڵکو لەوەش زیاتر ئاوەڵاکردنی رێگای ئەوروپا وایکرد کوردستان چۆڵ ببێ. ئەوروپا لە دوای شارەکانی تورکیا لەم پێناوەدا بووە پیلانی دووەم. لە رابردوودا عوسمانیەکانیش گەلێك کوردیان پەرتەوازەی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو و ناوچەی عەرەبستان کرد. دەتوانین بڵێین هەموو ئەو کوردانەی بەرخودانیان کرد کۆچبەرکران، بەهەمان شێوە PKKش وەکو پێشتر باسمان کرد پارتییەکە لەسەر بنەمای کۆچبەری دروست بووە و پاشانیش بوو بە هێزێکی مەزن.

لەسەر ئەم بنەمایە پێویستە خۆمان راست بکەینەوە؛ کوردی پەنابەری هەر وڵاتێك دەتوانن هێزێکی گەورە بۆ خۆیان سازبکەن، دەرفەتیان زۆرە، سیاسەت لە دەستیاندایە، هەموو ئەندامانی پارتی لەخزمەتی ئێوەدان. لەناو وڵاتیش گەریلا رۆژانە دەجەنگن، ئەو هێزەی ئێمە بە ئایدیۆلۆژیا و سیاسەت سازمان کردووە، لەگەڵ خۆیدا دوژمن دەهەژێنێ، ئەمانەش هەمووی لەخزمەتی ئێوەدان و پێویستە ئێوەش خۆتان

بناسن و سوود لەم دەرفەتانە وەربگرن کە لەدەرەوە بەدەستمان هێناوە و ئامادەمان کردووە، وەکو تەلەفیزیۆن کە رۆژانە دەتوانن سەیری بکەن، گۆڤار و رۆژنامەش زۆرن، رۆژانەش پەرتووك لە چاپ دەدرێن، هەروەها وێڕای هەبوونی رادیۆش. بێگومان ئەوانە تواناکاریەکی کەم نییە، مرۆڤ دەتوانێ بەهۆیانەوە یەکێتی ریزەکانی خۆی پتەو بکات، هەروەها وەکو رابردوو نییە، ئێستا هەر رۆژێك بخوازن دەتوانن بگەڕێنەوە کوردستان، پێشتر دوژمن نەیدەهێشت یەکێك نەدەردەکەوێ و نەبگەڕێتەوە کوردستان، ئەمەش دەرفەتێکی مەزنە.

کوردانی ناوەوەی وڵات، ئێستاکە هێزێکی مەزنن، تواناو مەعنەویات دەدەنە کوردی دەرەوەی وڵات، کوردی دەرەوەش هێزێکی مەزنن، واتە هێزی هەردوولا گەلێك پێشکەوتووە و یەکتری تەواو دەکەن و گەمەی دوژمن پووچەڵ دەکەنەوە. ئەگەر ئەم دوو هێزە یەك بگرن هیچ دوژمنێك ناتوانێ لە بەرامبەریان بوەستێ، لە رابردوودا وانەبوو، بەم هێزەی ئێستا، کە دەرکەوتووە پێشتر ئەگەر ئێمە لەناو کوردستان رووبەڕووی دوژمن بباینایەوە بەجارێك قڕدەبووین، لەبیر نەکەن لەسەرهەڵدانەکانی ساڵی 1925 ــ 1938 کەس نەیدەتوانی دەرکەوێتە دەرەوە، ئەوەی دەریش کەوتە دەرەوە توایەوە و لەناوچوو. بەڵام ئێستاکە نە لەناوەوە سەرهەڵدان رادەوستێ، نە لە دەرەوەی وڵاتیش. ئەمە نمونەیەکی مەزنە و لەسەری رادەوەستین.

ئەوەی بڵێ با من لەدەرەوە بتوێمەوە باشترە، ئەوا ژیان بۆ ئەم مرۆڤە نییە، چونکە لەدەرەوەی وڵاتیش یەکێك خاوەن هێز نەبێ، ناتوانێ جێگای خۆی لە هیچ شوێنێك بکاتەوە. بۆ نموونە: گەلی ئەرمەنی و جوولەکە بە هەزاران ساڵە ماڵی خۆیان جێهشتووە و ئاوارە بوون، کەچی لەدەرەوە خۆیان کردۆتە هێزێکی مەزن و رێگای گەڕانەوە بۆ خۆیان خۆش دەکەن، بەهەمان شێوە بانگەوازی سەرجەم کوردان دەکەم نەك تەنها کورد، بەڵکو ئەرمەنی و ئاسووریش، چونکە کوردستان زێدی ئەوانیشە، با هەموویان روو لە کوردستان بکەن و بگەڕێنەوە، تاوەکو ناسنامەیەکی نوێ بۆ خۆیان دروست بکەن و، لە دەرەوەی وڵاتیش یەکێتی و پەیوەندی خۆتان لەگەڵ کوردان پێش بخەن. لەبەر ئەوەی دوژمنی هەمووان دەوڵەتی تورکیایە، بەڵام بەپیلانی جیاواز شاڵاوی قڕکردنی ئەوانیشی راگەیاندووە. هەروەها لە رووی ئایین و ئایینزاوە ناکۆکی خستە نێوانیان و، رووبەڕووی یەکتری کردنەوە، کەچی دوایی دەرکەوت ئەمە پیلانی دوژمن

بوو، چونكه هەموو ئایین و ئایینزایەك برایەتی پەسند دەكەن. هەروەكو لەناو شۆڕشی PKKدا هەموویان یەكیان گرتووە، كەواتە ئەو دوژمنایەتیەی لەنێوانیاندا دەركەوتووە دوژمن پێكی هێناوە. بۆیە پێویستە خۆتانی لێ دوور بخەنەوە و پێویستە دوورە وڵاتی زیاتر لەیەكتان نزیك بكاتەوە. كورد و ئەرمەن و ئاشووری لە هەندەران دەتوانن لە ڕێگای "پەرلەمانی كوردستان لە مەنفا" زیاتر یەك بگرن و جێگای خۆیانی تێدا بكەنەوە و دەرگای كراوەیە. هەروەها لەڕووی سیاسیەوە دەتوانن بەرەی ڕزگاری خۆتان دروست بكەن. پێشتر ئەم هەل و دەرفەتانە لەئارادا نەبوو، هەریەك لە گەلی ئەرمەن و ئاشووری بەتەنیا و پارچە پارچەبوون، لەوەش گرنگتر دۆستایەتی گەلی كوردیان نەدەكرد، ئەوەی چارەنووسی ئەوانی بەدەست بوو نەیدەهێشت خۆیان لە گەلی كورد نزیك بكەنەوە. بەڵام ئەمڕۆ لەژێر سایەی سیاسەتی PKKدا هەموو گەلان دەتوانن ببنە دۆستی یەكتری، هەتاوەكو گەلی توركیش بەهەمان شێوە خۆیان لەئێمە نزیك بكەنەوە.

گەلی تورك بەڕێژەیەكی زۆر كۆچبەری ئەوروپا بوون و زۆربەشیان كرێكارن، لەوەش گرنگتر زۆربەیان لەژێر كاریگەری فاشیزمدان، با بزانن كە فاشیزم شتێك بە گەلی تورك نابەخشێ. لەبەر ئەوە خۆتانی لێ دووربخەنەوە. هەندێك بیربكەنەوە كە وڵاتی خۆتان زۆر دەوڵەمەندە و خۆشە، كەچی جوانی وڵاتەكەتان هەموو بۆ دەوڵەمەندەكانی ئەوروپایە. ئێوە بۆچی كۆچبەری ئەوروپا بوون؟ هاتوون لە ئەوروپا بوونەتە كرێكار و لە ڕەوشێكی زۆر خراپدا دەژین، هۆكارەكەشی بۆ ڕژێمی فاشیستی دەسەڵاتدار دەگەڕێتەوە، كە ڕژێمێكی زۆر دڕندە و كۆنە پەرستە. لەبەرئەوە پێویستە خۆتان لە فاشیەت ڕزگار بكەن و لەگەڵ گەلی كوردی كۆچبەر دۆستایەتی بكەن و پەیوەندیەكانتان بەهێز بكەن، چونكە ئێمە دوژمنمان یەكە، با بەیەكەوە دژی ئەم ڕژێمە فاشیستە خەبات بكەین.

دەبێ بزانن ئەوەی گەمە بە ئێمە و هەموو گەلان دەكات ئیمپریالیزمە. هەتاوەكو گەمە بەگەلی ئەرمەنی و ئاسوویش دەكات. هەرئەوە بۆتە هۆی ناتەباییمان. ئیتر با بەس بێ ناكۆكی و دووبەرەكی گەلان، با یەكێتی گەلان دروست بكەین، ئەو كاتە دەبینە هێزێكی مەزن، خێر و خۆشی وڵات دەبێتە هی گەلان. كێشە و ئاڵۆزیش لەسەر وڵات

نامێنێ، مرۆڤ دەبێتە خاوەن ژیانێکی ئابڕوومەندانە و کولتوور و شارستانیەتی خۆی. PKKش لەم پێناوەدا دەرکەوتۆتە روو و هەل و دەرفەتێکی مەزنی خوڵقاندووە. بۆ ئەم مەبەستە و لەسەر بنەمای ئەم راستیە بەشکۆیە سیاسەتی خۆی بەڕێوە دەبات. ئەم سیاسەتەش لە خزمەت تەواوی گەلاندایە، لەسەرووی هەموویانەوە گەلی کورد. هەربۆیە هاوکاری PKK بکەن، چونکە گەورەترین هاوکاریش چاندنی وڵاتپارێزییە لە دڵ و مێشکدا و، گەشەپێدانی گیانی وڵاتپارێزییە، هەروەها پێشخستنی بیری برایەتی و یەکێتی نێوان گەلانە.

دەمەوێ لەسەر پەنابەرانی کامپی ئەتروشیش هەندێك بدوێم، ئەوانە لە باکووری وڵات کۆچبەری باشووری وڵات بوون؛ لەڕاستیدا کوردانی کامپی ئەتروش ئەو کوردانەن کە لەبەرامبەر ئاگری دوژمن بەرگریان لە شۆڕش کردووە، لەشەڕدا بەرخودانیان نواندووە، لەشەڕی باشوور و باکووری وڵات بەرخودانییەکی مەونیان نیشاندا. لەشەڕی PKKدا بەرخودانیان کرد، ئێستاکەش بوونەتە هێزێکی گەورە و لەبن نەهاتوو. منداڵ و ژن و بەساڵاچووەکانیان نمونەی وڵاتپارێزین، ئێمە ئەوان وەکو ئەو موسڵمانانەی کە لەکاتی خۆیدا لە مەککە بۆ مەدینە کۆچیان کرد، بەمشێوەیە لەقەڵەمیان دەدەین، با نرخی خۆیان بزانن و درێژە بە رێگای خۆیان بدەن. ئەوانەی توانای گەریلاییان هەیە با خۆیان بگەیەننە ریزەکانی گەریلا و ئەوانەی دیکەش بە منداڵ و ژنەوە با بخوێنن. هەروەها پیاوە بەساڵاچووەکانیش رێکبخەن و پاراستنی کامپی خۆیان بکەن. بەمرەنگە ببنە نمونە بۆ خەڵکی باشوور، بۆ ئەوانەی کە لە شۆڕش دوورن، ئێوە خۆتان بگەیەننە ئەوان و رووی خۆتان بدەنە باشوور، بە خۆرەتاوی وڵات خۆتان گەرم بکەنەوە و، هێدی هێدی لە رێگای وڵاتپارێزیەوە هەنگاو بنێن.

جارێکی دیکە لەسەر کوردانی پەنابەر لە سەرتاسەری دنیا پێویستە لەسەر رەوشی خۆتان وورد ببنەوە و لە خۆتان بپرسن بۆچی واتان بەسەر هات و پەرش و بڵاو بوونەوە؟ بۆچی نەتوانرا سوود لە هەل و دەرفەت وەربگیرێ؟ سەبارەت بە کوردانی پەنابەرانی رووسیاش هەلومەرجێکی لەبار هاتۆتە پێش و دەتوانن سوود لە ناکۆکی نێوان رووسیا و تورکیا وەربگرن، ئەو تواناکارانەی کە لە سۆڤیەتی پێشوو هاتە ئاراوە، رووسیاش دەتوانێ سازی بکات، بەڵکو ناچارە ئەویش دەرفەت بدات.

سەبارەت بە کوردی ناوەوەی وڵات، کوردی ناو شارە گەورەکانی تورکیا لەشەڕی ئەم دواییەدا دوژمن کەوتە هەوڵی پەرتەوازەکردنێکی جددی، بۆ لێك دابڕانیان لەگەڵ گەریلا، پێویستە بوار بە دوژمن نەدەن. چونکە تەنها بە یەکێتی و یەکگرتن لەنێوانتان دەتوانن لەنێو خۆتاندا ڕێگا لە دوژمن بگرن. بە ملیۆنان کورد هەن، ڕۆژانە تواناکاری پارتی دەگاتە ئێوە، توانستی گەریلاش دەگاتە ئێوە، ئێوە دەتوانن خۆتان بگەیەننە ریزەکانی گەریلاش، هەروەها دەتوانن لەچوارچێوەی سیاسەتی تورکیادا خۆتان بکەنە هێزێکی سیاسی مەزن. لەبەرئەمە پێویستە ریزەکانی خۆتان بەهێز و پتەو بکەن و یەکبگرن. هیچ کوردێك بێ یەکگرتن و سیاسەت ناتوانێ بژی، وەکو رابردوو نییە، دوژمن ناتوانێ بتانکوژێ و هەمووتان لەناوببات، بە جەسارەتەوە ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوە و پێی خۆتان لە وڵاتی خۆتان گیربکەن و لە خزمەتی گەریلادا بن. هەرچەند باوەڕیتان بە یەکبوون زیاتر بێ، ئەوەندەش زووتر ئەو تەنگەتاوی و برسیبوون و تینووبوونەی کە تێیکەوتوون، چارسەر دەبێت. بەپێچەوانەوە ئەگەر ریزەکانی خۆتان پتەو نەکەن و ڕووی خۆتان نەکەنە وڵات و پشتگیری شۆڕش نەکەن و پەیوەندی لەگەڵ گەریلا نەبەستن، ئەوا ئەو بێزاری و ناچارییەی کە تێیدان مەزنتر دەبێت و چارەسەریش قووڵتر دەبێتەوە. بەڵام وەکو وتمان هەرچەندە بەرخودان بکەن و لەیەکتر نزیك بکەونەوە ئەوا ئەو ژیانە بێ شەرەف و بێ ئابڕووییەی دوژمن بەسەرتاندا دەسەپێنێ و دەیەوێ بیکاتە چارەنووستان، دەتوانن ئەم سیاسەتە پووچەڵ بکەنەوە و هەروەها بە کین و نەفرەتێکی مەزن، بەسیاسەتێکی باش ڕێگای وڵات بۆ خۆتان بکەنەوە.

لەڕاسیدا کار و خەباتی ئێمە شێوەیەکی شانۆیی وەرگرتووە، من ڕۆژانە کاری خۆم وەکو شانۆگەرێك ئەنجام دەدەم، ژیانی گەلی کوردیش ژیانێکی شانۆییە. هەمووتان دەزانن کە شانۆگەری کۆنترین هونەرە، هەربۆیە شانۆگەری بۆ سەرەتای هەر گەلێك و سەرەتای هەر شەڕێك بە بناخە دادەنرێت. بەڵام لەم مەسەلەیەشدا گەلێك تێڕوانینی تەسك هەیە، چونکە شانۆگەری بێ شۆڕش بەرهەمی نابێت، شانۆ ئەگەر لەسەر بنەمایەکی شۆڕشگێڕی نەیەتە ئاراوە و لەسەرەتا و قۆناخی دوای شۆڕشدا خۆی بنیاد

نەنێ، ئەوا ناتوانێ رۆڵی خۆی بگێرێ؛ چونکە شۆڕش بۆ هەموو هونەرێك بناخەیە. بەبێ شۆڕش تەنانەت بەبێ سیاسەتیش هیچ هونەرێك ناتوانێ رۆڵی خۆی بگێڕێ.

تائێستا گەلێك کەس هونەریان کردە پیشەی خۆیان، بەڵام بۆ مەسەلەی نەتەوایەتی و ئازادی گەل نەیانتوانیوە هیچ شتێك بکەن. راستە گەلێك کەسی لێهاتوویان لەنێودا هەڵکەوت، تەنانەت بەرهەمی چاك و رۆڵێکی سەرەکیشیان بینی، بەڵام چونکە دوور بوون لە شۆڕش، زوو بێکاریگەر بوون و لەبیر کران.

لێرەدا دووبارەی دەکەمەوە؛ ئەو هونەرمەندانەی دەیانەوێ جێگایەکی بەرز و شیاو بۆ خۆیان بگرن و رۆڵی خۆیان ببینن، پێویستە دید و بۆچوون و تێڕوانینی خۆیان لەسەر شۆڕش روون بکەنەوە و بەئاشکرایی هەڵوێستی خۆیان دیاری بکەن. چونکە ئەگەر هەڵوێستی خۆیان روون نەکەوە و خۆیان بە شۆڕشەوە گرێ نەدەن، ئەوا با دڵنیا بن کە ناتوانن رێگا لەبەردەم هونەری خۆیان خۆش بکەن و سەرکەوتن بەدەست بهێنن. بۆ نمونە سەیری زمان و هونەری کوردی بکەن، کە چۆن لەگەڵ پێشکەوتنی شۆڕشدا ئەویش پێش دەکەوێت، لەکاتی خۆی لەڕابردوودا هەندێ کەس دەیانگوت "ئێمە کاری هونەری خۆمان دەکەین و کارمان بەشۆڕش و سیاسەت نییە". بەڵام ئاکامیش هیچیان لێ دەرنەچوو و هیچیان نەکرد. شۆڕش کانگا و کانیاوی هونەرە، هەرچەندە بتەوێ دەتوانی ئەزموونی لێوەربگری و ببیتە جۆگەلەیەك لەم کانیاوە. من گەلێك جار ووتوومە ئێمە شۆڕشی خۆمان بە کارێکی هونەری دەزانین و بەمجۆرەش هەڵی دەسەنگێنین. ئێوە باش دەزانن کە شۆڕش بۆخۆی هونەرێکە، بگرە دایکی هونەرەکانە. ئەگەر یەکێك نەتوانێ هونەری شۆڕش پەیڕەو بکات، بێگومان ئەوا لە هیچ کارێکی دیکەی هونەر تێناگات و ناتوانێ بە سەرکەوتوویش پیادەی بکات. دیارە ئەم تێڕوانینەش بۆ هونەری شانۆش هەر راستە.

دەتوانم بڵێم ئەو تواناکاریەی کە ئێستا شۆڕش دەیڕەخسێنێ، بەر لەلایەنە ماددیەکە و ئەو دامودزگایانەی لەئارادان بوارێکی باش لەبەردەم شانۆدا دەکاتەوە، چونکە بیر و گیانی شۆڕشگێڕی بۆخۆی توانکاریەکی مەزنە بۆ شانۆ. لێرەدا من رووی پرسیارم ئاراستەی ئێوە دەکەم، ئایا ئێوە ئەو ژیانە دەناسن کە لەم شۆڕشەدا خوڵقاوە؟ سەیر بکەن کەسایەتیە مردووەکان چۆن لەخەو هەڵدەستنەوە؟! بێگومان ئەو کەسایەتیانەی کە ئێستا خۆیان بە زیندوو دادەنێن هەموویان دەمرن، واتە لەلایەك ژیان

دەبێتـە مـردن و لەلایـەکی دیکـەش مـردن دەبێتـە ژیـان. ئـەو کەسـایەتیەی کـە لـەنێو زەلکاودا خنکاوە و بەتـەواوی کەوتۆتـە خزمـەتی دوژمـن، دڵنیـابن کـە لـەنێو دەچێت و، لەبەرامبـەر ئـەم رەوشەشـدا ئـەو کەسایەتیانەی کـە سارد و سڕ و وشـك بـوون، ئێسـتا سەرلەنوێ گەرم دەبنەوە و زیندوو دەبنەوە. بێگومان ئەم رووداوانە بۆ شانۆ دەبنـە دەق و تێکستی زۆر چاك، ئەگەر نمایش بکرێت.

بەڵێ ئێمە کوێر و کەڕ بووین، بێ دڵ بووین، کەچی ئێستا چاومان باش دەبینێ و گوێچکەمان بـاش دەبیسـتێ و دڵیشـمان زۆر بـە گـەرمی لێـدەدات. ئەمـەش لـە کـارێکی شانۆیی دەچـێ و پـێش هـەموو هونـەرێك بـۆ هونـەری شانۆ دەبێتـە بناخـە. لەلایـەکیتر دەتوانین بڵێین گیانی قارەمـانێتی لـەنێو گـەلی کـوردا مردبـوو، کەچـی ئـەو رۆحـە ئێسـتا دەژێتـەوە. ئـەو قارەمانانـەی ئـەمڕۆ لـەناو شۆڕشـدان، هەریەکـەیان بۆخـۆی قارەمـان و پاڵەوانێکی شانۆییە. سەیر بکەن هەر شەهیدێك، هەر بەرخودانێکی شاخ و زیندان خۆی لەخۆیدا پەرتووکێکی هونەری و شانۆگەرییەکی مەزن و بنەمایەکی چاکیشە بـۆ شانۆی ئێوە. پێویستە ئێوەش ئەو کەسایەتییانە لە خۆتانـدا دروست بکـەن کـە لـەناو شۆڕشـدا دەردەکـەون، ئـەو خۆشەویسـتیەی تـازە دروسـت دەبـێ ئێـوە بیناسـن، ئـەوەش دەبێتـە بناخەیەکی بەهێز بۆ هونەرەکەتان.

بەڵام ئایا ئێوە بە قووڵی ئـەو شـتانە دەناسـن و تـا چ رادەیـەك ناسـیووتانە؟! ئـەو کچـانەی خۆیـان سـووتاند، بەسـەدان لەوانـەی دوا فیشـەکەکەیان بـە خۆیانـەوە نـاو بـەنارنجۆك خۆیـان تەقانـدەوە، ئەمانـە شانۆی سەرسووڕهێنەرن. بـەڵام ئایـا ئێـوە ئـەو کەسانە دەناسن؟ ئایا وەکو پێویست بایـەختان پـێ داوە و لەسـەریان راوەسـتاون؟ ئەمانـە بۆ شانۆ کانیاوێکی زۆر گەورەن و تەنها سەرچاوەیەکیش نـیین؛ بـەڵکو بەسـەدان و بگـرە بەهەزارانن. لەڕاستیدا من ئێستا گەلێك لاوازی لەڕووی زمانەوە دەبینم، ئێوە بۆچی ئەم شتە مەزنانە نابینن؟

زۆر هونەرمەنـد و رۆشـنبیر لـەبواری مێـژوو و ئـەدەبیات و بوارەکـانی تـر دەڵـێن: ئێمـە کاردەکـەین، باشـە ئەگـەر ئێـوە ئـەو ژیانـە نوێیـە و قارەمانێتیـەی دروسـت دەبـێ نەبینن، چۆن دەبن بە هورنەمەند؟!

ئێمە ئەشقی "خانی" بۆ "مەم و زین" مان ژیاندەوە و هەنگاوی مەزنمان لەسەر هەڵێنا. ئەگەر ئەو شتانە نەبینن، چۆن خۆتان بەخاوەن ئەدەبیات و خاوەن شانۆ دەزانن؟.

لەم روانگەیەوە دەڵێم: ئێستا بنەمایەکی مەزن بۆ هونەر بەگشتی و بەتایبەتی بۆ شانۆ دروست بووە، لەو باوەڕەدام کە لە ئاییندەدا ئەم بناخەیە نەك تەنها بۆ کوردان، بەڵکو بۆ جیهانیش دەنگ دەداتەوە. ئێمە گیانێکی نوێ و مرۆڤێکی نوێ، دروست دەکەین، ئەمەش نەك تەنها لە کوردستان بگرە لە جیهانیش جێگای خۆی دەکاتەوە. بۆیە پێویستە ئەم راستیانە لەبەرچاو بگرن و و لێی نزیك ببنەوە.

ئێستا من خۆم بە هونەرمەندێکی شانۆیی دادەنێم، کاری من شۆڕش و شێوازی من بۆ خۆی مۆنۆلۆژە. بێگومان مۆنۆلۆژیش شانۆیە. لە کوردستاندا مۆنۆلۆژی هەرە گەورە من دەیکەم. دیارە دیالۆگ و وتوێژی دووقۆڵیش کارێکی شانۆییە، ئێمەش لەلای خۆمانەوە زۆر بەبەرفراوانی و بەقووڵی پەیڕەوی لێ دەکەین، لەمە بەدواوە بەشەکانی تری شانۆ رۆژ بەرۆژ بەدی دێت و بەهێز دەبن. بۆیە ئێوە خاوەن بەخت دەبینم، چونکە ئەو کارەی ئێوە دەیکەن لەئێستا بەدواوە لەسەر ئەم بناخەیە بەرەو پێش دەچێ و گەلێك شتی باشیشی لێ بەدی دێت.

لە دێرسم ئەو ئیمکاناتەی دوژمن دروستی کرد، وەکو سازکردنی قۆتابخانە کە منداڵی حەوتساڵانیان تێدا پەروەردە دەکرد، کاتێ قۆتابخانەیان تەواو دەکرد پێیان دەگوتن وەرن لە ئەنقەرە و ئەستەمبۆڵ و ئەوروپا ئیش و کار هەیە و بۆخۆتان بژین. میللەتیش برسی و بێکار بوو، بۆ ژیانیش خوێندن پێویست بوو، بەم شێوەیە لە حەوت ساڵیەوە لەسەر زمان و شۆڤێنزمی تورکی پەروەردە دەکران. دوایش لەبەر برسێتی و ناهەمواری بۆ ژیان روویان دەکردە شارە گەورەکانی تورکیا و ئەوروپا. بەمڕەنگە لەدێرسم دابڕان و ئێستاش تەماشایان بکەی وەکو گەمەیەکی دوژمنیان لێهاتووە. لە سەرەتا بە کۆکوژی"لەکاتی سەرهەڵدانی سەید رەزا" قڕیان کردن و دواتریش برسی و تینوویان کردن، جا ئەگەر ژیانیان بویستایە، دەبوایە ببنە تورك و ئەگەر کاریشیان بویستایە، دەبوو بچنە ئەنقەرە و ئەستەمبوڵ و ئەوروپا. بەڵێ ئەمە بە پیلان و دەستی دوژمن ئەنجامدراوە و تەواوی گەلی کوردیش وەهایان بەسەر هاتووە و کۆچبەر بوون.

بۆیە با کەس نەڵێ من بەخۆم وڵاتم بەجێهێشت و هاتم بۆ هەندەران و کەوتوومەتە ئەم ڕەوشە خراپە. نەخێر هەمووی بە پیلانی دوژمن ئەنجامدراوە.

نموونەیەکی تریش بۆ ئەم ڕاستیە دەهێنینەوە؛ لە مەڕەش کۆنترا گەریلا قەسابخانەیەکیان بۆ گەلەکەمان لە ساڵی 1978 سازدا، ئێستا سەیر بکەن لە مەرەش کوردێك نەماوە و هەمووی کۆچبەر بوون، تەنها چەند سەرباز و چەند ژن ماون، لەئەنجامی ئەو کۆکوژیە میللەت کۆچبەر بوون. با کەس نەڵێ ئەوروپا خۆش بوو و بەدڵی خۆم هاتووم، لەسەرجەم پارچەکانی کوردستان کۆچبەری لەسەر ئەم بنەمایە ڕوویداوە. بۆیە پێویستە باش بیری لێ بکەینەوە کە دوژمن چۆن بەشەڕ ئێمەی دەرخست و دەبێ ئێمەش بەشەڕی گەل بگەڕێینەوە و هەموو شتێك لەهزر و بیری خۆماندا دوژمن بناسین و لە دڵ و گیانیشدا کین و تووڕەیی بەرامبەر دوژمن دروست بکەین. ئەمەش بکەینە سیاسەت و یەکێتی خۆمانی پێ سازبکەین و، دڵ و مێشکتان بەرەو ڕێگای وڵات ئاراستە بکەن، کار و خەباتی شۆڕشیش لەم بوارەدا لە خزمەت ئێوەدایە. پێویستە کوردەکانی دەرەوەی وڵات ئەگەر دوو نانیان هەبێ پێویستە نانێکی بخەنە خزمەت شۆڕش. ئەمە دروشمێکی باشە، ئەگەر هەمووتان پەیڕەوی بکەن پیلانەکانی دوژمن پوچەڵ دەبنەوە و دوژمن لەناو پیلانەکانی خۆیدا سەرنگون دەبێ و ئێوەش دەبن بە هێزێکی مەزن و لەکاتێکی نزیکدا دەتوانن بە کوردستان شاد ببنەوە. جارێکیتر دەمەوێ کوردی ناو وڵات و دەرەوەی وڵات لەسەر ئەم ڕاستیانە بە قووڵی ڕاوەستن، لەڕاستیدا کوردی ناو وڵات لە تەنگەتاویەکی مەزندا دەژین، دوژمن دەخوازێ بەشەڕ پیلانێکی چەپەڵیان لەسەر پیادە بکات، هەر بۆیە پێویستە ئەوانیش بکەونە شەڕ و بزانن ئەو ژیانەی شەڕێکی گەورەی لەپێناودا دەکەین و ئەو قوربانیانەی کە ڕۆژانە دەیدەین و هەر یەکێك لەوانە دڵی ئێمەیە، ئێوەش بەر ئەم شەڕە دەکەون، ئەم ژیانە گەورەبوونی ئێمە و شەرەفی ئێمەیە. ئێمە لە ژیانێکی بێ شەڕ دەترسین ژیانێکی بەشەڕ بۆ ئێمە شەرەفێکی زۆر مەزنە؟ لەبەر ئەمە ئەو کوردانەی ئێستا لەناو شەڕدان لە بەرامبەر دوژمن و لەژیانێکی دژواردان، خۆتان بە خاوەن شانسێکی پیرۆز بزانن. بەواتا شەڕ بۆ گەلی کورد ژیانە، خوێن ڕژاندن و قوربانیدان بۆ ئێمە ژیانە، با لە قوربانیدان و خوێن ڕژاندن نەترسین، بەپێچەوانەوە دەبێ لەسەر وەستاندنی خوێن بترسین. لەبەر

ئەمە کوردی ناو وڵات بەتایبەتی ئەوانەی لەناو شەڕدان و تینوو برسین، بەشەرەفترین مرۆڤن لەلای من. ژیانی مەزنیش هەر بۆ ئێوەیە، هەر بۆیە خۆتان نیگەران مەکەن و سەری خۆتان بەرزبکەنەوە و بەشێوەیەکی کاریگەرتر جێگای خۆتان لەناو شەڕدا بگرن. لە گوند و شار، لەنێو خێزان و لە نێو دراوسێکانتاندا چی لە دەستتان دێ لەم پێناوەدا درێخی مەکەن.

ئەمڕۆکە ئێمە لە شەڕێکی مەزنداین، دوژمن لەو ئۆپەراسیۆن و شاڵاوە سەربازییەی دوایدا دەیەوێ ئەو کوردەی کە ماوە پەرتەوازە بکات و لە وڵاتیان بەدەرنێ. ئەمە بڕیاری دوژمنە، ئێمەش بڕیارمان داوە. ئەو جێگایەی بەشەڕ لەناو وڵاتدا گرتوومانە بڕیاری هەزاران ساڵی دوژمن هەڵدەوەشێنێتەوە تاوەکو چیتر کۆچبەری روونەدات، نەك تەنها ئەمە، بەڵکو ئەو کوردانەی تائێستاش کۆچبەر بوون رێگای گەرانەوەیان بۆ خۆش دەکات. شەڕی گەریلا بۆ ئەم مەبەستە رۆڵێکی مەزن دەگێڕێ و لەمەو دواش ئەو رۆڵەی زیاتر دەبێ. واتە لە ئێستا بەدواوە گەریلا رۆڵێکی زیاتر دەگێڕێ، هەر گەریلایەك لەمەودوا دەبێتە گەریلایەکی گیانفیدایی. لە شارە گەورەکانیش هەڵمەتێکی وەها دەست پێدەکەین و، ناهێڵین دوژمن بە ئارامی بژی. نە لە شارەکانی کوردستان و نە لە شارەکانی تورکیا نەهێڵین ئارامی لەخۆوە بگرێ.

بۆ ئاشتی گەلێك هەوڵماندا و تائێستاش ئاگربەستی یەکلایەنەمان بەردەوامە. بەڵام ئەگەر دوژمن لێی تێنەگا و بەم ئۆپەراسیۆنانەش توندتر هێرشمان بکەنە سەر، ئێمەش دەستەوەستان نامێنین و ئامادەکاریشمان کەم نییە و لە ئاستێکی بەرزدایە. کاتێ وەڵام بدەینەوە بەجارێك لەسەر سەری دوژمن دەتەقینەوە. با جەماوەر و گەلەکەمان بەوپەڕی باوەڕییەوە بزانێ کە لەم هەنگاوەی دواییماندا سەرکەوتن زۆر نزیك دەبێتەوە.

سەبارەت بە گەلەکەمان لەباشووری کوردستان، ئێستا ئەوان لە قۆناخێکی نوێدان، با چیتر وڵات بەجی نەهێڵن و کۆچبەر نەبن. لەو باوەڕەشدام کە چیتر روو لەهەندەران ناکەن، چونکە خەباتی ئێمە لە باشووردا بۆ ئەوەیە کە ئیدی کۆچبەر نەبن. ئەو سیاسەتەی پیادەی دەکەین و ئەو یەکێتیەی سازی دەکەین زەمینە بۆ ئەوە خۆش دەکات کە خەڵکی باشوور جێگیر و ئارام بێت و روو لە دەرەوە نەکات.

لە ئێراق کێ دێتە سەر حوکم با بێت و، لە رۆژهەڵاتی ناوەراستیش چ روو دەدات با رووبدا، کوردی باشووری کوردستانیش هەر دەگات بە فیدراسیۆنێکی دیموکراتی. هیچ

کۆسپ و تەنگەرەیەکیش ناتوانێ هەتا سەر رێگای لەپێش بگرێت. لەبەر ئەمە چاوتان لەرێگای دەرەوەی وڵات نەبێ، بە پێچەوانەوە هەتا دوایی دڵی خۆتان بە وڵاتەوە گرێ بدەن.